# دوو ساڵ لە کوردستان

نووسینی: دابلیو. ئار. هەی

حاکمی سیاسیی هەولێر
لە سەردەمی داگیرکاریی بەریتانیا دا



وەرگێڕانی: لوقمان باپیر

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات

# دوو ساڵ لە کوردستان

دبلیو ئار هی

حاکمی سیاسی هەولێر لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیا

# دووساڵ لە کوردستان


○ ناوی نووسەر : دبلیو ئار هــــی
○ وەرگێڕانی : لوقمـــان باپیــر
○ دیزاینی ناوەوە: خەلیل هیدایەت مام شێخ
○ لە بەڕێوەبــەرایەتی گشـتی کتێبخـانەکان ژمــارەی سـپاردنی ( ١٠٦) ساڵی ٢٠١٠ی پێ دراوە.
○ نرخ: (٨٠٠٠) دینار
○ چاپی : ٢٠١٦
○ شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات– هەولێر

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا
**سەلام محەمەد رەسول**

## پێرست

## پێشەکی نوسەر

لەو لاپەڕانەی دێن، ئەوەندەی لە توانادا بوبێ، ئەوا چەندی کارەکە پەیوەندی بەناوی شوێنە عارەبی و فارسیەکانەوە هەبێ، شێوازێکی بەبەهای وێناکردنم (١) گرتۆتە بەر، کەچی ئەو کارە پێویستی بە جۆرە گۆڕانکاریەك هەبو دەربارەی ناوە تورکی و کوردیەکان، چونکە گۆکردنی (کۆی: KEUI) زۆرجار بەو شێوەیە هاتوە، لەجیاتی گۆکردنی باوتری: کۆیە. چونکە ئەوە لەگۆکردنی هاسانترو دروستتر نزیکە.

لیستی سەرچاوەکان دانەنراوە، جگە لەو کتێبە باوانەی کە لێیانەوە وەرگیراوە، تەنیا ئەو ناوی دو کتێب هاتوە کە:

کتێبی سی. گی. ڕیچ بەناوی: C.G.Richs Residnce 1836 مانەوە (نیشتەجێبون لە کوردستان ١٨٣٦، و کتێبی موقەدەم ئی. بی سۆن بەناوی: Major E.B.Soanes.

To Mesopotamia and Kurdistan گەشتێکی نهێنی بۆ وولاتی میزۆپۆتامیا و کوردستان دوپاشکۆش لە دوایی ئەو کتێبەدا دەبینی یەکێکیان نهێنی کورتەی سیستەمی بەڕێوەبردن لە ئیمپراتۆریای تورکی، و ئەویدیش پوختەی ئەو روداوانەن کە لە ولاتی میزۆپۆتامیاو لەکاتی ئاگربەستی تورکیا رویانداوە کە لە تشرینی یەکەمی (١٩١٨ن)دا بەسترا، تاکۆتایی(١٩٢٠ن).

نوسەر پێیخۆشە کە ئاماژە بەوپشتگیریە بکات کە یەکەم (سێر. ئەی. تی ویلهۆن)(٣) پێشکەشی کردوە و ئەگەر هاندانی ئەو نەبوایە ئەو کتێبە هەرگیز نەدەنوسرا. دوەمیش(گوروبان ڕاندڵ)ە کەلەو چاکانەی کردونی هەڵەچنی کاری چاپکردن بوو، وەك چۆن نوسەر خۆی بەقەرزاری(گوروبان کێرك) دەزانێ کە ڕێگەیدا کۆپی وێنە نایابەکانی بکات سەبارەت بە ناوچەی ڕەواندوز، بەداخەوە کە نەتوانرا سود لە زۆربەیان وەربگیرێ لەو وێنە نایابانەی کە لەو دەوروبەرەدا

گیرابون. بەخشندەیی(سەرهەنگ نوێڵ) و(گوروبان میللەر) کارێکە دەبێ سوپاس گوزاری لێبکرێ بە تایبەتیش ئەو وێنەیەی ئەوەی دواییان بۆ(حەماغا)ی گرتووە.

کەمێك لە وێنەکانیش نوسەر نازانێ بەرامبەریان قەرزاری کێیە، بۆ سوودلێوەرگرتنیان داوای لێبوردن لەوێنەگرەکانیان دەکا. هەر وەها نووسەر ئارەزوویەتی کە سوپاسگوزاری خۆی بۆ(خاتو سێبیل ئەبرام) ئاشکرابکا دەربارەی خوێندنەوەی دەستنوسەکەی، کەبێ ئەو نە وەدەردەکەوت و نە لەسەر ئامێری تایپ چێ دەکرا، هەروەها سوپاسی بەخشکاران بۆ سۆزداریان کە لەبەرامبەر نوسەردا دەریان خست لەکاتی کارکردنی لەگەڵیاندا.

هەمیشە ڕاهاتوم و هەوڵمداوە لەسەر ڕیشەی نەریتە ناوچەییەکان بڕۆم، تا ئەوڕادەی کە ویژدانم ئارامکا و،شەرەفمەندی وڵاتەکەشم ڕێگەم پێبدا.

---

## (ریچ) لەکتێبەکەیدا بەناوی (مانەوە لە کوردستان)

---

◆

# بەشی یەکەم
# پێشدەستی

لە نەوەکانی ئەو سەردەمەدا ڕێژەیەکی کەمی خەڵك بۆیان لواوە تا بچنە ناوچە نادیار و نەناتراوەکان و، لەنزیکەوە لەگەڵ هۆزە سەیرە نەناسراوەکان زیندەگی بکەن. لەگەڵ ئەو کاریگەری و سەرنجڕاکێشیەی کەژیانی نوێ هەیەتی، کەچی زۆرێك لە ئێمە، لە ئینگلتەرا، هێشتا هەست بە پاڵنەرە ڕۆحیە — ئەلیزابێیەکە — دەکەین، مەبەستم: بانگکردنی دەریای نەدۆزراوە و سیحری شتەناوازەو سەرسوڕ هێنەرەکانە.

ئەو کەسەی کە ئەم هەلەی بۆ گونجاوە لەو ناچانەدا گەڕاوە کە پێشتر کەس پێی تێنەناوە و، ئەوشتانەی دیوە کە پێشترکەس نەیدیوە، ببوورن ئەگەر تاقیکردنەوەکانی سەربکەن و هەوڵبدا وەسفیان بکا بۆ هەمنشینانی و قەڵەم بەدەستەوە بگرێ و بنوسێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەرگیز نوسەرێکی لەبار نەبێ بۆ ئەوکارە.

کە واتە پاساوی نوسەر بۆ نوسینی ئەم کتێبە لێرەدایە. ئەم کتێبە نەزیرەکی تیایە نە کارامەیی و نەبیرکردنەوەیەکی قووڵ. ئەمە گێڕانەوەیەکی(سەرسوڕماو)ە بۆ دیتن و ڕوداوەکان. نوسەر بەوە دڵخۆشەکە، لەم ساڵانەی دواییدا، لە فەرمانگوزاری (بەڕێوەبردنی شارستانی میزۆپۆتامیا)(٢)دابوە، ئەو کارەشی زۆربەی کات هەمیشە لە شوێنە دورەکاندابوە.

لەگەڵ ئەوەی کە(میزۆپۆتامیا) (وڵاتی نێوان دوڕوبار) هێشتا تەواو نەپشکنراوە، کەچی هەمیشەو، بە سەیرکردنی هەموخەڵك، خاکێکی نەناسراوبوە (Feera incognita). بەغدا پایتەختی وڵاتی چیرۆکەکانی جنۆکان بوو.

عەرەبەکانمان وا دەهاتە بەرچاو، کە مامزەیان لە ئەسپەسەرکێشەکانیان دەدا لە سارابەرینەکان، کە ڕێگایەکیان نەبوو.

لەکاتێکدا کە هەرگیز گویمان لە ناوی کوردەکان نەبیوو. یان تەنیا وەك ڕێگر و بەربەریترینی خەڵك ناومان بیستبون.

بە پێشڕەویکردنی سوپا لەبەسراوە بۆ ناو وڵات، دەسکرابە ناردنی(فەرمانڕەوا سیاسیەکان) بۆ بنکەی گرنگەکان تا وەك نێوانگیری نێوان (دەسەڵاتە سەربازیەکان) و خەڵك خزمەتبکەن. وەبە پەیمانی ئاگر بەست کارە سەربازیەکان گرنگیان کەمبۆوە و بەڕیوەبردن و بەرز ڕاگرتنی یاساو بەرکەماڵی ئاسایش و سیستەم لە نێوان هۆزەکاندا بونە ئامانجە سەرەکیەکانمان لە(میزۆپۆتامیا). بەڕێوەبەرایەتی سیاسی کە پێشتر پایەیەکی لاوەکی هەبوو، ئێستا کێبرکێی لەگەڵ بنکەی گشتی دەکرد و، بەپەلەو یەك لەدوای یەك بەڕێوەبەرایەتیەکانی دیکەی لە خۆگرت، وەك: (بەڕێوەبەرایەتی ئاودێری) و بەڕێوەبەرایەتیەکانی پۆستە و تەلەگراف و شەمەندەفەر. هەرچۆنێك بێت. تاکو هاتنی(سێربرسی کۆکس) لەئەیلولی(١٩٢٠ز)، (فەرمانـدەی گشتی) بەرزترین پایەی هەبوو، میزۆپۆتامیاش، بە هۆی ئاگربەست، وئێستاش(لەباری شەڕدابوو).

لەم ساڵەی دواییدا گەلێ هێرش کرایە سەر(بەڕێوەبەرایەتی شارستانی) لە میزۆپۆتامیا، بەلأم لێرەدا کارمان بە باسکردنیان نیە. سەرەکیترین ئامانجی(نوسەری ئەم دێڕانە) لە(کتێبەکەیدا) خۆپاراستنە لەو شتانەی مشتومڕ دروستدەکەن. وە دەربارەی ئەوەی کە ئەم هێرشانە پاساوێکیان هەبوبێ، لە سەرەتادا، ئەوا هیچ ڕایەك دەرنابڕێ. وەکچۆن هەوڵنادا بە دوای هۆکارەکانی پشێویەکانی ئێستادا بچێ(٤). لەسەروی ئەمانەشەوە هەوڵنادا کە بۆ چونە پەسندەکانی خۆی دەربارەی باشترین سیاسەت بۆ ڕۆژانی داهاتوو بسەپێنێ، ئەوەی کە چاوی تێبڕیوە ئەوەیە کە(خوێنەر)بباتە وڵاتێکی دوور، تابەشداری لەگەڵدابکا لەو خۆشیانەی کە لەشتی سەمەرەدا هەڵقولاون وقسە لەگەڵ کەسانێکی سەیردابکا و لەگەڵیاندا بژی، لە ڕێی سەرچڵی و ساتەکاتی تەنگانە و لەسەر ئەو شتانەی نوسەر دەستی کەوتون لە تاقیکردنەوە و هەواڵ.

شــایەنی ئەوەیــە کــەلێرەدا، نــاوی(ســێر ئەرنۆڵــد ویلــسۆن) بێــنین کەسەروکاری(بەڕێوەبەرایەتی شارستانی لە میزۆپۆتامیا) دەکرد، لە ئاداری (١٨١٩) تا ئەیلولی (١٩٢٠)، ئەمەش لە سەروبەندی سەردەمی فراوان بونە مەزنەکەیدا، تا ئەوسەردەمەی کە دوچاری کێشەی گەورەبوو.(سێر ئەرنۆڵد ویلسۆن) لەگەڵ ئەوەی کە(سەرۆکی گەورە) بوو بۆ نوسەری ئەم چەند دێڕەو ئەو کەسانەش کە لە(بەڕێوەبەرایەتی سیاسیدا) کاریان لەگەڵدا دەکرد، هاوڕییەکی تایبەت و ڕەهاکەری هەمو هەوڵ و ئاواتەکانمان بوو، ئەوەشی لادەبوژاندینەوە کە ژمارەیەکی کەم لە پیاوان دەتوانن کارێکی باش و مەزن ئەنجام بدەن کە لەژێر فەرمانی ئەودا کاریاندەکرد، ختورەی گومانی ئەوەشی دروستدەکرد کە پیاوێکی دیکە هەبێ کە قورسایی ئەو کارە بخاتە ئەستۆی و ئاکامەکانیشی بخاتە سەرشانی، وەك ئەوەی کە ئەو کردی و یان کەسێکی دیکە هەبێ ڕوبەڕەوی ئەوەندە کۆسپ و تەگەرانە ببێتەوە بەگیانی ئەو دروشمەی کە لەسەر دیواری نوسینگەکەی یدا نوسرابوو(٥).

(میزۆپۆتامیا)یان عێراق کە ئەوە ناوە ناوخۆییەکەیەتی، دوای(ئاگربەست)و، بۆ مەبەستی بەڕێوەبردن، بەسەر (١٣) یەکەی بەڕێوەبردنی سەرەکی دابەشکرابوو، هەر یەکەیەکیشی لە ژێر فەرمانی (فەرمانڕەوایەکی سیاسی)بوو کە ڕاستەوخۆ بەرپرسیاربو بەرامبەر(ڕێپێدراوی شارستانی لەبەغدا). هەریەکەیەکی سیاسی لەوانە یەك یان دوو(یەکەی پاشکۆ)ی لەخۆ دەگرت لەژێر فەرمانی (یارمەتی دەری فەرمانڕەوای سیاسی) بەرپرسیار بەرامبەر(فەرمانڕەوای سیاسی) لەبنکەی یەکەی سەرەکی، لە هەمو ئەو ناوچانەی کە تازە داگیرکرابون(یارمەتیدەری فەرمانڕەوای سیاسی) سەربەخۆی یەکی گەورەی هەبوو. (فەرمانڕەوای سیاسی) ئەرکی کۆنترۆڵکردنی نەدەگرتەبەر تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە کارە ڕۆتینیەکان زەقدەبونەوە. بەگشتیش(یەکەی بەڕێوەبردن) بەرامبەر(ویلایەت)ی تورکی کۆن بوو،(یەکەی پاشکۆ)ش بەرامبەر بە(قەزا) بوو. ڕوبەری یەکەی بەڕێوەبردنیش لە نێوان (٢٠٠٠ تا ٦٠٠٠ ) میلی چوارگۆشە بوو، دانیشتوانیشی لە نێوان(١٠٠) هەزار تا (٢٠٠) هەزار کەسبوو. لە هەموو یەکەکانی بەڕێوەبردن و هەندێ لە یەکە پاشکۆکانیش ئەفسەرانی بەریتانی دادەنران تا

کاروباری سەربازانی (لیڤی) (levies) بەڕێوە ببەن، کە سەربازانی ناوچەیی و(دەرەك) و(ژاندارمە بوون، ئەم ئەفسەرانەش لەلایەکەوە بەرپرسیاربون بەرامبەر بە(پشکنەری سەربازگیری لە بەغدا) و لەلایەکی دیکەشەوە لەبەردەم(فەرمانڕەوایی سیاسی). لە هەموویەکەکانی بەڕێوەبردنیش نوژدارێك (پزیشکێکی مەدەنی) هەبوو کە گرنگی بە تەندروستی خەڵك دەدا. کاروباری پەروەردە و داد و کشتوکاڵ فەرمانبەر و هەندێ کەسی تایبەتمەندیان هەبوو کە لە هەندێ لە شارەگەورەکان دادەنیشتن. یەکە سەربازیەکان لە بنکەی یەکەکانی بەڕێوەبردندا بوون تەنیا یەك دو یەکە نەبێ. بەهەر حاڵ (یارمەتیدانی فەرمانڕەوا سیاسەکان) بەزۆری، داوایان لێدەکرا کە لەناوچە دورەکان، ژیانێکی دورەپەرێز بژین، بەزۆریش تەنیا یەك نوسەریان(کاتب) لەگەڵدا بوو. ئەرکی(یارمەتیدانی فەرمانڕەوا سیاسیەکان) گەلێ زۆر بوون، سەرەکیەکانیش ئەمانەبون:-

یەکەم: بەرز ڕاگرتنی یاساو، بەرکەماڵی ئاسایش و، پارێزگاری کردن لێیان، لەمەشدا(دەرەك) (پۆلیس) هاوکاریان بوو.

دووەم: دەستەبەرکردنی زانیاری گشتگیری لەسەر جوگرافیای ناوچەکە و سروشتی ئەو هۆزانەی تێیدا نیشتەجێن و پێکهاتەو نەریتیان. ئەمەش مانای گەڕان و سوڕانێکی فراوانە.

سێیەم: بلاوکردنەوەی دادپەروەریەکی بێلایەن، کە ئەمەش ئەرکێکی ئەستەم بوو بۆ کەسێکی ئارەزومەند لەولاتێك کە سیستەمێکی یاسایی سەیری هەبێ، ئەگەر ئەو(یارمەتیدەرانەی فەرمانڕەوای سیاسی) کارێکی باشیان کردبێ ئەوا زیرەکی خۆیان ڕێ ی پێشانداون.

چوارەم: سەندنی باج، هەموو داهاتی ولات بەزۆری ئەوانەبون کە لەزەوی بەرهەمدەهاتن. ئەمەش پێویستی بە گرنگیدان و زانینی شێوازی کشتوکاڵی ناوخۆ و لێکۆڵینەوە هەبوو.

پێنجەم: سەندنی سەرانەی شارەوانیەکان و گرنگیدان بە پاراستنی تەندورستی ڕێکخستنەکانی شارەوانی. ئەم ئەرکانەش لەدواییدا بەشیکیان خرایە ئەستۆی ئەنجومەنی شارەوانی. وەکچۆن ئەرکی لاوەکی دیکەشی دەکەوتە سەرشان وەك گرنگیدان بە سەرپەرشتی ئەو خەڵکانەی لەژێر فەرمانی ئەو دابون. ئەگەر یەکەی

سەربازیش لە ناوچەکەیدا هەبوایە ئەوا دەبوایە هەموو یارمەتیەکانی کە لە تواناداا بوایە پێشکەش کردبان، بەتایبەت ئەوکارانەی کە پێویستن بە کرینەوەی بەروبومی ناوچەیی و ئامادەکردنی کرێکاران، لە یەکە بچوکەکانیشدا سەرەڕای سەرپەرشتی کاروبارەکانی (یارمەتیدەرانی ئەفسەرە سیاسیەکان) لە ناوچەکانی دەرەوە، دەبوایە(فەرمانڕەوای سیاسی) بەکاروباری (یارمەتیدەری فەرمانڕەوای سیاسی)ش هەڵسێ.

بەرلە(شەڕ ڕاگرتن(هدنة) لە کاتێکدا کە ئیعتیباراتە سەربازیەکان ڕێگربون لەبەردەم پێدانی ئەو جۆرە دەستڕۆیشتنانەی دەسەلاتە ناوخۆییەکان، ئەوا (یارمەتیدەری فەرمانڕەوای سیاسی) خۆی(دەسەلاتی شارستانی ی ناوچەیی) بە توانابوو، دوای ئاگربەست و بەتایبەتیش لە کوردستان، هەولێکیزۆردرا تا خەڵکەکە فێربکرێن خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، بەلام بە شانازیەوە، بە هۆی ئەو پێشوازیە گەرمەی کە دەسەلاتی بەریتانیا هەیبوو، وەك حاکمێکی کە خواوەند هەڵیبژاردبێ تا چارەسەری هەموو کێشەکان بکا.

دەسەلاتە دادوەریەکەی(قضائية) لەگەڵ ئەوەشدا کە سنوربەندبو بە حوکمی دوساڵ لەگەڵ کاری قورس و سەپاندنی بژاردنێك(غرامة) کە بڕەکەی دە هەزار روپیە بوو بەس بوو بۆ هەر کێشەیەکی کە چارەسەری دەکرد. دەکرا ئەو دەسەلاتە فراوان بکرێ بەمۆڵەت وەرگرتن لە(ڕێپێدراوی مەدەنی)(٨) و لە بارودۆخی تایبەت دا. بێ گومان خەڵکانی ڕۆژهەلات و لەوانیش دا کوردانی سەرەتایی، بەپلەی یەکەم لەگەڵ ئەو شێوازە دیموکراسیە نوێیانە رانەهاتون، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە سەیربێ ئەگەر بڵێین هەر چەندی حوکمی(یارمەتی دەری حاکمی سیاسی) راستەوخۆبوایە بەگشتی خۆشەویستتردەبوو لای دڵی خەڵك، بەتایبەتیش بۆ خانەدانەکانی ناوچەکە کە خاوەن عەقڵێکی زیرەکن. بونی ئەویش پشوی کەسی تەنگ نەدەکرد تەنیا ئەو سەرکردە تەقلیدیانە نەبێت کە پێشتر لەسەردەمی تورکەکان ڕاهاتبون(دادوەری بکرێن).

بەشێوەیەکی ئاسایی (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) نوسەرێکی بەریتانی و ژمێریارێکی هیندی یارمەتیاندەدا، ئەو کارمەندانەی دیکەش کە کاروباری داهاتەکان و داد و نوسەرانی شارەوانی و ئەوانی دیش، خەڵکی ناوچەکەبون.

نوسەرە بەریتانیەکان لە ڕاستیدا لە(لایەنە سەربازیەکە) دەخوازران، دوای (تەواوکردنی خزمەتی سەربازی) بەڵێننامەیەکی شارستانیان بۆ دەبەسترا کە ماوەکەی لە نێوان ساڵێك تا سێ ساڵ بوو، ئەوان کەسانێکبون کە چاودێری خەڵکی وڵاتەکەیان دەکرد، لانی کەمیش یەکێك لە زمانەکانی ناوچەکەیان دەزانی. بۆ ئەو ئەفسەرانەی، کە لەبەردەستیاندا کاریان دەکرد، پشتیوانیەکی گەورەبون. کارمەندە هیندیەکان لە هیندستانەوە دەهێنران، زۆربەخێرایی شارەزای زمانەکانی ناوچەکە بون، لانی کەم بەباشی دەیانتوانی هەڵسوکەوت لە تەك خەڵکەکەدا بکەن، خەڵك پێیان سەرسام بون، بەدڵسۆزی و زیرەکیان، هەرگیز نەمبیستوە سکالآیەکیان لەدژ تۆمارکرێ مەگەر بەدەگمەن، وەلەوکاتانەی کە(بارمەتیدەری حاکمی سیاسی) ئامادەنەبوایە، دەبوایە پۆستی ئەو تۆ وەرگرن کە زۆر ترسناك و پڕ لە بەرپرسیاریەتی بوو، لە زۆربەی کاتەکانیش زۆر جوامێرانە لە شوێنی خۆیاندا دەچەقین.

لە ڕۆژی یەکەمی (داگیرکردندا) ژمارەیەکی کەمی ئەفسەران پێویستبون بۆ ڕێکخستنی(بەڕێوەبردن) لە وڵاتدا، هەموشیان لە کارمەندانی(بەڕێوەبەرایەتی سیاسی لە حکومەتی هیندستان) بون یان لە(هێڵی خزمەتگوزاری مەدەنی هیندستان) بون، شتێکی ئاساییەکە پیاوانی ئەو دوو(هێڵە) لایەنەی کە لەبەردەستدابون ژمارەیان کەم بێت، دوای داگیرکردنی بەغدا، لەمانگی ئادار، لە کاتێکدا کە ئەو زەویانەی لەژێردەستی بەڕێوەبردنی بەریتانیا بون بە خێرایی فراوان بون، خواستنەوەی ئەفسەران لە دەسەلآتی سەربازی کارێکی پێویست بوو، ئەو ئەفسەرانەش، بەشێوەیەکی گشتی(سێر ئەرنۆڵد ویلسۆن) خۆی هەڵی دەبژاردن — ئەوکات سەرهەنگ(نقیب) ویڵسۆن بوو — لەمەشدا بەلای توانا زمانەوانیەکانیانیدا دەشکاندەوە. ئاسایی بو کە شارەزایی بەڕێوەبردنی پێشتریان نەبێ بەلآم بەشێوەیەك لەگەڵ هەندێ توانای دیکە، ئاسایی ڕەگەڵ یەکێك لە کۆنەپیاوانی(بەڕێوەبەرایەتی سیاسی) دەدران تا ئەرکەکانیان بزانن. لەبە ئەوە بەڕێوەبەرایەتی سیاسی لە حکومەتی هندستان و خزمەتگوزاری شارستانی هیندستان و بەڕێوەبەرایەتیەکانی لەو جۆرەش، بەهۆی پێداویستیە پێویستەکانی؛ ناچاربوو، هەموو ئەفسەرەکانی لەولآتی میزۆپۆتامیاوە بانگهێشت

بکا بۆیە ئەو ئەفسەرانەی کە لە(بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی)کاریاندەکرد لە وڵاتداو لە ساڵی(١٩٢٠) سەربازبون، لەوکەسانەبون کە بەشێوەیەکی کاتی لە یەکە سەربازیەکانیان و بەڕێوەبەرایەتیەکانیانخوازرابون. بەکارهێنانیشیان لەسەر بنچینەی ڕێککەوتێك بو کە کاتەکەی لە نێوان ساڵێ تا سێ ساڵ بوو، بێ گومان بەمەرجی باشیش، بەلأم لە ڕادەی مەعقول تێپەڕی نە دەکرد، ئەگەر ئەو بارودۆخە لەبەرچاو بگرین کە لە کارەکەیاندا هەبوو.

ژیانی(یارمەتیدری حاکمی سەربازی) بەهیچ شێوەیەك خۆشگوزەرانی تێدانەبوو، دەبوایە لە شوێنە دورەکاندا بژی، کە زۆرکات هیچ هۆکارێکی حەوانەوەی لێنەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەتوانادابوو خانوێکی فراوان و باش دابین بکرێ، بەلأم کەل و پەلەکانی زۆر سادەبون و ڕێکخستنی تەندروستی تێدانەبوو، ئەگەر هەشبوایە، لانی کەم سەرەتایی بون، خواردنیش، ئەگەر بڵێین تەندروستیانەبوو، کەچی جۆراوجۆری تێدانەبوو، بە شێوەیەکی ئاساییش، بریتی بوو لەگۆشت کاوڕ یان بزن و برنجیش سەوزەی باش و بژاردەی بۆ زیاد کرا. کەش و هەواش تەندروست و بەرگەگیراو بوو، بەلأم پڕماندوبون و ئەستەم بوو: هاوینی زۆرگەرم و زستانی زۆر سارد، ئەگەر بەراوردیان بکەین، بارانێکی ئەو تۆی لەگەڵدابوو سەرتاپای وڵاتی دەکردە قوڕو لیتە.(یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) دەبوا ڕۆژانە هەشت سەعات کاربکا، زۆربەی کارەکانیشی لە نوسینگەکەیدا داوەری بوو، ئەگەر لەنوسینگەش نەبوایە ئەوا دەبوا بەسواری لە ناوچەکەیدا بسوڕێتەوە، بەزۆریش لە شوێنێکی والآ کەهێندەگەرم بوو دەتگوت کلێپەی ئاگرە.

زیاد لە هەموو ئەوانەش، بەزۆری ژیانی لەژێر مەترسیەکی گەورەدا بوو، لەگەڵ ئەو هەموو ئاستەنگە قورسانەش دا، لە نێوان(یارمەتیدەرانی حاکمی سیاسی) بەشێکی کەمیان نەبێ ئەوانی دی هەموو ئاشقی کارەکەیان بون. هەریەك لەوانەش خۆی بە ناوچەکەیەوە هەڵدەکێشاو شانازی بەوەوە دەکرد کە ئاغاکان لەهەموان دڵسۆزترن و پتر لە ژێر فەرمانی یاسان لە نێوان ئەو کەسانەی کە دژایەتیەکی توندیان دەکردن، پێویستە هەر مرۆڤێ ئەو خەمە بێنێتە بەرچاوی خۆی کە(یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) دوچاری دەبوو کە دەیبینی هاوڕێکانی دەچونە ڕیزی خیانەتکارەکان و ئەو کارانەی کە بەهەمو توانایەوە ئەنجامی دەدان لێ ی

سەراوبن دەبون و دەخرانە ژێر پێیانەوە، ڕەنگە ئەوانەی لەو خەمانە دەربازبون و لە ناوچون و بونە ئێسك و پروسك، زۆر خۆشحاڵتر بوبن.

لەگەڵ ئەو پەیمانەی کە دابوم بەوەی کە هۆکارەکانی ئەو شڵەژانە شینەکەمەوە کە لەوڵاتی(میزۆپۆتامیا) دروستبون، کەچی پێویستە بە کورتی دەریخەم چۆن ڕوداوەکان ڕێڕەوی خۆیان گرت. بەریتانیەکان، کە لە وڵاتدا پێشڕەویان دەکرد، لە هەموو شوێنێکدا پێشوازیان لێدەکرا، ئەو شارە دورانەی کە چەندان میل لە یەکە سەربازیەکانەوە دووربون، نێردراوی خۆیان دەنارد تا بەرفەرمانی و گوێڕایەڵی خۆیان ڕابگەیەنن و تکایان دەکرد کە (یارمەتیدەرانی حاکمی سیاسی) یان بۆ بنێردرێ تا حکومیان بکا. هەر کاتێکیش کە نەفەری پێویست هەبوان ئەوا بۆیان ڕەوانە دەکران. لەمەوە(بەڕێوەبەرایەتیەکەمان ) ڕوبەرێکی فراوانیان قبوڵ کرد، لە هەموانیش دیارتر فوراتی ناوەڕاست بوو لە شارەکانیش : حیللە، کەربەلا، نەجەف کوفە و تویریج بون، بێ ئەوەی یەك سەربازی بەریتانیش ببینن لە باکور، لە کوردستانیش کارەکە بەهەمان شێوەبوو. خەڵك دەیانگوت، کە ئەوان چەندین ساڵە دەزانن بەریتانیەکان بۆ ئێرە دێن و مەلاکانیش(لەسەروی هەموو شاهیدەکان) دەیانگوت ئەوان لە سەردەمێکی دورەوە لە ناوکتێبەکانیاندا ئەو پێشبینیەیان دۆزیوەتەوە کە ڕۆژێك دێ حکومەتی بەریتانیا دەست بەسەر ئەو وڵاتە دا دەگرێ. (ئاوا ! : و. ع)

هەمو کەسێك پێیوابوو کە(سەردەمی زێڕین)داهاتوە، و سەردەمی گەشەکردنێکی مەزن بەڕێوەیە. ئامێرەکانی کشتوکاڵ ئامادەدەکرێن و زەویش دەهێنەدەی ئێستا بەرهەم دەبەخشێت. هێڵی ئاسن دەکێشرێ و کەناڵەکانی ئاودێری لێدەدرێن و بازرگانی گەشەدەکات ڕەنگە ئەوانەی لە نزیکەوە شارەزای کاروبارەکانن، لەسەر ئەوە کۆکبن کە بۆ وەدیهێنانی ئەو ئارەوزوانە چی لە توانادابوو کرا، بەڵام مرۆڤی ڕۆژ هەڵاتی هەمیشە خەیاڵبازە، نەخشە بۆ کۆشکە نایابەکەی دەکێشێ بێ ئەوەی حسێبی تێچوونەکەی بکا. لەبەر ئەوە(دانیشتوانی میزۆپۆتامیا) تەنیا توشی بێ ئومێدیەکی تاڵ نەبو کاتێك بینی کە ئەو(سەردەمە) لەناکاو لە نێوان شەو وڕۆژێکدا و بە سیحری سیحربازێك نەبوە(زێڕین)، بەڵکو لە تورەییان گڕی گرت کە بینی بەشێك لە ئازادیە تاکە کەسیەکەشی لەدەستدا.

تالآن و برۆی سەر ڕێگا گشتیەکان کە توند و تیژیان لەگەڵدابوو — کە پێشتر لە ئارەزوە باوەکانی ڕۆژانی ڕابردوو بوو — بوبە تاوانێك کە سزاکەی مردن بوو. ئیدی یاریدە مەزنەکەی دزینی ماڵی دەوڵەت لە تواناادا نەبوو دەبوایە باج لە کاتی خۆیدا بدرێت، بێ کەم و زیاد، هەر چەندە بە پێوانەیەکی کەمتر لەوەی کە لە سەردەمانی تورکیدا هەبوو، بۆ یەکاردانەوەیەکی مەزن دروستبوو — بە سوپاسەوە بۆ ئەو داواکاریانەی کە لە سوریا و تورکیا سەریانهەڵدا، کە لەبەر هەندێ هۆکاری دیکە پێویست نیە باسیان بکەین — کە دواترخوی لە شێوەی(شورشێك) نواند. بەشێوەیەکی گشتی ئاین لە(میزۆپۆتامیا) ڕۆڵێکە گەورەی نەبوو(ئاوا! : و. ع) کاتێکی زۆر تێپەڕ بوو پێشئەوەی عەشایەرەکان لەوە بگەن کە حکومەتی بەریتانیا(حکومەتێکی گاورە). دەگێڕنەوە کە سەرەك عەشیرەتێکی عارەب رۆژێك، بە ئامادەبونی(یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) جنێوی بە گاوران دەدا، کاتێك پیێ ی وت: (بۆ نازانی کەمنیش گاورم؟) سەرەك عەشیرەتەکە وتی (نەخێر تۆ گاورنیت تۆ ئینگلیزی، تاکە گاوری کە بەخەیاڵی عەشایەرەکاندا هاتبا ئەو ئافەریدە(مرۆڤە) بوو کە سەر بەو تایەفی نزمانە بون کە چی ئارامگربون و، تا ئێستاش بەشێوەی دەستەی بچوك لێرە و لەوێ لەولآتدا بلآوبونەتەوە. جێ ی گومانە کە ئەو بزوتنەوەی دوایی بەرامبەر بەریتانیەکان لە(میزۆپۆتامیا) بە ئاین ڕەنگرێژ بکرێ، یان بۆ مەبەستێك بە نیشتمانی ناوزەدەبکرێ(ئاوا! : و.ع).

دوای ئەوەی بە کورتی و، بۆ پێشدەستی، پایەی(حاکمە سیاسیەکان) و ئەو ئەرکانەی دەخراسەرشانیان، ڕونمان کردنەوە، ئەوا(نوسەری ئەم چەند دێرە) هەوڵدەدە(قسەکانی) بگێڕێتەوە و ئەو بنچینەیەش دیاری بکا کە (چیرۆکەکەی) لەسەر بنیات ناوە.

کە ئاگری شەڕ هەڵگیرسا من ساڵی یەکەمی خوێندنم لە(زانکۆی ئۆکسفۆرد) تەواو کردبوو لە تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩١٤) دا لەگەڵ(یەکەی دۆرسیتس ٤/١ ) لە دەریاوە بەرەو هیندستان کەوتینەڕێ، لە کانونی یەکەمی ساڵی(١٩١٥)دا چومە(میزۆپۆتامیا) و لە نزیك(شێخ سەعد)بوم لە ناوچەی(حننە) کە کوشتار کلیەی سەند لە مانگەکانی یەکەمی ساڵی (١٩١٦). لە نیسانی ئەو ساڵەدا بە سوکی بریندار بوم، گەڕاندرامەوە بۆ هیندوستان و تەنیا دوای ساڵێك گەڕامەوە(میزۆپۆتامیا). لەگەڵ

دوبارە دروستکردنەوەیدا لە لەگەڵ(یەکەی پەنجابیەکان)دا گەڕامەوە. تا حوزەیران لەبەسرابوین، دوایی بەرەو فورات ڕێگەمان گرتەبەر، لە تشرینی یەکەمدا تاقیکردنەوەیەکی عەرەبیم بڕی، لە کانونی یەکەمدا وەك کارمەند لە(بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی) هەڵبژێردرام.

وەك(یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) لە مەندەلی دامەزرام، کە شارۆچکەیەکی بە خورما بەناوبانگە و دەکەوێتە سەرسنوری فارس(مەبەستی ئێرانە: و. ك) لە دوری (١٠٠) میل لە ڕۆژهەڵاتی بەغدایە. تاکو ڕۆژی یەکەمی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨) تیایدامامەوە، تا کاتێکی درێژ تاکە ئەفسەربوم لەوێ و هیچ سەربازێکم نەبوو، مەندەلی ئەوکات ئارامترین شوێنبوو کە داگیرمان کردبێ و تیایدا بەختەوەربوم و حکومەتیش لای دڵی خەڵکەکەی خۆشەویست بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ تاقیکردنەوە هەن کە مرۆڤ بەدەستیان دێنێ تاکو(وەك پیتۆڵێکی لێبێ کە تاقیکردنەوەکان دەوڵەمەندی دەکەن).

ئەوەی کە یەکشێوازی ژیانی لادەبرد: کێشەکانی سنور و هێرشی ناوەناوەی ڕێگرەکان بوو، کە ئەوانیش لەو کەسانەبون لە سنورەوە پەنایان بۆ(پشتکۆ) بردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەوڵێکی زۆرم خستەگەڕ بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەی کە لەبەر نەشارەزاییم بە مەترسیەکی گەورەم دادەنا، کەچی ڕوبەڕوی کێشەیەکی مەترسیدار نەبومەوە و نەکەوتمەناو دودڵیەکی ڕاستەقینە و مەترسیەکی گەورەوە.

بەراستی مەندەلی(١٠) مەیدانێکی ڕاهێنانی نموونەیی بوو، لە شارەکە دا چوار زمان هەبوو هەموو دانیشتوانی شارەکەش دەیانتوانی قسەیان پێبکەن، ئەوان زمانی(دایك) کە تورکی بوو لە باوان فێردەبون وەکچۆنزمانی کوردی — لوڕی ناوچەکە لە(دایەنەکانیان) (لە لە)ەوە فێردەبون، هەروەها لەخەڵکی ناوچە گردۆڵکەکان، کە لە وەرزی گەرمادا بۆ ئەوێ دەنێردران. هەر وەها زانیاریان دەربارەی عەرەبیش لە وانەوە دەستدەکەوت کە سەرپەرشتی باخەکانی خورمایان دەکرد کە هەیانبوو، فارسیش لەو بازرگانانەوە فێردەبون کە لەوان جیابون و بەمیوانی دەهاتنەماڵەکانیان، گەلێ عەشیرەتی عەرەبی و کوردی لە ناوچەکەدا هەبون لە شاریشدا تورك هەبون(عوسمانی نەبون) فارس و کورد و لوڕ هەبون، هەر وەها هەر دو تایەفەی موحەممەدی سوننە و شیعەی تیابوو لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆری(عەلی ئیلاهی)

تێدابوو کە بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە چونکە باوەڕیان وایە عەلی(ر.خ: و.ع) مێردی کچی موحەممەد(د.خ: و.ع) ڕۆحی خودای تێدا بەرجەستەبوە، هەروەها هەندێ جولەکەشی تێدابوو.

من لە هیندستان کە مێك فارسی فێربوبوم و، کە میکیش عەرەبی لە ناوچەی فورات، لە مەندەلی توانیم لەو دوزمانەدا زۆر بەرەوپێش بچم و هەروەها دەستم بە فێربونی زمانی تورکیش کرد. وایلێهات لەو زمانەی دواییان تێدەگەیشتم و خەڵکیش تێمدەگەیشتن، ئەمەش بەر لەوەی بگوازرێمەوە بۆ(ئاڵتون کۆپری) لە سەرەتای تشرینی دووەمی(١٩١٨)، دوای ئەوە لە هەریەك لە کۆیەو هەولێر توانیم زمانی تورکیم باشتر بکەم و بە شێوەیەکی نیمچە ڕەوانیش فێری کوردی بوم.

لە ڕۆژی سێیەمی تشرینی دووەم گەیشتمە(ئاڵتون کۆپری) لە دەی مانگ لەگەڵ دو سەربازی سوارە نێردرام بۆ هەولێر تابە ناوی حکومەتی بەریتانیاوە دەسەڵات لە تورکەکان وەرگرم، تەنیا دوڕۆژی تێدامامەوە دوای ئەوە نەقیب(مری) کە ئێستا موقەدەمە جێگای گرتمەوە، من گەڕامەوە بۆ(ئاڵتون کۆپری) لە(١٥)ی کانونی یەکەم ئەرکی کارەکەم لە ئاڵتون کۆپری بە یارمەتیدەری حاکمی سیاسی کەرکوك سپارد کە نەقیب(لونکرك)بوو کە ئێستا موقەدەمە بەرەو کویسنجەق(کۆیە) ڕێگام گرتەبەر بۆ بەرز ڕاگرتنی پایەی یاساو بەرکەماڵکردنی ئاسایش لەوێ. دواتر سەردانی هەریەك لە(ڕانیە) و(قەلآدزە)م کرد، کۆیەم وەك بنکەی خۆم هێشتەوە تاکو(٢١)ی شوباتیساڵی(١٩١٩)، کە بەهۆی هەندێ هۆکاری خێزانی بەمۆڵەت گەڕامەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم.

لە کۆتایی حوزەیران گەڕامەوە بۆ(میزۆپۆتامیا) و لە هەولێر دامەزرام، ئەوکاتە قەزایەکی سەر بە لیوای(پارێزگا) موسڵ بوو کە لەژێر دەسەڵاتی خوالێخۆشبوو عەقید(لیچمان) بوو لە ڕۆژی یەکەمی تشرینی دووەم دا لیوایەکی نوێ بەناوی(هەولێر) دامەزرا بەدابڕینی بەشێکی بچوکی قەزای هەولێر پێشتر کە عەرەب تێیدا نیشتەجێبون و ئەو پارچەیە لە لیوای موسڵدامایەوە، هەریەك لە(ڕەواندوز) و(کۆیە) خرانە سەر لیوای هەولێر، من کرام بە(حاکمی سیاسی) هەولێر و نەقیب(ڕاندڵ) کرایە (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) لە کۆیە و نەقیب(کێرك) بەهەمان شێوە لە ڕەواندوز دانرا. نەقیب(برادشۆ) لە هەولێر یارمەتی دەدام، لە سەرەتای کانونی یەکەم

نەقیب(کێرك) گواسترایەوە بۆ شوێنێکی دیکە و کەسیش لە شوێنی ئەو وەك یارمەتیدەری حاکمی سیاسی دانەنرا، لەبەر ئەوە لەو کاتەبەدواوە سەرەڕای ئەرکی خۆم وەك حاکمی سیاسی هەولێر ، بومە(یارمەتیدەری حاکمی سیاسیش) لە ڕەواندوز.

لە هاوینی(١٩٢٠)دا وەك تاقیکردنەوەیەك لە(بەڕێوەبەرایەتی سیاسی حکومەتی هیندستان) دامەزرام، خزمەتگوزاریەکانم لە کۆتایی ساڵدا داواکرابون، بۆیە ئەرکەکانی پلەکەی خۆم وەك حاکمی سیاسی لە هەولێر دابەدەست موقەدەم(مارشل)و، چومەوە ئینگلتەرا تا چێژ لەو مۆڵەتە وەربگرم کە ڕۆژەکانی کەمبون، پێش ئەوەی ڕێگا بگرمەبەرو بەرەو هیندستان بگەڕێمەوە، بەداخ و جەخارەوە ولاتی(میزۆپۆتامیا)م بەجێهێشت هیوادارم بەخت یاوەرم بێ و جارێکی دیکەش سەردانی بکەمەوە بە تایبەتیش پارێزگای هەولێر تا جارێکی دیش تەوقە لەگەڵ(ئەحمەدەفەندی) و ئەو سەرۆکە کوردانە بکەم کەبە دڵسۆزیەوە لەگەڵ مندا خزمەتیان کرد.

لەم(چیرۆکەمدا) باس لە تاقیکردنەوەکانی خۆم دەکەم لە ولاتی(میزۆپۆتامیا) لە ئاگر بەستی تورکیا(٣١ تشرینی یەکەم ١٩١٨) بەتایبەتی و لەو ناوچانەی کە کەوتونەتە نێوان زێ ی گەورەو زێ ی بچوك کە پارێزگای هەولێریان پێکدێنا، لەگەڵ قەزای ڕانیە کە بەشێکە لە پارێزگای سلێمانی و شارۆچکەی(ئالتون کۆپری) کە لە ڕۆژی ئەمڕۆدا دەکەوێتە سەر پارێزگای کەرکوك.

لەو پێنج بەشەی دادێن باس لە بارودۆخی جوگرافی ئەو ناوچەیە دەکەم بەلێکۆڵینەوە وە،لەگەڵ سروشتی دانیشتوانی و نەریت و شێوازی کشتوکاڵی و سیستەمی موڵکداری باوی زەوی و ئەو شتانەی کەولات بەرهەمی دێنێ و تاقیان دەکاتەوە. بە کورتیش دەربارەی ئەو بابەتانە دەنوسم، دواتر دەچمە سەر گێڕانەوەی تاقیکردنەوەکانم، سەرەتا لە ئالتون کۆپری و یەکەم سەردانم بۆ هەولێر و زنجیرەی سەرچڵیەکانم لە ڕەواندوز و ئەو شڵەژانەی کە لە کۆتاییدا لە هەولێر ڕویدا، کەدوایی سەلماندی چۆن بارودۆخەکەی سەراوین کرد، بە ئامارەیەکی خێراش کە پەیوەندی بە هاوڕێکانمەوە هەیە لە بەڕێوەبەریەتی مەدەنی، بەتایبەتی ئەوانەی کوژران، کۆتایی بەشتەکان دێنم.

◆

## بەشی دووەم

## جوگرافیای روەک و گیانەوەری ناوچەکە

(بگەڕێوە بۆ نەخشەی پارێزگای هەولێر لە پاشبەندی ئەم کتێبەدا)

ئەوەی کە پەیوەندی بە ڕوکاری وڵاتی(میزۆپۆتامیا) وەهەبێ، و دەبێ یەکەم شت بێ کە بەزاکیرەی مرۆڤەوە بلکێ، ئەوەیە کە هەموشتێکی لە باشور – ڕۆژهەڵات و باکور – ڕۆژئاوا درێژدەبێتەوە شێوەی لاکێشەییە و دەکەوێتە نێوان ئەو ئاراستانە. چیایەکانی فارسی و کوردی لایەکی درێژی دروستدەکەن لە لای باکوری – ڕۆژهەڵات وەفورات و لێواری بیابان(هەندێ دەڵێن ناوەکەی عێراقە) (١) یان بەرزایی بیابان کە ناوی عێراقی لێداتاشراوە. سەرحەدی تەریب بەلای باشورەی ڕۆژئاوای دروستدەکەن و دەجلەش ڕاست لە ناوەندیەوە دێتە خوارێ.

عێراق لە ژێر سایەی تورکەکان بەسەر سێ ویلایەتدا دابەشکرابوو، بەسرا، بەغدا و موسڵ، ئەگەر لێواری ڕۆژئاوای دوری لێدەرکەین ئەوا بەغدا و بەسرا زەویەکی تەختانیە و نە بەردێکی تێدایە نەدرختێك جگە لە خورما و(٢) نزیکەی هەمو دانیشتوەکانیشی عەرەبن.

ویلایەتی باکور، موسڵ لەڕوی سروشتەکەیەوە، تەواو جیاوازە، بە(چیای حەمرین یان گردە سورەکان لە باشوری میزۆپۆتامیا جیادەبێتەوە. کە زنجیرە چیایەکە لە شوێنێك لە نزیك ئەهواز دەستپێدەکاو ڕولە باکوری ڕۆژئاوا دەکا، بێ پسانەوە بۆ مەودای(٣٥٠) میل تالە بیابانی خۆرئاوای دیجلەدا وندەبێ، کە هێندە لە موسڵ دورنیە، ئەو بەرزاییە روت و بەلوتکەیە، کەلە بەردی لمی(تەمۆخ) پێکدێ سەد پێ یەك لە زەوی دەوروبەری بەرزترە کەچی لەبەر چاوی ئەو سەربازانەی کە سەدان میلیان لەڕێگەی دیجلە و فوراتی تەختاییان بڕیووە دەهاتنە بەرچاو کە هێندەی هیمالایا بەرزە، بەڵام ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو چیایانەی دواتر

پێیـان گەیـشتم، وەك هـەڵتۆقینێکی ناشـیرین دێتـە بـەر چـاو. لـە پـشت ئـەو زنجیرەیەوە زەوی بەرز و نزمیی هەیـە و دەبێتـە بـەردین و هێشتا درەختـی تێدا دەگمەنە، دواتر ڕێکەوتی زنجیرەیەك بەرزایی دەکەی، کە لە سروشتیدا بە چیای حەمرین دەچێ کە دەشتی بەرزونزمی دەکەوێتە بەینەوە، ئەو بەرزو نزمیانە زیاتر بە دەرگای کە ناڵێك دەچن، کە هـەر یەکـەیان، یـەك لـەدوای یـەك ئاسـتی گشتی خاکەکە بەرز دەکەنەوە. لـە دوری چـەند میلێکـی کـەم لـە ڕۆژهـەلاتی کـەرکوك و ئـاڵتون کـۆپری و هـەولێر دەشـتە مەزنـەکان کۆتاییـان دێ و گەشـتیار یەکـەمجار دەگاتـە گردۆلکـە بەیەکداچـوەکان، کـە لـە کـەفی نویـشك دەچـێ و دواتـر چـیا بەرزەکان دێن کە یەك بەسەریەکدا کشاون، تا بەو زنجیرە بەرینـە کۆتـایی دێ کـە بەسەر بانی فارسدا دەڕوانێ.

گردۆڵکەکان لە هاوشانی سنوری فارس لە کەنداوە وە تاکو ڕوباری دیالە دێـن. کە دەگەیە ئەو ڕوبارە دەبێ سەرکەوی بۆ لوتکە تا دەگەیە سەرچاوەکان دواتر بە دوایدا دەگەیتە سـنوری ڕوسـیا، لای چـیای(ئـارارات)، بۆیـە ویلایـەتی موسـڵ، لـە ڕۆژهەلاتی دیجلە ڕوبەرێکی فراوانی چیایەکان لە خۆ دەگرێ.

لـە چـیای(سـنجار) شـەنگال بـترازێ کـە جـێ ی دانیـشتنی ئـەو ئێزدیانەیـە کـە بە(شەیتان پەرست) ناسراون، لـە ڕۆژئـاوای دیجلـە دا تـەنیا بیابـانێکی بـێ سـنور هەیـە و، هـیچ لقێکـیش نیـە کـە لـە ڕوبـاری سـەرەکی بکاتـەوە. لەبـەری دیکـەی دیجلـەدا، ئـەو گردانـەی دەکەونـە ڕۆژهـەلات ئاوەکانیـان لـە چـەند ڕۆبارێـك کـۆ دەبنەوە. لە زاخۆ (٤) کە دورترین ناوچەی داگیر کراوی بـاکورە، خـاپور دەڕژێتـە دیجلەوە، تۆزیکیش لە سەرەوەی ئەو تەنگەبەرەی کـە ئـاو لـەوێ چـیای حـەمرین دەبڕێ زێ ی بچوك دێتەوە ناو دیجلە. لەویلایـەتی بەغـداش زێـی دیالـە ڕوبارەکـە فراوان دەکا.

لـەم نوسـینەدا بەپلـەی یەکـەم گرنگـی بـەو ڕوبـەرە دەدەیـن کـە لـە شێوەی(دولاتـەریب) دەچـێ، کـە دەکەوێتـە نێـوان هـەردوزێ و دیجلـە و سـنوری فـارس، هـەردوولا درێژەکـەی نزیکـەی مـەودای(١٠٠) میلـە لـە کاتێکـدا هـەر دوو کۆتاییەکەی(٥٠) میلە، ئەگەر لەسەر نەخشە دا بەدوای زێ ی گەورەدا سەرکەوتین دەبیـنین کـە پێـچێك بـەلای بـاکوری عەرەبیـدا دەکاتـەوە پـێش ئـەوەی بگاتـە

(سەرحەد)(لێرەدا مەبەستی نێوان ناوچە کوردی و عەرەبیەکانە: و.ك)، بۆ ئەوەی وێنەکە تەواوکەین دەبێ بۆ ڕێژگەکەی درێژبونەوەیەکی خەیاڵی وێنا بکەین، ئەوسا تێبینی دەکەین کە ئەو روبەرە بەرەو باشوری ڕۆژئاوا و باکوری ڕۆژهەلاَت دەچێ، لەناو شوێنی گشتی ولاَتدا. بۆیە دەتوانین بینین و کە شوهەوای جیاواز بەدەست بێنین لە (بیابانی قەراجی) گەرمەوە تاچیاکانی زاگرۆسی سەر ڕازاوە بە بەفری سپی.

زێی گەورە لە باکوری(جۆڵە مێرگ) (٥) ەوە بەرز دەبێتەوە، دوای ئەوەی(١٥٠) میل لە ناوچەیەکی سەخت دەبڕێ و بە تەنگەبەرەکانی دیجلەدا دەڕوا کە پێشتر باسمان کرد. تالە گردۆلکەکان دەربازدەبێ لای (گردمامك)، لە دوری(١٨) میل لە باکوری هەولێر، لێرە بەدواوە فراوان دەبێ و گەلێ جار دورگەی بچوك ڕێڕەوەکەی دوبڕدەکەن و تاکو لە کۆتاییدا لە نزیك گردێکەوە کە پێ ی دەڵێن(گردی کوشاف) دەرژێتە دیجلەوە ئەو گردە لە دومەلاَنێکی سەراوبن دەچێ. زێی گەورە زێیەکی جوانە چ لە چیابەرزەکانەوە سەیری ئاوەڕۆیەکەی بکەن لە نێوان دۆڵە ڕەشەکان، یان لە ڕۆشتنی ئاوە لازوردیەکەی لە نێوان هەردو کەنارە داپۆشراوەکەی بە درەختی دارگەز، کە لە ئاوەڕۆیەکەی خوارەوەدا پێکیدا دەکوشن، لەو روباروبترازێ دیمەنی دیکەی دلخۆشکەر کەمە کە گەشتیار لە ناو ماشێنەوە بۆیان بڕوانێ، لە گەشتی نێوان هەولێر و موسڵ، کاتێك کە گەرما جۆشی سەندوە و کەش گەرمە. چاوەکانی گەشتیار بۆ دوکاتژمێر لە دەشتێکی بەرزو نزم زیاتر بەسەر شتێکی دیکەوە ناگیرسێنەوە، کە دواتر بە خێرایی سەردەکەوێ و دەکەوێتە سەر شریتێکی پێچاوپێچی شین، لەخوارەوەڕا، کە لە بریقدانەوە دایە و لە هەردوبەریدا سپێتی لێوارەکانیشی نیگای مرۆڤ دەڕفێنێ، دواتریش سەوزییە تۆخەکەی دارگە زەکان.

زێ ی گەورە کەبە دیجلە دەگا، ئاوێکی زۆری پێدەبەخشێ. زۆر قوڵە و بواری پەڕینەوە نادا، تەنیا لە هەندێ شوێن و لە کۆتایی هاوین و پایزدانەبێ، لەگەڵ ئەوەی کە ڕوبارێکی جوانە بەلاَم سودی بۆ خەڵك کەمە، بۆکەشتی ڕانی دەستنادا، تەنانەت بۆ کەڵەکیش(٦) تەنیا هەندێ بەشی ئاوەڕۆیەکەی نەبێ کە ئەویش مەوداکەی کورتە، بەلاَم دەتوانرێ داری فڕێبدرێتێ تابەرەو خوار بیبا. بڕێکی کەم

بەرزکەرەوە لە هەردوو کە نارەکەیدا هەیە (بۆ ئاو راکێشان بۆ کشتوکاڵ) کەموڵکی ئەو عارەبانەیە کە لە خوار(گوێڕ) نیشتەجێن، لەوەبترازێ سودێکی بۆ ئاودێری وڵات نیە. حکومەتی تورکی لێکۆڵینەوەی لەسەر هەڵکەندنی کە نالێك کردبوو کە بەرەو خوار وبچێ لە(گرد مامك(ەوە بۆ هەولێر، بەلآم ئەو پرۆژەیە، ئەگەر بشکرایە ئەوا پارەیەکی زۆری تێدەچوو. هەندێ شوێنەوار هەن کە ئاماژەن بۆ کە ناڵێکی کۆن یەکێکیان بە تەریب لەگەڵ ئاوەڕۆی سەرەکی ڕوبارەکە یە لە نزیك(ساقیە)، یەکی دیکەش لە باشوری گوێر لیێدەبێتەوە.

لقی سەرەکی زێ ی گەورە لەو ناوچەیەدا، کە مە بەستمان پێ ی(روباری ڕەواندوز)ە و، دواتر باسی دەکەین. لە خواروی(روباری ڕەواندوز)، زێ ی گەورە بەعادەتی خۆی بە لێواری زەویە گشتیەکەدا دەڕوا چەندین تەنگەبەری یەك لە دوای یەك دەبڕێت لە زنجیرە چیاکان. وە لەو ڕۆیشتنەیدا گەلێ چەم تێیدەکەنەوە کە بە دۆڵەکاندا دینەخوارەوە، ئەو ئاوانە بەسن بۆ ئاوی پێویست بۆ ئاودێری هەموو ناوچەگردۆلگەییەکان. وشەی (زاب)(٨) یان(زێ) دەربڕینێکی ڕەسەنە کە بە ڕوباری دەڵێن، لە کوردستانی باشور کوردەکان بەکاریدێنن کاتێك کە باسی دیجلە و زێ ی ڕەواندوز دەکەن. زێ ی گەورە و زێ ی بچوك بەپلەی یەکەم بەدوو ڕوباری کوردستان دادەنرێن.

زێ ی بچوك لە باشوری(دەریاچەی ورمێ) هەڵدەقوڵێ و لە زۆر ڕوەوە بەزێیەکەی دیکە دەچێ واتە زێ ی گەورە. وەکچۆن ئاوەکەی لە ئێستادا سودێکی ئەو تۆی نیە، ئەمەش لەبواری ئاودێریدا، هەرچەندە کە شوێنەواری کە ناڵی مەزنی هەیە لە هەردوو بەریدا لە باشوری ئاڵتون کۆپری، یەکێك لەو کە ناڵانە بە باشوری بیابانی(قەراج)دا دەچێتە خوار کە ئەگەر لێیبکۆڵرێتەوەو هەڵبکۆڵرێتەوە ئەوا روبەرێکی گەورەی ئەو دەشتە وشك و برینگە ئاودێر دەکا. لەڕوی بازرگانیەوە ئەم زێیە لە زێ ی گەورە مەترسیدارترە، چونکە دەتوانری(کەلەك)ی تێدا بەکار بهێرێ لە(دەربەندی رەمکان بەخوارەوە، زێ ی بچوك لەناکاو هەڵدەستێ و لافاودەکا' ناوەکەی دیکەشی هەرلەوەوە هاتوە کە پێ ی دەڵێن(زێ ی شێتە)، لە کاتی ئاو کەمیدا ڕێڕەوەکەی قوڵنیەو دەتوانرێ بە ئاسانی لە زۆر شوێندا لێ ی بدەی لە هاوین و پایزدا.

ئەو بەشەی دیجلە کە لای خوارەوەی چوارلایەکە پێکدێنێ مەترسیەکی نیە، گوندە عارەبەکانی لەسەر روبارن، خەڵکەکەی بە هۆی(ناعور) ڕوبەرێکی بچوکی لێدادەچێنن،

ئێستا هەوڵدەدەم باسی ئەو زەویانە بکەم کە لە ناو ئەو چوارلایەن کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین سەرەتا لە خاڵێکی سەردیجلە دەستپێدەکەم بەرەو باکوری ڕۆژهەلات تاکو سەر سنور. لە خاڵێکی سەر زێی بچووك و بەدوری ۳۰ میل لە ڕێژگەکەیدا بۆ دیجلە، زنجیرە چیایەك(زورگ) دەستپێدەکا کە بارێك و ڕەشەو پێ ی دەڵێن(قەرەج تاغ) و بەرەو باکوری ڕۆژهەلات درێژ دەبێتەوە، تالە کۆتاییدا کە لەزێ ی گەورە نزیك دەبێتەوە تالە خوار گوێڕ دەپوکێتەوە. ئەو ناوچە بێ ئاوەی کە دەکەوێتە نێوان ئەو گردانە و زێ ی بچوك و دیجلە بە بیابانی(قەرەچوغ)یان قەراج[١٠] ناوزەد کراوە، بەوەش بەناوبانگ کە زەویەکی بەپیتە(کە لە سالێکدا ئەگەر رەحمەتی خوا بباریێ(مەبەست بارانە) بەرهەمێکی زۆری دەبێ، هەردەنکێك سەد دەنك دەدا،(لای خۆمان دەڵێن یەکو سەد بڕدەکا)، بەلام بەداخەوە ئەمە بەدەگمەن رودەدا، زۆر بەی ساڵ باران نابارێ یان زۆرکەم دەبارێ. بیابانی قەرەچوغ(قەراج) لە هەرپارچەیەکی دیکەی پاریزگای هەولێر زیاتر، لە دەشتەکانی(میزۆپۆتامیا)نزیك دەبێتەوە. هەر چەند کە بەرز و نزمیەکی کەمی هەیە بەتایبەتیش لێواری سەروی کە گەلێك چۆمی ئاوی تێدایە، کەچی شێوەگشتیەکەی بەدەشتێکی تەواو تەخت دەچێ، و لە زۆربەی کاتی ساڵدا رەنگی ڕەشەو، ڕوتەن و بێ دار و درەختە، جگە لە هەندێ مێرگی بیابانی تایبەت(کۆدەرە)، بیر لە قەراج کەمە، ئەوەی هەشە ئاوێکی سویری شۆرە، هەوا لە هاویندا گەرم و سوتێنەرە، گەشتیار وا هەستدەکا کە لە مەودایەکی بەرینی زەویە. هەرچی تێیدایە لە ناو چوە و خۆرتیرە سوتێنەرەکانی داوێ.

کاتێکیش کە خودا هەوران دەنێرێ و، باران لە ناکاو دەستپێدەکا، لە سەرەتای مانگی نیساندا، ئەو ناوچەیە بە گوڵ و گوڵزار دەرازێتەوە. ئەودەم هەموو کوردەکانی دەشتی هەولێر ڕانەکانیان بۆ پاوانەکان ڕادەدەن و ڕەشماڵە گەورەکانیان، لە کوێ ی ئارەزوو بکەن هەڵدەدەن. ئەو گولاوانەی کە باران پێیان دەبەخشێ، ئاویان بۆ دابین دەکا، لاوەکان، کە لەسەر ئەسپەکانیان دەڵێ ی

سورەیای بەشەوقن لە جوانیدا، ئازایەتی خۆیان بەسەر زینەوە دەردەخەن، یان دەبینی ڕاوەدوی کەروێشك یان ئاسکێك دەنێن.

هەرچی سەرۆکەکانن (سەرەك هۆز) کە چونەتە ساڵەوەو موی سپیان لێ دەرکەوتوە ئەوا لە مەجلیسی پڕ لە جێو بان دادەنیشن و ئامادەی پێشوازی میوانانن، ئەو بیابانە بە درێژایی مانگێك تا شەش هەفتە، گیان وەبەرهێنەرەوەیە. بەڵام لە کۆتایی نیساندا خۆر دەسەڵاتی خۆی دەردەخاو لە ماوەی هەفتەیەك تا دوو هەفتە گیا کز دەبێ و گوڵەکان وشك و رەش دەبن.

ژمارەی دانیشتوانی بیابانی (قەرەچوغ) جیاوازە بە جیاوازی ڕێژەی باران بارین تیایدا، لە دوو ساڵ سان سێ ساڵی هاتی بێ بەشی لای سەرەوە، مەبەستم لای گردۆڵکەکانە، پڕ لە گوند دەبن، کەچی کە وشکە ساڵێك دادێ لە (ساڵانی یوسف) شوێنەواری دانیشتوانیش ون دەبێ و لە چەند ماڵێکی دامێنی (داغ) چیا بترازێ شتێکی دیکە جێناهێڵن لە کاتێکدا لە بەشەکانی دیکەی ئەو بیابانەدا کاولە خانووی لە قوڕ دروستکراو بڵاو دەبنەوە، وەك ئەوەی کە سەدەفی بەتاڵبن لە کەنارێکی وشکدا.

(قەرەچوغ) ۲۸۰۰ پێ لەڕوی دەریاوە بەرزە. کە لە تەنگەبەری (حوسێنی غازی)* دەبێتە دوو بەشی گەورە (ئێستا پێ ی دەڵێن دەرکی بازارگە: و.ك) کە بەشی هەرە گەورەی دەکەوێتە لای باشوور، سەری چیاکەو هەردوو لای، سەخت و ڕەقەو بارانی چەندین سەدە شوێنەواری خۆی لەسەر جێهێشتوە، ئەو زنجیرە چیایە سودێکی بۆ مرۆڤ نیە، چونکە بێ ئاوە لە چەند سەرچاوەیەکی گۆگردی بترازێ، وەك چۆن دارو درەختی نیە، دەگێڕنەوە کە سەدەیەك بەر لە ئێستا لەسەر لوتکەکانی دارو دەوەنێکی زۆر هەبووە، تا کوردەکان هاتن و، لە دارو درەختەکان بەربوون بۆ سوتاندن و ئەمڕۆ شوێنەوارێکی درەخت نیە. لە بەهاردا گیا گەشەدەکاو بەرز دەبێتەوە. لە کۆتایی نیساندا وشك دەبێ، بەڵام هەر دەمێنێ و لە هاوین و پایز و زستاندا لەوەڕگای مێگەلەکانە، کە ژمارەیان زۆرە.

ئەو زەویەی دەکەوێتە پشت قەرەچوغ بەهۆی کەندێك (چۆم) دەبێتە دوو بەش کە بە ئاسانی هەستی پێناکرێ، بەشی باکووری کە ئاوەکەی دەڕژێتە زێ ی گەورە پێ ی دەڵێن دەشتی (شەمامك) و بەشی باشووریش پێ ی دەڵێن

(کەندێناوە) (١٣) و هەردوو بەشەکەش بە کۆمەڵێ گردی پڕ بەرد (گاشە بەرد) لە دەشتی هەولێر جیا دەبنەوە. دەشتی شەمامك بەگشتی شێوەیەکی نیمچە بازنەیی هەیە دەکەوێتە سەر لێواری چەپی زێی گەورە، ئەو بەشە بەردەوام بەپیتترین و پڕ لە دانیشتوان ترینی پارێزگای هەولێرە، زەویەکەی تۆزێك بەرزو نزمە، زۆری بیر تێدایە و ئاوی شیرینە، دوو چەمی هەمیشەیی هەیە کە ئاوی دەدەن، بەرهەمی کشتوکاڵی دوو هەفتە دوای قەرەچوغ (قەراج) پێدەگا، هەموو شتێك لە سەرەتای ئاداردا سەوزە، گوڵەکان ئاسۆ پڕ لە بۆن و بەرامە دەکەن، لە گردەکانەوە و لە دوری چوار میل هاوین دەستپێکردووە زەوی ڕەشدا گەڕاوە، هۆی ئەو جیاوازیەش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارانە زۆرەی کە لەسەر لای باکووری قەرەچوغ باریوەو زیندوی کردۆتەوە.

کەندێناوە ئەو ڕووبەرە زەویەیە کە پانیەکەی نزیکەی (١٥) میلەو درێژیەکەشی نزیکەی (٣٠)میل دەبێ دەکەوێتە نێوان قەرەچوغ و (زۆرگە زراو). کەند لە کوردیدا وەك (ئالا)یە لە هیندستان مانای ئاوەڕۆیەکی تەسك و کەنار ڕك دەبەخشێ، ئەو ناوچەیەش ناوەکەی لەو کەندە گەورەیەوە وەرگرتووە کە بە ناوەندیدا دەچێتە خوارێ. چەندین کەندی دیکە لەو لاو لەولای بەدرێژایی میلێك تا دوو میل لە ئاوەڕۆکەی دەچنەوە سەری و، ئەو کەندانە ناوچەکەیان وا لێکردووە کە بە ئاسانی نەتوانی بە ماشێن پێدا بڕۆی. زەویەکەی هێندەی شەمامك بەپیتە، بەلام بەروبومی وەك ئەوێ دوور لە گومان نیە، باران زۆر کات بای کشتوکاڵ نابارێ و کوللەش زۆر جار زیانی لێدەدا. ناوچەکە لەلای باکووری چڕی دانیشتوانەکەی زۆرن کەچی لای باشووری گردی زۆرترەو کەمتر بەپیتە، ئاو لە چەند کانیەکی دەگمەن هەڵدەهێنجرێ و ئاوەکەش زۆربەی، سوێرو شۆرە.

(زورگە زراو) زنجیرە گردێکی نزم و تیژە کە کەندێناوە لە دەشتی هەولێر جیا دەکاتەوە ئەو ڕوبەرە گەورەیە بۆ (٥٠)میل درێژ دەبێتەوە لە زێ ی گەورەڕا تا زێ ی بچووك و، پانیەکەی نزیکەی (٢٥)میل دەبێ لە زورگە زراوەوە تا بناری گردۆڵکەکان، کۆتایی باکووری لای زێ ی گەورە بەرزو نزمی هەیە و دەتوانین بڵێین خاکێکی بەردینە، بەلام بەشی سەرەکی ئەو دەشتە لەنێوان ڕێ ی هەولێر–کرکوك و (زورگە زراو) تەنیا چەند بەرزیەکی کەمی هەیە. بەگشتی خاکێکی

بەپیتەو ساڵانە بەرهەمی بەدرێژایی چەند سەدەیەکە بەرێژەی یەکو دەیە. لە بەهاردا ئەگەر گەشتیار بتوانێ لەسەر یەکێك لەو گردانە کە لەسەر ڕووبەرەکەیدا بلاون، بوەستێ، چەندی چاو بڕکا، دەبینێ کە ناوچەکە چێندراوە یان سەوزەو دەغڵ و دان شین بووە یان کێڵدراوەو ئامادەی تۆو کردنە، لە پایزدا تەنیا ڕێگاکان نەبێ کە سپی دەچنەوە، ئەم دەشتەش شوێنی عەشیرەتی دزەیی بەهێزە لە سێ سەدە لەمەوبەرەوە.

لە ڕۆژهەلاتی ڕێگای کەرکوك ولاتەکە پتر بەرزو نزمی تێدەکەوێ و زۆرتر خاکێکی بەردینە، ئەوێ بەر لە شەڕ خەڵکێکی زۆری لێبوو، بەلام ساڵی (١٩٠٨) زۆربەی خەڵکەکەی لەناوچون و ڕێژەیەکی زۆریشیان کە مابونەوە کۆچیانکرد بۆ شوێنی دیکە.

دەشتی هەولێر بە پلەی یەکەم بە (کارێز) ئاو دەدرێ، کە دواتر وەسفت بۆ دەکەین، بیری زۆری لێ یە و ئاوەکەی کە لە قولایی (٣٠) هەتا (٤٠) مەتر لەڕووی زەوی دایە هەمیشە شیرناوە.

ئێستا گەیشتوینەتە دامێنی گردەکان، لە باکووری ڕۆژهەلاتی دەشتی هەولێر، ئاوی بەستۆرەو (باستور جای)و (چیای دێدەوان) دەبنە سنوور، بەستۆرە ڕێرەوی ئاوێکی بەرفراوانە کە دەرژێتە زێ ی گەورە، چەمێکە کە بەهاران هاژە دەکاو لە زستان و هاویندا دەبێتەوە چەمێکی بچووك و لە پایزاندا ئاوی تێدا نامێنێ ئەمەش سنووری باشووری ڕۆژئاوایە بۆ ناوچەی ڕەواندوز، بۆ خەڵکی هەولێریش دەبێتە سنووری نێوان عێراق و کوردستان.

زنجیرە چیای دێدەوان هێندەی قەرەچوغ بەرزە بەلام لەنێو دەشتاییدا نیە وەك ئەو لوتکەکەی سنووری نێوان هەردوو یەکەی هەولێر و کۆیە دروستدەکا.

یەکەی کۆیە دابەشدەبێ بۆ دوو بەش، یەکەی کۆیەو شەقلاوە، یەکەمیان کۆمەڵی گردۆڵکەی بەردینی لمینی نزمەو جۆگە ئاوی تێدایە، دارو درەختی تێدا دەگمەنەو کشتوکاڵی تێدا ئەستەمە تەنیا لەو زەویە بەرزانە نەبێت کە لێرەو لەوێ دەکەونە نێوان گردەکان. ئاویش لە کانیاوە بچوکەکانەوە دەستدەکەوێ، ئەم ناوچەیە بەزێ ی بچووك سنووردار کراوە لە باشورەوەو لە ڕۆژهەلاتیشەوە بە گردەکان. سنووری جیاکەرەوەی نێوان کۆیەو ڕانیە چیای هەیبەت سوڵتانە کە

بەرزیەکەی (٢٨٠٠) پێیە کە بەشێکە لەو زنجیرە چیایەی بێ پسانەوە لە کەنداوی فارسی ڕا (باشترە بڵێین عەرەبی: و.ع) تا دەگاتە ماردین. درێژبونەوەی لای باکووری ئەو زنجیرەیە نزیکەی (٧٠٠٠) پێ بەرزەو پێ ی دەڵێن چیای سەفین. ئەمە بە لەبەر چاوگرتنی بۆچونی مێژویی موحەمەدی (ئیسلامی) ئەو شوێنەیە کە کەشتیەکەی نوحی تێدا تێپەڕیوە بەسەر ئەو شەپۆلانەی کە هێندەی چیایەك بوون، ئەمەش بەر لەوەی کە لەسەر چیای (جودی) لە نزیك (جەزیرە) (١٥) بوەستێ.

چیای سەفین بە هەڵکشان و داکشانە جیۆلۆجیەکانەوە ناحیەی شەقلاوە دروستدەکا. پڕ لە دارەو بەڕوێکی زۆرو کانیاوی گەورەی هەیە. زەوی زۆر کەمەو ڕوبەری بچوکەو بۆ چاندنی بەروبومی ئاسایی گونجاوە: (گەنم و جۆ)، بەلأم قەدی گردەکان بە ڕەزی ترێ داپۆشراون. چیای سەفین چیایەکی جوانەو بۆ ماوەی چەند میلێك بەسەر ناوچەکەدا دەڕوانێ، گەشتیار دەبێ ڕۆژە ڕێیەك بڕوا پێش ئەوەی بگاتە زنجیرەیەکی دیکەی وەك ئەو.

قەزای ڕانیە کە بەشێك لە سنجاقی کۆنی تورکی لەخۆ دەگرێ: قەڵادزە، لە باشورەوەو بەو پێیەی بۆ ئێمە گرنگە، زێ ی بچووك دەبێتە سنووری، بەپلەی یەکەمیش لە دوو دەشتی بەرز پێکهاتوە کە چیایەکی باریك لێکیان جیا دەکاتەوە کە پێی دەڵێن (کێوە ڕەش) کە کۆتاییەکەی چیایەکی بەرزە. یەکەم دەشت لەو دوانە (بیتوێن) بە گشتی شێوەیەکی بازنەیی هەیەو ڕوبەرەکەی (١٥٠) میلی چوارگۆشەیە. کە کۆمەڵێ چۆم و کانیاو ئاوی دەدەن، زۆربەی ئەو کانیانەش گەرمن، بەلأم لەڕووی تەندروستیەوە تەواو بەکەڵك نایەن، ڕانیە لە هەولێر نزمترەو ڕەنگە دەشتەکەی زۆر بەپیتبێ گەر ئاودێریەکی دروستی بۆ بکرێ. بەلأم لێرە سروشت بە گوڵ و گژوگیا دەوڵەمەندەو لابردنیان هاسان نیە.

دەشتی دووەم بە دەشتی (پشدەر) ناسراوە لە بیتوێن بچوکترەو پتری بەرزی و نزمی تێدایە. چۆماوی زۆری هەیە و لە گردەکانەوە دێنە خوارەوە، بەلأم ئاوەڕۆکانیان قوڵەو بۆ ئاودێری دەستنادەن، مەگەر زۆر بە کەمی. لەڕۆژهەلأتی ئەو دەشتەش سنووری فارسە (مەبەستی ئێرانە) کە چیاکان لە ١٠٠٠٠) پێ بەرزترن، بەشێوەیەکی گشتی وەك گۆشەیەکی وەستاوی چیا سەرەکیەکان دێتە

بەرچاو، کە دۆڵێکی زۆریان دەکەوێتە نێوان و دارو درەختی چڕوپڕی تێدایەو ئەو کوردانەی تێدا نیشتەجێن کە لە هەموان ڕەوەندترن.

سنوری جیاکەرەوەی نێوان شەقلاوە و ڕەواندوز[۱۷] عەشایەریە، خوێنەر بە پێناسەی جوگرافیا ماندوناکەم ئەوەندەبەسە کە مرۆڤ وەبیری بێتەوە کە قەزای ڕەواندوز وەك شێوە لە ڕانی بەرخێك دەچێ. کۆتاییە تەسکەکەی لە نزیك زێی بەستۆڕە زنجیرە چیایەکی دوای یەك هەیە وردەوردە تا ماوەی نزیکەی(۲۵)میل دەست بە بەرزبونەوە دەکا تاکو لە ناکاو دەگاتە دەشتایی یان(دەشتی هەریر)، کە ئەمەش تەختاییەکە درێژیەکەی نزیکەی(۲۰) میل دەبێ و پانیەکەشی نزیکەی(۸) میلە. ئاو و ئاودانێکی زۆری هەیە و کانیاوی زۆر و جۆماوی هەن کەدێنەخوارەوە، ئەو ناوچەیە ئەگەر لەگەڵ بەشەکانی دیکەی ڕەواندوز بەراورد بکرێ ئەوا زۆر بەپیتە.(چیای هەریر) دەکەوێتە پشتەوە کە بەرزاییەکی ڕێك و ڕاستە و ڕوتەنە، کۆمەڵە لوتکە و بەرزایی و دۆڵێکی ئاڵۆزە، ئەستەمە مرۆڤ بەوردی وەسفی بکا ئەگەر نەگاتە سەرچاوەی سەرەکی ئاوەکە و بەسنوری ئێران کۆتایی نەهێنێ، لە نێو ئەو چیایانە کانیاوی زۆرهەن، بەڵام زەوی کشتوکاڵی کەمە.

ئەو دیاردەسەرەکیەی کە ناکرێ چاو پۆشی لەباسکردنی بکرێ(زێ ی ڕەواندوزە) ئەو ڕوبارە لە سەرەوەی سنوری فارس هەڵدەقوڵێ، نزیك(گەروی شێخ)یان(دەربەندی شێخی) لەکاتێکدا کە ئاستی گشتی زنجیرە ی سنور نزم دەبێتەوە بۆ نزیکەی(۳۰۰۰) پێ ڕێ بە تێپەربونێکی هاسان دەدا بۆ فارس. دۆڵێکی قوڵ هەیە کە بەگشتی بەرەو ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاَت دا دەکشێ تالای ڕەواندوز ناوەندی چیاکان دەبڕێ دوای ئەوەی ماوەی دە میلی نایاب دەبڕێ ڕێی ی خۆی بەرەو زێ ی گەورە دەدۆزێتەوە.

پێکهاتەی جیولۆجی پارێزگاری هەولێر جیاوازی هەیە لە نێوان(یۆرانسی) و (نویێ) گەلێ جۆری تاشەبەردی نایاب هەیە و هیچیان ئاگری نین، چیاکان هەموو بەزۆری لە بەردێك پێکهاتون کە پێی دەوترێ(کرتیاسیێ) (Creta ceous) و (ئەیۆسینیە) (Eocene) بڕێکی زۆر تاشەبەردی تێدایە کە لە(بەردی گەچی) پێکهاتون. دەشتی هەولێر لە(عەقیقی بلیوسینی) پێکهاتوە(Puoceene)

بەپلـەی یـەکیش لـە تێکەڵەیـەکی کەسـتەکی و تاشـی لمیـە. وەلەهـەردوو زنجیرەی(زورگەزراو) و قەرەچوغ) لە فارسی خوارو(نـازانم بـۆ دەبـێ فارسـی بـێ) هەندێ عەقیق دەردەکەون کە برێکی زۆر گەچیان تێدایە.

ئەم ولآتە لەڕوی کانزاوە هەژارە، دەماری زەوی ناسراوی نیە لـە نیـشتەیکانزا بەنرخەکان، پترۆڵ لە شوێنێکی کە دەکەوێتە هەردو لای زێ ی گەورە هەڵدەقوڵێ بەلآم بیرەکانی بەشێوەیەکی بـاش و دروسـت بـەکارناهێنرێن. گـەچ بەشـێوەیەکی زۆر هەیە و بۆ مەبەستەکانی بیناسازی بەنرخـە.(بـۆراکس)یـش هەیـە، لـە هەنـدێ شوێنی کەمیشدا گەچ ڕەقبوە و بۆتە مەڕمەڕێکی دڕ.

شـێوازی دەشـتی هـەولێری جیۆلـۆجی شـێوەی ئەسـتێڵکێکی وەرگرتـووە. ئەوڕاستیەش ئەگـەر لەگـەڵ سروشـتی چینەکانیخوارەوەی زەوی پێکـی بگـرین، ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەو بارودۆخـە گونجاوەی کـە بـۆ تەقاندنـەوەی ئـاوی ژێـر زەوی هەیـە. زۆربـەی ئـەو بارانـەی کەبـە خـوڕ بەسـەر گردەکانـدا دەبـارێ، بەهاسـانی لەچیاکانی دیکەی زەوی ڕۆدەچێتە خـوارێ، وەك دیـارە ڕەنگـە بـە هـەڵکۆڵین لـە چیاکانی دیکەی زەوی برێکی گەورە لـە ئـاو بتەقێنـەوە و لـە ڕێگـەی خودفـشاری یەوە بێتە سەرڕوی زەوی نزخی ئەو ئاوەش لە گوتن و ژماردن نایە.

لە کاتی ئێستادا هیچ کە نالێك نیە، بە مانای وشـەی(کـەناڵ) کـە لـە پارێزگـای هەولێردا سودی لێ وەربگـیرێ. ئەمـەش سـەرەڕای شـوێنەواری کەناڵـە کۆنـەکان، لەکانیەکانەوە جۆگەو جۆبار لێدەدرێن بۆ ئەو زەویانەی کە دەیانەوێت ئاودێری بۆ بکەن. عەرەبەکان لە ڕوبارەگەورەکانەوە ناعوربـەکاردێنن، هەرچـۆنێك بێـت ئـاوی سەرەکی هەولێر بۆ ئاودێری(کریز)یـان (کـەهریز)ە کەلـە فارسـیدا وای پێـدەڵێن و کارێز(کەهرێز) زنجیرە کانیەکە(بیر) کە بەدوای یەکدا دێن و تادێ قوڵیەکان کـەمتر دەبێتەوە، بەئاوەڕۆیەکی ژێـر زەوی پێکـەوە بەسـتراون کـە لـە کۆتاییـدا ئاوەکـە دەگاتە سەرزەوی و بۆ ئاودێری بـەکاردێت، ئـەم نەخـشەیەی دادێ مەبەسـتی مـن وێنادەکا.



(ا—ب) رووی زەوی. (ج) ئاوی ژێر زەوی (داڵەکان) زارکی بیرەکان

(ج،هـ،و): ئـاوەڕۆی ئـەو ئاوەیـە کـە کانیاوەکـان بـە یـەك دەگەیـەنیٚ(هـ) خـاڵی دەرچونی ئاوەکەیە بۆ سەر زەوی(هـ ، و) جۆگەیەکە کە ئاوەکـە بـۆ ئاسـتی زەوی بەرزدەکاتەوە. ئەو ئاوەی کە بـەو شـێوەیە دەسـت دەکـەویٚ بەوتـەی کوردەکـان بەدەگمـەن ئاشـگێڕیك تـا سـیٚ ئاشـگێڕ ئـاوی لێدەسـتدەکەویٚ کـە مەبەسـتمان لەوقسەیە جۆگەی ئاوەکەیە. کارێز لەخوار چیاکان نەبیٚ ناتوانریٚ دروستبکریٚ کـە زەویەکەی زۆر لێژە.

دەڵێن لەسەردەمی خەلافەتی عەباسیەکان(٣٦٥) کـارێز لـە دەشـتی هـەولێردا هەبوە، رێگای نێوان هـەولێر و پـردیٚ پـڕ لەبێـستان بـوە بەشـێوەیەك کـە باڵنـدە بەدرێژایی رێگاکە توانیویەتی لە دارێکەوە بازبدا بۆ دارێکی دیکە. هەرچۆنێك بێـت چـیرۆکی ئـەم باڵندەیـە لـە زۆربـەی ناوچـەکانی(میزۆپۆتامیـا) دەگێڕدرێتـەوە کـە ئێستا درەختی تێدانیە.[١٨]

گومانی تێدانیە کە کارێزێکی زۆر هەبوە، چـونکە دەشـتی هـەولێر بـە کۆمەڵـە گردۆلکەیەك بەرپزداپۆشراوە کە پاشمـاوەی ئـەو بیرانـەن. ئێـستاش نزیکـەی(٦٠)

کـارێز هــەن کـە بــەکاردەهێنرێن، وەکـچۆن گـەلێ کـارێزی کـۆنیش هــەن ئێـستا هەڵدەکۆڵرێنەوە.

پیرەپیاوێك لە هەولێر هەیە ناوی(وەستا فەتاح)ە دەڵـێن پـسپۆڕە لـە کـارێز و دەتوانێ بە غەریزە و هونەرەکەی بڕیاری ئەوەبدا کە لە کوێ هەڵکۆڵین بکرێ و لە کـوێ نـەکرێ. ئەمـەش کاتێـك کـە کۆنـە کـارێزێکی داپۆشـراوی لێبدرێتـەوە یـان کارێزێك ڕابکێـشرێ. بنەماڵەکـەی، نـەوە دوای نـەوە پـسپۆڕی کـارێز بـون و دوای خۆشـی کوڕەکـەی جێـی دەگرێتـەوە. لـە هـەولێردا کەسـێك نیەکـە تـەنیاکاری ئەوپیشەیەبێت و، هەرگیز هەوڵی ئـەوەش نـەدراوە کـە کـارێزێکی نـوێ ڕابکێـشن. زانستی پێشبینی بونی نیە و وای بۆ دەچم کە(وەستا فەتاح)یش تەنیا بڕیارەکانی لەسـەر بـاری زەوی و هۆکـاری دیکـەی هاوشـێوەی دەدا، بـۆ ئـەو کارانـەی کـە پەیوەنـدیان بـە بیرەکۆنـە داپۆشـراوەکان هـەبوبێ و ئایـا سـودی هەیـە یـان نـا. هەڵکۆڵینی ئەم جۆرە کارێزانە کارێکی پڕ مەترسیە چونکە بنمیچی ئەو کەناڵەی ژێر زەوی ڕاگرێکی نیە و، ڕەنگە وەستاکە بەزیندویی بکەوێتە ژێریەوە.

کەش و هەوا لەو پارێزگایەدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك جیـاوازی هەیـە، بـەڵام بە شێوەیەکی گشتی مامناوەندیە، لە هەولێردا بەدەگمـەن نـەبێ گـەرما لـەمانگێك تێناپــەڕێ و ئــەوەش کاتێــك کــە گــەرمیپێو لەبەرسـێبەردا ئامـاژە بـۆ پلــەی گـەرمی(١١٠) دەکـا، یـان زیـاتر(واتـە(٤٣) پلـەی سـەدی) ڕێـژەی بـاران بـارین لـە دەشتی هەولێر لـە نێـوان(١٢ — ١٤) گرێدایـە﴿واتـە(٢٠٤ — ٣٥٥،ملم﴾ لـەبیابانی قەرەچــوغدا زۆر لەوڕێژەیەکــەمترە و لەگردەکانــدا زۆر زیــاترە. کــانونی دووەم لەهەمو مانگەکان بەبارانترە. زستان بەزۆری مامناوەندیـە، زۆرجـار خـەڵك هەسـت بەسەرمایەکی توند دەکەن. لە شوباتی(١٩٢٠)دا یازدەڕۆژ بەردەوام بەفر باری، لە حــەوت ســاڵی ڕابــردودا ئــەوە یەکــەم جــاربوو بــەفر لــە هــەولێر ببــارێ، لــە ساڵی(١٩١٦)دا چل ڕۆژ بەفر وڵاتی داپۆشیوو ئاوی ڕوبارەکـان بەسـتای. وەك لای کوردەکـان بـاوە ئـەوە(سـاڵی بەفرەکەیـە) و زۆر جـار بـۆ مێـژووی ڕوداوەکـان بەکاردێت.

لە مانگی ئازاردا کەش و هەوا گـەرم دەبـێ و تـا کۆتـایی ئایـار هەموشـتێك لـە بارە. نـاوە نـاوە کرێـوە بارانێـك دەبـارێ و هـەوا شـێدار دەبـێ و، وڵات بـەگوڵو و

گوڵزار دەخەملێ حوزەیران و نیوەی یەکەمی تەمموز گەرمن، بەڵام بێزارکەر نیە و شەوانی فێنکە. لەنیوەی تەموز و تاکو نیوەی ئاب خەڵك هەست بەگەرمایەکی زۆر دەکەن و بای ڕۆژهەڵات گڕەی هەیە. لەنیوەی دووەمی ئابدا هەوا لەناکاو سارد دەبێ و هەر یەك لە مانگی ئەیلول و تشرینی یەکەم مامناوەندین. هەرچۆنێك بێ، هەموو شتێك وشك وتۆزاویە و، مێشێکی زۆر هەیە و مرۆڤ ئارەزو دەکا باران بباریێ تا ئەوپیسیە بشواتەوە کە لە کەشی گەرمەوە کەڵەکە بوە.

پارێزگاکە لە ڕوی تەندروستیەوە زۆرباشە تەنیا ئەو ناوچانە نەبێ کە چەڵتوکی لێدەچێنن، مەلاریای تێدا بڵاوە. بەدرێژایی مانەوەم لە هەولێر یەك حاڵەتی کولێرا یان ئاوڵە، یان تیفۆ ئیدم بەبیرنایەتەوە، بەدەست(کۆکە ڕەشە)ەوە هیلاك بوین کە لەنەخۆشیە درمەکانە، لەگەڵ ئەوشدا کە (ئەنفلەوەنزای ئیسپانی) کەلە ناوچەکە دابە (ئیسپانیۆل) دەناسرێ، بەرلە هاتنم، ساڵی(١٩١٨)خەڵکێکی زۆری دروێنەکردبوو. ئەوەی کە سەیرە ئەوەیە کە لە گوندە کوردیە دورەکان بارەکە خراپتر بوو، بەتایبەت لێرە باسی شەقڵاوە دەکەم، کەلەیەك لە ماڵە ئاغاکان هەموپیاو و ژن و منداڵەکان مردبون ئاوی خواردنەوە، بەتایبەت لەدەشتی هەولێر، نایابە، ئەمەش تارادەیەکی زۆر پاساوی بڵاو نەبونەوەی نەخۆشیە درمەکانە.

ئەو شارە گەورانەی کەجێی گرنگی ئێمەیە لەو پارێزگایە ئەمانەن: هەولێر(١٤٠٠٠)[١٩] کەس کە دەکەوێتە کۆتایی باکوری دەشتی هەولێر، کۆیە دانیشتوانەکەی(٥٠٠٠)[٢٠] کەس و دەکەوێتە سەر لێواری سنجەقی کۆیە و بناری هەیبەت سوڵتان، ئاڵتون کۆپری، دانیشتوانی(٢٠٠٠) [٢١] کەس کە بەشی هەرە زۆری دەکەوێتە دورگەیەك لە زێ ی گەورە، ڕەواندوز، کە دانیشتوانەکەی(١٥٠٠) [٢٢] کەس دەکەوێتە کۆتایی سەرەوەی گەلی ی چیای ڕەواندوز(گەلی عەلی بەگ) شەقڵاوە کە دانیشتوانەکەی(٣٠٠٠) [٢٣] کەسەو دەکەوێتە سەر لێژاییەکانی باکوری چیای(سەفین) و مەخمور کە دانیشتوانەکەی(١٠٠٠) [٢٤] کەسەو دەکەوێتە لێواری سەرەوەی بیابانی قەرەچوغ(قەراج)، وە هەریەك لەو شوێنانەی لەجێی خۆیدا باسی دەکەم کۆی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر بە کۆیەو ڕەواندوزەوە، جگە لە ئاڵتون کۆپری و ناوچەی ڕانیە بە ١٠٥٠٠ کەس دەقەبڵێنرێ.

گرنگترین ڕێگاکانی ئەو ناوچەیە ئەو ڕێیەیە کە موسڵ بەهەولێرو ئاڵتون کۆپری و کەرکوك و(سەری سکەی) (هێلی شەمەندەفەر) نزیك کفری دەبەستێتەوە، ئۆتۆمبیل دەتوانێ هەموی بەکاربێنێ. بەر لەشەڕ بازرگانیەکی گەورە هەبوو کە لەو ڕێیەوە بەرەو خواردەچوو. ڕێگای هەرە تەناهیش ڕێ ی بەغدا و موسڵ بوو، بۆ کورتترین ڕێگای تەریب بە دیجلە. زەویەکانی ئەو ئەوبەرو ئەو بەری ڕێگاکە بەپیت بون ڕێژەی دانیشتوانەکەی چڕبوو، دەکرێ بڵێین ڕێگای چەند هەزار ساڵێك بوە.

دەتوانرێ لە دووشوێن لەزێی گەورە بپەڕیەوە یان لای(کەڵەك)یان لای(گوێڕ) نزیکترە، پەڕینەوە لەزێ بە (کەڵەك) ە(معبر) پردێکی نایاب هەیە کە تورکەکان بنیاتیان ناوە بەلاّم بەشی هەرە پێویستی لە ئاوەڕۆی سەرەکی زێیەکە کەمو کوڕی هەیە، نیازی تەواوکردنی لە ئارادابوو بە هۆی(پردێکی هەڵواسراو) بەلاّم یەکێك لەو کۆڵەگانەی کە دەبوا بخرێتە سەری دارما، لەوەوە دەرکەوت کە بنچینەی بیناکە دڵنیایی نابەخشێ. گەلێ دینگەهەن کە نیشانەی کەمدەستی و بێ توانایی تورکەکانە، پارەیان هێناوە تا پرۆژەی تەواوبکەن، ئەمەگومانی تێدانیە بەلاّم بەرەو گیرفانی کارمەندە چاوچنۆکەکان چوە کە مانگانەیەکی کەمیان هەبوە، یان ڕێگەی دووەم کەتەنگو چەڵەمەیەکی نیە و بە(گوێڕ)دا دەڕوا، بەهۆی(کەڵەك) ێك لە ڕوباری دەپەڕیەوە کە دەکرێ لە هەرکاتێکی بتەوێ بەکاری بێنی تەنیا ئەو ڕۆژانە نەبێ کەزێ لافاو دەکا. ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ هەیە کە لە ئاڵتون کۆپری بەرەو(گوێڕ) و بە(دیبەگەدا) دەڕوا کە ڕێی سەرەکی هاتوچۆ بوو لە نێوان موسڵ و کەرکوك لەکاتی شەڕدا.

ڕێگای گرنگی دووەم کە لە هەولێرەوە درێژ دەبێتەوە تا لەسە هێڵی ئاسن لە(شەرگات)، بەمەخموردا دەڕوا. ڕێگا ڕاستەوخۆ کە کەڵکی ئەوەی پێوەنیە ئۆتۆمۆبیل پیایدا بڕوا، ئەمڕۆ دەبێ سوڕانەوەیەکی گەورەی بۆ بکەی و بەکەڵەیێك لە دیجلە بپەڕیەوە، گرنگی ئەو ڕوبارە لەو کاتەوە کە هێڵی ئاسن گەیشتۆتە شەرگات زۆر زیادی کردوە.

ڕەنگە بتوانی بە ئۆتۆمبێل بگەیتە هەموو گوندێکی هەولێر، بەڵام هاتوچۆ لە گردەکان زۆر خراپە، زۆربەی ڕێگاکان تەنانەت بۆ ڕۆیشتنی ولاغیش دەستنادا، گەلێ ڕێگا لە نێوان کۆیە و هەولێردا هەیە بەڵام هەمویان زۆر خراپن.

دو ڕێگای سەرەکی هەن کەلە فارسەوە دێن و بە ناوچەکەی ئێمەدا تێدەپەڕن، بەڵام ئەوەی دەکەوێتە باکوری ڕێگاکەی دیکە ئەو ڕێیەیەکە لە(ساوج بۆ لاق)ەوە(مهاباد) دێ لای(گەروی شێخ) دەپەڕێتەوە بە دوڵایی(زێ ی ڕەواندوز)دا دێتە خوار و دواتر دێتە ناو ڕەواندوز و دەربەند دەبڕێ لەدەشتی هەریرەوە و لەکۆتاییدا دەگاتە هەولێر. روسەکان کاتێك ڕەواندوزیان داگیرکرد ئەو ڕێگایەیان بەکارهێنا، هەولێکی فراوان دراوە بۆ چاکردنەوەی. دوو ئۆتۆمبێلیان بۆ هێنا، تا ئێستاش پاشماوەی یەکێکیان لە قوڵایی گەلیدا دەبینرێ. لە سەردەمی تورکەکان عارەبانەی بەڕێکوپێکی بەسەردا دەڕۆیی. بەهاکەشی چونکە ڕێگەیەکی بازرگانیە، لەبارودۆخی سیاسی هەردوو سنورەوە دێ. ئەو ڕێیانەی کە لە (شنۆ) و (ورمێ) وە دێن لە ڕەواندوز لەگەڵ ڕێگە سەرەکیەکە بەیەکدەگەن. پێش ئەوەی بگاتە(دێرە) ڕێگایەکی ڕاستەوخۆی لێدەبێتەوە بۆ ئەو کاروانانەی کە دەچنە موسڵ لەڕێ ی کەڵەکی گرد مامك. ئەوڕێیەی کە زیاتر بەرەو ڕۆژئاوایە لە دەربەندی(وەزنە)وە سنوردەبڕێ و بەدەشتی پشتدەر و بیتوێن دا دەڕوا تا دەگاتە کۆیە. ڕێگاکە لەسەر هەیبەت سوڵتان زۆر سەختە. بەسەر زێی بچوکدا کاروانەکان لە کۆیەوە بەرەو(تەقتەق) دەچن، گەشتیاران بارەکانیان لەسەر کەڵەکەکان دادەنێن تا لەسەر ئاوادا بۆ ئاڵتون کۆپری و بەرەو خوار بۆ بەغدا بچێ یان لەروبارەکە دەپەڕنەوە بە هۆی کەڵەکەوە تا گەشتەکە بەرەو کەرکوك لەوشکانی بڕوا.

لیستێکی ناوی گیانەوەران دەنوسین کە فراوان نیە، گیانەوەروەماڵیەکان بۆ بەشی داهاتوو جێدەهێڵم، لە نێوان ئەو شیردەرانەی لەدەشتەکان دەژین و بڵاوترینیان: ئاسکی فارسی و گورگی بۆرو، چەقەڵ و ڕێویە کە ڕەنگی لای پەلەکانی مەیلەو ڕەشە لەزستان و، کەروێشك و بەرازی کێوی و گۆڕ هەڵکەنەو ژوشك و کۆمەڵێك لە قەپاڵ گرەخان هەن رەوە مەمزی گەورە لە بیابانی قەرەچوغدا هەن، گۆشتیان نایابەو زۆرکاتیش ماڵی دەکرێن. خەڵك پێیاوایە کە

گورگ ژمارەیەکی زۆری مەڕ دەبا، بەڵام ئەوەی لە ڕاستیدا دەیاندزێ ئەوە مرۆکانن چونکە ئەوە بۆ شوانەکان هەنجەتێکی زۆر باشە بۆ خەڵەتاندنی گەورەکانیان. کەرویشکیش وەك بەراز ڕاوێکی باشە بۆ سەرۆکە کوردەکان بەڵام بەراز زیانێکی زۆر بە بەروبومی کشتوکاڵی دەگەیەنێ، بەتیبەت لەبیتوێن. کورد مەگەر دەگمەن ئەگەر نا حەزی لەگۆشتی بەراز نیە[٢٧]، لە ساڵی ١٩١٩ ڕەوە مشکێك هاتن و زیانێکی زۆریان بە بەروبومی توتن گەیاند کە لەسەر زێیەگەورەکان دەکرێ! . وەکچۆن جۆرەمشکێکی ناوازە و ناشیرین رویان لە ماڵەکان کرد. گۆڕهەڵکەنەش بە قاچە درێژەکانی پشتەوەی و کلکە بەتوکە، ئەستورەکەی گیاندارێکی سەرنجڕاکێشە و دەکرێ زۆر بەئاسانی ماڵی بکرێ.

لە گردەکانیش کەڵەکێوی (Ibex) زۆرە، کە لەوێ پێیدەڵێن(شور)، من وادەبینم کە لە پۆلی(ئاسکی میسکە) (Musk – Deer) ئەمەش وەك هەموو گیانەوەرە بچوکەکانی وەك پشیلەی کێوی(Lyny) و سمۆرە(Squirrels) و دەڵەك (Stone – Martens) و گیانەوەرانی دیکەیە.

ڕێوی و بەرازی کێوی زۆرن، کورد زۆریان ئارەزو لەڕاوی شورە، بەپلەی یەکەم بۆ گۆشتەکەی، دواتریش داواکاری لە سەری پێستەکەی کە دەکرێتە بەرگی سەرزین، من خۆم ورچێکی تەواوپێگەیشتوم نەبینی، بەڵام بەچکەکانی ڕاودەکرین و ماڵی دەکرێن. من وای بۆ دەچم کە هەمیشە ئەو بێچوانە دەمرن. هەرچۆنێك بێ کە گەورەدەبن بەیدەست کردنیان هاسان نیە. دەڵەك بە هۆی کەوڵەکەیەوە زۆر بەنرخە و پێستی دەڵەکێك بە نزیکەی چواردە ڕوپیە دەکردرا لەنیسانی ١٩٢٠، وەك چۆن برێکی زۆریش لە کەوڵی ڕێوی دەفرۆشرا. نرخی کەوڵە ڕێویەك نزیکەی(٢,٨) ڕوپیە بوو.

خشۆکەکان، لە بۆق و، گارگرەکان(Lizaeds)[٣٠] بترازێ بەربلاونین لە کانیاوەکاندا برێکی کەمی ماری بچوك دەبینرێن، بەڵام من بۆ ئەوەدەچم بەزۆری بێ زیانن، بەڵام کوردەکان زۆر لێیان دەترسن بەڵام من گوێم لێنەبووە کە کەسێك بە پێوەدانی مار مردبێت. لە پیرێژنێك بترازێ کە تەمەنی زۆر گەورەبوو. ئەمەش لەباروذۆخێکی زۆر گوماناوی بوو. ڕەنگە لەگردەکاندا ماری گەورە هەبن، ڕەنگە ئەژدنگ بن، ماسەکی زۆر لەڕبارەکاندا هەن، ئەوانە ماسی باشترن کە لەزێی گەورەدا هەن، بەڵام بەرهەمی ماسی لە زێی بچوك لەجۆرێکی نزمترن ئەو ماسیانەش بەتۆڕ ڕاودەکرێن ڕەنگە لەلایەن خەڵکەوە بە هۆی دانەخۆری

ژەهراویەوە ڕاوبکرێن، ماسی لە زێ ی گەورە تەنیا بەزستان و بەهاران ڕاودەکرێن کاتێك کەئاو شلوێ یەو کەش سارده دەتوانن بیبەنە هەولێر و بیفرۆشن.

باڵندەکان بەزۆری لەو باڵندانەن کە لەبەریتانیاشدا هەن. هەرچی جۆرە هیندیە ڕازاوەکانیشن بونیان نیە، چۆلەکەو کلاو کورەی زۆرە لەگەڵ: (فنجی زیرین ) (Gold finches) گەلێ لە باڵندەی بچوك کەناتوانم ناویان لێبنێم. پەڕەسێلکە بەرەتۆ خە بریقەدارەکەیەوە بەزۆری لەدەشتە کان دەبینرێ وەك پەپو سلێمانکە و قیرناویلکە کە باڵندەیەکی بچوکی ڕەنگ مسیە، لە گردەکانیشدا باڵندەی(جقە)(جوقە) جوقە زەردە دەبینرێ کە باڵندەیەکی سپی و ڕەشەو کلکێکی درێژی هەیە.

قەڵەڕەشکەش لەهەموو شوێنێکدا دەبینردرێ وەك هەمو جۆرە بازو کۆلارەیەك،[32] داڵ بەشکۆ و سەربەرزیەکەوە لە نێوچیاکاندا دەفرێ. لەساڵی (١٩٢٠)دا هەندێ بێچوەبازم ڕاوکرد لە نێوان دوو یان سێ سەرۆکی کورددا دابەشم کرد، ئەوان وایان ڕاگەیاند کە هەڵدەستن بە ڕاهێنانیان.

لە باڵندەی ڕاو گەلێ جۆری دیکەی هەیە، لە دەشتی هەولێر چێرگ(چرگ)ی[33] گەورە هەن، من چرگی بچوکم لەوناوچەیە نەدیوە تەنیا یەك جار نەبێ، سوێسکە ڕەشە بە درێژایی زێ ی گەورە زۆرە، بەڵام سوێسکە بچوك (سی ی هیندی) تەنیا لە گردە نزمەکاندا هەیە. پۆڕ لە گردە بەرزەکان زۆرە کە باڵندەیەکی گەورەیەو پێیەکانی سورن و لە جۆری سوێسکەیە. لەنێوان نیسان و تشرینی یەکەمدا ڕەوە قەتێ ی[34] گەورە دەشتەکان دادەپۆشن دواتر بەرەو باشوردەچن. لە باڵندە ئاویەکانیش سۆنە و قازی کێوی بەشێوەیەکی زۆر هەن، لە زستاندا وەکو زۆر جۆری قاز و مراوی، قۆڵنگی گەورە هەن ڕەنگی شینە و(قۆڵۆن)ژمارەیان زۆرەو زۆریش ئارەزووی گۆشتەکەی دەکرێ.زیقاوڵەش چیرۆکێکی هەیە کە دەنگێکە وەك برگەی:(Oh did you do it) ی ئینگلیزی دەردەکات. کۆتریش لە دەستەکاندا لە هەموشوێنێك دەبینرێ، لەهەمو باڵندەکاندا جوانترو سەرنج ڕاکێشترە (ڕەوە لەقلەقن کە دەیکەن بەهەرا) شایەنی ئەوەیە کە برگەیەکی بۆ تەرخانکەین، مانگی شوبات وادەی هاتنیەتی، کە مێیەکەشی لەگەڵدایە، دواتر دەستدەکا بەدروست کردنی هێلانەکەی لە سەر بلندی ماڵەکان ئەو بەشێوەیەکی ئاسایی هێلانەیەکی کۆن هەڵدەبژێرێ، کە لەبەرزیدا خۆی لە پێیەك دەدا دواتر هەندێ شتی دیکەی دەخاتە سەر، کاتێك کە

دان و خواردن کۆدەکاتەوە دەبینی کە لەسەر هێلانەکەی وەستاوە و بە دەنوک تەقتەقە دەکا، سەری بە خۆشیەوە بەرزدەکاتەوە وردەوردە دەیسوڕێنێ تا بەسوکی دەیگەیەنێتە ملی، دوایی دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی و، دوبارە کردارەکە دوبارەدەکاتەوە، لەبەر ئەو هەراوزەنایەی دروستی دەکا و، لەو بۆ چونەی کە دەڵێن دەچێتە حەج بۆ مەککە، کە لەئابدا کۆچدەکا، خەڵك ناویانناوە(حاجی لەقلەق)، بۆیە ڕێزی لێدەگیرێ و کەس دەست لە کارەکانیەوە وەرنادا و هیلانەکەی تێکنادەن، ڕەنگە(نهێنی دانپیانان)یان بەگوێدا بچرێنێ ئەگەر هەستی پێبکەن، ڕەنگە جوتێك یان دوجوت لەقلەق، لە وەرزی هێلانە دروستکردن دا، لەسەر هەموو ماڵێك ببینی.

مێروەکان دەردێکی گەورەن لە کوردستان دا، یەکەم و گرنگترینیان(ئەسپێ)یە کە دواتر زۆرتر قسەی لەسەر دەکەین. دوای ئەسپێ(مێشی ناوماڵ)دێ مێشێکی دیکەش هەیە کە لە شێوەدا تەواو لەمێش دەچێ(مەبەستی نوسەر مێشولەیە) بەلأم لموزێکی تیژی هەیە کە ئازارێکی زۆر دەبەخشێ. لەو مێروانەی کە زۆر بێزارکەرن مێرولەیەکی بچوکی سورە کە زۆر ئارەزوی لە(پسکوت)ە (مەبەستی ئەو مێروەیە کە لە هەولێر پێ ی دەڵێن گێرکە) پێشکە یان(تەپۆ)ش لە هاوین و پایز دێن لەو شوێنانەی کە ئاودێریان تێدایە.(مێش خورما)ش هەیە کە لە زەردەواڵەیەکی گەورە دەچێ ڕەنگی ڕەشێکی زەردباوە و، لەهاویندا بەروبوم دەخوا بەلأم وەك دەردەکەوێ مەترسیەکی ئەو تۆی نیە. گیانلەبەرێکی دیکە هەیە کە ناوقەدی باریکەو دەنگێکی بەرزی هەیە، پێم وابێ (مێشی وڕەیە) [٣٥] کە لەسەر هەموو دیواری ماڵدا لانە بۆ نەوەکانی دروستدەکا و پڕیان دەکا لە پەپولە. دوپشك زۆرە بەتایبەت دوپشکی ڕەش کە لەهی زەرد مەترسی دار ترە و وەك جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکە لەجۆری (Gerry man drum) کە جاڵجاڵۆکەیەکی گەورەی زەردە درێژیەکەی خۆی لە (٦) ئینج دەدا لە ئەژنۆوە بۆ ئەژنۆ. خەڵك زۆر ئارەزویان لەڕاوکردنی دوپشك و جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکەو دەیان خەنە ناو دەفرێکەوە تا شەڕی هەردوولا ببینن جاڵجاڵۆکەکەش ئەگەر ئەستور نەبێ و نەتوانێ جوڵەبکا هەمیشە سەرکەوتوە. بەهۆی کارێژە بەهێزەکانی کلکی دوپشکەکە لەنزیك چزودکەیەوە دەگرێ و وەك مشار دەیبڕێ دواتر دەست دەکا بە خواردنی نێچیرەکەی. [٣٦] جاڵجاڵۆکەی ڕەنگ مسی و سەوزی بریقەدار هەن کەدەبینرێن لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێکی دی دەفڕن لەوەرزی گەشانەوەی ساڵ. کە

هاوین دێ هەوای گوند پڕدەبێ لە دەنگی(زەردەزیڕە) واتە (زیکزیکە) و کوللەو پەپولەی ڕەنگاو ڕەنگ، کە جۆرەکانیان خۆی لەسەد جۆردەدا. زۆرجار کوللە بەشێوەی ڕەوەدێن و زیانێکی زۆر بەبەرهەمی کشتوکاڵی دەگەیەنێ. بەلاّم ئەو پەپولانەی کە لەناوچەکەدا هەن ژمارەیان کەمەو زۆریش لەجۆرە ئینگلیزیەکان دەچن[٢٧] لەگوندەکانی ناوچە گردەکان مێشەنگ بەخێودەکرێ کە هەنگوینێکی نایاب بەرهەم دێنێ.

بەقوڵی باسی سەوزەوات ناکەم،لەبەرزی(٣٠٠٠) پێ لەسەر گردەکان، داربەڕو هەرمێ و گێوژ و درەختی دیکە گردەکان دادەپۆشن. ئەمە تا بەرزایی(٧٠٠٠) پێ بەردەوامەو دواتر سەرچیاکان ڕوتەنن، لەسەر جۆماوەکاندا درەختی چنار و ڕەشەدار(دار بناو) گوێز و سورە چنار و دار توو دار بی دەبینرێن. داری(عەرعەر) (هەڤریسك) م لەیەك شوێندا بینی.

درەختی قوچەکی(گومەزی) بونی نیە لەوێدا. ژاڵە(لورك) لە لێواری ئاوەڕۆیەکان و لەبناری گردەکاندا هەڵچوە. بەشێوەیەکی جوان لەوەرزی گەرمادا گوڵ دەکا. لە دەشتەکاندا لەهەندێ درەختی کێوی زیاتر شتێکی دیکە نیە، لەوانەیە ناوەناوە دار توێك ببینرێ کە لەنزیك ئاودا ڕواوە. ڕوەکی تایبەت بەو ناوچەیە بریتی یە لە وشترالوك و تو ترك. بڕێکی زۆری(سۆتکە) (بەڵەك) لەنزیك ئاو و بەتایبەتی هەردو بەری زێی گەورەدا هەیە. گەلێ جۆر درەختی میوە و تەختە دەڕوێن کە دواتر باسیان دەکەین.

لە بەهاردا زەوی ڕەنگین دەبێ و بەگوڵ دەڕازێتەوە، ڕۆژێك سی جۆری جیاوازم ژمارد لەسی یاردەی گوڕەپانی ماڵەکەمدا. زۆرترینی ئەو گولاّنەی دەبینرێن و دەتوانم ناویان بێنم. گولاّلە سورە(چاران چەقیلە) بەڕەنگی مۆڤ (Mouve)و سپی و سوری تێر. پێ پشیلەی زەرد و چەند جۆری سەوسەن و تۆڵەگە کە دوڕەنگی هەیە.

◆

# بەشی سێیەم
# کوردەکان

هەمو دانیشتوانی پارێزگای هەولێر کوردن تەنیا دانیشتوانی هەولێر[1] نەبێ و لەگەڵ بەشێکی کەم لە گاورەکانی عەنکاوە و شەقلاوە و کۆیە و هەندێ گوندی پەرش و بلاَوی ناوچەی شەمامك و قەرەچوغ (قەراج).

لەگەڵ ئەوەشدا کە کوردەکان میللەتێکی پیاوانە و ئازان [2] و لەبەشێکی گەورەی رۆژهەلاَتی ناوەڕاستدا نیشتەجێنو لەرەگەزی ئارین، واتە رەگەزی ئێمە، کەچی خەڵك لەولاَتی ئێمەدا هیچ شتێکیان دەربارەی نازانن، تەنانەت زۆرمان بەر لەشەڕ هەرناویشیان نەبیستون.

رەنگە یەکێك بپرسێ(باشە، ئەونەتەوە مەزنە لەکوێ نیشتەجێن؟ [3] ئەی بۆچی وای نەکردوە دەسەلاَتی لەسیاسەتی رۆژهەلاَتدا هەست پێ بکرێ؟ ناوی(کوردستان) واتە ولاَتی کوردان، کە دەیبینی بەپیتی گەورە لەسەر نەخشەکانی رۆژهەلاَتی ناوەڕلستدا نوسراوە، بەلاَم ئەگەر مرۆڤ هەوڵدا بەدوای سنورەکەی دا بگەڕێ، ئەوا هەرگیز نای دۆزێتەوە.

چونکە ئەم دەستەواژەیە بەشێکی گەورەی بەشی سەرەوەی(میزۆپۆتامیا) دەگرێتەوە کە ئێستا لەژێرداگیرکاری بەریتانیا دایە[4] بەشێکی گەورەشی دەکەوێتە سنوری رۆژئاوای فارس و، بەشێکیشی دەکەوێتە ژێر دەسەلاَتی تورکی، وەك شارەکانی وان، ئەرزرۆم و بەدلیس و خەرپوت و دیاربەکر، تەنانەت بەشێکی دەکەوێتە ژێر دەسەلاَتی فەرەنسا لەباکوری حەلەب[5]، ئەمەش ئەو پرسیارە روندەکاتەوە(بۆ شتێکی ئەوتۆمان دەربارەی کوردەکان نەبیستوە؟) ئەوان وەك میللەتێك قەوارەیەکی سیاسیان نیە، ئەوان کۆمەڵە هۆزی پەرشو بلاَون، زۆر ئارەزویان لەیەك گرتن نیە.ئەوان زیاتر حەزدەکەن لە قەلاَ بەهێزەکانیان بژین،

ئـەوان گـویّ ڕایـەڵی هەرحوکومـەتێك دەبـن کـە لەناوچـەکەدابیّ، کـە تـەنیا لـە حوکومێکی ڕەمزی زیاتریان بەسەردا نەسەپێنیّ.

کوردەکان ئارین، بۆچونی ئەوەش هەیە کە لەگەڵ مادەکان یـەکبن، زینـۆن بـە کودۆجی[٦] ئاماژەیان بۆ دەکا. بەناوبانگترین کوردیش لە مێژوودا (سەلاحەدین)ە، ئەو ڕۆژێك لەڕۆژان هـەولێری کـردە پایتـەختی خـۆی[٧]، سـەرکردەکانیان بـەزۆری ولاّتی سەربەخۆیان دامەزراندوە بەناوبانگترینیان(بایەزید) لەسەدەی شـازدەو لـەم سەردەمەی دواییشدا لەڕەوانـدوز و سـلێمانی و، بـەلاّم ئـەم ولاّتانـە بەشـێوەیەکی ئاسایی چەند ساڵێك دوای مردنی دامەزرێنەرەکەی دەڕوخان.

زمانی کوردی زمانێکی شیرینە، بۆ ئەوانەی فارسی دەزانن و ئەوانەشی کە هـەلی باشیان هەیە بۆ قسەکردن لەگەڵیاندا فێربونی ئاسـانە. لەگـەڵ ئـەو بۆچـونەی کـە دەڵیّ زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە کەچـی بـە دیـالێکتێکی فارسـی دەچـیّ، ئەوە کە تایبەتمەند نەبیّ لـە ڕێوشـوێنی زمانـان وادەزانـیّ کـە پەیوەندیـەکی بـەو زمانەوە هەیە وەك پەیوەندی دیالێکتی یورکشیر (Yourk shire) ی بـەرفراوان و زمـانی ئینگلیـزی، کـوردی ئـەلف و بـیّ یـەکی تایبـەت بـە خـۆی نیـە، پیتـە عەرەبیەکان بـۆ نوسـین دەگـۆڕدرێن. لەبـەر ئـەوەی کـە زۆردەنـگ و پیتـی بـزوێن بەتایبەتی لەو زمانەدا هەن و لەعەرەبی دانین بۆیە نوسینی بـە پیتـە عەرەبیـەکان شێوازێکی دروستنیە. ئەمەش پاساوە بۆ ئەوەی کە زۆرکەم بەم زمانە دەنوسریّ، لە پارێزگای هەولێر لە نامە گۆڕینەوەی سەرۆکەکاندا فارسی بـەکاردیّ و لەموسـڵ عەرەبی. لەسلێمانی لە نامەگۆڕینـەوەی فەرمیـدا کـوردی بـەکاردیّ، دوای ئـەوەی کە(موقەدەم ئـەی. بـی. سـۆن) هـەوڵی دا خەڵکەکـەی والێبکـا زمـانێکی تایبـەتی خۆیان دروستکەن. ڕۆژنامەیەك بەوزمانەدەرچـو. پێشنیارێکیـشی پێـشکەش کـرد کەپیتە لاتینیەکان بەکاربهێنرێن چونکە زیاتر لەگەڵ ئەو زمانـەدا دەگـونجێن نـەك پیتە عەرەبیەکان. چونکە تورکـەکان هەسـتی (یـەکێتی تۆرانیـەکان) بەسـەریاندا زاڵبو بۆیە تالەتوانایاندابوو هەوڵیاندا ئـەو زمانـە لەناوببـەن، بۆیـە زۆرکـەم کتێبـی قوتابخانەو ڕێزمان بەوزمانـە نوسـراون، ئەگـەر نـەڵێین هەرنیـە. موقـەدەم(سـۆن) دوکتێبی لەڕێزمانی کوردی _ ئینگلیزی داناوە.

زمانی کوردی گەلێ دیالێکتی هەیە، ئەمەش کارێکە حەتمیە بۆ میللەتێك کە بەفراوانی بلاّو بوبێتەوە و زمانێکی نوسراوی نەبێت. ئەو دیالێکتانەش بەسەر دوو کۆمەڵە دابەش دەبن: باکورو باشور، پارێزگای هەولێر دەکەوێتە ناوەڕاستیان، دیالێکتی هەولێر و کۆیە باشوریەکی جیاوازە. لەکاتێکدا ئەو هۆزانەی لەسەرەوەی ڕەواندوز نیشتەجێن و، بەتایبەت خێڵە ڕەوەندەکانی کە زستانان دێنە خوار بۆ دەشتی هەولێر، دیالێکتێکی باکور بەکاردێنن. هەر خێلێکیش تایبەت مەلدی خۆی هەیە. تایەفەیەك هەن پێیاندەڵێن (دەربەندلس) و لەچەند گوندێکی نزیك تەق تەق لەسەر زێی بچوك نیشتە جێن. زمانێکیان هەیە کە دراوسێکانیشیان تێناگەن، لە کۆیەش چیرۆکی ئەو ئینگلیزە گەمژەیە دەگێڕنەوە کە هاتبوە ئەوێ و پرسیبوی ئەو وشەیە چیە کە بۆ(کچ) بەکاری دێنن؟! هەر ئەوەندە زانیبوی کە (دەربەندلس)ە کان وشەی(دۆت: Daut) بەکاردێنن و بەراوردی کردبو لەگەڵ وشەی(Daughter) ی ئینگلیزی، خێرا خۆی گەیاندبوە یەکێك لە گوندەکانو چەند ڕۆژێك خەریکی لێکۆڵینەوەی زمانە سەیرەکەیان دەبێت. عەبدواللە پاشا، کە کوردێکی ڕەواندوزە کاتی خۆی حوکومەتی عوسمانی کردبوی بە قایمەقامی ئامێدی، بینی کە دەبێ لەگەڵ دانیشتوانە کوردەکان بەزمانی کوردی گفتوگۆ بکا، چونکە ئەمە بەزمانە تایبەتیەکەی ئەوان ئەستەم بوو.

ئەدەبێکی کوردی هەیەو باشترین دانەریش تیایدا(شێخ ڕەزایە) [1] کە بەچوار زمان شیعری نوسیوە، ئەو خەڵکی کەرکوکەو لە بنەماڵەی تاڵەبانیەکانە، کە شکۆیەکی باشیان هەیە. کوڕەکەی لە کاتی کە ئێمە ئەو وڵاتەمان داگیرکرد قایمقامی تورك بوو لە ڕانیە.

لە پارێزگای هەولێر گۆرانی میللی زۆر بڵاوەو بەزۆریش بەدیالێکتی باکورەو بابەتەکانیشی داشۆرین و دڵداریە.

زۆربەی کوردەکان ئێستا لەسەر مەزەبی سوننەن، کوردەکان ئاینی موحەمەدیان لەوەختێکی زووەوە وەرگرت، تەنیا بەشێکی کەمی هۆزەکان نەبێ. تا هاتنی تورکەکان وەك ئەوە وابون کە هیچ ئاینێکیان نەبێت. چونکە تورکەکان بەزیرەکیەکی سیاسی بێ وێنە ئەوەیان بۆڕون بۆوە کە تاکە هۆکارێکی بتوانن ئەم

گەلە بەگەلەکەی خۆیانەوە ببەستنەوە ئەوەیە کە بیانهێنینە سەر ئاینی خۆیان.(ئاوا! : و. ع) باشترین هەوڵیاندا تا ئیسلام بڵاو بکەنەوەو لە ناوکوردەکاندا گەشەی پێبدەن. ئەنجامەکەشی — لەگەڵ ئەوەی کە شوێنەواری(بێ ئاینی) لەچیابەرزەکان هەر ماوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە جوتیاری لادێی ڕەنگە(ڕەمەزان)پشتگوێ بخاو گۆشتی بەراز بخوا — بەڵام چینی سەرەوەی کوردەکان زۆرڕشتن لەسەر باوەڕیان و نوێژەکان لە کاتی خۆیدا دەکەن. بەڵام ئەمەشیان وەك ئەو منداڵەیە کە فەرمانێکی لەوانەوە بۆ دەرچوبێ کە لەخۆی گەورەترن(ئاوا! : و. ع) نەك لەباوەڕەوە بە پێویستی نوێژکردن. زۆر کەسم لە کوردەکان دیوە کە نوێژەکەیان دەبڕن، بێ ئەوەی جێگای خۆیان بگۆڕن، تا تێبینیەك بۆ ئەو قسانە زیاد کەن کە دەربارەی بابەتێك دەکرێن. لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە گەورەیەی کە شێخ و مەلاکان لەناو کوردەکاندا هەیانە، کەچی کوردەکان هیچ کات دەمار گیر نین زۆریشیان باوەڕ بە شێخ و مەلاکان هەیە.

وشەی (شێخ) لە کوردستان مانای(سەرکردەی هۆز) ناگەیەنێ وەك چۆن لەناوعەرەبەکاندا هەیە.

ئەم ناوە هەمیشە بۆ کابرایەك ڕۆحانی بەرێز دادەنرێ، یان بەهۆی بنچەیەکی پیرۆزەوە(ئەوەی پێغەمبەری پاك : و. ع) یان بەهۆی ئەو ژیانە خواپەرستیەی کە لەسەری دەڕوا، ئەو ناوە لەو(سەید) انە دەنرێ کە لەپشتی پێغەمبەر(د.خ) هاتوە خوار. هەندێ لە شێخەکان بەڕاستی پیاوی باشن و هەندێکیشیان خونخوار و فێلبازن. لەم کتێبەدا دەسەڵاتی ئەو پیاوە ڕۆحانیانە بەشێوەیەکی ڕون وێنە دەکەین. هەرکەسێکی سەفەر بۆ کوردستان دەکا ئامۆژگاری دەکەین کەزۆر ڕێز لەو شێخانە بگرێ کاتێك دەیانبینێ و پێویستە نەوازشیان بکا.

هەمو گوندێك مەلایەکی لێیە و هەر میوانێکی بچێتە ئەو گوندە فەرموی دەکا و دبێتە خانەخۆێ ی. بێ گومان سودی زۆریشیان هەیە کاتێك کە پێویستت بەوەرگێڕێك دەبێ، ئەو مەلایانە هەمیشە ئامۆژگاری سەرۆك هۆزەکان دەکەن لەهەمو کارێکداو هەموسەرکردەیەکی باشی کوردەکان مەلایەکی هەیە، لەتەمەندا پیرەو لە پشتەوە دەوەستێ بەتایبەت(بابەکراغا)ی پشدەر، بابەکراغا گەورەترین سەرکردەی کوردەو هەمیشەش لەهەموان گوێڕایەڵترە، بەتەواویش گوێڕایەڵی

شـێخێکی ناوچـەکەیە. ئەمـەو مـەلاکان سەرچـاوەی خوێنـدنن لـە گونـدەکانی کوردستان، ڕەنگە هەندێ لە هۆزە کوردەکانی پاکور ڕۆژێك لەڕۆژان لەسـەر ئـاینی گاوران بوبن، ئێستاش بەشێکی کەمیان لەژێر بـاڵی (نەسـتوریەکاندان) وەك چۆن هەندێك هـۆزی دیکـە هـەن لـەژێر ڕێزلێنـانی دینـی موحەممـەدی ڕێـو ڕەسمـەکانی خۆیان دەشارنەوە، وەك(قزڵباشـەکان) [١٢] و (کاکەییـەکان) [١٣] لـەلای خـوارەوەی باشوریشدا هۆزی زۆر هەن کەکەوتونـە ژێـر دەسـەڵاتی فارسـی و بـون بـە شـیعە، بەڵام کوردەکان لە پارێزگای هەولێر بەگشتی لەسەر مەزەبی سـوننەن تـەنیا دوو گوند نەبێ لە گوندەکانی(سارەلو). [١٤]

بەشێوەیەکی گشتی ولاتی کوردان ئەو زەویانەن کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی دیجلەو سەروی ئەو هێڵەی کە لەمەندەلیەوە درێژدەبێتەوە تا دەگاتە ڕێژگەی زێی گەورە، گـرنگترین بنکـەش لەباشـوری زێـی بچوك، کـەرکوك و سـلێمانیە. یەکـەمیان وەك هەولێر دانیشتوی تورکی تێدایە، بـەڵام ئەویـدیان گـشتی کـوردن و هەریەکەشـیان سەنتەری یەکەیەکی سیاسیە.

کوردەکـانی لەناوچـەکەدا نیـشتەجێن لـە(جـاف) و (هەمەوەنـدەکان) بـترازێ بەشێوەیەکی کەم نەبێ هەستێکی عەشیرەتگەریان نیە. سیـستەمێکی عەشـایەری مەزن لەباکوری زێ ی بچوك دا هەیە وەك: دزەیی، پشتدەر. هـۆزە کۆچـەریەکانی کە لەچیاکانی ڕەواندوزدا نیشتەجێن هەستێکی قوڵی عەشیرەتگەریان هەیە.

بنکە سەرەکیەکانی کە دەکەونە پشت زێ ی گـەورە بـریتین لـە(ئـاکرێ) [١٥] و (ئامێدیی) [١٦] و (زاخۆ) [١٧]، لەدەوروبەریاندا هەندێ هۆزی کوردی نیشتەجێنٚ کـە دواکـەوتوترین و ڕەوەنـدترین هـۆزن. لـەم بەشەشـدا دەمـەوێ بـەکورتی بـاس لەشێوازی ژیانی ئەو کوردانە بکەم کە لەنێوان هەردو زێدا نیشتەجێن.

کوردەکـان لـە پارێزگـای هـەولێر سـەربە دوو جـۆری سـەرەکین : (دانـدۆك خۆرەکان) (دەشتەکی) کە لەدەشتەکاندا نیشتەجێن و(دۆشـاو خۆرەکـان) کـە لـە چیاوگردەکاندا نیـشتەجێن، ئەمـەش لەگـەڵ وەبیرهێنـاوە کـە لـە بنەچـەدا هـەمو کوردەکـان خـەڵکی چـیاکانن، دانیـشتوانی دەشـتەکان بـەر لـە دوسـێ سـەدە چـیاکانیان جێهێـشتوە، تـا ئێـستاش تایبەتمەندیـەکانی ئـەوێیان پاراسـتوە.

هەمیشەش جیاوازیەکی گەورە لە نێوان ئەو دوجۆرە هەیە لەڕوی شێوازی ژیان و ئاکارەکانی و لەنێوان(ئاغا) و کرمانجەکان (جوتیارەکان) ٧

جوتیاری کوردی بەشێوەیەکی گشتی، بالآیان کورتە، ناوشان پان، جەستەیان لاواز، بەدەگمەن نەبێ بالآیان لە(٥) پێ و(٦) ئینج تێناپەڕێ، تەنیا دەشت لەمەدا هاوێر دەکرێ چونکە پیاوی وایان تێدایە کە لەوە گەورەترن(قەبەترن). ڕیشیان بەردەدەنەوە و سەریان دەتاشن، تەنیا بەشێکی بچوك نەبێ لەپێشەوە (کاکۆڵ)، دەم وچاوێکی ئاریان هەیە، تەنیا ئەوانە نەبن کە چاوەکانیا بچوك و مەغۆلیانەن. مویان بەزۆری ڕەشە، یان قاوەییەکی تۆخە، چاوەکانیشیان ڕەشن و ڕەنگی پێست زەیتونیەکی کراوەیە، وەك پێستی ئیتاڵیەکان یان ئیسپانیەکان یان لەوانەیش ئاچۆغ ترن. دەگمەنیش نیە کە کەسانێك ببینی قژێکی سور و دوچاوی شین و پێستێکی خاڵداری هەبێ.

جلوبەرگ بەشێوەیەکی ئاسایی بریتیە لە کراسێکی پەمۆیی سپی قۆڵ درێژ و شەرواڵێکی بەرینی پەمۆ و چاکەتێکی ڕەش کە لەسەر گەدەدا دەگاتەوە یەك و دەخرێتە ناو شەرواڵەکەوە. لەناو قەدیشی پارچە قوماشێکی درێژ و لولدراو و بەنەخش لەپێش و پشتەوە دەبەستێ، کە بەزۆری ڕەش یان شینە. درێژیەکەشی لەنێوان ٣ — ١٥ یاردەیە. کە لەپشت دەکرێ مەودای نێوان ناوقەد و بن هەنگڵ دەگرێ. لەزستاندا جگە لەشەرواڵ کە لەچنینی ماڵەکان دروست دەکرێ. دەرپێیەکی دیکە لەبن شەرواڵ لەپێ دەکرێ کە بەزۆری سپی خەتشینەو دەگاتە سەر پییەکان. لەکاتی سەرماشدا قاپوتێکی لە لباد دروست کراو لەبەردەکەن، کە قۆڵی کورتە، لەبەرئەوەی زۆر کەم قۆڵی تێهەڵ دەکێشن بۆیە لەسەر شانەکانەوە بەرزدەبنەوە و ئەو کەسەی لەبەری دەکا لەداهۆڵ دەکا. سەرپۆشی سەریش بریتیە لە کلآوێك کە کۆفیەك یان دوان و سیان لەدەورە دەئاڵێنێ کەلە حەریریان لۆکە دروست کراون. لەناوچەی گردەکاندا(چیا) خەڵك کلآوێکی لەلباد دروستکراو لەسەردەکەن کەشێوەکەی قوچەکیە. لەوەرزی دروێنەدا خەڵکی دەشتی هەولێر کلآوێکی فراوانی لەلباد دروست کراو لەسەر دەکەن کە لێواری هەیە.دەسکەموێکی بزن کەلەسەری سەرەوەی کلآوەکەوە دیارە کەسەکە وەك ڕێگرێك دەردەخا. بەشێوەیەکی گشتی هەمیشە دەتوانی کەسەکە جیابکەیتەوە کە موحەممەدیە یان

گاورە یان جولەکە، ئەگەر موحەممەدی بێ لەکام هۆزە و ئی چ جێیەکە، ئەمەش هەموی لەجۆری بەستانی جەمەدانیەکەی. لەبەشی ڕەواندوز خەڵکەکە کەمێك جیاوازیان هەیە.

ئەو شەروالانەی کە دەرەلینگەکەیان فراوانەو لەزەنگ دەچێو وەك هی دەریاوانەکانەو لە چنراوی خۆماڵی دروست دەکرێت و شاڵێکی لەهەمان قوماشی لەگەڵدا لەبەر دەکرێ لەگەڵ کورتەکێکی ئەستور لەژێریەوە. ئەم شەرواڵە تایبەت بەکوردەکانی باکورە(شال و شەپك) هەرچی شەرواڵی باشوریەکانیشە لەسەرەوە فراوانەو لەخوارەوە هەمیشە تەسکە.پێڵاوی کوردەکان زۆر جۆری چەکمەی هەیە، دیارترینیان ئەو پێڵاوەیە کە پێی دەڵێن(کاڵەك)، لەیەك پارچە لە پێستی گامێش دروست دکرێ بێ ئەوەی دورمانی تێدابێ، بەشێوەیەك کە لەگەڵ پێدا بگونجێ و لەسەرەوە بەخوری یان بەئاوریشم دەڕازێنرێتەوە. لە هەردولایدا کونی تێدایە کە بەهۆیەوە دەتوانرێ بەپەتێکی خوری پێڵاوەکە توند بکرێ لەپێدا.

ئەو جۆرە کاڵەکە زۆر لەناوچە بەرزەکان بەکاردێت، خەڵکی ڕانیە جۆرە گۆرەویەك لەپێ دەکەن کە لەخوریەکی سپی دەچنرێو دەگاتە ئەژنۆ(بەلەك پێچ) (و. ك) ئاغاکان لەهۆزە گەورەکاندا، کە هەمیشە خانەوادەکانیان بەدرێژی چەند سەدەیەك وا ڕاهاتون لەکاری دەستی دورکەونەوە، ئەوان شێوەیەکی تایبەتن، زۆر جار درێژی کەسێکیان دەگاتە(٦) پێ، بەشێوەیەکی گشتیش شێوەی یادگاری بازێکی جوانیان هەیە. من یەك دوانێکیان دەناسم کەهێزێکی زۆری گەنجیان هەیە، ئەمەش لەکوردستاندا دەگمەن نەبێ ڕونادا. جلوبەرگیان وەك جلوبەرگی جوتیارەکانە، تەنیا ئەو ماددەیە نەبێ کەلێی دروستکراوە، گرانترەو ڕەنگەکانی بەڕەونەقترە. لەدەشتەکاندا خەڵکەکە لەجیاتی کورتەك بەرگێکی ئاودامانی درێژ لەبەردەکەن کە لەئاوریشم دروست کراوە(کەواو سەڵتە)کە ئەمەش لە عەرەبەکانەوە هاتوە. چاکەتێکی لەسەر لەبەردەکرێ کەکورتەو لەقوماشێکی: کە ڕەنگی شین یان قاوەیی یان شیری هەیە. شێوەکە زۆرجیاواز نیە لە(چاکەتی ئیتن ETON) و زۆر کات زرێچن دەکرێ.

لە بۆنەفەرمیەکانیش عەبای عەرەبی لەبەردەکرێ. هەندێجار پیاوێکی پیر دەبینی کە باڵتۆیەکی ئەستوری لە ئاوریشم دروستکراوی لەبەردایە کە ڕەنگی

زەردێکی کاڵە یان پەمەییەو دەگاتە خوار ئەژنۆکان. لە ناوچە شاخاویەکاندا جلوبەرگی ئاغا زۆر لەجلوبەرگی تاکەکانی خێڵەکەی جیاوازنیە. پێویستە باسی ئەو قوڵە درێژو سپیانە بکەین کە کورد بۆ جلو بەرگی دروستدەکەن(مەبەستی فەقیانەیە: و. ك.) زۆر کات عەرەبیش دروستی دەکەن بەڵام بێ زیادەڕۆیی لەنەخشکردنی. زۆرجاریش بۆ درێژیەکەی پرسیارم کردوە، ئاوا وەڵامیان دامەوە کە: بۆیە وادرێژە تاکەسەکە بتوانێ لەپشت ملیدا گرێیبدا، بەمەش دەتوانێ کە قۆڵی تا ئانیشکی هەڵماڵێ، بەمەش دەستەکانی ئازاد دەبن بۆ کارکردنو خواردن و شوشتن و شەڕ، بەپێ ی پێویست، ئەگەر لەپشت ملدا گرێ نەدرێت ئەوا لەقۆڵەوە دەپێچرێت، لەسەرەوەی مەچەکو هەمیشە لەکاتی نوێژکردندا دەکرێنەوە.

ژنان کە دێنە ناوخەڵك هەمیشە جلێکی شینی تۆخیان لەبەردایە، فراوانەو لەناوقەددا بەستراوە،(هیزارێك) لەهەمان ڕەنگ لەسەر دەکەن، تەنیا ئەوانن کە لە ناو ژنانی ڕۆژهەڵاتدا ئەو هیزارە لەسەردەکەن. جگە لەژنی سەرۆکەکان کە هەمیشە سفورن، منداڵان بەخشڵ باریان گران کراوە، جلوبەرگیان ڕەنگێکی کراوەی هەیە تادەگەنە تەمەنی حەوت وهەشت ساڵ ئیدی جل وەك گەوران لەبەردەکەن.

کوردەکان ئەوەندە بەڕێزەوە هەلسوکەوت لەگەڵ ژنەکانیاندا دەکەن کە لەهەموو میللەتە موحەممەدیەکان تێدەپەڕێ. کەس هەوڵی جیاکردنەوەی ژنەکانیان نادا جگە لەشێخەکانیان، ئەونەریتەش لەکاتێکی درەنگتر سەری گرت ئەویش بەهۆی کاریگەری تورکەکان[١٩] ژنان لەهەموو شوێنێك دا وەك پیاوان بەئازادی دەسوڕێنەوە. زانیم کە ژنی موختاری گوندێك دەچێتە دیوەخانیش. وا باوە کەقسەکردنی ژنان لەگەڵ ئەوروپیەکان بەکارێکی نەنگ دادەنرێ، بەڵام ئەوان ئازادن لەگەڵ غەریبانی میللەتەکەی خۆیاندا قسەبکەن. زۆربەی سەرۆکەکان لەژێر کاریگەری ژنەکانیان دان، من پێموایە کە ئەو ژنانە کاریگەریەکی پۆزەتیڤیان هەیە، ڕێگرن لەبەردەم ئەو ڕایە خراپانەی کە ڕەنگە پیاوەکانیان هەیان بێ و ببنە گاڵتەجاڕی ئەو شتە. هەر سەرۆکێك بە(دایکی فلان) بانگی دەکا یان باسی دەکا: (هەرناوێك ئیبعۆمەکەی فلانە) کە ناوی کوڕە گەورەی دێنێ، ژنان هەمیشە

خواردن ئامادە دەکەن و جل دەشۆن. ئـەوان بـەکاری گرانـی ناومـاڵ هەڵدەسـتن، لەکاتێکدا پیاوەکانیان لەکێڵگەدان.

هەندێجار ڕودەدا کە ژنێك ببێتە پێشرەو لەدێدا و ڕەنگە ببێتە سەرۆك هۆزیش، ئەمەش بەتایبەت کە منداڵێکی شیرەخۆرەی هـەبێو سەرپەرشـتیاری ئـەو موڵـك و ماڵەی بـێ کـە لەمێردەکەیـەوە بـۆی بـەجێماوە، هەرچـۆنێك بـێ، دەگمەنـە ژنێـك ئەوپایە وەرگرێ چونکە دەبێتە هۆی دروست بونی کێشە.

منداڵەکان تـا حـەوت سـاڵی لەگـەڵ ژنانـدا دەمێننـەوە دواتـر ڕەگـەڵ باوکیـان دەکەون، پیاوانیش کە میـوانێکی بێگانـە بێـت ئـەوا دەچـنە دیوەخـان و دەسـتی ئەوانە ماچ دەکـەن کەپایـەیان لـەوان بـەرزترە، ئـەوان قـاوە پێـشکەش دەکـەن و زۆرکاری بەسودی دیکەش دەکەن.

ڕێژەی مردنی منداڵان بەرزە. ئیبراهیم ئەو پیاوەی کە بەتەمەنە، باوکی حەڤدە منداڵ بوە، چواردەیان مردون لەو حەفتا ساڵەی تەمەنیشی (١٩) ژنی هێناوە.

ئەو یاسایانەی کە ژن هێنان و تـەلاق ڕێـك دەخـەن هـەمان ئەوانـەن کـە لـەناو هـەموو موحەممەدیـەکان بـاون. لەگـەڵ ئـەوەی کـە هەنـدێ نـەریتی سـەیر هـەن پەیوەندیان بە عورفی عەشایەریەوە هەیە. لەوانەش کە دواتر دێینە سەریان. پیاو بۆی هەیە چوار ژن بێنێ، سەرۆك هۆز گەر بتوانێ ئەوا چوار ژن دێنـێ. تـەلاق دان کارێکی سانایە[٢٠] بەپێی لێکدانەوەی ئەوێ، پیاو هێندەی لەسەرە کـە سـێجار بـە ژنەکەی بڵێت(تۆ تەلاق دراوی) بـەو شـێوەیە هاوسـەرێتی هەڵدەوەشـێتەوە. پیـاو لـەڕۆژی تەلاقدانـەوە تـا سـێ مـانگ بـاری ژنەکـەی پێـشتری لەسـەر شـانە، وەبـۆ ماوەیەکی درێژتر ئەگەر ژنەکە دوگیان بێ[٢١]. ژنان دڵنیاییـەکی باشـیان هەیـە بـۆ تـەلاق لـەڕێ ی مـارەیی دواخـراو کـە لـەکاتی ژن هێنـان بڕیـاری لەسـەر دەدرێ. مەبەستیش لەوە دیاریکردنی بڕە پارەیەکە: بابڵێین(١٠٠) دینار بۆ نمونە .دەدرێتە ژنەکە لەکاتی تەلاقدان. یان ئەگەر پێش ژنەکەی بمرێ.

پیاو بەپێی شـەرعی یـسلام نـاتوانێ وەسـیەت لەسـەر هـەموو ماڵەکـەی خـۆی بکات، بەشێکی کەم نەبێ، بەڵام ئەوی دیکە بەسەر میراتگرەکانیدا دابەش دەکرێ لەگەڵ خزمی نزیك و لەوانەش ژنەکانی بەڕێژەی دیاری کراو. لەکوردستان کە پیاو

دەمرێ برایەکانی، ئەگەر برای هەبێ، ژنەکانی مارە دەکەنەوە. ئەمەش بۆ رێگرتن لەوەی بەشێك لەموڵکو ماڵەکەی بچێتە دەرەوەی خانەوادە. لەکوردستاندا مارەیی دەدرێتە ژن، سەرۆك هۆز رەنگە برە پارەیەك بدا کە خۆی لە(٥٠٠) دینار دەدا بۆئەوەی ژنێکی خانەدان و ئەسڵزادەبێنێ. جگە لەوەی مارەییەکی پێشینە دەداتە باوکی ژنەکەو، جلو بەرگێکی بەنرخیشی بۆ دەکا.

بێ گومان ئەمەش بەپێی پلەو پایەی ژنەکەو زاواکە دەگۆرێ. پیاوەکە یەکجار بۆی هەیە کە ژنەکە ببینێ پێش ئەوەی زەماوەند بکرێ. پارەکەش نزیکترین کەسی عەشیرەتی ژنەکە وەریدەگرێ، باوك، برا، مام.

بۆ ژن هێنان ئاهەنگ رێکدەخرێ و دەبێتە خۆشی و رازانەوەو ماوەکەشی دورودرێژە، ژنان و پیاوان بەشداری لەشایی دەکەن لەسەر ئاوازی دەهۆڵ و زورنا، زورناش ئامێرێکە کەدەنگی لە دەنگی ئامێری مۆسیقای هەمبانە دەچێ(ئامێرێکی فوداری رۆژئاواییە)

ئەگەر کچ خزمێکی نزیکی نێرینەی نەبێ، ئەوا دەتوانێ شوو بەهەر کەسێك بکا. کچێکی ئاواش خۆی دەخاتە بەر رەحمەتی نزیکترین سەرۆك خێزان، ئەویش یان وەك یارمەتیدەرێك لەماڵ کاری پێدەکا یان لەیەکێك لەپیاوانی دەستەو دایەرەکەی خۆی مارە دەکا. بەپێ ی نەریتی عەشایەری کورە مام لەپێشترە بۆ هێنانی کچە مام، لەکاتێکی کە لەهەولێر بوم کارەساتێکی کوشتنی زۆر ناخۆش رویدا، هۆکارەکەش رەتکردنەوەی ئەو مافەبوو، لەبەشی داهاتوو بەفراوانی قسەی لەسەر دەکەم.

کوردەکان لەپارێزگای هەولێر، هەموویان نیشتەجێن، یان نیمچە رەوەندن، بەشی هەرە زۆری ساڵ لەگوندی جێگیردا دەژین. تەنیا دووسێ هۆز نەبێ کە هاوین لەچیاکانی فارسی و زستانان لەدەشتی هەولێر بەسەر دەبەن، ئەو گوندانەی کە باسیشمان کرد ماڵەکانی هەمووی لەقور دروستکراون و، بەشی هەرە بەنرخی ئەوکاریتانەن کە سەربانەکەی رادەگرن.

ئەگەر کوردێك گوندەکەی بەدڵ نەبێ، تەنیا هێندەی بەسە کە سەربانی خانوەکەی تێکداو کاریتەو شەقڵەکانی لەپشتی کەرێك بار بکاو بچێتە شوێنێکی دی، گوندە چۆڵەکان لەو لاو لەم لای ڕێگاکاندا دەبینرێن ئەگەر گەشتیار سەرەنج بدا ئەوا نیشتەجێیەکی دیکە لەدوری میلێك دەبینێ. گوندەکەی پێشتر لەسەر ڕێڕەوی سەربازانی تورك بوە بۆیە ئێستا بەردڵی ئەو نیە، خەڵکەکەی گواستویانەتەوە شوێنێکی دیکە.

ئەگەر سەیری شێوازەکانیان بکەین ئەوا ئەو خانوە قوڕانە زۆر سادەن، لای چینە هەژارەکە لەیەك ژوور پێك هاتوەو خۆی و ژن و منداڵەکانی گامێش و مریشکەکانیش تێیدا دەخەون و داری سوتانیشی تێدا هەمبار دەکا کەرەو پەنیری تێدا هەڵدەگرێ و چێشتیشی تێدا لێدەنێن.

لەگەڵ ئەو هەموو شتانەشدا، تەنیا دیوارەکانی نەبێ کە بەدوکەڵ ڕەشداگەڕاون،ئیدی هەمووشتێك پاك و خاوێنە، ڕەنگە جوتیار کە لەچینێکی بەتواناترە لەدوو ژوور یان سێی هەبێ، کەیەکێکیان تەویڵەی ئاژەڵەکانیەتی. لەکاتێکدا کە سەرۆك یان موختاری گوند زیاد لەوە ماڵێکی ڕێکی هەیە بۆ ژنەکانی، دیوەخانێك کە سەربەخۆیەو میواندارى برادەرەکانی و ڕێبوارانی تێدا دەکا. ئەوی ئەو بنکەیەیە کە لە کوردستاندا ژیانی تێدا دەگەڕێ.

بەرلەوەی باسی ئەو دامەزراوە گرنگە بکەم، بەپێویستی دەزانم کەئەوەی وەبیربێنمەوە کوردەکان درێژایی ساڵ لە گوندەکانیان بەسەر نابەن. هەرهێندەی بەهار بێ، ڕەشماڵی دێنێتە دەرێو لەگەڵ خێزان و ڕانەکەی بەرەو نزیکترین لەوەڕگا دەچێو دوومانگ لەجوانترین مانگەکانی ساڵ بەسەر دەبا. ئایا ئەوە خوێنی گەرمە کەلە دەمارەکانی خوڕە دەکا لەگەڵ هاتنی بەهار، یان هەستی جوانیە کە بانگی دەکا تا بەسەر ڕازانەوەی سروشتدا ڕابگاو پڕ لەچالاکی دەکاو ئارەزوی هەوایەکی پاك و خاوێن بکا؟ ئەمەش ناچاری بارکردنی دەکا بەڵام من وەڵامێکم بۆئەوە پێنیە. هەموو ئەوەی کەدەیزانم.... کاتێك کەلە پیرە پیاوێکی

کوردم پرسی هۆی ئەمەچیە؟ وەهای وەڵام دامەوە کە یەکەم لەبەر ئەسپێیەو دووەمیان لەبەر ئەو هەراوزەنایەی کە مانگاکان بەرپای دەکەن بەهۆی خواردنی گیای تەڕ.

کەم دیمەن هەیە لەدنیادا هێندەی دیمەنی ڕەشماڵەکانی کوردان جوانبێ لەناو گیاوگۆڵ و گوڵ و گوڵزاردا و دیتنی کۆمەڵێك لەئاغاکانی کوردان، کە لەسەرەتای لاوین و جوانترین جلوبەرگیان لەبەر کردوە، خوێنی گەرم لەدەمارەکانیاندا دەگەڕێو هەڵچونی سۆزێك دروستدەکا، ئەوان یان لەدورەوە وەستاون یان لەسەر پشتی ئەسپە سەرکێشەکانیان کە ئالیکی باشیان دراوە بەهەوراز و لێژەکاندا ڕمبازی دەکەن.

کوردەکان لەدەشتی هەولێر لە ئایاردا دەگەڕێنەوە گوند و لەسەر ماڵەکەی کەپرێك لە لقو گەڵای دار دروستدەکەن تا ژن و منداڵەکەی تێدا بخەون. لەناوچەی کۆیەو خواروی ڕەواندوز خەڵکەکە گوندی نوێ دروستدەکەن تا گەرمای هاوین دێت، هەوا کە هەڵدەکا هەرچۆنێبێ کەبە کوخە قامیشەکاندا تێدەپەڕێ فێنك دەبێت، ئەگەر دیواری ڕۆژئاوای ئاو ڕشێن بکرێ ئەوا فێنکتریش دەبێ. ئەم کەپرانەش لەشەقڵاوەو باخەکانی میوە دەبینرێن.

هۆزە گەورەکانی ناوچەی ڕانیەو هەندێ کۆمەڵی بچوکی ناوچەی ڕەواندوز بەهاوین کۆچ بۆ ناوچە بەرزەکان دەکەن و لەدوای خۆیان هەندێ لەپیاوان جێدێڵن تا سەرپەرشتی ماڵ و کشتوکاڵەکانیان بکەن.

لێرە جیاوازیەکی گەورە لەنێوان کوردەکان و عارەبەکان هەیە، عەرەبەکان لەزۆربەی کاتدا بەخوایشتی خۆیان بەڕەوەند دادەنرێن و ناکرێ ناچاری نیشتەجێبون بکرێن، کەچی کوردەکان گەلێکی شوانکارەن و یان ناچارن یان وەك نەریتێك ڕەوەندن و ئامادەیی نیشتەجێبونیان تێدایە کاتێك یەکێکیان بۆی دەرکەوێ کە نیشتەجێبون باشترە.

ئێستا پەنا دەبەمە بەر حەوسەڵەی خوێنەر بۆ وەسفکردنی دیوەخان بەقوڵی. سەدان کاتژمێرم لەدیوەخانی سەرۆکەکان یاموختاری گوندەکان بەسەر بردوە لەوکاتەی لەکوردستان بوم، لەوێ کەم شتێك لەبارەی کوردەکان و زمانەکەیان فێربوم. هەموو ئەرکە مەترسیدارەکانم لەوێ جێبەجێکردن. هەڵسوکەوتی هەر سەرۆك هۆزێك تا رادەیەکی زۆر بەندە بە دیوەخانەکەیەوە، هەرچەند گوندی زۆرترین زیاتر مافی ئەوەی هەیە کە پێی بڵێن(پیاو). دیوەخان لەسەر بەرزترین شوێنی گوند دروست دەکرێ و لەدەشتی هەولێر لەسەر یەکێك گردەکانی کۆنی ئاشوریەکان دروست دەکرێ. لەژورێك تا سێ ژوور پێك دێ بەپێی پایەو دەوڵەمەندی سەرۆك، نمونەیەك دەهێنمەوە، دیوەخانی (احمد پاشا) کە هەرە دەوڵەمەندی عەشیرەتی دزەیی یەو خاوەن زۆرترین گوند نیە. وا دروستکراوە کەسێ لای چوارگۆشەیەك دروستکاو، لەسەر گردێکی گەورە بنیاتنراو. دەرگاکەی روی لەباکورە، لای رۆژهەڵاتی ژورێکی فراوانە کە روبەرەکەی(٤٥) پێ بە (١٥) پێ یەو لە زستاندا وەك ماڵ بەکاردێ. لە هاوینیشدا لەبەشی سەرەکیدا پێشوازی لەمیوانان دەکرێو لەسەر شێوەی بەر هەیوانێکە؛ لای باشوری کە داخراوە هەندێ پەنجەرەی بچوکی تێدایە کە بای پێدا دێت و دەچێ و دەتوانرێ دابخرێ ئەگەر بایەکە تۆز و خۆڵی هەبوو. لای رۆئاوای چەند ژورێکە کەکەرەستەی چایەو فەرشی تێدا هەڵدەگیرێت، خزمەتکارەکان لەوێ دادەنیشن و چەقەچەق دەکەن. دەرگایەك لەوێوە هەیە کە دەگاتە دالآنی ژنان، کە بەدرێژکراوەی لای رۆژئاوا دادەنرێ. ئەم هێلکاریەی دێ مەبەستەکەم روندەکاتەوە.

◆




## دیوەخـــــان

بــەربلاْوترین جـۆری دیوەخـان ئەوەیەکـە لـەدوژورو بانیژەیـەك پێکـدیّ. لەهاویندا سەکۆیەکی بەرز لەدەرەوە لە قوڕ دروست دەکریّ. (واتە لەقوڕو لە کای تێکەڵکراو)، ئەمەش سودی لێوەرنـاگیرێ تـەنیا ئـەو کاتـە نـەبیّ کـە خـۆر بـەرەو ئاوابونە ئەگەر دارنەبیّ بۆ دروست کردنی چارداغێك، چـارداغ کەپرێکـە کـە لـەلقی دارێکی درخت بەگەلاْکانیوە دروست دەکرێو چوار ستونی هەیـە بـەزۆریش لەسـەر حەوزی ئاو دەبینریّ کە ئاوی دێتەناو. کە پەناگەیەکی فێنکە بۆ گەرمای هاوین.

هـەمووديوەخانێك مزگـەوتێکی هەیـە کـە بەشـێکە لـیّ ی، لـە هەنـدیّ گونـد دیوەخـان دەبێتـە مزگـەوت وبەویـشەوە نـاودەنریّ. کـەس رێگـری ئـەوە نیـە ئەورووپیەك لەدیوەخاندا بژی. کـاتێکیش کـە خـەڵکەکـە بـۆ نوێـژکردن کۆدەبنـەوە پێویست ناکائەو خۆی بشڵەژێنیّ بەوەی کەلەناویاندایە.

لەزسـتـاندا ژورەکـە بـە ئـاگردانێکی کراوەگـەرم دەکرێتـەوە کەدوکەڵەکـەی لەدوکەلکێشی بنمیچەوە دەچێتەدەرەوە(ڕەنگە بەپیّ ی بـارودۆخ کـراوەش نـەبیّ دوکـەڵ نەچـێتە دەرەوە) زۆرکـات بـەهۆی ئـەو دوکەلـە ئاولەچـاوم دێـت. بـەلاْم کوردەکان وەك دەردەکەویّ زۆر گویّ ی پێنادەن. هەمیشە بەهۆی ئـەو دوکەڵـەی کەبنمیچ و دیوارەکـانی ڕش کـردوە دەتـوانی تەمـەنی بیناکـە دیـاری بکـەی، ئـەو

سوتەمەنیەی کە بەگشتی بەکاردێت(تەپاڵە)ی وشکە کە لە پاشەڕۆی مەڕوبزن دروستدەکرێ و لەسەرخۆ دەسوتێ و زۆرجار لەگەڵیدا پەنابۆ دارو لقەداردەبەن، ئەگەر بیانەوێ بەپەلە ژورەکە گەرمکەنەوە ئەوا دڕك ودالّ و توتڕك بەکاردێنن بۆ ئاگر خۆشکردن.

دیوەخان بێ بەرامبەر دروستدەکرێ. ئەمە یەکێك لەئەرکەکانی سەر شانی لادێیەکانە بەرامبەر سەرۆکیان یان موختاریان. ئەگەر سەرۆك هەژار یان پایە نزم بێت و مێوانیش هاتن ئەوا کەسێك دەنێرێتە لای(سمایل)یان(حەمەد)ئەم دوناوە وەك ناوی(تووم)و(هاری)لای خۆمانن —داوای پاوەندێك کەرەو دومریشك و دووپاوەند برنج دەکا.

لەڕاستیدا دیوەخان لەزۆرکاتدا یانەیەکە بۆ گوند زیاتر لەوەی کەموڵکی تاکەکەسی موختاربێ، تیایدا هەموو ئێوارەیەك کۆڕی پێشڕەوانی گوندو پیرەکان دەگیرێ، بۆباری کەش و هەواو بەروبوم و دواکێشەکان. لای سەرۆکە مەزنەکان لەدیوەخان بەدرێژایی ڕۆژ کوڕێك دەبەسترێ و هاورێ و کەسوکاری نەخشەی کوشتنی دوژمنان و خەڵەتاندنی حکومەت دادەنێن.

میوان دۆستی لەباشترین ئاکارەکانی سروشتی مرۆڤی کوردە. ئەم کارەش ئاینەکەیان پێی خۆشە، ئەم نەریتەش لەنێوان میللەتە موحەممەدیەکانی دیکەش بەربڵاوە. بەڵام کوردەکان بەرەو پێشیان بردوەو بوەتە هونەرێکی جوان. سەرۆك، ئەگەر بەماڵەکەیدا بڕۆی و نەوەستی بۆخواردنەوەی پیاڵە چایەك ئەوە بە نەنگیەکی گەورە دادەنێ، زۆر کات بەناچاری وام کردوە.

عەرەبیش لەوەدا شێلگیرن ئەو قسەکەرێکی باشتریشە بەڵام وەك ئەوان میوانەکەی بەخۆشیەوە بەڕێ ناکا.

بۆ ئەوەی ئەوبابەتە درێژە باش باس بکەم، دەستی خوێنەر دەگرم بۆ سەردانی (ئیبراهیم ئاغا) سەرۆکی دزەیی‌یەکانی مەخمورە. ئەوا لەناکاو گەیشتین. ئەوا برایماغای پیرە دێتە دەرەوەو بەدەنگێکی بڵند پێشوازیمان لێدەکاو دەڵێ(بەخێرهاتی) وەڵامی ئێمەش ئەوەیە(سەلامەتبی)، دواتر پرسیار دەربارەی تەندروستی خۆی و کەسو کاری دەست پێ دەکا. لەهەمانکاتدا فەرمان بەخزمەتکاران دەدا ڕایەخو بالیفان بینن(بالیف: سەرین)دواتر بەرەو ژوری

سەرەکی میوانان دەمانبا. ژورەکە چۆڵو پاکەو پەڵەو خەوشێکی تیانیە. لەکاتێکدا کە ئێمە لە چاوەڕوانیداین ئەو جگەرەمان پێشکەش دەکا.

جگەرەی کوردەکان گەیە پەنجەیەك یان زیاتر لە جگەرەی ئێمە درێژترە، درێژیەکەشی بریتیە لە مۆدنەو توتنەوشکەکەی ئەمەش، باشترین جۆری توتنی کوردییە. بەدرێژایی ڕۆژ ناوە ناوە جگەرەمان پێشکەش دەکرێ. بە دەگمەن نەبێ کوردەکان لەجگەرەکێشان ناوەستن لەگەڵ ئەوکاتەی کە نان دەخۆن. کیسە توتنێکی بە بەردەوام پێیەو بە پشتێنیەوە کردوە قوتوێکی پەڕەجگەرەش. تا ئێستاش هەندێ لە بەتەمەنەکان(ئەستێ و بەردەستێ) بەکاردێنن بۆ جگەرەداگیرسان، بەلأم ئەوانی دی هەموویان (چەرخ) بەکاردێنن کە پێموایە لەیابانەوە هاتوە. زۆربەی جوتیاران بە(سەبیل) توتن دەکێشن کە کورتەو لە قوڕێکی سورکراوە دروستکراوە لەکاتێکدا کە ئاغاکان سەبیلێکی لە دار دروستکراو و دەسکدرێژ بەکاردێنن.(حەماغا)ی کۆیە کە پیرەمێردێکی پیربوو سەبیلێکی هەبوو دوپێ درێژ بوو.

لە کوردستاندا(نێرگەلە) کێشان نیە چونکە خەڵکەکەی بەگشتی لەبەر هەر هۆیەك بێ نێرگەلە بەشورەیی دادەنێن. بەزۆری من(سیکار)م پێشکەش بە سەرۆکە کوردەکان دەکرد، ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی، بەلأم تێبینی ئەوەم دەکرد کە کاتێك سەندوقێك (سیکار)م پێشکەش دەکردن ئەوان بۆ میوانە ئەوروپیەکانیان هەڵدەگرت، ئەوان پێیانوایە توتنی ئێمە ئەگەر بەسەبیل بکێشرێ توند نیە.

بەخێرایی ڕایەخ و سەرینیان هێنا لە بن دیوار و لای سەرەوەی ژورەکە ڕاخران. وەك چۆن لە لای سەرەوە مافوری تایبەت بۆ ئێمە ڕاخران. ئێمەش پێڵاوەکانمان داکەند و بەچوارمشقی دانیشتین. لە کاتێکدا کە سەردانی سەرۆکێکی کورد دەکەیت سێ شتی بنچینەیی هەن نابێ لەبیر کرێن:- یەکەمیان نابێ لەبەرامبەر کەس پێت درێژکەی، دووەمیان بەدەستی چەپ نان ناخۆی، سێیەمیان یاری لەگەڵ هیچ سەگێك نەکەی، ئەگەر ئەو سێ ڕێوشوێنەت بەجێگەیاند، ئەوە هەڵسوکەوتێکی ڕێکە و هەستی خانەخوێکەت بریندار ناکا. کە سەرینەکان داندران

یەکسەر ژورەکە ئاو ڕشێن کرا تا بەپاکی و فێنکی بمێنێتەوە، ئەگەر کەش و هەوا گەرم بوو ئەوا پارێزگاری لە شێ ی ژورەکە دەکەن.

ئێستاش کات بەرەو نیوەڕۆ دەڕوا، یەکەم شت کە پێویستە بیکەین ئەوەیە دەبێ واله خانەخۆی بکەین هەستبکا کە حەزمان لەخواردنێکی زۆرنیە، ئەگەر نا تاسەعات سێ ی دوای نیوەڕۆ خواردن نابێ. زۆر جار توشی ئەم هەڵویستانە بوم: جارێکیان گەیشتمە گوندێك، بێ ئەوەی ئاگام لێبێ سەرۆکەکە فەرمانی سەربڕینی کاوڕێکی دابوو، دوای نیو سەعات ڕوخسەتم خواست کە بڕۆم، خانەخوێیەکەم وەها وەڵامی دامەوە: (نابێ بڕۆی، کاوڕێکم سەربڕیوە و مەسرەفی زۆرم کردوە، نابێ وابکەی کە ئەمە هەموی بەفیڕۆ بڕوات) بۆیە ناچاربوم دوسێ سەعاتی دیکە چاوەڕێبکەم تا خواردن ئامادەدەبێ، ئیبراهیم ئاغا زۆر ناڕازی دەبێ گەر بڕۆین، بەڵام ئەگەر بەڵێنی ئەوە بدەین کە بۆ شێوی ئێواری دەمێنینەوە، ئەوا ڕازی دەبێ خواردنێکی سوکمان بۆ بێنێ.

لەو کاتەدا، ئەگەر لو میوانی سەرۆکێکی بچوك بین ئەوا سەرانی گوند هەموو دێن لەبن دیواری ژورەوە دادەنیشن، گوێ بۆ ئەو قسانە هەڵدەخەن کە ئێمە دەیانکەین. ئەوان زۆر وشکن و لایەنی بێدەنگی دەگرن، وەك ئەوەی باڵندەیەك لەسەر سەریان نیشتبێتەوە، هیچ بیرۆکەیەکیان نیە بۆ گفتوگۆ بەکێشیان بکا[٢٤].

بەشێوەیەکی گشتیش شتێکی وام نەبوو کەقسەیان بۆ بکەم، کاتێکی زۆرم لەپرسیارکردن دەربارەی زمان و نەریت و مێژوی ڕابردویان بەسەر دەبرد، لەهەمانکاتدا منداڵەکان لەبەر پەنجەرە کۆدەبونەوە و سەیری ئێمەیان دەکرد.

هەرچۆنێك بێ. لای برایماغا وانەبوو لەگەنجێك یان دوگەنجت زیاتر نەدەبینی، کە خزمی خۆی بون، لەمەودایەکی دور و بەڕێزەوە ڕاوەستابون و چاودێری ئێمەیان دەکرد و جگەرەی نەرمیان پێشکەش دەکردین دوای ئەوەی کە لەدەمی خۆیاندا دایاندەگیرساند، بەر لەوەی کە ئێمە لە جگەرەکانمان ببینەوە. ئەمە جگە لەچەند خزمەتکارێك کە خەریکی ئامادەکردنی قاوەبون.

چا لە سوچێکی دیکەی ژورەکە بوو. خانەخوێکەمان پیاوێکی پیری خوێندەوارە و قسەی پێکدادەدا، بۆ ئەوەی بەگفتوگۆ دڵخۆشمان بکا(قسەکردن بەشێکە لە میوانداری کردن) ئەو ئاوا بەردەوام دەبێ تا قاوە دێت، قاوەی تورکی

شیرینکراو بە شەکر لەناو فنجان و فنجانەکانیش لەسەر سینیەك. خزمەکانی خانەخوێ لەسەر سینیەکە هەڵیاندەگرت کە خزمەتکارێك لە پشتەوان لەدەستیدابوو، یەکێك لەوان بەدەستی ڕاست قاوەکەی پێشکەشی ئێمەی دەکرد و لەکاتێکدا کە دەستی چەپی وەك ڕەمزی ڕێزلێنان و گەورەیی لەسەر دڵی دادەنا.

من بۆ خۆم قاوەی عارەبی تاڵم پێخۆشترە، بەزۆریش لای کوردەکان هەیە. تۆزێکی لە بنی فنجانێکی بێ قوڵپ پێشکەش دەکرێ، زۆرجار بەهێل تامی خۆشدەکرێ. بۆت هەیە فرێك یا دوفر بخۆیتەوە، ئەمجۆرە قاوەیە زۆر دڵکەرەوەیە دوای خواردنەوەی برێکی زۆری چای شیرین کە مرۆڤ ناچاری خواردنەوەیەتی.

(هەر هێندەی لە خواردنەوەی قاوەکە تەواو بوین، چای ئامادەبوو، کورد زۆر چا خۆرەوەن و زێدەڕۆیی تێدا دەکەن، هەر کە میوانێك دێت(سەماوەر دا دەخرێ) [٢٥] لەگەڵ پیاڵەکان. ئەگەر بۆ سەفەرێکیش بچن و زۆریان پێبچێ ئەوا لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، سەماوەر لە روسیا یان لە فارس دروستدەکرێ، لە ناوەوە بۆریەکی لولەیی تێدایە لەسەرەوە بۆ خوارەوە درێژدەبێتەوە، پارچە پۆڵۆ یان خەڵوزی تێدەکرێ، لە سەرەوەش دوکەڵێکیشی هەیە تا دوکەڵ و گەرمیەکە بباتەدەرەوە چایچی لەلای خوارەوە ڕا فوی لێدەکا. هەرکە ئاوەکە گەرم بوو قۆریەکە(چاپەست) دەشوا و پیاڵەکانیش دەشوا، هەرکە ئاوەکە تەواو کوڵا چایە خەستەکە لە قۆری دەکا و دەیخاتە سەر سەماوەرەکە، دوای ئەوەی کە سەری دوکەڵکێشەکەی لادەدا، پیاڵەی چایەکان نزیکەی سێ ئینج درێژن و نیو تیرەکەی ئینجێك و تۆزێکە لە سەرەوە و لەبنەوە ڕا و لە ناوەڕاستەوە تەسك دەبێتەوە و چای تێدا پێشکەش دەکەن کە دەخرێنە سەر سینیەکی بچوك و کەوچکی تەنەکەی بچوکی لەگەڵدایە، چایچی هێندەی دوکڵۆ شەکری تێدەکا، دوایی کە مێك چای تێدەکا و پڕ لە ئاوی دەکا. هەرگیز شیر لەگەڵ چادا تێکەڵ ناکەن، چاهەمیشە لە کوڵاندایە و لەسەر گەدەدا زۆر قورسە، خواردنەوەی بێ شەکر ڕێی تێناچێ. دەبێ دو یا سێ چا بخۆینەوە، لەهەموو جارێکیش پیاڵەکان جوان دەشورێن پێش ئەوەی جارێکیدی چای تێبکرێ.

هەرکە لەچا خواردنەوە بوینەوە نانی نیوەڕۆ دێت کەلە نانێکی تەنك(نانی تیری) (نانی ساج) و هەندێ نانی تر کە ئەستورترە و(کەرە) نقیشکی پێداکراوە(مەبەستی ناسکە نانە)(و.ك) و لەگەڵ قاپێك گۆشتی کاوڕی کوڵاو. لەگەڵ قاپێك ماست و میوەی ئەو وەرزەو کۆتکێك ماستاو چەقۆو چەتاڵ دانانرێ بەڵکو تەنیا کەوچك هەیە، بۆ ئەوکەسانەش کە ناتوانن بەدەست نان بخۆن باشترین شێواز بۆ خواردنی گۆشت و ماست ئەوەیەکە بە پارچە نانی بچوك هەڵی بگری و بیخۆی.

ئەم قسەیە دەمان باتەوە سەر ماست: کە خواردنێکی خۆشی لای دڵی کوردەکانە، شیری تازە دۆشراو چ هی بزن یان مەڕ یان گامێش بێ، دەکولێنرێ تا دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو دواتر تێکەڵ بە ماستێکی ترش دەکرێ(هەوێن) ئەمەش ماستی لێ دروست دەبێ، کە زۆر ترشە بەلآم ئەگەر نوێ بێ چەورو بەتامە، کە لەگەڵ ئاودا تێکەڵی دەکەن ماستاوی لێ دروستدەبێ، کە خۆشترین خواردنەوەیە لای کوردان. هیچ شتێك لەوە دەرون فێنکتر ناکاتەوە هێندی جامە ماستاوێك کە پارچە بەفرێکی تێدابێ، کەمیوانێك دەگاتە گوند لەوەرزی گەرمادا ئەوا بە ماستاو پێشوازی لێدەکرێ، کاتێ ماندو وتینو دەگاتە گوند و بەکەوچکێکی(ئەسکوێ) فراوانی لە دار دروستکراو ماستاوەکە دەخواتەوە. ئەو ماستەی کە دەمێنێتەوە و ناخورێ دەکرێتە مەشکەوە و بەسێپێکەوە هەڵدەواسرێ و دەهەژێنرێ تا دەبێتەکەرەو دۆ، دۆ خواردنەوەیەکی بە تامی نایابە بەلآم کوردە خاوەن پلەو پایەکان پێشکەش ئەو میوانانەی ناکەن کە ڕێزیان لێدەگرن. کەرەش بە شێوە خاوەکەی نا خورێ بەڵکو زنجیرەیەك کوڵانی بۆ دەکەن تا دەبێتە ڕۆن، کە لە زمانی هیندی پێ ی دەڵێن (گی: Ghi) لە چێشتلێنان بە کاردەهێنرێ.

پێشئەوەی دەست بە خواردن بکەین یەك لەخزمەتکارەکان مەسینەو دەستشۆرێك دێنێ لەگەڵ پەشتەماڵێك، دواتر ئاو بەدەستی ڕاستی هەر یەکێکماندا دەکا، دوای ئەوەی نان دەخورێ دوبارەدێتەوە بەلآم بە سابونێکەوە، هەر یەك دەستەکانی بەسابون دەشوا، ئیبراهیم ئاغا لەگەڵ ئێمەدا نان ناخوا، چونکە ئەو پێشتر نانی خواردوە. لە دوای نیوەڕۆ لە دیوەخان دادەنیشین و باس لەو کاروبارانە دەکەین پەیوەندی پێمانەوە هەیە. ئەمەش ناچارمان دەکا کە

ژمارەیەکی زۆر پیاڵە چا بخۆینەوە و چەند فنجانێك قاوەش، لەگەڵ چەند جگەرەیەك، یان دەبێ سەرخەوێك بشکێنین، دواتر بەناو گوندا بگەڕێین، پێش ئەوەی خۆر زەرد داگەڕێ...... ئێمە ڕێ ی گەڕانەوەمان گرتۆتەبەر، هەرکە مەلا بانگیدا ئیبراهیم ئاغا دەستنوێژ دەگرێ و لەنزیك ئێمەوە بەرماڵ بۆ نوێژ ڕادەخا، هەر کە لە نوێژ کردن بووەوە(شێو) نانی ئێواریٚ دێ، لەسەر سینیەکی گەورە دانراوە کە تیرەکەی (٥) پێ دەبێ، لەسەر تەختێکی نەوی دادەنرێ و هەموو لەدەوری کۆدەبینەوە، ئیبراهیم ئاغاش لەگەڵماندا یان هەرمیوانێکی گرنگی دیکە.

ژەمی یەکەم یان گوشتێکی کوتراوە لە ناو قاپێکی گەورە یان ئەگەر وەرزی تایبەت بێ، بەرخێکی کوڵاو کە پڕ لەبرنج و کشمیش و بەهارات کراوە، دواتر قاپێکی گەورە دێت کە کاکڵە گوێزی تێکەڵ بەهەنگوینی تێدایە، ئەو خواردنانە تەنیا سەرەتایە لەو ژەمەدا، هاوشێوەی ئەوەش لە ماڵی سەرۆکێکی پایە نزمتردا پێشکەش ناکرێ. خواردنی ئاسایی قاپێك یان دوقاپ برنجی بە ڕۆنە(پلاو) کە پارچە گۆشت و کشمیشی لە سەرە لەگەڵ هەندێ قاپی بچوکتر کە گۆشت و سەوزە و هێلکەوڕۆنی بە ئارد و کێکی شیرین و ماست و میوە چەندیش هەبێ دەخرێنە سەر سینیەك و بەیەکجار دەهێنرێن ئێمەش چیمان پێخۆشبوو ئەوە دەخۆین. ڕەنگە ئیبراهیم ئاغا کام پارچە گۆشتی چەورە هەڵی گرێ و لەسەر ئەو نانەی دانێ کە لەبەردەمی ئێمەدایە. برنجیش بە دەست دەخۆین، ئەمەش کارێکی ئاسانە، پڕ بەدەستت برنج هەڵدەگری و دەیکوشی تا وەك تۆپێکی بچوکی لێدێ و دوایی پەنجەی دۆشاو مژە دەخەیە پشتی و بەسوکی پاڵیپێوە دەنێ ی تا بچێتە نێو دەمت. ئێمە هەموو شتێك بە ماستاو(دەشۆینەوە) کە لە ناو کۆتکێك لە خوارەوەی مێزەکە دانراوە چونکە لەسەرەوە جێی نابێتەوە.

دوای نان خواردن دادەنیشین: جگەرە دەکێشین و چاو قاوە دەخۆینەوە، تا خانەخوێ پرسیاری ئەوەمان لێدەکا کە حەزمان لەخەوتنە؟ ئەوسا خۆمان بۆ خەوتن ئامادەدەکەین خەڵکەکە لێفەو نوێنی نایاب دەهێنن، ئەوسا لەسەر مافورەکان ڕادەکشێین، چونکە ئەسپێ لە مەخمور زۆر کەمە ئیدی بەخێرایی دەچینە دەریای خەوەوە. ئیبراهیم ئاغا پیرێکی زیرەك و دنیا دیدەیە. هەر زوو بەجیمان دێڵێ، لە هەندێ دیوەخاندا سەرۆك و پیاو ماقوڵان بەدەوری ئاگرێکی

خۆش حەڵقە دەگرن لەدوری چەند پێیەك لە ئێمە دەربارەی ئێمە قسەدەکەن کە مێشك بە تەواوی لەقسەکانیان ناگاو نازانێ چی دەڵێن.

هەر کە بەیانی هات لەخەو هەڵدەستین، کە خۆمان ئامادەکرد(فراوین) نانی بەیانی دێت کە پێکهاتوە لە شیری گەرم و نان و ماست و پەنیر. شیرەکە لە کوپی گەورەی نەخشاو بە رستەی(ئاشقم بە) (loveme) و وشەی (یادگاری) (Souvenir) و (لە ئالمان دروست کراوە)ی لە قولاّیەکەی نوسراوە. ڕەنگە بازاڕی ئەو کوپانە دوای بەرپابونی شەڕ لە وڵاتی میزۆپۆتامیا پەیدا بوبێ وەکچۆن لە هەموو ناوچە دورەکاندا هەبون، هەندێ جار تەپڵەکی جگەرەم بینیوە(Ashtrays) کە وێنەی شاو شاژنی ئێمەی کاتی تاج لە سەرنانی لەسەر نەخشابوو.

دوای نانخواردن داوای مەرەخسمان لە خانەخوێ کرد، بەلاّم ڕازی نابێ و دەڵێ نانی نیوەڕۆ ئامادەدەکەین، دواتر بەهەزار حاڵ ڕازی دەبێ. بۆ دەربڕینی(بەخێر هاتی) ئەو، ئێمە دەڵێین(بە دوعا) کە دوعاکردنی ئێمە بۆ ئەو لەخۆ دەگرێ بۆ تەندروستی و بەختی باش.

ئەوەی وتمان ئەو شتەیە کە هەموو جارێك لەسەردانی سەرۆکێکی کورددا ڕودەدا.

لە ڕاستیدا ژەمی خواردنی کوردەکان دو ژەمە مەبەستم نیوەڕۆیە کە خەڵکەکە بەرلە بانگی نیوەڕۆ دەیخۆن و(شێو ) نانی ئێواریێ کە ڕۆژ تەواو دەبێ و خۆربەرەو ئاوابون دەچێ و وندەبێ. جگە لەوە کوردەکان بۆ فراوین چی هەبێ ئەوە دەخۆن، پیاڵە چایەك و نان، خواردنی سەرەکی جوتیاران نانی گەنم و مێوژ و. ماست و ساوارە، ساوار گەنمێکی هاڕدراوە، ساوار وەك برنج پێشکەش دەکرێ، ئەو جێگرەوەیەکی نایابی برنجە، لەگەڵ ئەوەی کە بۆ مێوانی خۆشەویست دادەنرێ، بەلاّم زۆر کەم گۆشتی لەگەڵ دەخۆن. کوردەکان لەلێنانی سەوزە هونەرمەندن، لە ناوچە گردەکاندا دۆشاو و هەنگوین لای پیاوی پایەدار جێگای هەموشتێك دەگرێتەوە، کەچی خواردنی سەرەکی لە ناوچە شاخاویە دورەکان بەڕوە، بەڕو دەکوترێ و دەکرێتە ئارد نانێکی ڕەشی لێ دروست دەکرێ بەلاّم

نایابە. خواردنــەوە کهولیــەکان بونیــان نیــە، ئــەوەی کــە بــاوبێ ئــاو و ماســتاوە و قاوەیە. خواردنەوەی خۆشی لای دڵی کوردەکانیش لە ئاوی ترێ دروست دەکرێ.

ئەسپ یەکەمین گیانداری ماڵیەلای کوردەکــان و لــە لەهــەموانیش شــکۆدارترە. عەشیرەتەکانی دەشتی هەولێر هەندێ ئەسپی نایابیــان هەیــە کــە لــە ڕەســەنی عەرەبین. لە ناوچە گردۆڵــەکان ئەســپەکان بــچوکتر و تونــدترن و باشــترن بــۆ ئــەو ڕێگــە ســەختانەی کــە دەبــێ بیــبڕن لــە هــەو ڕاز و لێژەکانــدا. لەوانەیــە ئاژەڵێــك، بەتایبەتی ماین موڵکی چەند کەسێك بێ، دوکەس تا چوار، لەو حاڵەتــەدا هەریــەك لەوانە جوانوێکی بەردەکــەوێ، یــەك لــە دوای یــەك. ئەســپەکان بەدەگمــەن نــەبێ ناخەسێنرێن، ناتوانی ئەسپێکی ڕەسەن بەکــەمتر لــە(٧٠) جونەیــە بکڕیــت، مــاینی ڕەسەن(جوانە ماین) [٢٦] لە دوسەد جونەیە بەســەرەوەیە. ئەســپی ســەرۆك جــوان خزمەتدەکرێ، ئالیکی کاو جۆی دەدرێتــێ، لــە بــەهاردا بەڕەڵڵادەکرێتــە نــاو گیــاو گۆڵ. کورد لــە پاککردنــەوەی ئەســپدا شــتێکی کــەم دەزانــن، لــە کــاتی ســواربون هەرگیز غاری پینادەن، ئەو ماوەی ئەسپ دەیــبڕێ دەکرێتــە پێوانــە و بەحیــسابی کاتژمێر دادەنرێ. ئەو ئاغایانەی کــە لــە تــافی لاویــدان زۆر ئارەزویانــە کــە لەســەر پشتی ئەسپەکانیان کەشوفش بکەن و خۆڕانێن و ئازایەتی و ســوار چــاکی خۆیــان دەرخەن، بەڵام سوارچاکی باش نین. زینی ئەسپیش باش ئاخنراوە و لــە پێشەوە لە سامۆتەکەیەوە خوارکراوەتەوە و تیژە، من پێم وایە کە مرۆڤ زۆرماندو دەکا و ناتوانی غاری پێبیدەی. ڕکێبیش تەسکەو بنکەیــەکی فراوانــی گــەورەی هەیــە کــە جێ ی پێشەوەی پێ ی تیدا دەبێتەوە، لغاو لە هەموو ولآتی میزۆپۆتامیادا باوە.

خێڵــەکانی نیــشتەجێ ی بــەرزایی بەتایبــەتی ڕەوەنــدەکان وەك(هــەرکی) ئــەو ئەسپانە بەخێو دەکەن کە بچوك و بەهێزن، ئەوانە لە بارهەڵگرتندا بەکاردێن.

ئێستریش پایەی خۆی هەیــە، دەتــوانی جــۆری زۆر باشــی ببینــی. لــە دەشــتی هەولێریشدا، تاکە ئاژەڵێکە کە بۆ جوتکردن بەکاردێت، بۆ بارلێدانیش بەکاردێت و باشــترین جۆریــشیان بــۆ ســولاربون بــەکاردێت. کەســانی خــاوەن پایــەی شــار و پیرەکــان ئــەو ئاژەڵــە هێمنــەیان لــە ئەســپێکی خــورت پێباشــترە. لەناوچــە گردەکانیشدا زیــتر پــشت بــەو ئاژەڵــە دەبەســتن، هێــسترێکی باشــی جــوتکردنیش نزیکەی ٤٠ جونیە ی تێدەچێ.

گوێدرێژ لە هەموشوێنێکدا دەبیندرێ، هەرجوتیارێك، هەرچەند نەداریشبێ، لانیکەم کەرێکی هەیە، بۆ بارو بۆمەبەستیدیکەش بەکاردەهێنرێ. بەزۆری شوێنی دۆلابی دەستی لای ئێمەدەگرێتەوە لە جەنجەڕ گێران داو بۆ جوتکردنیش بەکاردێ. ئەو شکاتکاریانەی دەربارەی هەیە لە ئەژمار نایەن، چونکە من ڕۆژانە دو یا سێ ئەرزو حاڵم بەدەست دەگەیشت کە ئاوا نوسرابوو: (خزمەتکارە گوێڕایەڵەکەتان عەرزی ئێوەدەکا کە گوێدرێژێکی ڕەش، بە هاکەی دەگاتە بیست جونێ و نیشانەیەکی ڕەش لەسەر پشتی هەیە و گوێ ی ڕاستی بڕاوە و، لە ماڵەکەی مندا لە دایك بوەو گەورەبوە، بەلام بەر لە پێنج ساڵ و نیو دیارنەماوە و ئێستالای قادر کوڕی نادر بینراوە کە ماڵی لە گەڕەکی سەرای هەولێرە، من داوای لوتفی ئێوە دەکەم کە بۆم بگێڕنەوە بە پێ ی ئەو دادپەروەریەی کە لەدنیا بلاوەو حکومەتی بەریتانیای بەشکۆی پێدەناسرێ (بەمجۆرە) فەرمان بۆ فەرماندارە.

کە کێشەکە حەواڵەی لای قازی دەکرێ، ئەگەر داواکار توانی پێناسی ئاژەڵەکە بسەلمێنێ و توانی وەکچۆن منداڵێکی خۆی جیادەکاتەوە ئاواجیای بکاتەوە، دەیدرێتەوە. ئەو کات قادر کوڕی نادر کە پێشتر باسمان کرد داوایەك لەسەر ئەحمەد کوڕی موحەممەد بەرزدەکاتەوە، کە کەرەکەی لێکڕیوە، تا نرخی کەرەکە وەگرێتەوە، بەمشێوەیە تا مێژوی ئاژەڵەکە لەو چەند ساڵەیدا بەتایبەتی ئاشکرادەبێ، کە پێنج ساڵ و نیو دەبێ. نرخی گوێدرێژ لە نێوان (٥ — ١٠) جونێ دەبێت ئەگەر جۆری گەورەی سپی بێ کە داواکاری لەسەر زۆرە چونکە ژنان بۆ هات و چۆ بەکاری دێنن.

لێرە بەپێویستی دەزانم کە باسی ئەوە بکەم کوردی ڕەسەن ئازاری گیانەوەرەکان نادا وەك کوردەکانی فارسی، دەگمەن نەبێ گوێدرێژێکی شێوە نارێك نابینی لەکاتێکدا لەسەر ڕێگای بەغدا — کرماشان ئاژەڵی وا دەبینی کە برینی کێماوی لەسەر کەفەڵیان هەیە کە ڕەنگە بەهۆی نەقیزەوەبێ کە بۆ خێرا لێخوڕین بەکاردێ. ئەگەر کوردێك وازی لێبهێندرێ ئەوا هەرگیز باری قورس لە ئاژەڵەکانی نانێ، گیا نەماو خاوەنەکەی هەژاربوو دانەوێڵەش گرانە بۆیە ئالیکی تەواوی نادەنێ، هەر چۆنێبێ کە بەهار هات قەرەبوی دەکاتەوە، ئەو ئاژەلانەی کە بۆ جەنجەڕ گێران بەکاردێن دەم بەستیان بۆ دادەنرێ.

کورد ناتوانێ وشتر بەخێوکا، ڕەنگە سەرۆکێکی کوردان برێکی کەم وشتری هەبێ بەلاّم عەرەبێك ڕادەگرێت بۆ سەرو کاریان.

کوردەکان لە بنەچەدا میللەتێکی شوانکارەن، مەڕو بزن ڕۆڵێکی گەورە لە ژیانی ئەواندا دەبینن، مەڕ دونگێکی چەوری قەڵەویان هەیە کە نزیکەی یەك پێی چوارگۆشە دەبێ، هەرچی بزنیشە لەو جۆرەن کە لەولاّتی ئێمەدا ناسراون(ئینگلتەرا) لەو جۆرە خەڵقەندە ناشیرنانە نین کە لە هیندستان هەیە. (بزنی ئەنگۆرا) لە بەرزاییەکاندا بەخێو دەکرێ، بزن و مەڕ بەیەکەوە شیرو بەرهەمەکانی بە کورد دەبەخشن: ماست و نقیشك و شیر و پەنیر، هەمووشیان پێویستن و خواردنی سەرەکی کوردەکان پێکدێنن. گۆشتەکەیان لە کاتی پێویستدا بۆ خوان بەکاردێت. خوریش بۆ جلوبەرگ و لباد و قاپوت و کلاّو وچاکەت بەکاردێن، (مو)ش بۆ ڕەشماڵ کە لەسەر دەمێکدا ماڵی کوردەکان بوە. پیستەش بۆ ئاو هێنان و مەشکە هەژاندن و بۆ ئەو هەمبانانەی کە لە کەڵەکان دەخرێن و لەسەر ڕوبارەکان شۆڕدەبنەوە. پاشەڕۆکانیشیان بۆ سوتەمەنی و پەینی ئەو ناوچانە بەکاردێ کە بەتوتن چێنراون. پێش شەڕ نرخی مەڕێك نزیکەی (٥ شلن) بوە بەلاّم ئەمڕۆ نرخی مەڕێکی باش بە هەمان قەبارە(٣٠ شلن)نە، ئاژەڵ لەکاتی شەڕدا زۆرکەمی کردوە، چونکە سەرچاوەی باجی حوکومەت بوو،چونکە ساڵانە هەشتیەکیان وەردەگرت، وەبە پێ ی ئەو سەرژمێریەی کە لەسەرەتای ساڵی(١٩٢٠) کراوە ژمارەی مەڕو بزن لە پارێزگای هەولێر گەیشتۆتە(٢٠٠٠٠٠) سەر.

ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵ بەخێو دەکرێن و سودێکی زۆریان هەیە، بەدەگمەن نەبێ بۆ گۆشت سەر نابڕدرێن، یان ئەو کاتەی کە نزیکە مردنن، بەشێوەیەکی ئاساییش تەنیا خەڵکە هەژارەکە دەیکرن. مانگاش شیری هەیە بەلاّم بەو ڕادەیەنیەکە لەولاّتی ئێمەدا هەیە(ئینگلترا)، شیری مەڕ و بزن پایەیەکی باشتری هەیە، گایەکان بۆ بارهەڵگرتن و جوت و گێرە بەکاردێن. لە بەرزاییەکاندا تاکە ئاژەڵی جوتکردنن، لە ناوچە دەشتەکانیش چینە هەژارەکەی جوتیاران بۆ جوت بەکاری دێنن، پێستەکەشی سودی لێ وەردەگیرێ، گیانەوەرێکی ناوخۆیی بنەچەیەکی باشی هەبێ و بۆ جوت بەکاربهێنرێ(١٢ جونێ) ی تێدەچێ.

ژمارەیەکی زۆر گای هیندی هێنرایە کوردستان بۆ جوتکردن و سەلماندی کە بۆ ئەم کارە گونجاوە. گامێش لەو شوێنانە بەخێو دەکرێن کە ئاویان هەیە. لەدەشتی بیتوێن بە شێوەیەکی بەرچاو هەن. شیری گامێش قەیماغی لێ دروستدەکرێ، مانگاش ئەگەر گوێرەکەکەی لەوێ نەبێ شیر نادا(ناهێڵێ بیدۆشن) بۆیە ئەگەر گوێرەکەکەی بمرێ ئەوا پێستەکەی پڕ لە کا دەکەن و لە تەویلە دای دەنێن کە ئەمەش خەڵەتاندنی(دایکە جگەرسوتاوەکەیە)، گامێش گیانەوەرێکی بە هێز و گەورەو ناشیرینە، بەڵام پێستەکەی بە نرخە و لە پێستەخۆشکردن بەکاردێ.

سەگ بەگڵاو دادەنرێ، بەڵام لانیکەم هەر ماڵەو سەگێکی هەیە، لە جۆری گەورە و بەتوکن، زۆریش درن، بەتایبەتی لە بەرزاییەکاندا کە ئاژەڵی گەورە دەبینرێن. سەگ باشترین پاسەوانە، ماڵ و مێگەل دەپارێزێ. هەر سەرۆکە و ڕەنگە سەگێکی لەو بابەتەی هەبێ کە پێی دەڵێن(تاژی) (تانجی) یان ڕەنگە دوانی هەبێ. کە ئەویش لە سەگی ڕاوی فارسی زیاتر نیە، ئەو لە شێوەدا بە هاوشێوەکانی لای خۆمان دەچێ بەڵام توکن ترە و گوێیەکانی کورت و جوانن، ئەمانە بۆ مەبەستی ڕاو بەکاردێن. زۆرجار لە سوچێکی دیوەخان وەردەکەوێ و وەك غەریمێك جێی ناهێڵێ، وەك چۆن باوە گەورەکەی خاوەن نامەکانی جێنەهێشت [٤٨] (مەبەستی یارانی ئەشکەوتە) بەڵام کاتی نانخواردن کە لە میوانەکان نزیك دەبێتەوە دوری دەخەنەوە. وەك سەگێکی ماڵی یەکێکم بەخێوکرد، بەڵام گیانەوەرێکی سۆزدارنیە. ناوە ناوە سەگێکی جۆری(تریر Terrier) ی بچکۆلە دەبینیەوە، وە ئەو سەگە ناوێکی خۆشی هەیە کە دڵ خۆشدەکا مەبەستم: (بوجی) یە.

پشیلە لە ماڵەکاندا، بەگشتی گیانەوەری ماڵی نین، تەنیا جارێك پشیلەیەکی ماڵیم دیت لەخێمەی عەرەبێکی ناوچەی مەندەلی بوو، لە نزیك ئاگر هەڵتروشکابوو خۆی گەرم دەکردەوە و دەیمیاواند.

مریشك لە هەموو دێیەکەدا بە خێودەکرێ، زۆرجار قاز و عەلەشیش (قەل) بەخێو دەکرێن، کە تۆزێك لەو جۆرەی کە لە هیندستان هەیە گەورە ترە، جۆرێکی گەورەی هەیە کەکلکی نیە. هێلکەش زۆرە.

کوردەکـان ئەگـەر ڕێگایـان پێبـدرێ بەچـەکەوە دەسـوڕێنەوە، خەنجـەرێك و (شەشاگر) دەمانچەیەکی لەبەر پشتێدایە لەگەڵ چوار فیشەکدان لە دەوری شان و ناوقەدی، تفـەنگێگ هەڵدەگرێ کـە زۆر جـوان پارێزگـاری لێـدەکا، کـە لولەیـەکی تەسکی هەیە. مۆزە گەورەکان، بە تفەنگی تورکی جۆری(٣٠١) زۆربـاش چـەکدار کـراون، بـەلأم کۆمەڵگـەکانی کـەنزمترن ژمارەیـەکی زۆری تفـەنگی(مـوزەر ٤٥٠) ماهۆزەریان هەیە، خەنجـەر دەمێکـی هەیـە کـە پێیـەك درێـژە، لـە کۆتاییەکەیدا کەمێك خوار کراوەتەوە.

ئەمجۆرەیان لای کوردەکان و عەرەبەکان بڵاوە.

کوردەکان بەشێوەیەکی سەرەکی خەریکی کشتوکاڵ و مەڕ دارین. کوردەکـان زۆرکـەم خـەریکیبازرگانین، لەگـەڵ ئـەوەی کـە زۆر لـە گونـدەکان جولەکەیـەکی ناوچەکەیان بۆ ئەو مەبەستە هەیە، ڕەنگە کوردێك کاری ئێستر ڕاگرتن بکـا، یـان خاوەنی ئەو گوێدرێژانەبێ کە لەسەر ڕێ ی کاروانە سەرەکیەکان دەڕۆن. لە کـاتی نەبونیدا ژمارەیەکی زۆری کوردان کۆچ دەکەن بۆ کارکردن لە ڕێگا سەربازیەکان و هێڵی شەمەندەفەر.

کوردەکـان کـاتی دەسـتبەتاڵیان نیـە، مەگـەر دەگمـەن، ئـارەزوی یەکەمیـشی ڕێگریە، لە سەردەمی تورکەکان هەر ئاغایەکی کە بەتوانا بوایە کۆمەڵە خـەڵکێکی هەبوو پێیان دەگوتن(خوبزە) (مانای نـانخۆر دەگەیـەنێ لـە (خبـز)ی عەرەبیـەوە هاتوە) یان دەستەی چەکدار. لە ماڵی ئەو دا دەژیان و لەخوانی ئەویان دەخوارد. ئەگەر بەشەڕی دراوسـێیەکەوە نەبوایـە(کـە دەبوایـە ئەمـە لـە بڕگەیـەکی تایبـەت باسـی بکـەم) ئـەوا پیاوەکـانی دەنـارد بـۆ چـاودێریکردنی ڕێگـا سـەرەکیەکان. هێرشـیان دەکـردە سـەر یەکـەم کـاروانی قەڵـەو کـە بەوێـدا تێپـەڕیبا(ئەگـەر قافڵەچـیەکان هـەژاربوان و تـەنیا گوێدرێـژێك یـان چـەند گوێدرێـژێکیان هەبوایـە گێـچەڵیان پـێ نـەدەکردن) دەسـکەوتەکە دەبەنـەوە بـۆ گـەورەکانیان ئـەویش بەسەریاندا دابەشی دەکاو(بەشی شێر)یش بۆ خـۆی دەگێڕێتـەوە. ئەگـەر خـاوەن قافڵە بەختی یاربێ و تالأنکەرەکان بناسێ ئەوا سەردانێکی لای گەورەکەیان دەکا، ئەگەر ئەویش لە ئاغا باشەکان بێت ئـەوا کاڵاکـەی بـۆ دەگێڕێتـەوە، دوای ئـەوەی هەندێکی وەك ماندوبونی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەمە و کارەکە لە کۆتاییدا لەیاریـەك

تێناپەڕێ، یەکێك لەئاغاکانی دزەیی وا ڕاهاتبوو کە ڕەتی دەکردەوە کالاّ دزراوەکەبداتەوە بۆیە شکۆی کەمبۆوە، لە ئەنجامدا بوە خاوەن ڕێزو حورمەتێك کە کەس ئێرەیی پێنە دەبرد.

لەو ئارەزوانەی کە کاتی دەسبەتاڵی پێپڕدەکەنەوە ڕاوکردنە بە تاژی، تەنیا ڕاوی خەڵکەکەش کەروێشك و ئاسکە و تەقەکردن لە مامز و کەڵەکێوی و بەراز، خەڵکێکی کەم چەکی ڕاوکردنیان هەیە و خەڵکەکەش شارەزاییان لێ ی نیە. ڕەنگە لەسەر پشتی ئەسپەکانەوە دوای نێچیر بکەون، بەلاّم یاری(پۆلۆ: Polo) لای ئەوان نەناسراوە تەنیا ئەوەنەبێ کە لەئەدەبی فارسی باسی لێوەکراوە. منداڵنم بینیوە کە جۆرێك لە یاری(هۆکی Hockey) دەکەن(مەبەستی قاشوانێیە) بە داردەستێکی سەر خوار لەگەڵ پارچە دارێك کە لەجێ ی تۆپە. یاری قومار لە گوندەکاندا دەگمەنە. لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ یاری کاغەز زۆر بڵاوە. منداڵان یاری بە(جگ) دەکەن یاریەکی پڕ لە گرێ و گۆڵیان هەیە کە هەڵماتەکان خل دەکەنەوە بۆ ناو چاڵێك، تاکە خەمڕەوێنی گەورەکان دوای ڕۆژێکی درێژ و پڕ لە ماندوبون، دانیشتن و جگەرە کێشانە.

لای کوردەکان نابینی کە زۆر ئارەزویان لە مۆسیقابێ. ئەوان پاکیز و توندڕەون. پێم وابێ بە بەدڕەوشتی دادەنێن. تاکە ئامێری مۆسیقای ناسراو لای ئەوان دەهۆڵ و زوڕنایە.

وەك پێشتر باسمان کرد، مەلاکان تاکە سەرچاوەی خوێندنن، ئەویش بەپلەی یەکەم خوێندنی قورئان و هەندێ کتێبی ژمارەکەمی فارسیە، لەوانە گوڵستانی سەعدی، هەموو سەرۆکە گەورەکان فارسی دەنوسن و دەخوێننەوە، مەلاکان دەستێکی باشیان هەیە لە ئەدەبی ڕۆژهەلاّت و لای هەندێ لە ڕۆحانیە بالاّکان، لەوڵاتلی ئەواندا خوێندویانە.

دەربارەی سروشتی کوردەکان دەڵێین (لە ڕاپۆرتێکی فەرمی ئەوەم دەرخستوە) کە ئەم میللەتە بۆ سەر سێ پۆل دابەشدەبن، ئەوانیش(ئاغا باشەکان) (ئاغا خراپەکان) و(خەڵکی ڕەشۆکی): لە سەرەتادا باسی خەڵکە ڕەشۆکیەکە دەکەین چونکە ئەوان باشترین خەڵکێکن کە لەڕۆژهەڵاتدا بینیبێتم تا ئێستا. ئەوان میزاجێکی باکوریانەیان هەیە، هاوتای فارس و عەرەبە ڕوخاوەکان،

زۆر زوو هەڵدەچن، کەسی کورد زۆر ئارەزووی لەکارکردنە، بەردەوامە لەسەری و دەستیپێوەدەگرێ، ئەو زیاتر حەز لە کۆکردنەوەی پارە دەکا نەك خەرجکردنی. ئەگەر دەستکورت و هەژار نەبێ، ئەوا بەردەوام پاکو خاوێنە. لەکاتی ڕۆژدا و لەنزیك هەموو گوندێك ژنان دەبینی کەچاڵاکانە جل دەشۆن. کوردەکان تا ڕادەی پاکیزی مۆڕاڵین(ئەخلاقی) ئەو بەدڕەوشتیانەی کە لە بەشەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات بڵاون لە ناوچە عەشایەریەکانی کوردستان باسیان نیە.

کوردەکان بەگشتی کڕو بێ دەنگن و فزوڵی نین، ئەگەر قسەش بکەن بەکورتیە و بەوردی قسەدەکەن، شتەکان وەك خۆیان باسدەکەن. زەینی بەشێوەیەکی ناوازە. تەمەڵە، تێگەیشتنێکی دروست، ئەگەر هەیشیبێ ئەوا زۆر لاوازە. لەسەروی هەمووشیانەوە پیاوێکی کورتبینە تەنیا ئەوشتانە دەبینێ کە لەپێش چاویەتی، لەبەر ئەو کەمزانیەی هەڵسوکەوتەکانی لەگەڵدا دەگونجێنێ. لاینگری جوتیاری کورد بۆ گەورەکەی لەقنابێ و نا جوڵێ. هەرچەندە بیچەوسێنێتەوە، ئەو هێشتا وانەکانی(سەربەستی) و برایەتی نەخوێندوە. ئەسڵزادەیی لای ئەوان شوێنێکی بەرزی هەیە. کوردەکان هەمویان میزاجێکی توندیان هەیەو، دەتوانن لەناکاو تا ئەوپەڕی ڕادە بیوروژێنی، دەڵێن دوو کورد شەوێك بەیەکەوە دەڕۆیشتن دەربارەی ئەستێرەیەك زۆر بەتوندی بو بەشەڕیان و سەرو پۆرتەلاکی یەکیان شکاند.(ریچ Rich) دەگێرێتەوە کە یەکێك لەمیرەکانی خۆشناو توڕەدەبێو هەڵدەچێ لەمێشێك کە بەسەر پێڵویەوە دەنیشێ، خەنجەرەکەی دەردێنێ و چاوێکی خۆی کوێر دەکا. کوردەکان ئەوەندە بەتەنگ ژیانەوە نین، کە خوێن دەبینن شێت و هاردەبن، هەموو هەلێکی تالان هەستێکی تەماعکاریان جۆشدەدا، شەرەف بەژنەوە بەندە، ئەو بەپێ ی یاسایەکی توند ناچارە تۆڵە بکاتەوە، ئەگەر ئەو شەرەفە دەستی بۆ ببردرێ. لە هەموو ئەوانەی پێشوەوە دەردەکەوێ کە سروشتی کوردێکی دروست لەلایەکەوە سروشتی جوتیارێکی ڕەنجدەرەو لەلایەکی دیکەوە سروشتی مرۆڤێکی سەرەتایی ماڵی نەبوە. ڕەگەزی دووەم لەناو خێڵەکانی بەرزای باوترە کە دورترن.

ئاغاکان کە بەچینێك دادەنرێن زۆر زیندوترن، ئەوان توانای بیرکردنەوەیەکی باشتریان هەیە و گیانێکی درەوشاوەتر، سیفەتەکانیان هەمان سیفەتی

جوتیارەکانە، تـەنیا ئـەو گۆشـانە نـەبێ کـە ئـەو ژیانـە کـشتوکاڵیەی دەژیـن و باپیرانیان چەند نەوەك تیایداژیاون، دەمەزەردی کردون.

هەر ئاغایـەك تـا ڕادەیـەك ئـارەزوی تـەماعکاری هەیـە، ئـەو کەسـەی کـە ئـەو ئارەزوە جڵە و دەکا ئەوا لە ئاغا(باشەکانە)، ئەوەی جڵەویشی بـۆ شـل دەکـا لـە ئاغا خراپەکانە.

کوردەکان سیفەتێکی سەیریان هەیە کە شکاندنی شکۆی براکانیـەتی. ڕەنگـە ئـەوە ڕەگـی تورکـەکان بـێ کـە دەیانویـست بیانکەنــە عوسمـانی و هەسـتی نەتەوایەتیان بسڕنەوە. کەسی کورد زۆر ئاماژە بۆخۆی دەکا بەوشەی(زاهیر بـین) واتە بەس دەرەوەی شتەکان دەبینێ، یان(تەماعکار) یان (وەحشی).

هەمیشەحەزدەکەم بەراوردی کـورد بکـەم لەگـەڵ قوتابیـیەك ، سروشـتی ئـەو وەك قوتابیەکە، ئەو لە لەنەرمترین و شیاوترین بـاردۆخ توشـی شـۆك دەبـێ. ئـەو گوێڕایەڵە کە کاتێك کە تێلا بەدەست ئاغاکەیـەوە ببینـێ (ئـاوا! : و. ع) ئـەو بـە تونـدو تیـژی زۆر و بەسـۆزی زۆر پێـی لـە بـەرخۆی دەچـێ. ئـەو بـەزۆری بـێ بیرکردنـەوە دڵڕەقـە، گـوێ بەهەسـتی کەسـانی دی نـادا، ئـەو یاسـایەکی تونـدی بەرامبەر یاسـای شـەڕەف هەیـە، ئەمـەش بـەو ڕادەیـەی کـە پەیوەنـدی بـەزاڵبون بەسـەر خـۆی دا هـەبێ ئـەوا لەهەنـدێ بـارودۆخ دا یـاری تـاڕادەی مەترسـی سەرکۆنەکردنی خۆی دەکا.

◆

# بەشی چوارەم
# خێڵ(عەشیرەت)

خێڵ: کۆمەڵگایەکە یان هاوپەیمانی چەند کۆمەڵگایەکە، بەرپا کراوە تاکو باڵی پارێزگاری بەسەر ئەو تاکانەدا بکێشێ کە سەر بەئەون و، پشتیان پێ ببەستێ لە کاتی ڕەتدانەوەی هێرشی دوژمنان و ئەو ڕوداوانەی لەدەرەوەڕادێن. دواتریش پاراستنی نەریتە کۆنەکان و پێوەرەکانی ژیان. عەشیرەتی واهەیە سەرۆکی نیەو هی واش هەیە کەچەند سەرۆکێکی هەیە.

هەموو کوردێك نیشتەجێ ی شاربێ یان گوند وا ئاماژەبۆ خۆی دەکا کە عەشایەریە. ئەگەر عەشیرەتێکی دانپیانراویشی نەبێت. ئەو خۆدانانەش بۆ ئەوەیە کە دانبە عورف و عادەتی عەشیرەتدابنێ، بۆ ئەوەشیەتی کە کەسانی دیکە بەخاوەن مافی عەشیرەتی دابنێن و لەسەر ئەو بنچینەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دا بکەن.(عەشیرەتیم) ئەو دەستەواژەیە بەدەستەواژەی( Civis rom a nus sum) ی ڕۆمانی یە کەمانای (من سەربە سەندیکایەکم) دەگەیەنێ، ئەم سەربەخێڵ بونەشی پێویستە جێ و ڕێ و بەرز ڕاگرتنێکی هەبێ.

پایەی سەرۆك لە عەشیرەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە زۆر جیاوازە لەناوچەشاخاویە دورەکاندا لەگەڵ ئەوەی گوێڕایەڵیەکی کوێرانە هەیە بۆ سەرۆك، بەلآم بەڕون و ئاشکرایی ئەو یەکێکە لە کەسەکانی عەشیرەت کە براگەورەی خانەوادەیەکە بە هۆی ئازایەتی شەڕ سەرۆکایەتی بەدەستهێناوە. لانیکەم ئەو سەرۆکە سەربەچینێکە کە تەواو لەوان جیایە، لەبنەچەکەیەوە هاتوە کە تەواو لەبنەچەکەی کەسانی عەشیرەتەکە جودایە. عەشیرەتە گەورەکان بۆ چەند لقێك دابەش دەبن. لەزۆر عەشیرەتیش کۆمەڵێ لق دەبینن کەناوی هاوشێوەیان هەیە ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەو لقانە ناوی خاوەن زەوییە ڕەسەنەکانن لەکاتێکدا کە

سەرۆکەکانی ئێستا سەر بەخێزانی بەهێزن کە دەستیان بە سەر زەویەکانیاندا داگرتوە. بە شێوەیەکی ئاشکراش عەشیرەتی دزەیی[1]، چونکە زەویەکان نزیکەی هەموویان موڵکی خانەوادەی بەهێزن. کەهەندێ لەئاغاو موختاری عەشیرەتە کۆنەکان لە خەباتی بەردەوامدان بەرامبەریان بەڵام ململانێیەکی نابەرامبەر، ئالێرەدا سەرۆك خاوەن موڵك و سیستەمەکەش فیودالی(دەرەبەگی)یە نەك عەشایەری.

عەشیرەتی سورچی شوێنێکی دیاری هەیە. بەشێکیان لەباکوری زێی گەورە لەناوچەی ئاکرێ[2] دەژین و بەشێکیان لەناوچەی ڕەواندوز، لەباشور. لەباکور خانەوادەیەك هەن کە لەبنەچەی یەکێك لە شێخەکانن. دەسەڵاتێکی گەورەیان پەیدا کردوە بونەتە خاوەن موڵك و سەرۆکایەتی. ئێستاش لقە کۆنەکان لەباشور ماون و، هەموو موختارێکی گوندێك سەربەخۆیە. هەرچەندە کە هەموان بەیەك پەیوەندی عەشایەریەوە بەندن.

لەنێوان هاو پەیمانی عەشایەری هەریەك لە(بلباس) و (خۆشناو) بە دیارترینیان دەژمێردرێن. بلباس لە(٧) یان (٨) عەشیرەت پێکدێن هەندێکیان لەوڵاتی فارسن و هەندێکیان لەناوچەی ڕانیەن و هەریەکەیان سنوری خۆی هەیە. ئەو عەشیرەتانەی کە لەناو هاوپەیمانیدان بەزۆری لە شەڕدان لەگەڵ یەکتر، بەڵام پێویستە بەرامبەر دوژمنی دەرەکی یەکبگرن. یەکێك لەئاغاکان سەرۆکی ڕەمزی عەشیرەتەکەیە، مەبەستم(کوڕی بایزە) ئەوسەرۆکی(٥) یان (٦) گوندە و بەس، ڕەنگە باپیرانی پشتگیری هەموو هاوپەیمانیەکەیان هەبوبێ، بەڵام ئێستا دان بە دەسەڵاتی ئەو دانانرێ، مەگەر تەنیا لە کۆبونەوەی سەرۆکەکاندا شوێنی سەرەوەی بدەنێ. ڕەنگە لەو کاتانەش کە ناچارن هەڵسوکەوتێکی هاوبەش بکەن داوای لێبکەن کە سەرۆکایەتی عەشیرەتەکان بکا.

خۆشناویش هاوپەیمانیەکە کە لەسێ عەشیرەت پێکدێ دوانیان سنوریان لەسەریەکە و گوندەکانیان تێکەڵاون. لێرەدا دەسەڵاتی سەرۆك بە گشتی دانپانراوە لەگەڵ ئەوەی کە سەرۆکەکانی دیکە حەزدەکەن وەك سەربەخۆیەك دەرکەون.

ئـەو کوردانـەی عەشـایەری نـین بەشـێوەیەکی ئاسـایی جوتیـاری یـەکێك لـە ئاغاکانی شارن، ئەویش کار بۆ پاراستنی مافـەکانیان دەکـا، بەشـێوەی سـەرۆکی عەشیرەتەکان. ئەوان ئەگەر سەربەخۆشبن خۆیان دەخەنەژێر پاراستنی نـزیکترین ئاغای عەشایەری بەهێز(خودا وەسیەتی دراوسێیەتی کردوە) لە کاتی تەنگانە.

سـەرۆك گـەلێ ئـەرکی لەسـەر شـانە بەرامبـەر جوتیارەکـانی یـان کەسـانی عەشیرەتەکەی لە هەموشی گرنگتر ئەوەیە کـە ئـەو بـەزمانی ئـەوان قـسەدەکا لـە هەموومەسەلەیەکی کە پەیوەندی بە حکومەتەوە هەبێ. ئەو بەدوای بەرژەوەنـدی کوڕانی عەشیرەتەکەی دا دەچێ چ لە شکاتکاری بێ یان مەسەلەیەکی تـاوان. جـا ئەوکەسە لەسەر حەق بێ یان نا. ئەگەر ئیسپات بێ کە کەسێك تـاوانێکی کوشـتن یان دزیەکی ئەنجامداوە ئەوا ڕێو شوێنی پێویست دەگرێتـە بـەر بـۆ گەڕاندنـەوەی ماڵەکە یان بۆ بەخشینی خوێنبایی، بـەڵام نـاکرێ ناچـاریکرێ مەگـەر بەئەسـتەم، کەتاوان بار بداتە دەست دەسەڵاتی فـەرمی، یـان ڕێـو شـوێنی تـەمێکردن بگرێتـە بـەر، لـە دانـی باجەکـەی زیـاتر. ئـەوداوای کـەم کردنـەوەی بـاجی سـەپێنراوی سەرکەسێك دەکا ئەگەر جێ بـەجێ کـرا ئـەو دەسـت بەسـەر هـەموو پارەکـە یـان بەشێکی دادەگرێ.

ئاغاکـان زۆر تونـدن لەگـەڵ جوتیارەکانیـان، ئەمـەش لەکاتێکـدا ڕاسـتە کـە حکومەت نزیك بێ و بتوانی دەسەڵاتی خۆی پیا دەبکـا. لـە ناوچـە شـاخاویەکاندا عەشـایەرەکان ئەونـدە هـەژارن کـە زۆرکـەم گـوێ بـە حکومـەت دەدەن، ئەگـەر سەرۆکەکەشیان بیەوێ فـشاریان بخاتـە سـەر خـۆی توشـی دژواری دەکـا، ئەگـەر واش بکا، ئەوا خێرا سەرۆکێکی دژی ئەو پەیدا دەبـێ. کـوردی دروسـت واسـەیری حکومـەت دەکـا لـە شـتێکی سـەیرەو نـاتوانی لـە ماهیـەتی تێبگـەی و بـەزمانێك قسەدەکا کەلێ ی حاڵی نابی، ئەو خۆناخاتە بەرامبەر ئەو دێوەزمەیە. ئەم کارە بۆ سەرۆکەکەی لێدەگەڕێ تا ئەو دێوەزمەیە ساردکاتەوە کـە پێشتر باسمـان کـرد، ئەگـەر بـارودۆخی گونجـاو بـۆ ئـەوە هاتەپێـشەوە. لەهەمانکاتـدا خۆدەخاتـە بەردەستی سەرۆکەکەی تاکو خوریەکەی بێ ڕەحمانە ببڕێتەوە. ئەگەر لەبەرامبەر سەرۆکەکەشی ڕاستبێتەوە ئەوا سزاکە زۆر خێرا دێ، چـونکە دوژمنـەکانی لـەروی ڕادەبن و ئاژەڵەکانی دەدزن و ئاوی لێ دەبڕن و گێچەڵ بەژن و منداڵەکەی دەکـەن

و، هەموو سەرۆکێك جوتیارەکانی ناچەوسێنێتەوە، هەندێکیان وەك باوك وان بۆ کەسو کاریان و سەرچاوەی سۆز و بەزەیین بۆیان، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوانەی چرنوکی تەماعکاریان نیە ژمارەیان کەمە. تەنانەت ئاغا باشەکانیش دەبێ ڕێزیان بگیرێ بەهۆی ئەو پاراستنەی کە بۆ کەسەکانی هۆزەکەیان، بەرامبەر دوژمنان دابینی دەکەن، لەهەندێ حاڵەتدا سەرۆکە کوردەکان هەندێ جولەکەو گاور وەك کۆیلە ڕادەگرن(٥). هەر چۆنێك بێ کە یەکێك لەدەرەوەی عەشیرەت گێچەڵ بەوان دەکا پەشێویەکی گەورە ڕوو دەدا، چونکە زیان گەیاندن بە گاورێك کارێکی خراپە و وەك ئەوە وایە مانگایەکی سەرۆك هۆز ئەتك کرابێ. سەرۆك هۆز لەبەر ئەوەی خاوەن زەویە دەیەکی ئەو بەرهەمە دەبا کە زەوی هەیەتی، ئەوەی کە دەمێنێتەوە هیچ مافێکی یاسایی بەسەریەوە نیە. عورف و عەشایەریش وایە کە مەڕێکی ئاوس لەسەرەتای ساڵ لەناو مێگەڵ پێشکەش بەسەرۆك بکرێت. جگە لەو نەریتەی کە بۆتە باو، لەهەردوو جەژنەگەورەکەی موسوڵماناندا، سەرۆك لقەکان سەردانی سەرۆکەکەیان بکەن و دیاری پێشکەش بکەن. بەم جۆرە موختارەکان دان بەسەرۆکایەتی سەرۆکێك دەنێن کە خاوەن زەوی ئەوانیش نیە. هەر بەم جۆرەش موختارەکان یان سەرۆك لقەکان چاویان لەوەیە کە ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتیاندان سەردانیان بکەن و دیاریان پێشکەش بکەن.

یارمەتیدەران و کوڕانی عەشیرەت هەمیشە ئامادەن لە بەرامبەر دوژمنێکی دەرەکی پشتیوانی سەرۆکەکەیان بکەن. تەنانەت بەرامبەر حکومەتیش، ئەمە دەڵێم لەکاتێکدا لەگەڵ ئەوەی کە بارودۆخێك لە ڕابردودا دروست بوو کێشەیەك کەوتە نێوان ئاغاکان و حکومەت کەچی دزەییەکان ڕەتیان کردەوە یارمەتی ئاغاکان بدەن.

یاسای عەشایەری پشت بە یاسایەك دەبەستێ کە بریتییە لە(دار بەدار) سەرۆك هۆز هیچ دەسەڵاتێکی دادوەری نیە ئەگەر حکومەت ئەو دەسەڵاتەی پێنەدابێ. دەتوانێ بەرۆڵی ناوبژیوان هەڵسێ، ئەمەش لەکاتێکدا کە هەردوو لایەن پەیوەندی پێوە بکەن و، لەکاتی زوڵمێکی ئاشکراو دیار. زۆرکات لایەنی زیانلێکەوتو دەگرێ و تاوانبار ناچار دەکا کە زەرەرەکە ببژێرێ و شوێنەواری تاوانەکە بسڕێتەوە، یاسای عەشایەری ڕێگەی دروستکردنی دادگا داوەریەکان نادا، سزایەکی

دیاریکراویشی بۆ ئەو تاوانانە تێدانیە کە دەکرێن، جگە لە ناموسی ژن. ئەوەی کە تاوانەکەی لەدژ کراوە لەو حاڵەتـەدا دەبـێ ڕێوشـوێنێك بگرێتەبـەر تامافی خـۆی دەسکەوێتەوە.

بۆیە ئەگەر کەسێك بەیانی لەخەو هەڵساو دیتی کەرەکەی دزراوە، ئـەوا شـونی هەڵـدەگریّ تـابزانیّ دواجـار، بـۆ کـویّ بـردراوە. ئەوسـا دەچـێتە لای موختـاری گوندەکە، ڕەنگە موختارەکەش، ئەگەر دزیەکە بـێ ئاگـاداری ئـەو کرابـێ،کەرەکـە بداتەوە خاوەنی، بەلاّم ئەگەر دوژمنی داواکار یان دوژمنی ئاغای داواکارەکـە بـێ، ئەوا ڕەتی دەکاتەوە کەرەکە بداتەوە، کاتێکیش کە داواکار دەچێتە لای ئاغاکـەی خۆی ئەوا ئەویش چەند کەسێك لە داروەدەستەکەی دەنێرێ کـە دووکـەر لەگونـدی کابراکەی دیکە بدزن. ئەو یاریە خۆشە بەردەوام دەبێ تا دەگاتە خوێنڕشـتن یـان لایەنێکی دیکە ڕادەسپێرن بۆ ناو بژی کردن لەنێوانیان.

ئەو کەسەی کەدزی بۆ بەرژەوەنـدی خـۆی دەکـا، بێئـەوەی مۆڵـەتی لـە ئاغـا وەرگرتبێ، ئەوا کەسێکی بەد بەختەو، زو یـان درەنـگ لەگونـد دەردەکـرێ، بۆیـە ئەو کاتە دەبێتـە پـۆلیس یـان(شـەبانە) (حەسـحەس)ی ناوخۆ،کـە پـەناگـەی دز و درۆزنانە.

ئەگەر شتومەکی ڕێبوارێك، یان غەریبەیەك، لـەکاتی مانـەوەی لەگونـد بـدزرێ، ئەوا موختار بەرپرسیارە کە شتە دزراوەکە بگەڕێنێتـەوە یـان پارەکـەی بـدا، بـەو مەرجەی ئەو غەریبەیە پێشتر ئاگاداری کردبێتەوە کە هاتۆتە دێیەکە.

هەرچـی ناموسـی ژنـە، ئـەوا یاسـاکەی زۆر تونـد و تیـژە. ژن لـە هەرپایەیـەکی کۆمەلاّیەتی بێ لەگەڵ هەڵسوکەوتێکی نـاڕێکی لێبینـرا یـان بـە بەڵگـەوە گومـانی لێکـرا ئـەوا چارەنوسـی مردنـە، مێـردی یـان بـرای یـان هەرکەوسـێکی کـە لێـی بەرپرسـیارە، کـە شـەرمەزاریەکەی یـان ئابروچـونەکەی نەشـواتەوە، ئـەوا بەبێشەرەف لە قەڵەم دەدرێ، ناموس لای کوردان بـە نـرخترین شـتە، بـێ گومـان لـەو کاتـەدا کـە مـن لـە هـەولێر بـووم گـەلێك لـەژنانی کـورد لـەو ڕێیـەدا ژیانیـان لەدەستداوە، بەلاّم زۆر کەم لەو حاڵەتانە خەبەردار بووم و ئەویش دوای تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر. ڕوداوی ژنێکم گویّ لێبوو کە خرابوە تەلیسێکەوە فڕەدرابـووە نـاو زێ. تەنانەت کاتێك کە ئاگاداریش بومایە لـەو جۆرەکێشانە، هـەرکارێکم بکردایـە

سودێكی نەبوو چونكە ڕایگشتی عەشیرەت پشتی بكوژەكەیان دەگرت و ئەستەم بوو بەڵگەیەكمان دەستكەوێ. ئەوەندەی كارەكە پەیوەندی بەو پیاوەوەش هەبێ ژنەكەی فریو داوەو لەخشتەی بردوە، یاساكە ئەوەندە توند و تیژ نیە، بەهەر حاڵ لەهەندێ كاتدا دەكوژرا، بەڵام بەزۆری بە پێدانی خوێنبایی دەرباز دەبوو.

لەهاوینی ساڵی ١٩١٩ ، ڕوداوێك لەناوچەی ڕانیەدا ڕویدا، پیاوێك لەگەڵ زیاد لە ژنێك نێوانی هەبوو.

(مامەند ئاغا)ی سەرەك عەشیرەتی(ئاكۆ) خوشكی(سواراغای) سەرۆك عەشیرەتی(پیوان)ی هێنابوو. گومانی لە كوڕەمامی مامەند ئاغا هەبوو چونكە زۆر گرنگی بەو ژنەدەدا. بنچینەیەكی واش هەبو بۆ ئەو گومانە. ئەو كوڕە مامەش ناوی (سلێمان ئاغا)بوو، بۆیە مامەند ئاغا ڕۆژێك لەگەڵ چلێتێكی گلاو كە دوایی باسی دەكەین و ناوی(مامەند شێخ ئاغا) بوو گەشتێكیان لە دەشتی بیتوێن كرد لەكاتێك دا ئەو لەسەر ئەسپەكەی بوو مامەندی دووەم لەناكاو لەدواوەڕا تەقەی لێكرد، بەهەردوكیان بە فیشەك جەستەیان دابێژا و ئاگرێكیان تێ بەردا كەنیوەی دەشتەكەی سوتاند و جەستەی سلێماناغای بەد بەختی كردە خەڵوز. هەرهێندەی كە مامەند ئاغا گەیشتەوە ماڵ ژنەكە ی ناردەوە بۆ(سواراغا)ی برای تا بە ئەركی خۆی هەڵستێو لەناوی ببا. بەڵام سواراغا لەبەر هەز هۆیەك بێ ئەوەی نەكرد. ئەمەش وای لە مامەند ئاغا كرد لە تورەییان هار ببێ، هەر هێندەشی كە ئەم كارە زانراو بڵاو بۆوە هەر دوو بكوژەكە ڕایان كرد وڵاتیان جێهێشت.

ژن هۆكاری ئەو كێشانەیە كە لە كوردستان ڕودەدەن. ئای چەند هێلین وڵاتی خۆیان وێران كردوە. هەردوو دەستەی ڕكابەر لە پشتدەر كە بەهێز ترین عەشیرەتن لە كوردستانی باشور، بەرەو لێكدانێكی گەورە دەچون بەهۆی ژنێكەوە، حكومەتیش تێیدا تەنگە تاو دەبوو.

تەدارەك ڕێكخرابوو بۆ گواستنەوەی ژنێك بۆ یەكێك لە كوڕانی هەردوو لایەنەكە، لەكاتێكدا كە لایەنێكیان ئەوەی بەمافی خۆی دەزانی، بۆیە هەڵسان لەناكاو ژنەكەیان ڕفاند. دوای ئەوە دانوستان كراو چەند مانگێكی برد، خەریك بوو كارەكان بگەنە لوتكە، لە ناكاو لایەنی سێ یەم كە لە هۆزێكی جیاواز بوون

(مەبەستم هۆزی مەنگوڕە)کچەکەیان لەناو کەسو کاریدا ڕفاند و هەردوو دەستەکەی دیکەیان سەر سوڕماو کرد.

پێشتر وتم کە کوڕەمام لە هەموو کەس زیاترە مافی ئەوەی هەیە داوای دەستی کچە مام بکا. ئەمەش بەهۆی ڕەتکردنەوەی داوایەکی لەو بابەتە بوە هۆی ڕوداوێکی گەورە کە لە تەموزی ١٩٢٠ دا ڕویداو شانۆی ڕوداوەکەش گوندی (کەپەنك ڕەش) بوو کە لەبناری ڕۆژهەڵاتی چیای(قەرەچوغە)، خاوەنی ئەو گوندە ناوی (خاڵ بەکر)بوو کە خوشکە بێوەژنەکەی و(ئامینە خانم)ی کچە جوانەکەی، کە دەتگوت گوڵی بەهارە،(فاتیمە) لەژێر سیبەری ئەودا دەژیان. هەردوو کوڕە مامەکانی فاتیمە لە گوندێکی سەر گردێکی دیکە دەژیان کە(فەرحانە شەل) و (ڕەحماناغا)بون، فەرحان چەند جار براکەی ڕەوانەی لای(خاڵ بەکر) کرد بوو تا کچی خوشکەکەی بداتێ، چونکە ڕێوشوێن وانەبوو کە خۆی بچێ و داوای بکا، بەڵام هەمووجارێك داواکەی ڕەتکرایەوە. دواتر یەك لەسەرۆکە گەورەکانی دزەیی کە ناوی(حاجی پیرداود ئاغا) بوو بەنهێنی چوە داخوازی بۆ(مەعروف) ی کوڕی، ئەو مارەییەی کە پێشنیار کرابوو زۆر بوو، بۆیە خاڵ بەکر کارەکەی قبوڵ بوو، کەشکەشەی زەماوەند زۆر بەنهێنی بەڕێوەچوو، تەنانەت بڕیاری فەرمی قازیش لە هەولێر وەرگیرا تا هیچ کێشەیەکی شەرعی ڕونەدا. بەڵام ئەمە کارێکی بێهودە بوو.

شەوێك، کە دنیا لە ژێر باڵی تاریکیدا بوو، فاتیمە لەگەڵ دایکیدا لە کەپرێکی لە چڵەدار دروست کراو خەوتبون، لەدەرەوەی ماڵ، دوپیاو هێرشیان کردنە سەرو خەنجەریان لەسەر سنگی کچەکە کوتاو دواتر چەند خەنجەری دیکەیان لێدا تا دوا هەناسەی دەرچوو، دایکەکەش تەنیا بە قودرەتی قادر لەو چارەنوسە ڕزگاری بوو. بێ گومان یەکێك لە بکوژەکان(ڕەحمان ئاغا) بوە، ترس لە ناو عەشیرەتدا بڵاو بۆوە، ڕێوشوێنی ڕاستەقینە ئەوە بوو کە(حاجی پیرداود) بکوژن یان کچەکە بڕفێنن، کوشتنی کچەکە هەڵەیەکی گەورەبوو، چونکە ئەو لە ماڵی سەرپەرشتیارەکەیدا لەکاڵایەك زیاتر نەبوو، حاجی پیرداود، کە بێدینێکی گەورەیە، هاتەلام و فرمێسکی لە چاوان دەڕژان، بەڵام فرمێسکی تیمساح بون و لە نوسینگەکەی مندا هەڵیدەڕشتن و گلەیی دەکرد کە کوڕەکەی توشی شەرمەزاری بوە:– کوڕەکەی مێروێکی بوودەڵە بو کە زۆر ڕقم لێ ی بوو– شەرەف و شکۆی

بەباداچـوبوو. ڕەحماناغـا خرایـە کـونجی زینـدان. نـەتوانرا بەڵگـەی لەسـەر بـسەلمێنرێ، لـەو ڕۆژە ناخۆشـانەی دواتـر هـاتن بـەرەڵلا کـرا، لایەنـە پەیوەنـدداره‌کان مەسـەلەکەیان پەردەپۆشـکرد، چـونکە هـەموو پەیوەنـدیان بەیەکەوە هەبوو.

جگە لەو مەسەلانە پەیوەندیان بەژنەوە هەیە، کوشتن بەربلاو نیە. ڕەنگە کەسێك یەکێکی دیکە ببینێ کە مەڕی لە ناو دەغڵ و دانی ئەو کردوە شێتگیرببێ و تەقەی لێبکا و بیکوژێ.

بەزۆری کوشتن لەسەر ئەو کێشانە ڕودەدەن کەپەیوەستن بەململانێی زەوی یان مەڕو ماڵات. لە حاڵەتی ئاوادا ژنی کوژراوەکە یان دیکی دەهات و جلە بە خوێنەکانی خۆشەویستەکەی بە دەستەوە بوو هاواری دەکرد: (داد، داد، دادپەروەری، دادپەروەری) بەبیرم دێ کە لە مەندەلی بوم و ڕۆژی جەژنی لە دایك بون بوو، تەرمێکیان هێناو لەبەردەمی نوسینگەی مندا فڕێیاندا، ئەمەش دیاریەکی گونجاو نەبوو بۆ ڕۆژێکی ئاوا پیرۆز. جەندرمە ڕەوانەکران تا بکوژەکە بگرن، بەلام هەمیشە بەدەستی بەتاڵ دەهاتنەوە چونکە گونجاوە کەسوکاری کوژراوەکە تۆڵەی بکەنەوە، بەلام سزادان بە دەستی ئەو دێوەزمەیەی پێیدەڵێن حکومەت شتێکی جیاوازە. بۆیە تاوانبارەکە بەجوانی دەشاردرایەوە تا بتوانێ بەرەو چیاکان ڕابکا. تاکو ڕێگەش لە کوشتاری دیکە بگیرێ، کە لەوانەیە خزمەکانی بکرێنە ئامانجی تۆڵە سەندنەوە. لە کۆتاییدا ڕێگە بۆ ناوبژی دەدرێ هەرکە خوێنبایی دراو لەگەڵیدا برەپارەیەکیش، ئەوکات ڕێگە بەبکوژەکە دەدرێ بگەڕێتەوە باوەشی کەسوکارەکەی.

مەبەست لە ناوبژیوانیش چارەسەرکردنی کێشەکانە بەپێی ڕێوشوێنە عەشایەریەکان، ئەمەش هەموو کێشەیەك دەگرێتەوە بەگشتی و بەتایبەتیش(تۆڵەی خوێن)، چارەسەریش لەسەر دەستی کەسێك دەکرێ کە لەوانەیە(سەرۆك) یان (پیاوماقوڵ) ێك بێ کە هەر دولا لەسەری ڕێکدەکەون، یان حەواڵەی (کۆڕ) دەکرێ — کە کۆمەڵی سەرۆك عەشیرەتەکانن — لە(٣ — ٥) کەس پێکدێن.

ئـەم جـۆرە دادگایانـە تـەنیا بـە نـاو بـڕێوانی هەڵدەسـتن، لەگـەڵ ئـەوەی کـە حوکومەت سورە لەسەر ئەوەی بڕیارێك دەرکاو جێبەجێکردنیشی حەتمیە. تۆڵەی خوێن هەمیشە بە خوێنبایی چارەسەر دەکرێ، هـەر حاڵـەتێکی پەیوەسـت بـە ژن یان پیاو نرخی تایبەتی خۆی هەیە، نرخی جوتیارێکی کرمانج(مـسکێن) لـە چـینی ناوەڕاست (٩٠ جونیّ) یە یەکێك لە ژنەکانیشی(٤٥ جونیّ) پێیەکی یان دەسـتێکی بابڵێین بە(٢٠ جونیّ) یـە، ئـەو جـۆرە پارەدانـەش بەشـێوەیەکی عەینیـە واتـە بـە هەندێ ئاژەڵ یان ئەسپێك یان برێك گەنم کە دەدرێتە لایەنی زیانلێکەوتوو. زۆریش باوە کە کچێك بدەن بەشێوەی شوکردن لە جیاتی خوێنبایی.

لەسەر ئەوە ئەگەر داواکە ٩٠ جـونیّ بـێ کـە نرخـی پیاوێکـە، بەگریمانـەی کـە قەرزەکە بدرێ، ئەوا کچێك و سێ مانگا و کەرێك دەکا. ئەگـەر تۆڵـە سـەندنەوەکە گـەورەبوو لەئەنجامیـدا کۆمـەڵێ کـەس ژیانیـان لەدەسـتدابوو، ئـەوا ژمارەکانیـان دیاری دەکەن و ژمارەی ژن و مندال، لە هەردوو بەرە، ئینجا نرخـەکانیان حـسێب دەکەن، کێ لـەو دوبەرەیـە قـازانجی کردبـێ جیـاوازی نێـوان نرخـەکان دەدا، کـە کێشەکە دەبڕێتەوە، بۆ ئەوەی جارێکی دی کێشە رونەداتەوە، هەردولای شـەڕکەر زۆرکات ئاشتەواییەکە بەوە مۆر دەکەن کە هەریەك کچێك بداتە ئەوی دی.

سـوڵحیش لـە کاتێکدا دەکـرێ کـە لایەنـەکان لەچـینی ناوەنـد و خـوارەوەبن، چونکە ئەوەی بەسوڵحەکە هەڵدەستێ خـودی سـەرۆکەکانن. بـەلاّم بارەکـە تـەواو جیاوازە ئەگەر لایەنەکان خودی سەرۆکەکانیان بـن. ئەوسـا لـەبیرکردنی زیانـەکان ساڵانێکی درێـژی دەوێ، لەگـەڵ ئـەوەی کـە سـوڵحەکە لـەژێر فـشاری حکومەتـدا دەکرێ، بەلاّم هەر هێندەی ئەو فشارە نەما پێشێلکاری دەکرێ.

لــە کاتێکــدا کــەروداوێکی کوشــتن ڕودەدا، ئــەو دودڵیەســەرەکیە کــە دوچاری(حاکمی سیاسی) دەبێ ئەوەیە کە ڕێ لە ڕودانی شەڕێکی ترسـناك بگـرێ کـە ڕەنگـە لـە نێـوان عەشـیرەتەکاندا روبـدا. شـەری عەشـیرەتەکان لەسـەردەمی تورکەکانـدا کـارێکی بـاو بـوو، بـەزۆریش لـە نێـوان دوو بـەرەی ڕکابـەر لـە یـەك عەشیرەتدا ڕویدەدا، نەك لە نێوان دو عەشیرەت. پریـشکێکی بـچوك دەبـوە هـۆی هەڵگیرسانی ئاگرێکی گەورە، بەلاّم هۆکاری قوڵتر و مەترسیداتر لە گۆڕێدا هەبون، بەتایبـەت لـە دەشـتەکاندا، کـە فراوانـی و دەستبەسـەردا گرتنـی زەوی پاڵنـەری

سەرەکی سەرۆك عەشیرەت بون لە ژیان و ئەو پەڕی ئاواتی ئەو بون. گورانیەکان گەلێ پێکدادانی عەشایەریان تۆمارکردوە و پەنا بۆ ئەو گۆرانیانە دەبردرا بۆ بەسەر بردنی شەوانی درێژی زستان.

لەو پێنج شەش ساڵانەی دوایی دوو شەڕی گەورە لەنێوان دوو دەستەی ڕکابەری عەشیرەتی دزەیی ڕوویاندا، کە هەر یەك لەو دو دەستەیە دەگەڕێنەوە بۆ بنەچەیەکی هاوبەش کە پێش پێنج نەوە بوە. یەکە میان بەهۆی هەولێکەوە بوو لەلایەن پیرەمێردێکی خاوەن موڵك بۆ فرۆشتنی گوندەکەی. دەستەی ئەحمەد پاشاو دەستەی برایماغا لەسەر ئەوە بوو بە شەڕیان کە کامەیان خاوەن مافی کڕینەوەی ئەو گوندەن؟ لەو پێناوەشدا نزیکەی (٦٠) کەس گیانیان لەدەستدا.

کە هێزەکانی ئێمە گەیشتنە کەرکوك شەڕی دووەم بەردەوام بوو، ململانێیەك لەنێوان دەستەی برایماغا و حاجی پیرداوەد ڕویدابوو لەسەر موڵکایەتی بیرێك. چونکە یەکێك لەخزمانی حاجی پیرداود چوبوو ئاو لەبیرەکە دەر بهێنێ. تەقەی لێکرابوو کوژرابوو، شەڕی ناوە ناوە لەسەر ئەوە لەنێوانیان ڕویدا. لە ئەنجامدا کوڕە گەورەکەی برایماغا بوو بەقوربانی، ئەو شەڕەش ئەوکاتە کۆتایی هات کە هێزەکانی بەریتانیا لەو ناوچەیە نزیك بونەوەو سولحێکی بە پەلە کرا.

بەر لەبیست ساڵ شەڕێك لەدەشتی بیتوێن ڕویدا کە زۆر دەنگی دایەوە، پیرانەکان کە ڕاهاتبون هاوینان بچنە کوێستانەکان و لە ڕێگادا دەبن بۆ گەڕانەوە بۆ زستانە هەواری خۆیان، بینیان کە دراوسێکانیان دەستەیەکیان پێکهێناوە بۆ ئەوەی ڕێگەی گەڕانەوەیان لێبگرن و نەهێڵن ببنە شەریکە زەوییان. پیرانەکان تەنیا سەد و بیست سواردەبن، ئەوان ئەو دەربەندەیان بڕی کە زێ ی گچکە بە زنجیرە چیایی(قەرە ڕەش)دا تێدەپەڕی، ڕۆیشتنیان بۆ ئەو شوێنەی بردن کە هێزێکی(٣٠٠٠) نەفەری چاوەڕوانیان بون. هەر دوولا دانیشتن و چاودێری یەکتریان دەکرد و تێبینیان دەکرد. ئەمەش چەند ڕۆژێکی خایاند. دزینی تانجیەکی ڕاوی نایاب هۆکاری ئاگری شەڕەکە بوو لەنێوانیاندا. ئەم شەڕە بەسەر کەوتنی پیرانەکان کۆتایی هات — کە بە ئازایەتی ناسراون — بێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك بڕژێ.

ئەم جۆرە شەڕانە لەسەر بنچینەیەکی دیارو بڕیار لەسەر دراو دەکرێن. هەر لایەنێك لە بەشداربوان لە مەیدان دەکشێنەوە بۆ نان خواردن لەکاتی پێویست، هەراو زەنایەکی زۆری لێدروست دەبێو خوێنی کەم تێدا دەڕژێ، کوردەکانیشەك زۆر داوێن، بۆیە هەزاران فیشەك دەتەقێنرێ بێ ئەوەی قوربانی لێبکەوێتەوە. شەڕە عەشیرەتەکانیش بەزۆری لە زنجیرە هێرشێك پێکدێن کە دەکرێنە سەر ماڵ و موڵکی دوژمن و مەگەر دەگمەن دەنا بەشەڕێکی بەرفراوان کۆتایی نایە.

کوردەکان بەپێ ی پێوەرەکانی ئێمە شەڕکەری باش نین(ئاوا : و.ع). تورکەکان لەکاتی شەڕدا توانییان بڕێکی کەم لە کوردەکان بکەنە سەرباز، بەڵام نزیکەی هەموویان ڕایان کرد. کورد بە پلەی یەکەم ماڵەکەی خۆی خۆش دەوێ، واتە خێزانەکەی، یەکێك لەسەرۆکەکانی مەنگوڕ پێی وتم کە ئەو ناتوانێ لە دەرۆژ زیاتر لە ماڵەوە دوورکەوێتەوە و سەیری بەوەدێ کە ئەوروپییەك چۆن دەتوانێ لە وڵاتی غەریبی هەڵبکاو بۆ ماوەیەکی درێژ لە کەسوکاری جیا بێتەوە.

ئەو تایبەتمەندییە ئەو سەرکەوتنەمان بۆ لێکدەداتەوە کە پیرانەکان لە شەڕی بیتوێن بە دەستیان هێنا. ئەوان شەڕیان بۆ پاراستنی خانەوادە و کردنەوەی ڕێگای گوندەکان دەکرد، لەکاتێکدا دوژمنەکانیان چەند ڕۆژێك بو لە جێگەو ڕێگەی خۆیان دووربون بۆیە ئارەزویان لە شەڕ نەبوو، کوردەکان لەبنەچەدا پیاوی شەڕی چەتەیین و، لە بۆسەنانەوە و هێرش بردنە سەر(شوێنە قایمەکان) لاوەکیەکان باڵادەستن. ئەگەر لەلایەن هێزێکی زۆرتر فشاری بخرێتە سەر کە نابەرامبەر بن لەگەڵ هێزی ئەودا ئەوا بێدەستکردنەوە ڕادەکا و خودەگەیەنێتە قەڵای چیاکان. ئەوێ پەناگەیەکی قایم و ئارامە. لە ئەنجامی شەڕێکی کورتدا دەبینی ئامادەیە بۆ سوڵحکردن. و زیاتریش ئامادەیە بۆ شەڕ کردنەوە کە دوبارە هێزی هاتەوە دەست. وە بۆ داوا شارستانیەکان، دەقێك نیە لە یاسا عەشایەریەکاندا، ئەو مەسەلانە یان حەواڵەی سەرۆك هۆز دەکرێن بۆ ناوبژی یان حەواڵەی مەلا دەکرێن بۆ حوکمی شەرعی یان حەواڵەی دادگای مەدەنی دەکرێن لە نزیکترین بنکەی حوکومەت. بەر بڵاوترین جۆرەکانی ململانێ ئەوانەن کە پەیوەندیان بە موڵکداری زەوی هەیە، بەزۆریش خوێنی تێدا دەڕژێ، یەکلاکردنەوەی ئەو جۆرە کێشانە بە حوکومەت نەبێ ناکرێ، ئەمەش

ڕێوشوێنێکی دوورو درێژی دەوێ، بەڵام زۆر کات سەرۆك هۆز دێتە ناوەوەو نێوانی هەردولا ڕێکدەخاو چارەسەرێکی میانڕەو دادەنێ.

لە جۆرە چارەسەریەکانی بلاَون. سوێند خواردن. ئەگەر(أ) ،(ب)ی تاوانبارکرد بەدزینی کەرەکەی. نەیشی توانی بەڵگەی تەواو بداتە دەست، تا حوکمەکە بباتەوە ئەوا دەتوانێ داوا لە(ب) بکا سوێند بخوا کە دەستی بەسەر ئەو ئاژەڵەدا نەگرتوە، ئەگەر(ب) سوێندی نەخوارد ئەوا بە تاوان بار دادەنرێ و، ئەگەر سوێندیش بخوا ئەوا داواکە کۆتایی دێ. ڕەنگە لە کێشەیەکدا ناوبژیوان داوا لە هەردوو لایەن بکا سوێند بخۆن. زۆر جۆری سوێند خواردن هەیە، باوترینیان سوێند خواردن بەناوی خوا(وەڵلا هی ، بیلاهی، تەڵلاهی) وە بۆ ئەوەی سوێندەکە سوێندێکی ڕاست بێ و درۆی تیانەبێ، کەسی سوێند خۆر دەست دەکاتە سەر قورئانی پیرۆز. هەر چۆنێك بێ کوردەکان لەسەر درۆی گەورە ڕاهاتون(ئاوا:ز.ع) ڕۆژی چەندین جار سوێندی بێ ترس دەخۆن، ڕۆژێك یەکێکیان پێی وتم : (کە کوردێك دەستی بەسوێند خواردن کرد دەبێ لە باوەڕ پیکردنی دورکەویەوە) (ئاوا: و.ع) وە ئەگەر یەکێکیان وتی: (بەخوا و بە پێغمبەر بە قورئانی پیرۆز و بەسەری باوکم ئەو ڕۆژەی کەکەرەکە دزراوە من لە گوند نەبوم) کەسی بەرامبەر دەگاتە یەقین کە ئەو لەوێ بوە. ئەگەر سوێند خۆر لای چەپی چاکەتەکەی بە دەستی ڕاست گرت و هەژاندی و وتی : (من گوێم لێبوە، بەڵام دڵنیانیم، بۆیە سوێند ناخۆم کە قادر زەویەکەی بەرلە(١٠) ڕۆژ بە(٥٠) پاوەند بە ڕەشید ئاغا فرۆشتوە) ئەوا گومانێکی ئەو تۆی تێدا نیە کە ڕاستی دەڵێ.

لەبەر ئەمانە و، لەبەر ئەوەی کەسی کوردی هەمیشە ئامادەیە کە درۆی بێ ترس بکا،پێویستی وایکردوە کە جۆری تایبەتی لێ دابهێنێ. بۆیە لەسەری پێویستە یان بچێتە مەرقەدێکی دوری سەرگردەکان کە پێیانوایە سزایەکی گەورەی ئەو کەسە دەدا کە بەدرۆ سوێند بخوا، یان داوای لێبکرێ کە سوێند بە تەلاَق بخوا. لە حاڵەتی یەکەمدا پێش ئەوەی بگاتە کۆتایی سەفەرەکەی توشی نۆبە شۆکێك دەبێ و ڕاستیەکە دەڵێ. ڕەنگە لە شێوەی دووەمی سوێند خواردنەکەدا فێڵ بکا. لەوتەکانیدا فێڵ دەکا بەڵام هەمیشە شکست دەخوا(وەك ئەوەی بەسترابێتەوە یان قورگی گیرابێ) ئەگەر سوێند بە تەلاَق بخورێ ئەوا دەبێ

سوێند خۆر لە(٣ – ١٢) جار تەڵاق بخوا بەپێی ژمارەی ژنەکانی، ئەگەر دواتر زانرا کە سوێندەکەی درۆیە، بەشێوەیەکی یەکسەری ژنەکانی لەو تەڵاقدراون، واتە کەس و کارەکانیان دێن و دەیان بەنەوە، ئەویش وەك ئەوان شکۆی دەشکێ، ئەگەر دوای سوێند خواردن بەتەڵاق دەستیان بۆببا ئەوا دەکەوێتە بەرتوڵەی کەسو کارەکانیان، دووبارە هێنانەوەشیان کارێکی وەها هاسان نیە چونکە لە شەریعەتی ئیسلامی دەبێ ئەو ژنە تەڵاقدراوە شوبە پیاوێکی دی بکاو لێشی تەڵاق بدرێ پێش ئەوەی بتوانێ بگەڕێتەوە لای پیاوەکەی یەکەمی.

ئەم بەشە بەژماردنێکی کورتی عەشیرەتە کوردە سەرەکیەکان تەواو دەکەم، واتە ئەو عەشیرەتانەی کە لەنێوان هەردوو زێدا نیشتەجێن.

عەشیرەتی دزەیی، لەسەر نیوەی ناوچەی هەولێردا نیشتەجێن کە پێکهاتوە لە بیابانی(قەرەچوغ) (قەراج) گەندێناوەو بەپیتترین بەشی دەشتی هەولێرەو، دانیشتوان دەبەخشێتە ئەو گوندانەی کەوا واحیسب دەکرێن کە عەشایەری نین لە ناوچەکانی دیکە، ژمارەی کەسانی ئەو عەشیرەتە(٣٠) هەزار کەسدەبێ دەتوانێ لەمەیداندا (٦٠٠) سوار چاك و (٤٤٠٠) چەکداریش کە باش پرچەك کراون ئامادەکا[١١] ئەندامانی ئەم عەشیرەتە بەر لەسێ سەدە لەگردەکانەوە هاتونە خوار و لە هەندێ گوندی دەوروبەری(قوشتەپە)[١٢] نیشتەجێبون، بەردەوام(خاوە)یان دەدا عەرەبەکان، بەرلە (٦٠) ساڵ بەرفراوان بون و بەخێرایی دەستیان بەسەر ئەو زەویانەدا گرت کە تا دیجلە درێژ دەبێتەوە. جێگای ئەو عەرەبە بەدوانەیان گرتەوە کە لەناوچەکە پێشتر بە هەوەسی خۆیان دەهاتن و دەچون. تەنانەت دەگەیشتنە نزیك شاری هەولێریش، گوندەکان هەر چەندە کوردین، بەڵام بەزۆری عەشایەری نین. لەباکوری ناوچەکەش عەشیرەتی (کوردی) نیشتەجێن کە عەشیرەتێکی بچوکە زۆر چالاکە، هەر ئەویش توانیویەتی تا ئێستا بەر بەدزەییەکان بگرێ و سەرکەوتوش بوە لەوەداو، لە(١٥) گوند نیشتەجێن، هەر ئەو عەشیرەتە لقێکی لە کۆیە هەیە لەدەرەوەی قەزای شەقڵاوە، کە بە پلەی یەکەم عەشایەری نین.

قـەزای شـەقلاوە جگـە بەشـی لای خـوارەوەی ڕۆژئـاوای کـەهی عەشـیرەتێکە بەناوی (کورە) ئـەوی دی هـی (هاوپـەیمانی خۆشـناوە) بەگشتی و نزیکـەی(١٠٠) گوندن و هەریەکەیان لە(١٠٠٠٠) کەس زیاترن.

عەشیرەتە سەرەکیەکانی ناوچەی ڕانیەی باکوری زێی بچوك بریتین لە پـیران و ئاکۆ و پشتدەر، پیرانەکان لە هاوپەیمانی بلباسدان، ئەوان ژمارەیـان کەمـە بـەلاَم بـەهێز و پـشت ئەسـتورن. عەشـیرەتی ئـاکۆ لـە چـەند لقێـك پێـك دێ بـەلاَم پەیوەندیەکی لاواز بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، ئـەوان لەچیا بـەرزەکانی بـاکوری ڕانیەو قەلاَدزێ نیشتەجێن، ژمارەی گوندەکانیشیان لەنێوان(٤٠) تـا (٥٠) گونـدە. ئەوان لـەجۆرە کوردانێکن کـە لـە هـەموان ڕەوەنـدترن. دەڵـێن ئـەوان تۆزێـك لـە ورچـەکان باشــترن. جــێ و شوێنیــشیان قەلاَبەردینەکانــە(مەبەســتی چــیایە ســەختەکانە). پــشدەر لــە بــەهێزترین عەشــیرەتەکانی باشــوری کوردســتانن. سەرۆکەکەیان لە قەلاَدزە، لە باکوری زێی بچوك دادەنیشێ، بەلاَم گوندەکانیان لـە سنوری فارسیەوە درێژ دەبێتەوە بـەلای ڕۆژهەلاَتـدا تـا نزیـك شـاری سـلێمانی لـە باشور. ڕەنگە چەکو تفاقیان لە دزەییـەکان پـتر نـەبێ، بـەلاَم لـە توانـای شـەڕدا، لەوان بالاَترن.

بە ئاشکرا دیارە کە لە ناوچەی ڕەواندوز عەشیرەتی گەورە نیەو سەرۆك هۆزی بە دەسەلاَتیش لەوێ نیە. (زراریەکان) لە باکوری زێی بەستۆرە نیشتەجێن ئـەوان نزیکەی دوازدە گوندیان هە یە. لەدوای ئەوانیش لقە جیاوازەکانی (سورچـی) دێـن کە شوێنی نیشتەجێیان بەلێواری کەناری زێی گەورەوە درێژدەبێتەوە بـۆ بـاکوری ڕەواندوز. ئەوان نزیکەی(٤٠) گوندیان هەیە، کـە هەریەکـەیان لـە(٢٥٠) کـەس پـتر نیە، ئەوان لە شەڕی یەکەمی جیهانی دەردەسەرییان چەشتوە. لـە دەورو پـشتی ڕەواندوزدا کۆمەڵ و دەستەی خەڵك دەبینرێن، ئەوان(٧) تا(٨) گوندیان هەیە کـە لە دۆڵەکانی چیاکاندان، ئەوان هەمویان لە بنەچەی یەکێك لە خانـەوادەدیارەکانی شارن ئەو گردانەش کە دەکەونە سـەر بەشـی سـەرەوەی(زێـی ڕەوانـدوز) شـوێنی عەشیرەتی باڵەکە، ئەوان زۆر بە دەسەلاَتن، چونکە دەسەلاَتیان بەسەر ئەو ڕێیەدا هەیە کە لە فارسەوە دێت. خەڵکەکە هەژارو دورە کێشەن، بـەلاَم ئاغاکـان زۆرن و لە تالاَنکاری سەر ڕێگای گشتی بترازێ شتێکیان نیە خۆیانی پێوە خەریك بکەن.

نزیکەی (٦٠) گوندیان هەیە، زۆربەیان پڕن لە دانیشتوان، بەشی هەرە دوری باکوری ڕەواندوزیش بەدەست عەشیرەتی(شێروان) و (برادۆست)ە وەیە، ئەم دوعەشیرەتەش دابەش دەبن بۆ لقی بچوك، بەلأم بە تایبەت عەشیرەتی یەکەم هەموو یەکگرتون و دان بەیەك سەرۆکدا دەنێن، خەڵکەکەی ئەو عەشیرەتە زۆر ڕەوەندین و ڕێگا نادەن بچیتە گوندەکانیانەوە مەگەر دەگمەن. ئەوان بە هۆی شەڕەوە زۆریان چەشتوە: لە دڵڕەقی ڕوسەکان و کەڵبەی برسیەتی.

ئێستا تەنیا عەشیرەتە ڕەوەندەکان ماون کە ئەوانیش سێ عەشیرەتن(هەرکی) و (خەیلانی) و (بۆڵی)، لەنێوانیاندا هەرکی بە دەسەلأترینیانە. ژمارەیان دەگاتە(٢٠٠٠٠) کەس هەندێکیان بەدرێژایی ساڵ لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە کە دەکەوێتە سەر چیاکانی سنوری تورکی – فارس، لەکاتێکدا کە هەندێکیان بەرەو ناوچەی ئاکرێ دێنە خوارێ و هەندێکیان کە ژمارەیان(٨٠٠٠) کەسە ناوچەی ڕەواندز دەبڕن و لەدەوروبەری(دێرێ) و ئاوی بەستۆڕەدا دەمێننەوە، هەرکیەکان بە ئازایەتی بەناو بانگن پیاوەکانیان چەکی نوێیان هەیە تێپەڕینیان بە وڵاتدا وەك ڕەوە کوللەیە، واباوە کە هەرچی بێتە ڕێیان تالأنی دەکەن. بەلأم ئەو عەشیرەتە لە کاتی کە لە هەولێر بوم هەڵسوکەوتیان زۆر باش بوو. ئەو بەشەی عەشیرەت کە دەچنە ناوچەی ڕەواندوز لە ژێر فەرماندەی سەرۆکێك یان دوسەرۆکی بە دەسەلأتدان. تورکەکان نەریتێکیان هەبوو کە پیاو ماقوڵێکیان هەڵ دەبژارد کە لەپێش حکومەتدا بەناوی ئەوانەوە قسەی دەکرد.

هەرچی خەیلانی و بۆڵیە هەریەکەیان لە چەند لقێکی بچوك پێکدێن، بێ ئەوەی هیچ یەکێکیان سەرۆکێکیان هەبێ، بەوەش بەناو بانگن کە مەیلی دزییان زۆرە. خەیلانیەکان نزیکەی(١٠٠٠) کەس دەبن و، لە ناوچەی چیاکانی باکوری باڵەکەوە دێن و ڕەشماڵەکانیان لە دەورەی هەولێر هەڵدەدەن، لەکاتێکدا(بۆڵی) یەکان لە بەشی باشوری باڵەکەوەدێن تاوەرزی زستان لە ناوچەی کۆیە بەسەر ببەن.

◆

# بەشی پێنجەم

## دانیشتوانی شارەکان و میللەتانی دیکە.

لە (نەبی یونس)[1] ەوە، مەرقەدی یونس پێغەمبەر(س) — کە دەکەوێتە سەر لێواری دیجلە بەرامبەر موسڵ. وەك سەرەتاو، بە شۆڕبونەوە بۆ هەولێر و ئاڵتون کۆپری[3] و کەرکوك و[4] و کفری و(قزل ربات) [6] (قزرابات) تا مەندەلی، هێڵێك دەبینی لە کۆمەڵێ شار خەڵکەکەی بە تورکی قسە دەکەن. ئەمەش ئەو هێڵەیە کە ئەو ناوچانە جیادەکاتەوە کە زۆرینەی کوردیان تێدایە لەگەڵ ئەو ناوچانەی کە زۆررینەیان عەرەبن. کەرکوك بنکەی سەرەکی ئەو دانیشتوە تورکانەیە بەرلە شەڕی (یەکەمیش) ژمارەی دانیشتوانی(٣٠٠٠٠) کەس بوە و هەندێ گوند لە نزیك کەرکوکیش هەن کە تورکی قسەدەکەن. لەکاتێکدا شارەکانی دیکە کۆمەڵگای جیای تێکەڵن لە کورد و عارەب.

ئەو دانیشتوانەی بنەچەیان تەم و مژاویە خۆیان زۆرجار دەڵێن ئێمە تورکمانین، بۆ ئەوەی دەری بخەن کە لە عوسمانیەکان نین، بەلاّم بەگشتی خەڵك بۆ ئەوە دەچێ کە لەو نیشتەجێیانەوە بن کە سەلجوقیەکانی تێدا نیشتەجێبون، چونکە بە ناوچەی پارێزراوی دەسەلاّتی خۆیان دادەنان. سەلجوقیەکان لە میللەتە تورکەکانن کە لە سەدەکانی یازدە و دوازدە لە جەرگەی ئاسیای ناوەڕاستەوە، کە نیشتمانی ڕەسەنی ئەوانە، بەرەو ئاسیاو میزۆپۆتامیا هاتن و دەسەلاّتی خۆیان دامەزراند. دوایی کەوتنە ژێر دەسەلاّتی نەوەی(عصمان)ی بە هێز و(عوسمانیش) دامەزرێنەری(عوسمانلی)یە واتە، ئیمپراتۆریای عوسمانی.

زمانی تورکانی میزۆپۆتامیا لە زمانی قوستەنتنیە جیایە، چونکە لە هی ئەوێ قورسترە، هەندێ پیتی قورگی سوك کراون لەو زمانانەی کە لە پایتەختدا زیندو

کراوەتەوە تاکو بەها ڕەسەنیەکە بپارێزێ، هەندێ تورکمانەکان بۆ ئەوە دەچن کە کەرکوك کورتکراوەی هەردو وشەی(قەلاّی سەلجوقی) [٧] بێ.

لە هەولێر چیرۆکێکی بەربلاّو هەیە کە بۆ ئەوە دەچن: دانیشتوانەکانی لە ڕەچەڵەکی سەربازگەیەکی سەربازە فارسەکان بن(ڕەنگە خەڵکی ئازەربایجان بن کە دانیشتوانەکەی بە تورکی قسەدەکەن) کە نادر شا لە دوای خۆی بە جێهێشتون کاتێك لە ساڵی(١٧٣٢) شارەکەی داگیرکرد. لە ڕاستیدا هەندێ لە دانیشتوانی هەولێر لەڕوی قۆزی و جوانی بە فارسەکان دەچن زیاتر لەوەی بە هەر میللەتێکی دیکەی میزۆپۆتامیا بچن، بەلاّم چونکە لەڕوی ئاینەوە لەسەر مەزەبی سوننەن[٨]، بێ ئەوەی هیچ مەیلێکی شیعەیان هەبێ، بۆیە ئەم بەڵگەیە لەڕوی ئەوبیرۆکەیەی پێشتر دەوەستێ.

تەنیا دوو شوێن هەن کە دانیشتوانەکەی بە تورکی قسەدەکەن، کە بەوردی گرنگیان پێداوە ئەوانیش هەولێر و ئاڵتون کوپرین، ئەوەی دواییان دەکەوێتە دورگەیەکی ناوەڕاستی زێی بچوك کە لە هەر دوو لایەوە بە دوو پرد بە وشکانی دەبەستێتەوە. دانەوێڵەی ناوچەکانیدەوروبەری و ئەو مێوژەی لە ناوچە بەرزەکان دێن لێرە دەخرێنە سەر پشتی کەڵەکەکان و بەرەو بەغدا شۆڕدەکرێنەوە. خەڵکەکەی زۆر هەژارن و توند و تیژی و دڵرەقیان پێوە دیارە. دەموچاوی ناشیرین و نەریتی پیس و پۆخڵیان هەیە. (ئاوا: و.ع) ئەوان هاوشێوەی چینە گەجەریەکانی خەڵکی کەرکوکن، کە بەدڕەوشترین و بەڕەڵلاّترین کەسانی پۆلیس و ئەوانەش کە دەچونە ڕیزی سوپای تورك لەوانەبون. لەگەڵ هەولێردا جیاوازیان ئاسمان و ڕێسمانە، کە ڕەنگە حاڵی ئەوان بە تێکەڵبونی خوێنی کوردی لەگەڵیاندا باشتربوبێ. یەك لە گەرەکەکانی شار هەموویان کوردن، لە گەڵ یەکێکی دیکەش دا لە کوردەکانی چینی خوارەوە دەچن، لە ڕوکارو جل و بەرگدا. هەموویان بە کوردیەکی ڕەوان قسەدەکەن بەلاّم زمانی ماڵەوەیان تورکیە.

لە شارە بەرزەکەش(مەبەستی سەرقەلاّیە) کە دانیشتوانەکەی(٦٠٠٠) کەس دەبن پاکترین ڕەگەزی تورکی لەوێیە. ئەوەی لەوێدایە حاڵ و باڵیان باشە و خاوەن خان و زەوین. پیاوەکانیان جۆرە جلێك لەبەر دەکەن کە لەو جلانە دەچێ کە سەرۆکە کوردەکان لە دەشت لەبەری دەکەن، مەبەستم ئەو جلە شوڕەیەکە لە ئاوریشم

یان پەمۆ دروست دەکرێ و تا سەر پێ دێ لەسەرەوەش چاکەتێك و لەسەر ئەویش عەبایەکی فراوانی بە نرخ. ئەوان بە گشتی باریك و لاوازن ئادگاری باز و دەموچاوێکی باریکیان هەیە، ئەگەر بە دەموچاوی کوردەکان بەراوردی بکەین، لە جوڵەدا زۆر رێکن زۆربەیان دەستیان تا ئەو پەڕی ڕادەناسك و جوانە. جامانەی سەریش بە هی کوردەکان دەچێ بەلاّم بچوکتر و پاکترە، ئەوانەی دەچنە تەمەنەوە یان تەربۆش یان سەر پۆشێکی زەرکەشکراو لەسەر دەکەن، بەلاّم ئەوانەی کە مەلێکی ئاینیان هەیە عەمامەیەکی سپی یان شینی کاڵ لەسەر دەکەن، ئەگەر لە بنەچەی پێغەمبەریش بن(د.ع) ئەوا شریتێکی قوماشی سەوز لە دەوری تەربوشەکە دەئاڵێنن. هەرچی جلی ژنانە ئەوانەی کە لە دەرەوەی ماڵ دەبینرێن، ئەوا ڕەنگی شین و درێژە، بەلاّم لەو جلە کاڵترە کە ژنە کوردەکان لەبەری دەکەن. دەموچاویان بە پەچەیەکی هەمان ڕەنگ داپۆشراوە پەچەکەش دەمامکێکی ڕەشی پێوەیە کە لە مادەیەکی دڕ دروستکراوە و دامێنەکەی ڕەنگی زەردە. لەبەر ئەوەی پەچە کە جێگای کونەچاوی تێدانیە بۆیە هەمیشە هەڵدەدرێتەوە بۆ ئەوەی ژنەکە ڕێگەی خۆی ببینێ، بەلاّم هەر هێندەی ئەوروپیەکی بەرامبەر هات ئەوا دادەرێتەوە. ژنان پێلاوێکی زەردی لە پێستە دروستکراو لە جۆری(ویلینگتۆن) لەپێدەکەن کە تا نیوەی پوز درێژە، ناگاتە ئەژنۆ. کچان تا تەمەنی دوازدەو چواردە سفورن، چاکەت و جلی ڕەنگ جوان لەبەر دەکەن کلاّوێك لەسەر دەکەن بە پارەی زێڕ بە بازنەیی نەخشاوەو لە ناوەڕاستەوەش پارەیەکی زێڕی جوان شۆڕبۆتەوە(چەناغەی پێدەڵێن) تورکەکان لە ماڵ و خواردن و خانو و نەریت بە کوردەکانی دەوروبەریان دەچن، تەنیا ئەوە نەبێ کە لەوان پێشکەوتوترن. ئاغاکان دیوەخانەکانیان جوان بنیات نراوە و لە(قایە) (کەرپوچ) دروستکراوە. هەیانە کە زەویەکەشی بە مەڕ مەڕ داپۆشراوە و کۆڵەگەی لەناوەوە هەیە. ئەوانەی کە لە لێواری قەلاّدان [٩] بانیژەی هەیە کە مرۆڤ دەتوانێ تێیدا سەرنجی ئەو زەویانە بدا کە ماوەی چەند میلێك ڕاکشاون. ژورەکان لە دەوری حەوشەکەدا بنیاتنراون، کە کەمێك دارو درەختی تێدا ڕوێنراوە. ئاغاکان لەو دیوەخانە پێشوازی لەومیوانانە دەکەن کە دێنە شار،

وەکچۆن جێگا دەدەنە ئەو کوردانەی کە لە گوندەکانەوە دێن. هەر سەرۆك هۆزێك موشتەری یەك یان دوو ئاغای شارە .

ئەو پەیوەندیە بە درێـژایی چەند نەوەیەکـەوە دروست بـوە. کـە ڕەنگـە ئـەو پەیوەندیە لەگەڵ خانەخوێکەیدا خراپ بوبێ، بەڵام بە دەگمەن ئەو سەرۆکە ڕێ ی لای یەکێکی دیکە دادەگرێ.

ئاغا بۆ ئەو پێشوازیە داوای بەرامبەر ناکا. بەڵام بۆتە نـەریت کـە ناوەنـاوە لـە گوندەوە دیاری بۆ بنێرن وەك پەنیر و میوە. وەکچۆن هەرکاتێکی کـە پـشێویەکی عەشایەری دروستدەبێ ئـەوا ئـەو موشـتەریە پێویـستە بەرژەوەنـدی ئاغاکـەی لـە گوندا بپارێزێ. وەکوچۆن ئەو ئاغایەش نوێنەری ئەوە لە شار. هەندێ لە ئاغاکانی شار جلی ئەوروپی لەبەر دەکەن، لەکاتێکدا کە زۆربەیان جلێکـی نیمـچە ئـەوروپی لەبەر دەکەن لەکاتی نانخواردن. ئەوان لەسەر کورسی دادەنیشن و قاپ وو چـەقۆ و چەنگاڵ و کەوچك بەکاردێنن، بۆ هەموو ژەمێك لەگەنێکی پاك دێنن، بـەڵام سـێ شتەکەی دیکەی ناگۆڕێن. قاپە کانیشیان لە کوردەکان جۆراو جۆرترن.

نەریتی ژنهێنان لە شاردا جیاوازە لـەوەی کـە لەگوندەکانـدا هەیـە، بەتایبـەت، نەریتی وایە کە کەسوکاری کچەکە جیازی پێویست ئامادەبکەن، لە جیاتی ئەوەی کوڕەکـە پارەکۆبکاتــەوە تــا ژنەکــە بکــڕێ(ئــاوا: ئــەو دەیــەوێ بیخــوازێ: و.ع) سەرپۆش و دابڕینی ژنان لە شاردا زۆر توند و پتەوترە.

ئاغاکانی شار ژیانێکی ئارام و جێگیریان هەیە، چونکە هەنـدێ گونـدیان هەیـە، کە ناوە ناوە بۆی دەچـن و گرنگیـەکی زیرەکانـەش بـە کـشتوکاڵ دەدەن. ئـەوان هەمیشە ئارەزو یـان لەوەیـە توانـا زەینیەیـەکان پێـشخەن، ڕۆژنامـە بـەڕێکوپێکی دەخوێننـــەوە، بـــەئازادیش بـــاس لـــە سیاســـەتی ئـــەوروپی و ڕۆژهـــەڵات دەکـــەن. یەکدوانێکیان پارەیان بۆ وەبەرهێنان لـە ئـەوروپا هەیـە، ڕەنگـە لـە بـارودۆخێکی باشتر ئـەو چاکسازیە کـشتوکاڵیانەی دوایـی بخەنـە نـاو کارەکانیـان. پەیوەندیـە بازرگانیەکان فـراوان بکـەن. سـەرداری خانـەوادەکان کـاری حکومـەتی لـە پایـەی خۆیان بەکەمتر دادەنێن، بەڵام بەزۆری هانی کەسوکاریان دەدەن لەگەنجەکان کـە بخزێنە ناو کاری ڕەسمـی حکومـەت. سەرچـاوەی سـەرەکی داهاتیـان گەنمـە، لـە

دواساڵەکانی شەڕدا پارەیەکی زۆریان کۆکردەوە، ئەوان لە سەرۆکە کوردەکان کەمتەماعترنین، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان کە کێڵگە بخەنە سەرکێڵگە.

هەندێ لە ئاغا گەنجەکان تارادەیەکی باش بە کەش و فش و خۆڕانانن، ئەوان لە گوندەکاندا سواری ئەسپ دەبن و تاژیان پێیە، هەندێ جار دەبینی لەشاردا پیاسەدەکەن لەکاتی ئێوارانـدا، سەریان بەرزکردۆتەوە و عەباکانیان با بەملاو بەولایدا دەبا لەپشتەوە.

ژمارەیەکی زۆری تورکەکان لە چینی ناوەڕاست، لە کەرکوک و هەولێر خاوەن زەوین و ئارەزوویانە داهاتیان زیاد بکەن، ئەوانە ئەفەندیەکانن — واتە شارەزاییان لە خوێندنەوە و نوسین هەیە، جل و بەرگی ئەوروپی لەبەر دەکەن و لە پۆستە حکومیەکاندا کاردەکەن، وشەی ئەفەندی بەرامبەر بە(سێر)ی ئینگلیزیە، لە قسەکردندا بەکاردێ کاتێک لەگەڵ پیاوێکی بەڕێزدا قسەدەکرێ، چونکە ناونیشانێکە لە بەرامبەر وشەی(esquire ) دێت لە زمانی ئینگلیزی، ئەم ناوە بۆ هەموو پیاوانی ئاینی دەگوترێ لە شار. هەروەها بۆ پلە و پایەی بچوکی ئەوانەی لە سوپادان، لە ئەفسەر و پیشەگەرو نوسەران و کارمەندانی ڕاژەی حکومی، هەر کەسێ توانای خوێندنەوەو نوسینی هەبێ و بای ئەوەندەبێ کە دەریخا دەبێتە ئەفەندی.

بەڕێوەبەرایەتیە حوکومیەکانی تورك پڕ بون لە ئەفەندی. هەمووشیان لە تەمەڵی بەدخوبون. هەموو ڕۆژێ لە چایخانەکان دەیانبینی، بەدەم و چاوێکی چڵکن، یاخەکانیان پۆخڵەو بۆینباخەکانیان جوان نەبەستراوە دوسێ دوگمەی پانتۆڵەکەیان باش دانەخراوە ئەو جۆرە کەسانە وایان کردوە کەوشەی(ئەفەندی)مانای خۆی نەمێنێ و ببێتە ناوێکی نزم. من حاکمێکی سیاسی دەناسم کە بەتوڕەییەوە ئەو خەڵکانەی دەردەکرد لە بەڕێوەبەرایەتیەکەی کە بە ئەفەندی بانگیان بکردایە. هەر چەندە لەقسەکردندا ئەو دەربڕینە کارێکی دروستە. کەرکوك و هەولێر، بە تایبەتیش کەرکوك ژمارەیەکی زۆری کارمەندیبۆ حکومەتی تورکی دابین دەکرد. حکومەتیش ئەوانی پێباشتربوو چونکە زمانی دەوڵەتیان دەزانی.

لەدوای پلەی(ئەفەندی) دوکاندارەکان دێن،ژمارەیان زۆرە، چونکە هەولێر بازاڕێکی گەورەی هەیە،دوای ئەوانیش ئەو کەسانەن کە لە پێستە خۆشکردن و دروستکردنی لباد کاردەکەن و دوای وان کاروانچییەکان دێن یان خاوەن ئێستر و کەر کە تاکە هۆکاری گواستنەوەیە لە بازرگانیدا. لە ناو ژنانیشدا هەن کە ژیانیان بە رستنی لۆکە دابین دەکەن، بەڵام زۆربەیان بۆ نانی ڕۆژ پشت بەمێردەکانیان دەبەستن. خەڵکی هەژارو ڕەشوڕوت کەمن، دەسکەوتنی کرێکار کارێکی زۆر ئەستەمە.

جیاوازی نێوان خەڵکی هەولێر و ئەو کوردانەی لەدەوروبەریدا نیشتەجێن، بەپلەی یەکەم هەمان ئەو جیاوازیانەیە کە لە هەموو شوێنێك لە نێوان شارو گوندا هەیە.

هەولێری ڕقی لەکوردە(ئاوا!: و.ع) بە نەزان و وشك و کەللە ڕەقی دادەنێ و لەکاتێکدا کوردەکەش پێی وایە هەولێری ژنانەو بێ ڕەوشت و گەندەڵە(ئاوا!: و.ع) لەگەڵ ئەوەی کە خواردنەوە و خراپەکاریەکانی دیکە لە هەولێردا هەن بەڵام لەوێ باشترە لەشارەکانی دیکەی(میزۆپۆتامیا)کەس لە ئاغا گەورەکان شەراب ناخۆنەوە و ئەنجومەنی شارەوانیش سوورە لەسەر ئەوەی ڕێنماییەکانی بێگەرد بن و بەسەر هەموو خەڵکدا جێبەجێکرێن.هەمو ئەو بەد ڕەوشتانەی لەشاردا دەیبینی لە دەرەوە ڕاهاتون، ئەمەش گومانی تێدانیە.

لەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی کۆیە هەمویان کوردن، بەڵام زۆر بەخەڵکی هەولێر دەچن، ئەگەر چی وەك ئەوانیش پێشکەوتونەبن. ئاغاکانیان زیاتر بە ئاغا عەشایەریەکان دەچن نەك ئاغاکانی هەولێر، هەرچی خەڵکی ڕەواندوزیشن ئەوا لەڕوی شارستانیەوە لە دوای لادێیەکانی دەشتی هەولێرەوەن.

هەندێ تایفەی جولەکە لە هەولێرو کۆیە و گوندی بێتواتە هەن کە دەکەوێتە سەرپەڕی ناوچەی خۆشناوەتی.لە (باتاس) لە دەشتی هەریریش هەن، لە زۆر لە گوندە کوردیەکاندا پیاو توشی خێزانی تاکتاکەی جولەکان دەبێ کە کۆگای بچوکی گشتییان هەیە.

ئەو زەویانەی نێوان دوزێ بەگشتی کشتوکاڵین، بازرگانی لەوێ بەپلەی دووەم دێ. بۆیە جولەکەکان پایەیەکی بەرزیان نیە وەك ئەوەی لە بەغدا هەیانە. لە

ڕاستیدا کەسانی دەوڵەمەندیان نیە. هەندێ بازرگانیان لە هەولێر هەیە، ژمارەیان کەمە. هەندێ لە دوکانە سەرەکیەکانی کۆتاڵ فرۆشی جولەکەکان بەڕێوەی دەبەن. تایفەکە زۆربەیان خەریکی پێستە خۆشکردن و چنینن، کاری دروستکردنی شەڕابیش هەر ئەوان دەیکەن کە لە دڵۆپاندنی مێوژ دەکرێ.

ئەو پیشە و ئەوکارە بۆ موسڵمانان حەرامە. هەرچەندە هەندێکیان شەراب دەخۆنەوە، خەڵك ڕونادەنە جولەکەکان و بە چاوی سوکەوە سەیریان دەکەن. بەزۆریش لە گوندەکان بەخراپی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدەکەن. هەر چەندە من نەمبیستوە کە چەوساندنەوەیەکی بە بەرنامەو دوژمنکاریەك هەبوبێ و بوبێتە هۆی خوێنڕشتن. زۆر جار کچەکان دەڕفێنرێن و داوایان لێدەکەن ئاینیان بگۆڕن[١٠] . ئەگەر کوردێك ڕقی خۆی لە فەرمانبەرێك دەربڕێ دەڵێ(تەنانەت جولەکەش لەو باشترن). ئەگەر بیەوێ ڕەوشت چاکی عەشیرەتەکەی دەبڕێ، دەڵێ(تەنانەت جولەکەش دەستی بەسەریاندا دەشکێ).

جولەکەکان بەزمانی خۆیان قسەدەکەن و پێ ی دەنوسن، ئەوان لە شارەکاندا لەجیاتی کوردی و تورکی پێیان باشترە بە عارەبی قسەبکەن.

دوگوندی کلدانیەکان هەن ئەوانیش(عەنکاوا) [١١] کەسێ میل لە هەولێر دوورە و گوندی(ئەرمۆتا) لە دەرەوەی شاری کۆیەیە. تایەفەی گەورەشیان لە شەقلاوە و کۆیە هەیە، هەر چوار شوێنەکەش کەنیسەیان هەیە، ژمارەی گشتی[١٢] گاورەکان نزیکەی (٤٠٠٠) کەسن و (٢٥٠٠) کەسیان لە عنکاوە نیشتەجێن. کەلدانەکان لە بنەچەدا وەك نەستوریەکان بون، بەلاَم سەدەی شازدەی زاینی ناچارکران دان بەدەسەلاَتی کلێسای ڕۆمیدا بنێن. تایەفەی گەورە لەوخەڵکانە لە باکوری زێ ی گەورە، لە لێواری موسڵدا هەن،دەڵێن بەر لەدوو سەدە یان سێ سەدە پارچە زەویەکی گەورە لەتەنیشت ڕەواندوز لەبەر دەستی ئەواندا بوە، دانیشتوانی دواگوندیان، ڕایانکرد کاتێك ڕوسەکان لە ساڵی(١٩١٦)دا شکان. ئێستاش لە باکوری شارەکەدا دەشتێك هەیە پێی دەڵێن دەشتە دیانە. ڕەنگە بەرلە دەرکەوتنی موحەممەدیەکان گاورەکان خاوەنی ئەو زەویە بەرزو نزمانە بوبن کە لە نێوان دیجلە و دامێنی گردەکاندایە، لە ڕۆژهەلاَتی کەرکوك و بەسەرەوە، یان بەشی هەرە گەورەی ئەو زەویانە. ئەو گاورانە بەڕەچەڵەك(سامین) زمانی کتێبە

پیرۆزەکانیان سریانیە، زمانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام هەموویان کوردی دەزانن.

ژمارەیەکی کەمیان لەسەر مەزەبی(پرۆتستانتن)، ئەوان بەپلەی یەکەم لە موسڵدان بەبیرم دێ کە پیاوێك ئەرزو حاڵێکی پێشکەش کردم کەتکای لێدەکردم بیکەمە(ئینگلیزی) وا دیاربوو کە هەرایەکی لەگەڵ قەشەکان هەبوو بۆیە ئەو داوایەی کردبوو. ئەو قەشانە نەفرەتێکن توشی ئەو تایەفانەبون(ئاوا! : و.ع) لە عەنکاوە نزیکەی شەش قەشە هەن لە جێگاکانی دیکەش سێ چوارێك هەن، زۆربەیان خوێندەواری باشن و دەمارگیرن. ئەوەندەی کە من جیای بکەمەوە ئەوان بیرۆکەیەکی لاوازیان هەیە بەرامبەر بە شتی باش و شتی خراپ، ئەوان پلەی خۆیان بۆ زاڵبون بەسەر خەڵکەکەدا بەکاردێنن.

ئەوان هەڵسوکەوت لەسەر ئەوبنچینەیەدەکەن کە پێشڕەوی خەڵکن لە کاروباری دنیایی و دینی دا. بەگشتی بەناوی ئەوانەوە قسە لەگەڵ حکومەت دەکەن، جلەکانیان تەیلەسانێکی دریژی ڕەشە، ئەوان کلاوێکی ڕەشیان لەسەرە کە بەچەندین شریتی ڕەشی بریقەدار پێچراوەتەوە.

هەمیشە وا ڕاهاتوین کە بە(قەلەڕەشەکان) ئاماژەیان بۆ بکەین.

مەترانی کەرکوك کە ناوی(ستیڤان)ە پیرە مێردێکی لە دڵاشیرینە و رەوشتێکی جوانی هەیە و هەست بە ئازارەکانی ئەو پیاوە ئاینیانە دەکا کە لەبەر دەستیدان ئەو هەمیشە بە تەیلەسانە گوڵڕەنگەکەیەوە دەردەکەوێ.

کلدانەکان هەرەمێکی کەهەنوتی ئاڵۆزیان هەیە کە بریتیە لە: پەتریرکێك و چەند مەترانێك و سەرۆکی قەشەکان و قەشەکان. ئەوانەش پۆستی ئاینی وان کە ئەو کەسی وەریدەگرێ دەبێ ڕەبەن بێ. هەمیشەش میراتین. مەبەستم ئەوەیە لە ناو هەندێ خێزاندا پاوان کراون. یەك بە دوای یەکدادێن، مام، کوڕی، برا، تاد، قەشەی ئاسایی ڕەبەن نین. گاورەکان چەندین سەدە لەژێر دەسەڵاتی ئەو موحەممەدیانە بون کەلە دەورووبەریانن، بۆیە ئەوان ئازایەتی خۆیان لەدەستداوە و ئێستا لاواز و گوێ لە مستن(ئاوا! : و.ع) ئەوان دەردەسەریان زۆردیوە، چونکە ئاغا چاوچنۆکەکان هەمیشە هەوڵی بەردەوامیان داوە بۆ ئەوەی دەستبەسەر

زەوی و مێگەلەکانیاندا بگرن. بەلاّم بەگشتی بەشێوەیەکی بە بەزەییانەو نەرم هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ، ئێستاش رایگشتی رێنادا زوڵمیان لێبکرێ.

لە کۆتایی شەڕدا حکومەتی تورکی فەرمانی قەتلوعامی لە عنکاوەدا، بەلاّم کوردەکان ڕەتیان کردەوە و ڕازی نەبون. لە ڕۆژانی پشێوی و نا ئارامی ئاسایشدا گاورەکان پارەدەدەنە یەکێك لە سەرۆکە کوردەکان(خاوە)بەمشێوەیەش بەرگری لێکردن و پاراستنی خۆیان دەکڕن. هەرچونێك بێ ئەوان ژیانێکی پڕ ترس و بیم و گومانی بەردەوام دەژین. ئەوان هەمیشە ڕقیان لە موحەممەدیەکانە(ئاوا! : و.ع) تەنانەت ئەگەر هۆکارێکیشیان نەبێ.ئەمەش خراپترین سیفەتیانە، ئەگەر ڕێگایان بدرێ هەموو ڕۆژ دێنەلای (حاکمی سیاسی) ئەو چیرۆکە درێژانە دەگێڕنەوە کە هەموی درۆن. ئەمەش شتێکی سروشتیە ئەگەر وایدانێین کە لەو ڕق و کینەیەوە پەیدابوە کە لە نێوان محەممەدیەکان هەیە(ئاوا! : و.ع)، بەلاّم گاورەکانی شەقلاّوە لە ناو ناوچەیەکی عەشایەری دەژین، ئەوان هەمیشە هەڵسوکەوتێکی باشیان لەتەکدا دەکرێ ئەوان سەرۆك هۆز لە ناوچەکە بە گەورەی خۆیان دەزانن. ڕێگەشیان دراوە کە موڵك و مالیان هەبێ لە بارێکی پڕ ئاسایش و ئارامی و کەسیش دەست لە کاروباریان وەرنادا.

گاورەکان لە شەقلاّوە و کۆیە کاری چنین دەکەن، ئەوانەی شەقلاّوە باخی میوەی فراوانیان هەیە،بە پلەی یەکەم ئەوان ئەو قوماشە خۆماڵیە دەکەن کە کوردەکانی شوێنە ڕوتەنەکان و گردۆلکە و بەرزەکان دەیکەنە جل و بەرگ(مەبەست ئەو جۆرەقوماشەیە کە لە مەرەزی بزن دروستدەکرێ و پێیدەڵێن کر) چنینیش وەك(ڕەنگ و ڕیس) موحەممەدیەکان بەکارێکی نزمی دادەنێن، ڕەنگە هەر ئەوەش بێ کەوای کردوە گاورەکان بتوانن لە ناوچەی گردەکان بژین، لە عەنکاوە و هەرمۆتە کشتوکاڵ دەکەن، لە عەنکاوە چەندین کێڵگەی سەوز و گەشاوەیان هەیە کە باشترین زەویەکانی دەشتی هەولێرە. ساڵی (١٩٢٠) (٦٠٠)تەن گەنم و(٦٠٠) تەن جۆیان بەرهەمهێناوە ئەمە جگە لە بەروبومی دیکە، لە ڕاستیدا ئەوان باشترین کشتیاری ئەو ناوچەیەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە عەنکاوە قەرەبالغەو زەوی تەواو بەشیان ناکا، کەچی گاورەکان ناچنە خانەی جوتیارانی سەرۆکە کوردەکان، تەنیا لەو موڵکانە نەبێ کە دەکەونە سنوری گوندەکانی ئەوان.

هەندێ لە گشتیارانی عەنکاوە گەیشتونەتە پلەو پایەی بەرز: بەتایبەت ناوی خواجە (سیبی) و خواجە(شابۆ) دێنم. خواجە نازناوێکی ڕێزگرتنە بۆ ئەو کەسانەی تەمەنیان تێپەڕکردوە، ئەو دوو پیاوەی باسمکردن لەڕێی ژنەوە دەگەنە هەندێ خانەوادەی بەڕێزی هەولێر — چونکە موحەممەدیەکان کچە گاورەکان دێنن هەرچەندە کە ڕێگەنادەن کچیان بدرێتە ئاینی دیکە — ئەو دوو پیاوە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی جوانیان هەیە، بەتایبەتی خواجە (سێبی)، ئەو خۆشەویستترین کەسی بەتەمەنی لای دڵی منە، لەوانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا ناسیومن. [١٣] دەسەڵاتی تورکی و بەریتانی، بەپێی توانا، ئەو دوو کەسەیان لە قەبلاندنی بەروبوم بۆ مەبەستی وەرگرتنی باج دانان، چونکە حوکومەت و خەڵکەکەش، وەك یەك. زۆر بەدەست پاك تریان دادەنان لەو موحەممەدیانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنران(ئاوا: و.ع) من لە هاتوچۆو گەشتەکاندا لەگەڵ خۆمم دەبردن، بەتایبەت کە بەروبوم پێدەگەیشتن دۆستایەتیان لەگەڵ سەرۆکە کوردەکانی دەشتی هەولێر هەبوو، خۆشەویستی لە نێوان هەردوولا هەبوو هۆیەکانیشی دیاربوو.

گاورەکان وەك یارمەتیدەر لە ماڵە موسڵمانەکان داوایان لەسەربوو، چونکە زیاتر پشتیان پێ دەبەسترا لەیارمەتی دەرەوە موحەممەدیەکان بەگشتی، من یارمەتی دەرەکەم لە کاتی کە لە هەولێر بووم، ناوی(فێردۆ) بوو خەڵکی عەنکاوە بوو. پیاوێکی ڕەزا قورس بوو(بەلام زۆر ئارەزوی لەخزمەتکردن بوو، دەست پاك و ڕاست گۆبوو، زیرەکیش بوو).

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو گاورانە مەراییکەر و زمان لوسن زۆر لەژنەکانیان دەدەن و ناکۆکی خێزانیان هێندەی هەموو گوندەکانی دی هەیە، لەگەڵ ئەوەی کە بەوە بەناو بانگن ماڵی دزراویان لەلایە، کەچی لەژیانی گشتیدا ڕێوشوێنێکیان هەیە کە تان و پۆیەکەی ڕاستگۆیی و دەستپاکیە. کە ئەمەش شتێکی دەگمەنە لە ڕۆژهەلات. ئاینی ئەوان گاورە، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر شپرێو بوە پڕ لە خورافەو بیرو باوەڕی کوێرانەیە، بەلام ئەگەر ئەو پیسیەی لەسەر لادەی لەژێرەوە

بەردێکی بەنرخ دەدۆزیەوە، ئاینێك کە بە ئازایەتی و سەبرێکەوە پارێزگارییان لێکردوە کە وێنەی نیە. بەهێز و پتەو لە ناوچەیەکدا کە دابڕاوە و پڕ لە وەحشیگەرییە، بەدرێژایی(١٢) سەدەی پڕلە چەوسانەوە(ئاوا!: و.ع) ئەوەی سەیرە کەتۆ دوسێ مەزار لەو پارێزگایەدا بدۆزیەوە کە دەڵێن هی هەواڵەکانی عیسان(س) موحەممەدیەکانیش هەموو بە پیرۆزی دەزانن.

لە شەمامك و (بیابانی قەرەچوغ) هەندێ گوندی پەرش وبڵاوی عارەبان هەیە کە هەموی هی عەشیرەتی(تەی)ە لە کاتێکدا کە کەناری چەپی دیجلە، لە نێوان هەردوو زێدا هەموو عارەبن و هۆزی (جبور) تێیدا نیشتەجێن.

(تەی) لە هەمو عەشیرەتە عەرەبەکان بەناوبانگترو کۆنترە. ئێستا ناوی یەك لەبەخشندەکانی(حاتەمی تەی) ناوێکی ناسراوە و لە بەشێکی گەورەی ڕۆژهەلاتدا ناوی هەیە[١٤] ئەو عەشیرەتە سەدەیەك بەر لە ئێستا بە ئارەزوی خۆی لە شەمامك و کەندێناوە و قەرەچوغ دەگەڕا. چونکە هەموی بیابانێکی وشك بوو. سەرۆکەکانی دزەیی لە قوشتەپەبون و سەرانەیان دەدا بە عارەبان. کوردەکان وردەوردە فراوانبون هەرکە گەیشتنە کێڵگەکانی ئەوان(عەشیرەتی تەی)، ئەوان پاشەکشەیان کرد بێئەوەی کێشە لە نێوانیان دروستبێ.(تەی)یەکان چونە بنکەی سەرەکیان لە نزیك(نسێبین) ، تەنیا کەمێکیان نیشتەجێبون و گوندیان دروستکرد و وەك کوردەکان دەستیان بەکشتوکاڵ کرد. بەلام عەرەب تەمبەڵ و سروشتێکی زۆڵیان هەیە(ئاوا!: و.ع) هەمو داواکاریەکانیان پێداویستی بەپەلەو دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەیە. ژیانێکی نیمچە ئاسودە. ئەوان وەك کوردەکان هەوڵی بەردەوام و حەزی کۆکردنەوەی سامانیان نیە. کاتێك کە بەلای گوندێکی عارەبان و گوندێکی کوردانـدا دەڕۆی، دەبینی کوردەکە هەموو زەویەکەی بە تەواوی داچاندوەو داوای زیاتریش دەکا، لەکاتێکدا کە عەرەبەکە تەنیا لە هەندێ شوێن ڕوی زەویەکەی هەڵکۆڵیوەو بەشەزۆرەکەی زەوی بەبەیاری جێهێشتوە. بەو هۆیەوە کوردەکان لە فراوانبونی بەردەوامن و گومانیشم نیە کە لەکۆتایدا لە هەموو ناوچەکەیان دەردەکەن.

عەرەب خاوەن میزاجێکی زۆر هەڵچوە، ئەمەش سروشتیەتی، دەمێك زۆرچالاکەو دەمێك شل و خاوە — بەلام کەیف خۆشەو قسە زۆردەکاو زۆر زیرەکە .......

هەرچی کوردەکەیە لەژیاندا لەسەرخۆو هێدی دەڕوا، بەردەوام لە کاردایەو بەڕێزە.......... [١٥] سەرۆکی عەرەب زۆربە ڕێزەو هەڵسوکەوتی لە تەکدا دەکرێ بەڕەچاوکردنی بنەچەکەی وە پایەی سەرەوە کە لەجێی دانیشتنی سەرۆکە لەدزەیی یەکانیش بەرز ترە دەدرێتە شێخ(حەنەش) کە لە عەشیرەتی(تەی)ە لەگەڵ ئەوەی کە نەدەسەلاتێکی هەیە نە دەوڵەمەندە. هەرسەرۆکێکی کوردی شانازی بەوەوەدەکا کە لەبنەچەدا عەرەبەو هەوڵدەدا ڕەچەڵەکی بگەڕێنێتەوە سەر پێغەمبەر(د.خ) یان یەکێك لەیاوەرانی. عەرەب، کورد وا حسێب دەکا کە بارگرانیە بەسەریەوە و ئازادی کارکردنی زەوت دەکا(ئاوا ! : و.ع).

ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی لە هەردو بەری دیجلە دا نیشتەجێن لە نزمترین عەشیرەتە عەرەبەکانن...... ئەوان لەو شێوە کشتوکاڵە شارەزان کە پشت بەناعور دەبەستیێ و بەهۆیەوە ئاوی پێویست دەستدەخەن. ئەوان لە ڕەشماڵدا دەژین و شوێنەکەیان جێناهێڵن مەگەر بەدەگمەن، ئەوەی کە دڵخۆشی دەکردم ئەوەبوو کە کۆڕی کوردەکانم جێدەهێشت، دوای چەند سەعاتێك لە دانیشتن، کە خەڵکەکەی هەموو بێدەنگ و بەڕێزبون. بۆ یەکێك لە ڕەشماڵەکانی(جبور) کە کۆمەڵێك دەست دەیانگرتم و لە کۆڕێك دایاندەنام لە دوری ئاگرێکی خۆش، لە کۆڕێك نەگەورەو نەبچوکی تێدابوو هەموو بەیەکجار قسەیاندەکرد دڵخۆشیەکی بەردەوامیان هەبوو قاقا پێدەکەنین، کورد ئەرستۆکراتیەکی لێزانە، لەکاتێکدا عەرەب لە نێوان دیموکراسیەت و گێرەشێوێنی دا دەهەژێ.

پێش ئەوەی ئەم بەشە تەواو بکەم، دەمەوێ ئاماژە بۆ عەشیرەتی(سارەلو) بکەم کە لەدوو گوند دادەنیشن لەسەر بەری چەپی زێ ی گەورە کە زۆر لە گوێر دورنیە، لەگەڵ شەش گوند یان زیاتر لەبەری بەرامبەر، ئەوان لەروی دەرەوە زۆر لە کوردەکان دەچن هەریەکێکیان بەشێوەیەکی ئاسایی کەواوسەڵتەی لەبەر دایە، وە لەبارەی کشتوکاڵەوە ڕکابەری گاورەکانی عەنکاوە دەکەن، بەڵام ئاینێکی تایبەتیان هەیە، دەڵێن ئاینی کاکەییە [١٧] ئەوانە لە باشوری کەرکوکیش هەن [١٨] لە ئاینی(عەلی ئیلاهی) [١٩] یەکان دەچێ لە نزیك خانەقین و مەندەلی لەسەر سنوری فارس.

موحەممەدیە ڕێکەکان بە ئەهلی کیتابیان دادەنێن (خاوەن نامە)، بەگریمانەی ئەوەی کە ئەوان دان بە یەکێك لە کتێبە ئاسمانیەکان دەنێن، جا ئەو کتێبە (تەلمودە) (کتێبی پیرۆزە یان (قورئان)، لە ڕاستیشدا لەبەر ئەوەی ئەوان باوەڕیان بە قورئان هەیە بۆیە بە تایەفەیەکی موسلمانەکان دادەنرێن. بەلاَم بیرو باوەڕیان و ئەو پەرستشانەی(تەقس) کە پیادەی دەکەن، لەخۆیان زیاتر کەس نایزانێ، گەلێ پەرستشی سەیری ئەخلاقیان دەدرێتەپاڵ.

ڕەنگە (سارەلو) پاشماوە ئاینێکی کۆن بن کە یەکتاپەرست نەبوبن، بەلاَم بۆ خۆخۆدەربازکردن لەچەوسانەوە بون بە ئیسلام، ڕەنگە لە — بنەچەدا ئێزدی بن، چونکە لە زۆرکات قژیان بەردەدەنەوە، ئەمەش لە تایبەتمەندیەکانی ئێزدیەکانە.

◆

# بەشی شەشەم
# کشتوکاڵ[7] و بازرگانی

زەویە کشتوکاڵیەکان لە پارێزگای هەولێر بۆ سێ بەش دابەشدەبن، ئەوانیش: یەکەمیان (تاپۆ) واتە موڵکی تۆمارکراو ئەمەش هی دەرەبەگەکانە[1] بە پێ ی سەنەدی موڵکایەتی فەرمی، درەمیان نوسراو(التحریر) یان موڵکداری لە ڕێی مافی خاوەنیەتی(حیازە)، ئەمە بە پلەی یەکەم لە ناوچە ڕوتەنە دورەکان باوە، چونکە تۆمارکردن تا ئێستاش ئەستەمە، سێیەم (سوننەیی) [2] ئەمەش ئەو زەویانە بون کە هی سوڵتان بون بۆ دەوڵەت دەگەڕانەوە.

سیستەمی موڵکداری(میزۆپۆتامیا) زۆر ئاڵۆزە. بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی بە تاپۆوە، هەیە چونکە تۆمار (سجل) و کۆمپیاڵەکانی موڵکداری لەلایەن فەرمانبەری نەزان و بێویژدان کراون. پڕن لە و هەڵانەی کە بە هۆیانەوە چەندین کێشەی دادوەری دروست دەبن کە لەژمارە نایەن.

مەرجەکانی موڵکداری و ئەو باجەی پێویستە بدرێتە دەوڵەت بە پێی جیاوازی جۆرەکانی زەوی جیاوازن. بنچینەی دروست بۆ ئەو زەویانەی تاپۆ ئەوەیە کە دەیەکی بدرێتە دەوڵەت و دەیەکی بۆ خاوەن زەوی، ئەمەش هەندێ بەشی گردەکانیش دەگرێتەوە.ئەگەر خاوەن زەوی(تووی چاندن) یان ئاژەڵی جوتی دایە جوتیارەکە ئەوا پێویستە دوهەند یا سێ هەندەی پێشتری بداتێ. ئەو زەویانەی کە ئاغا خۆی بەکار دەهێنان، ئەوا(کرێ پارە یان جوتیار)ی بەکاردێنا تا لەو زەویانە کاربکەن و کرێکەشیان بەشێوەی شتومەك دەدرایە. لەگوندی(خدران) لە لێواری بیتوێن لەسەرەتای ساڵی(١٩١٩) بەدواداچونێکم کرد، دەربارەی ئەوەی(حەماغا) کە خەڵکی کۆیەیە چی دەداتە پیاوەکانی، وتیان کە ئەوان نۆ مانگ کاردەکەن(ماوەی کێڵان و بەرهەم)، یان خۆی نانیان دەدا، یان ئەگەر لە

دەرەوە بڕین ئەو (٨٨) پاوەن گەنم و (٤,٥) پاوەند ڕۆن و هەندێ خوێیان [٤] دەدرێتێ. بەر لەشەڕ ژیان هەرزانتربوو بۆیە کرێیەکی کەمیان دەدرایە. لە کۆتایی کارکردنیشیان هەرکەسێ کە کارەکەی خۆی بە باشی کردوە، قاپوتێکی لباد و دەستێ جلی دەدرایێ، ئەگەری ئەوەش هەبوو کە یەك(جونێ) پارەی پێبدرایە.

حوکومەت لە زەویە ئەمیریەکان(١٧,٥٪) ی بەرهەمەکەی وەك باج وەردەگرت. ئاغاو موختارەکان [٥] ئەگەر پشتیوانی باشیان هەبوا ئەو (٢,٥٪) یەکەی دیکەیان دەخوارد، لەگەڵ ئەو بەشەی کە حوکومەت لە ئەنجامی قەبڵاندنی هەڵە نەیدەتوانی وەریبگرێ. چونکە بەشێکی زۆری بەرهەمەکەیان دەشاردەوە کاتێك کە قەبڵێنەرەکان لە دەرەبان. لەهەموو شوێنێك دا ئاغا چەندی بتوانێ فێڵ لە جوتیار دەکا، یارمەتیدەریشی بێ بۆ فێڵێکردن لە حوکومەت، بۆ ئەوەی بەشی تایبەتی ئەو پتربێ.

دوو جۆربەرهەم هەیە هاوینی و زستانی. یەکەمیان لە پایز یان لە زستاندا دەچێندرێ تا لە بەهاردا بدروێتەوە. لە باکوری میزۆپۆتامیا خەڵك پێویستیان بە ئاودێری نیە، بەروبومە هاوینیەکانیش لە سەرەتای بەهاردا دەچێنرێن و تا لە هاوین یان پایزدا بدروێنەوە. زۆر کات ئاودێری باشی دەوێ، کوردەکان جوتیاری دێمەکاری نایابن. ناوچەی هەولێریش لای ئەوان نمونەییە. ڕەنگە باشترین ناوچە بێ لە میزۆپۆتامیا کە گەنم بەرهەم بهێنێ. هەولێر بە پلەی یەکەم، بنکەی دانەوێڵەیە، نزیکەی هەموو دانیشتوانەکەش کاری کشتوکاڵ دەکەن، کارەکە لەبەرزاییەکان جیاوازە، چونکە زەوی کشتوکاڵی کەمەو ئاوێکی زۆریش هەیە، بۆیە خەڵکی بەرزاییەکان بۆ وەدەست هێنانی ژیانیان پشت بە بەروبومە هاوینیەکان و باخی میوە دەبەستن.

لەگەڵ ئەوەی کە بەروبوم کەمە، هەندێکی بۆ بەکارهێنانی مرۆیی تەرخان دەکرێ و هەندێ بۆ بەکارهێنانی ئاژەڵ، بەرهەمە زستانیەکان تەنیا گەنم و جۆیە، گەنم دوجۆری سەرەکی هەیە جۆرێکی ڕەق پێی دەڵێن(ڕەشگوڵ)یان (ئاردی ڕەش) کە ساواری لێدروستدەکرێ و خواردنی سەرەکی خەڵکەکەیە. جۆری دووەمیان نەرمەو پێی دەڵێن(قەندەهاری) کە باشترین ئاردی نان کردنی لێدروست دەکرێ. بەر لەشەڕیش گەنم لە هەولێرەوە ڕەوانەی ئەوروپا دەکرا.

جۆ هەمیشە لە جۆرە ڕەشەکەیە. ناخۆش نیە ئەگەر بەراوردێکی نرخەکان بکەین، بەر لەشەڕ نرخی گەنم و جۆ دابەزی بۆ (٤٠) ڕوپیە [٦] و (٢٤) ڕوپیە بەدوای یەکدا. لەساڵی (١٩١٨) نرخ بەرز بۆوە و گەیشتە نزیکەی (١٥٠٠) ڕوپیە و (١٢٠٠) ڕوپیەو، ئەو کاتەی کە هەولێریشم بەجێ هێشت لە تشرینی یەکەم ساڵی(١٩٢٠) نرخەکانیان نزیکەی(٣٢٠) ڕوپیە و(٢٠٠) ڕوپیە بوو. لەباشوری میزۆپۆتامیادا جۆ دوو هەندەی گەنم دەچێندرێ، لە ناوچەی هەولێریش پێچەوانەکەی ڕاستە.

بە شێوەیەکی ئاسایی، جوتکردن بۆ کشتوکاڵی پایز، لە کانونی دووەم یا شوبات دەست پێ دەکا ئەگەر زەوی شێ داربێ، ئەوا بابڵێین تا کۆتایی نیسان بەردەوام دەبێ. هەوجاریش سەرێکی پۆڵای تیژی هەیە کە بەستونێکەوە چەسپ کراوە کە بەهۆی نیرەوە لە گایەکان یان ئێسترەکان دەخرێ، [٧] زەوی دووجار دەکێڵدرێ: جاری یەکەم (شۆ) و جاری دووەم کە بە پانیە پێی دەڵێن (وەرد). کاتێك کە نیسان دێ هەموو زەویەکانی دەورەی گوند یا بە پاشماوەی بەروبومی کشتوکاڵی پایزی ڕابردوو سەوز دەچێتەوە یان کێلراوە و ئامادە کراوە بۆ پایزی داهاتوو.

لە مانگی ئایار تاکو ئاب کێڵگەکان دەستیان لێنادرێ، ئەگەر چەند پارچەیەکی بەکاڵەك و خەیار نەچێنرێن. ئەو کاڵەکەی بەرهەمدێ بچووك و شیرینە، لەکاتێکدا خیارەکەی کورت و قەڵەوە. ئەوان لە کۆتایی ئایار پێدەگەن. تامانگێك هەر سەوزن، ئەو دوو بەرهەمە ئاو نادرێن، بەڵام بارانی کۆتایی ئایار زۆر پێویستە بۆ گەشەکردنیان.

جوتیاری کورد شتێکی ئەوتۆ لەسووڕی بەرو بوم نازانێ، بەڵام ئەم نەزانییەی سروشت تۆڵەی بۆ کردۆتەوە [٨]، لە هاویندا زەویەکەی پڕ دەبێ لە دڕك، کە لە ڕوەکە پاقلەییەکانەو ڕەگەکەی دەگاتە بیست پێ شێی زەوی بۆ سەرەوە دێنێ کە زستانیش دێ بەگەڵاو قەدەکانی زەویەکە دەوڵەمەند دەکا، کەگیا کەم دەبێ دەبێتە ئالیکی مەڕومالات و سوتەمەنی پێویستی ماڵانیشە لە زستان. ساڵی گرانیەکە (بر سێتیەکە) ١٩١٨ هەزارەکان قەدەکەیان کۆدەکردەوە تا تووەکەی بهاڕن و ئاردەکەی بکەن بە نان، نانەکەی بەڕاستی نەدەخورا، تەنیا بەوانە نەبێ

کەگەدەیەکی بەهێزیان هەبوو هەرس دەکرا، بەڵام مردنی دوور دەخستەوە، ئەو ڕوەکەش وابزانم ناوی حوشترالوکە.(مەبەستی خڕنوکە و.ك) لە ئاب و ئەیلول وتشرینی یەکەم ئەو زەویەی ئامادەکراوە دادەچێندرێ، [١٠] گەشتیار کوردەکان دەبینێ کە قاچیان ڕووتەو چونکە هاوینان لەکاتی کارکردن لە کێڵگەدا شەرواڵ لە پێدەکرێتەوە) بەناو خەتە جووتەکاندا دەڕۆن و زەویەکە تۆو دەدەن، لەکاتێکدا کەسێکی دیکە هەنگاو بە هەنگاو لە دوای دەڕواو هەوجارەکەی بەدەستەوەیەو زەویەکە وەر دەگێڕێ. ئەگەر ئاو زۆر بێ و زەویش بە هێز، حەوت ڕۆژ بەر لە داچاندنی زەویەکە ئاودەدەن، ئەمەش دەسکەنەکردنی گیا کەڵە ئاسان دەکات کە زیان بەو کشتوکاڵە دەگەیەنێ کە دواتر دەکرێ. ئەوَ بەروبومەی لە دەشتی هەولێر زەوی دەخەملێنن و بەو شێوەیە ئاو دەدرێت پێی دەڵێن (ڕەباس). ئەو زوتر پێدەگاو بەروبومی زیاترە. هەرکە زەویەکە دەچاندرا ئیدی کارێك نامێنێ جگە لەدانیشتن و چاوەڕوانی بەزەیی خودا، واتە باران. لەساڵە ئاساییەکاندا لە مانگی تشرینی دووەمدا چاوەڕوانی بارانن، پڕوشەکردنی باران سودێکی نیە تەنیا ئەگەر شەستەبکا کە پێیدەڵێن(پارا) (مەبەستی پەڵەیە کە لەهەولێر دەڵێن پەرەی دایە) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە زەوی ئاوێکی باشی هەڵمژیوە، کە ئەویش ڕوویدا ئەوا ڕوی زەوی شێ هەڵدەکێشێو گەرمای هاوین دێت. ئەو بارانەی کە زەوی پێویستیەتی بارانی بەردەوامە کە تەنیا(٢٤) سەعات ببارێ. ئەمەش لە زستانی ١٩١٩ — ١٩٢٠ دا ڕوینەدا تەنیا لە مانگی ئادار نەبێ.

لە هەردوو مانگی کانونی یەکەم و شوباتدا پێویستی بە بارانێکی کەم هەیە. بە شێوەیەکی ئاسایش لە هەموو مانگەکانی ساڵ بارانیان زیاتر تیادا دەبارێ، هەرچی ئادارو نیسانە ئەوا مانگی تەنگانەن، پێویستە لانیکەم دەڕۆژ جارێك بارانی تێدا ببارێ، لەپازدەی ئایارەوە باران کەم دەبێتەوە و ڕوەو کاری دروێنە دەچن. لەساڵێکدا باوبۆرانی بەهێز هەڵی کردوو، کە لەمانگی حوزەیران بوو، بەشێکی زۆری دانەوێڵەی دروەوەی لەگەڵ خۆیدا بە چۆمەکاندا برد. لە تشرینی دووەم یان کانونی یەکەم دا کە یەکەم لێزمە باران دەبارێو بەشی ئەوە دەکا کە سێ ئینج یان چوار ئینج قوڵایی زەوی تەڕبکا، جوتیاری کورد ئەو زەویانە دەکێڵێ کە بە بەیاری

بەجێیهێشتون، بە هۆی دەست نەکەوتنی ئاژەڵی کێڵان. ئەو جۆرە بەروبومەش پێی دەڵێن(تەڕەکاڵ) (تەڕاون).

لە زستانی ساڵی ۱۹۱۸ – ۱۹۱۹ دا نزیکەی هەموو بەرهەمی کشتوکاڵی لەم جۆرە بوو. چونکە باری شێواوی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، ئەوەش زانرابوو کە ئەگەر تورکەکان لەوڵاتدا بمێننەوە ئەوا دەست بەسەر هەموو بەروبومی کشتوکاڵی دا دەگرن، ئەمەش وای لە کوردەکان کرد کە لە بەهاردا زەوییەکان نەکێڵن، دانەوێڵەی ئەو جۆرە کشتوکاڵە بە ۲۰٪ دادەنرێ، یان تۆزێك زیاترو لە بەروبومی ئاسایی زۆر کەمتر.

کوردەکان لە مانگی کانونی دووەمدا جارێکیدیکە دەکەونەوە کارکردن، چونکە بۆ پایزی داهاتوو دەست بە کێڵان دەکەن، ئەگەر ئەوەی دەیچێنێ زوو شین ببێ ئەوا ڕێگابە مەڕوماڵاتەکەی دەدا تێیدا بلەوەڕێن. لەزەویە بەراوەکاندا مەگەر دەگمەن ئەگەر نا پەینی کیمیاوی بەکار ناهێنرێ. تەنیا ئەو پارچە زەوییانە نەبێ کە بەجۆ دەچێنرێ بۆ ئالیکی ئاژەڵ و لەبەروبومی کاڵەك و خەیار کە پێشتر باسم کردن، بە هاتنی مانگی ئادار شتێك نامێنێ بیکەن بۆ ئەو بەروبومانەی کە سەوزبون جگەلە ئاوکێشان و پاڕانەوە لە خودای گەورە کە لە دەردوو بەلای دوورکا. گرینگترین ئەودەردانەش(سن) و کوللەیە. ڕەنگە مۆرانەش هەبێ، کە لە ساڵی ۱۹۲۰ لە دامێنی گردەکانیداو زیانێکی گەورەی لێکەوتەوە. (سن) تەنیا گەشەیەکی کەڕوییە. کە بەشێوەیەکی گشتی دوای بارانێکی زۆر پەیدا دەبێ لەزستانداو زیان بەگەنم دەگەیەنێ بەتایبەتیش(قەندەهاری) کوردەکان، لەو تەنگە تاوییە دا نازانن چیبکەن و لە کێشە چۆن دەربازبن.(سن) جۆرێکە لە زەروی بچوك و بە ئەندازەی گەورە دەردەکەون و لەگەڵای دانەوێڵە دەداو دەیفەوتێنێ. مەترسیدارترین پەتاشە کە بەروبومی ناوچەیەکی فراوان لە ناو دەبا. لە ساڵی (۱۹۲۰) لە ڕۆژئاواوە، ڕەوە کوللەهاتن بەلام بۆ خۆشبەختی درەنگ هاتن بۆیە نەبوە هۆی زیانێکی ئەو تۆی گەنم و جۆ، لەگەڵ ئەوەی کە گەرای لە هەموو وڵاتدا دانا. لە هەندێ ناوچەی دەرەوەی دەشتی قەرەچوغ، لە بناری گردەکان بەتایبەت، لەبەر ئەوەی کە فەرخەکانی دەردەچن دەتوانرێ لە ناوببردرێ، ئەگەر

نا ناتوارێ شتێك بکرێ. ئەوان هەموشتێکی سەوزی بەروبوم دەخۆن و زیانێکی گەورەش دەخەنەوە.

وەرزی دروێنەی جۆ لە مانگی ئایار زوو دەستپێدەکا و تاکۆتایی ئەو مانگە بەردەوام دەبێ. هەرچی دروێنەی گەنمە ئەوا لە مانگی حوزەیران دەسپێدەکا، لەبەر ئەوەی کارەکان لە ساڵی(١٩٢٠) دەگمەن بون، بۆیە لە کۆتایی تەموزیشدا هێشتا بەروبومەکە بە پێوەبون دروێنەش بە دەست دەکرا و هەموان تێدا بەشداربون، پیاو و ژن و منداڵ. خەڵکێکی زۆری ناوچە بەرزەکان کە بەهاریان لە دەشتەکاندا بەسەر بردوە، ئێستا بواریان بۆ ڕەخساوە کە بچنەوە ماڵەکانی خۆیان و شتێکیشیان لە گیرفاندابێ. ئەو کەسانە پێیان دەڵێن سەپان. شەش یەکی ئەو بەرهەمە وەردەگرن کە کۆی دەکەنەوە، ئەگەر کەسێکی هەژار بەوێدا تێپەرێ ئەوا یەکێك لە دروێنەکەران ڕادەکا بۆلای و شتێکی لەو بەرهەمە دەداتێ، چونکە ئەوە یەکەم بەرە(واتە بەرهەم)، ئەو دەیەوێ بەخشیش یان خەرمان بەرەکەتێك بدات. ئەو دروێنەیەی دەیکەن بەشێوەی دەسك (سواڵە بەجێدێڵن ئەو دەم ژنانی کۆکەرەوە(گیشەکەر) دەبینرێن کە سواڵەکان کۆدەکەنەوە و دەیکەنە گیشە(گەلاوێژ) ئەوسا بۆ گۆڕەپانی کوتان(جۆخین) (خەرمان) دەگوازرێنەوە بە هۆی گویدرێژ یان ئاژەڵی دی دەگوازرێنەوە کە کەرەستەی تایبەتی بۆ کراوە(شەغرە) .

سەر خەرمان(جۆخین) شوێنێکی فراوانە و دەکەوێتە تەنیشت گوند. ئەو شوێنانە موڵکی گشتین، هەر جوتیارە و بۆ خۆی شوێنێك پاك دەکاتەوە و ڕێکی دەخا، کە بەروبومەکەی(قرشە) لە دەوەری ستونێك بەخڕی کۆدەکاتەوە کە لە ناوەڕاست چەقێنراوە. هەرکە کۆکردنەوەی بەرهەم تەواو بوو ئەوا بە پەتێك ژمارەیەك ئاژەڵ کە لە دو تا شەش ئاژەڵ دەبن بە شێوەیەکی بازنەیی بەسەریدادەبردرێن، ئەمەش کوتانی دەغل و دانە، ئەو جوتیارەی لەچینێکی هەبوبێ ئەوا ئامێرێك دروست دەکا کە لە عارەبانەی سەر بەفر دەچێ، تەوەرێکی هەیە دەسوڕێ و هەندێ دەمەباڵتەی پێوەیە(مەبەستی جەنجەڕە) بەشێوەیەکی بازنەیی لەسەر قرشەکە بە هۆی دوو هێسترەوە ڕادەکێشرێ، بەزۆریش دومنداڵ دەبینی کە لە نێوان(٥ تا ٦) ساڵانن و دەیئاژۆن. ئەم کاری دانەوێڵە کوتانەش لە ناوەڕاستی هاویندا

دەکرێ[11]، ئەوکاتە کوردەکانی بەرزاییەکان دەبینی بەخۆیان و کڵاوی(رۆبنسۆن کرۆز)ی نایابەوە.

شەنەباکردن پێویستی بە بایەکی گونجاوە، ئەو کاتە، ئەو دانەوێڵەیە کە کوتراوە بە هۆی شەنەیەکی دارەوە کە پێنج لکی هەیە بەرەو بایەکە هەڵدەدرێ، بەو هۆیەوە دانە کە دەکەوێتە سەر زەوی و کایەکەش بەبایەکەوە دەڕوا. هەرکە لە شەنەبا بونەوە ئیدی بەرهەمەکە لە بێژینگ دەدرێ تالە قەد و کۆزەرەکەی جیاکەنەوە، دواتر لە شێوەی کۆمەڵی پاك کۆ دەکرێتەوە و بۆ ئەوەی لە دزین دوربێ بەشەنە شەقڵی دەکەن. شەنەکە سەراوبن لە ناوەڕاستی ڕەوسەکە دەچەقێنرێ وەك ڕاگەیاندنێك بۆ بەرهەمی دوای ماندوبونێکی درێژ و بەوەی کە لە بەرهەمهێنانی گەنم بونەتەوە. بەزۆری جەنجەڕ و شەنەبا لە گوندەکاندا تا مانگی ئەیلول بەردەوامی هەیە. لە باشترین زەویەکانی دەشتی هەولێر وا چاوەڕوان دەکرێ یەك و دە تا یەك و پازدە بڕیکا (واتە هەردەنکە گەنمێك (١٠ — ١٥) دەنك بەرهەمی دبێ) لە کشتوکاڵی (وەرد) و لە(٨ — ١٠) بڕ بکا لە تەڕەکاڵ(تەڕاوز).

لە گردەکاندا هەرگۆلمێك هەشت گۆلم دێنێ لە وەردەکان و لە تەڕەکاڵیش هەر گۆلمێك پێنج گۆڵم دێنێ. لە ساڵانی هاتی دا دەشتی قەرەچوغ یەك و سی تا یەك و چل دەبڕێ، دواتر دانەوێڵە لە شوێنێکی پارێزراو هەڵدەگیرێ بە زۆریش لە ژێر زەوی (چاڵ)، ئینجا کایەکە کۆدەکرێتەوە کە بەزمانی هیندی پێیدەڵێن(بەهوسا) کە ئالیکی ئاژەڵانە تا بەهاری داهاتو وەك چۆن لە دروستکردنی خشت سودی لێوەردەگیرێ.

بە زۆری پیاو لەدەرەوەی گوند دا، دوای وەرزی دروێنە، ڕیزێك مەنجەڵی گەورە لەسەر ئاگردا دەبینێ کە دەکوڵێ، ژنان سەروبەری دەکەن، ئەوان ساوار دروست دەکەن. شێوازەکەش ئاوایە: سەرەتا گەنمەکە دەکوڵێنرێو لەبەر هەتاو وشك دەکرێتەوەو، دواتر بەهۆی دەستاڕی قورس کە لەسەر لێوارەکەیەوە و لەسەر بنکەیەك کە لەناوەڕاستیەتی بەهۆی دەسکێکەوە دەسوڕێنرێ، بنەکەکە لەسەر تای بنەوە چەسپکراوە، ئەو گەنمەش کە لەهەموان و ورتترە دەدرێتە ئاشو بە پێی پێویست ئاردی لێ دروست دەکرێ. دوای ئەوەی بەتێری و فراوانی باسی بەروبومە پێویستیەکانمان کرد، مەبەستم گەنم و جۆیە. ئێستا بەکورتیو سەرپێی

باس لەبەرهەمە هاوینیەکان دەکەین، پێداویستی یەکەمی ئەو بەرهەمانە ئاوە، ئەویش جگە لە ئاوی ڕووبارەکان مولّکی تاکە کەسن، سەرچاوەیەك یان دوان کەمولّکی دەولّەتن دەکەونە ناوچەی هەولێر، لەلایەن باشترین ئەوکەسانەی کە پارەدەدەن وەبەردەهێنرێ. بەرهەمی یەك لە جۆگەلە بچوکەکان(١٢٠٠٠) ڕوپیە بوو(بەپێی نرخی دراو گۆڕینەوەی ئەوسا دەیکردە(١٠٠٠) جونێ) لەمەوە دەردەکەوێ کە ئاو شوێنێکی شایانی هەیە لە ئاودێری و زۆر خۆشەویستە. خاوەنی زەوی دێراو زەوییەکەی بەکرێ ناداتە جوتیاران، خۆی لە ڕێگەی کرێ پارەوە بەکاری دێنێ.

ئەو بەرهەمەی کە لەناوچەی دەشتایی و هەندێ ناوچەی شاخاوی هەیە(برنج)ە، نزیکەی هەموو بەرهەمەکەشی لە جۆری(کوردا)یە، کە تایبەتە بەم ناوچەیەی دنیا. دەنکەکەی قورس و قەڵەوەو دڵنیایی بەخشە. من زۆر تەڕتری دەبینم لەجۆرە بڵاوەکانی دیکە. ئەو برنجەش کەورد تروو باریك ترەو سوك ترەو، بە(عەنبەر)یان(سەدری) دەناسرێ هەندێ جار دەچێنرێ. شتێکی بێزارکەرو هیلاك کەرە ئەگەر بچینە ناو وردەکاریەکانی چاندنی برنج، لەمانگی ئازاردا دادەچێنرێو لە تشرینی یەکەم دا دەدروێتەوە. دەتوانین بلێین کە برنج یەك و سێ سەد دەبرێو زیاتریش، بەلاّم لەبەر شێوازی داچاندن و ئەو پشت گوێ خستنانەی کە هەن، ئیدی لەیەك و هەشتا زیاتری لێوە بەرنایە.

لەبەرهەمە هاوینیەکانی دیکەش(ماش) و(نۆخود)نۆکە، کە ئەوانە گرنگیەکی زۆریان پێ دەدرێ چونکە بۆ خواردنی مرۆڤ دەشێن. لەگەڵ کونجی کە تامێکی خۆش دەداتە نان و کێك و ڕۆنێکی لێ دەردەهێنرێ کەلای جولەکەکان زۆر بەبەهایە، وەك گەنمەشامی و پەمۆ و توتن سەیری دەکرێ. ڕەنگە گەنمە بەهارەش ببینی کە پێویستی بە ئاودان هەیە، لە ناوچەی باڵەك بەتایبەت کەبەفری تا درەنگی ئازار ناتوێتەوە.

گەلێ تاقیکردنەوە لەسەر چاندنی پەمۆ و لەسەر جۆرە باشەکانی کراوە لەلایەن بەڕێوە بەرایەتی کشتوکاڵ و سەرکەوتنیشی بەدەستهێناوە. دەشڵێن کەئەم ولاتە لەو ڕووەوە دوارۆژێکی گەشی هەیە. هەرچی پەمۆی کوردییە لە جۆری خراپەو، تەنیا بۆ پێداویستی ناوخۆ بەرهەم دەهێنرێ.

عەرەبەکان لەسەر زێی گەورەو بچوک و دیجلەش توتن دەچێنن کە لە جۆری سپیە کە دە پێ تا دوازدە پێ بەرز دەبێتەوە. بەناعور ئاوی دەدەن(دۆلابی فارسی) کە بە هۆی(کوندە)ەوە کە دەولکێکی لە پێستە دروستکراوە ئاوی ڕوبار بەرز دەکرێتەوە. بە ئاژەڵێکەوە بەستراوە بەهۆی دوو گوریسەوە کەلەسەر سیستەمی خولخولۆك کاردەکەن، ئاژەڵەکە لەسەر ڕێچکەیەك دەهاژورێ لەگەڵ لێواری زێیەکە بەمەش دەو لکەکە پڕئاو دەبێ و کە دەگاتە دوورترین خاڵ لەلێواری زێ ئاوەکە بەتاڵدەبێتە ناو جۆگەیەك کەبۆ ئەم مەبەستە کراوە، لەدووری چەند میلێك گوێت لە دەنگی خولخولۆکەی ئەو ئامێرە دەبێ.

دو لەو ناعورانە لەتەك یەك کاردەکەن، کەبەسە بۆ ئاودانی بەرهەمێك کەچوار تەن بەرهەم بدات.(گرد) بەهۆی ئەو بیرانەوە کاری پێدەکرێ کەلە تەك ڕوبار هەن، کەلە زنجیرەیەك دەولك پێکدێ (دۆلاب) بەکرەیەکی گەورە دەیسوڕێنی. چەند ئاژەڵێك کەبە ستونێکەوە بەستراون کەبە دۆلابە سەرەکیەکەوەیە دەیسوڕێنن.

گرنگترین بەرهەمی ئاودێری لە بەرزاییەکاندا توتنە. لەبەر ئەو نرخە بەرزەی کە توتن هەیەتی کوردەکان هەرچی ئاوێکی لەبەر دەستیان بێ لە چاندنی توتندا بەکاری دێنن. توتن زۆر جۆری هەیە بەلام کوردەکان باشترین جۆری بۆ بەکار هێنانی خۆیان دەچێنن، عەرەبەکانیش خراپترین جۆری بەکار دێنن، لەبەر ئەوەی کەتوتن سەرپەرشتیەکی زۆری دەوێ لە چاندنیدا، بۆیە ئەگەری ئەوەنیە کە بە بڕی زۆر بەرهەم بهێنرێ ئەگەر داوایەکی دیاریکراوی لەسەر نەبێت. وە بەڕای پسپۆڕان توتنی کوردی ناکرێ بۆ بە کار بردنی ئەوروپی بیگونجێنن، ئەمەش لەبەر ئەو کەش و هەوایەی کە ڕێ لە بڕین و پارچە کردنی دەگرێ. دەبێ وشك بکرێتەوە و ورد بکرێ لە بەر ئەوە پێویستی بە بافرەیەکی(پەڕی جگەرە) ئەستور هەیە کە خەڵك زۆر حەزی لێناکەن. هەندێ جۆری ورد هەیە کە تامێکی خۆشی هەیە و نەرمە، بەلام ئەو توتنەی کەبۆ ناردنە دەرەوە دەچێنرێ توندەو کار لە گەرو دەکا.

توتن لە کاتێکی زوی ساڵدا دەچێنرێ، ئەمەش لە خانەی بچوکدا دەکرێ کە بە چڵ و پۆپ دادە پۆشرێ بۆ پاراستنی لە شەختەو بەفر. لە بەهاراندا لە پارچە زەویەکدا دادەچێنرێ کە بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کراوە و پەین کراوە. لە

حوزەیران بەسەرەوە دەچنرێتەوە و بە دارێکدا دەکرێ لە سەر بانی ماڵان دادەنرێ تا وشك بێتەوە، دارەکان لە کاتێکی گونجاودا دەر دەهێنرێن کە گەڵایە کان تۆزێ تەڕن. ئیدی لە تەلیسان دەکرێن تا بازرگانەکان بۆ کڕین و فرۆشتنی دێن. توتن لە سەردەمی تورکان(ئینحیساری) حکو مەت بوو(واتە حکومەت وەری دەگرت) باجێکی گرانی لەسەر بو و بەسەرچاوەیەکی باج دادەنرا.

گەلێ جۆری سەوزە دەچێنرێ، هەموشی لەسەر لێواری ئاو لە کەنار ڕوبار بە هاوین دەکرێن. لە کشتوکاڵی هاوینیش شوتی شیرینی نایاب و خەیارو کولەکەو تەماتەو بامیەو باینجان. کاتێك کوردەکان یان عەرەبەکان بامیە لێدەنێن بەڕای من بەتامترین سەوزەی لێنراوە، بەڵام کە لە لایەن چێشت لێنەرێکی هیندیەوە ئامادە دەکرێ شتێکی لینجی تێکەڵاوی تیژ دەردەچێ، بە زۆری وشك دەکرێتەوەو بە داوێکەوە دەکرێ، لە ماڵی هەموو کوردێك دا وەك کۆمەڵێ زنجیر دەبینین بە دارەوە کراوە، بە درێژایی مانگەکانی زستان بە باشی دەمێنێتەوە، لای کوردە کان خۆشترین سەوزەواتە. لە زستاندا شێلم و تورو چەوەندەر و کەرەوزو کوزەڵەو سپێناغ دەچێنرێ، لە کۆیە هەنجیری کێویش هەیە. ئاغاکانی هەولێر زۆر وازیان لەوەیە کە جۆری نوێی سەوزەیان دەسکەوێ، بەتایبەت پەتاتە کە لە موسڵەوە دەهێنرێ. بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ هەندێ تۆوی(چەوەندەری شەکر) یان دابەش کرد، ئەگەر بەباشی بڕوێو کارگەی گوشینی بۆ دروست بکرێ، دەسەلمێ کەسەرچاوەی قازانجە، شەکر زۆر گرانەو دەبێ لە هیندستانەوە بهێنرێ.

لەبەرزاییەکاندا ڕەزی ترێ سودێکی زۆری هەیە. چونکە سەر گردەکان، لە ناوچەی خۆشناوەتی بەتایبەت، بە ڕەزی ترێ داپۆشراوەو، پێویستی بە ئاودان نییە. ئەو ڕەزانە ترێیەکی ئەرخەوانی دەنك بچوك دەدەن، وەرزەکەشی لە ئابەوە تا کانونی یەکەمە. هەر چۆنێك بێ ترێ لە کانونی یەکەمدا دەڕژێو لەسەر گردەکان هەڵدەخرێو وشك دەکرێتەوە و دەکرێتە مێوژ. گاورە کان دەیدڵۆپێنن و شەڕابێکی لێ دروستدەکەن کە جۆرەکەی زۆر باش نیە. هەندێ ڕەزی ترێش لە دەشتە کاندا هەیە ئاو دەدرێو ترێی سپی و ئەرخەوانی دەدا.

میوەجاتی دیکەی کە لە دەورەی گوندەکانی ناوچە گردیەکاندا بەزۆری هەیەو هەندێ لە دەشتەکانیش بریتین لە: خۆخ و هەڵوژەو قەیسی و سێوو هەرمێ و

هەنجیرو هەنار. شەقڵاوە بە میوەجاتەکەی بەناوبانگە، بەڵام درەختەکانی ئەو گرنگیەیان پێنادرێ و میوەکەی ناگاتە ئاستی جۆرەکانی ئینگلیزی. سێو لە حوزەیران پێدەگا، جۆرێکی خراپە، بەڵام سێوی پایزی نایاب لە باڵەکدا زۆرە. هەنار میوەیەکی نایابە، چونکە باوەڕێك هەیە کە دژە تایەکی باشەو توێکڵەکەی لە پێستە خۆشکردن بەکاردێ، هەنجیر زۆرەو وشکدەکرێتەوەو بە داوەوە دەکرێ، لە گردەکاندا درەختێکی زۆری (تو)هەیە، لە دەشتیش لێرەو لەوێ هەیە. ئەم میوەیەش (تو) بەزۆری جۆری سپیە، هەرچەندە کە شاتوش هەیەو بەرەکەی سورە. تو بە زۆری وشکدەکرێتەوە بۆ خواردنی زستانە. داری درەختەکەشی زۆر بە بەهایە.

لە ناوچە جیاکاندا درەختێکی زۆری گوێز هەیە، زۆربەیان زۆر گەورە دەبن، گوێزی ئەم ناوچەیەش لە جۆری نایابە. هەندێکم دیوە کە هێندەی هێلکە مریشکێکە، دار هەر بۆ دروستکردنی هەوجاڕو ئەو کەرەستانەی کە پێویستیان بەدارێکی ڕەق و گەورەیە داوای لەسەرە. لە هەندێ لە باخەکانی دەورەی هەولێردا درەختی فستق هەیە، ئەو درەختەی کە لەو ناوچەیەدا زۆرە دار بەڕوە، بەڵام دارەکەی ئەوەندە گەورە نیە کە سودی لێوەربگیرێ. ئەسپیندار جۆرێکە لە درەختی چناری سپی و یەکجار زۆر ڕوێنراوە. زۆر خێرا گەورە دەبێ، تیرەی درەختێك کە تەمەنی (١٥)ساڵبێ دەگاتە (١٨) ئینج لەلای بنەوەی، دارەکەی بۆ سەربان گرتن و کاری بیناسازی بەکاردێ، درەختی چناریش بۆ دارەکەی دەچێنرێ. ڕەنگە جەنگەڵی دار بی و چنار لەگەلێ شوێن لە لێواری هەردو زێدا ببینرێ، گرنگترین ڕوکاری دەشتەکان نەبونی دارە تیایدا، ئێستا هەمو هەوڵێك دەدرێ بۆ هاندانی خەڵك تا داری بی و درەختی دیکە بڕوێنن لەسەر لێواری ئاوەڕۆکاندا.

بەرهەمێك یان دو بەرهەمی سروشتی هەن کە گرنگیەکی زۆریان هەیە. یەکەمیان مازوە کە لەسەر جۆرێك دار بەڕو هەیەو خەڵك کۆیدەکەنەوەو بەبڕی زۆر دەینێرنە خوارەوە بۆ بەغداو لەوێوە بۆ ئەوروپا. مازو لە پێستە خۆشکردن بەکاردێ و سەرچاوەی داهاتێکی گەورەیە بۆ حکومەت، چونکە مافی ئەوەی هەیە

کە دەیەکی بەرهەمەکە ببا چ چێنراو بێ و چ سروشتی و خۆرسك، کەتیرەش لە جۆرە دەوەنێکی سەر گردەکان دەردەهێنرێ.

سماقیش زۆر بە نرخە لە تامو بۆدانی گۆشت و جۆرەکانی دیکەی خواردن، لەکاتێکدا کە (سمل) لە گردەکان و دەشتەکانیش زۆرەو بە تایبەت لەنزیك ئاوەکاندا، سملێ بەر لە شەڕ لەلایەن کۆمپانیا ئەوروپی و ئەمریکییەکان بەکاردەهێنرا، سملێ سودێکی بۆ کوردەکان نیە، زۆر بێ یان کەم، لە زۆر جێگاش تەنگی بە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان هەڵچنیوەو چنینەوەیان دەکاتە کارێکی گران.

لەگەڵ ئەوەشدا من دڵنیام ئەگەر بارێکی ئارام دەستەبەر ببێ ئەوا کشتوکاڵ لە ناوچەی هەولێردا دوارۆژێکی گەشی دەبێ. پسپۆرانی چینەکانی زەوی (جیۆلۆجیا) دەڵێن دەشتی هەولێر بارێکی نمونەیی هەیە بۆ هەڵکەندنی بیری ئیرتیوازی و دەسکەوتنی ئاو. ئەگەر ئەو بیرانە هەڵکەنرێن و ئەو ئاوە فرەیە پەیدابێ ئەوا برنج و لۆکەی هەولێر گرنگیەکەیان دەگاتە گرنگی گەنم و جۆیەکەی. خۆڵ لەوێ لەجۆرێکی نایابە، ئەی بۆچی باشترین جۆری پەمۆو چەوەندەری شەکری تێدا گەشە ناکا؟ زیاد لەوەش ئەگەر جۆری گەنمی وا بهێنرێ کە بەرگری ڕزین بکاو ئامێرە کشتوکاڵیە نوێیەکان بەکاربهێنرێن بەتایبەت گاسنی نوێ (ڕەنگە مەبەستی تراکتۆر بێ) بێگومان بەرهەمی گەنم دو هەندەو زیاتریش دەبێ.

ئەوەی کە لەم شتانەی ڕابردو بەرچاو دەکەوێ ئەوەیە، کە: نێردەی هەولێر پێکدێ لە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و، شوانکارەییەکان، بەتایبەتی سروشتیەکان، مەبەستم دانەوێڵەو خوری و توتن و مازو و کەتیرەو دارو، پەنیر و هەنگوین و میوەی وشککراوەی دیکەن. ئەوانە دەگەیەنرێنە سەر سکە لە کفری (١٨) و شەرگاتیان دەخرێنە سەر کەڵەك و بەرەو خوار بۆ بەغدا، ئەمەش دوای کۆکردنەوەیان لە تەقتەق و ئاڵتون کۆپری(١٩). برێکی باشی گەنم لە موسڵ دەفرۆشرێ و دەشکرێتەوە ئەمەش کاتێك کە پێویست بێ بڕی پارەی مفت (سیوڵە) زیاد بکرێ بەمەبەستی هێنانی کاڵا لە دەرەوە.

کاڵای هێنراویش بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لە: چا، شەکر، قاوە، ئەو کەرەستانەی لە بەغدا دروستدەکرێن و ئاژەڵ لەناوچەی فارس. دو ڕێگای گرنگ کە لەنێوان میزۆپۆتامیاو ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای فارس درێژ دەبنەوە، بە

هەولێردا دەڕۆن کاتێکیش کە لە هەردو بەری سنور ئاشتی بەرکەماڵ بێ، ئەوا بازرگانی ترانزێت گرنگیەکی گەورە پەیدا دەکا. لە ڕاستیشدا هەر وایەو چەندین کاروان بەرەو (ساو جبۆلاق)(٢٠) و ورمێ دەکەونە ڕێ و چایەو شەکرو قاوەو کەل و پەلی دروستکراویان هەڵگرتوە، بەتایبەت قوماش، بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەدا مافورو ئاوریشم و پێستەو کەوڵ و سەماوەر و گیانەوەر بهێنن، بەفر لە کانونی یەکەم تا ئادار ڕێگا دەگرێ.

بازرگانیەکی ناوخۆی گەورەش هەیە، هۆزەکانی بەرزاییەکان میوەو توتن بە دانەوێڵەی دزەیی دەگۆڕنەوە.

لە هەولێر بانك نیە، بۆیە کوردەکان وازیان لە کۆکردنەوەو داکردنی پارەیە. ڕەنگە بۆ وەبەرهێنانیش ئامادەبن ئەگەر هەلی وا هەبێ. دەوڵەمەندەکان پارە دەدەنە بازرگانە بچوکەکان کە پێی دەڵێن سەرمایە، بەمەش لە قازانج و زیاندا دەبنە هاوبەش کە لە بازرگانیدا پەیدا دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕیبا لە شەرعی موحەمەدیدا حەرامە کەچی زۆر بەر بلاوە. دەڵێن (ئەحمەد پاشا) بە پەنجا هەزار پاوەنەوە ڕیبا دەکا. بە قازانجێك کە برەکەی ٣٢٪ دەبێت لە ساڵێکدا. بەشێوەیەکی گشتیش جوتیارەکان قەرز وەردەگرن. چونکە گاسن و هەوجار دەکڕن لەگەڵ ئاژەڵ و تۆو. ئەگەر بەرو بوم خراپ بێ ئەوا ئەو قەرزارە بەد بەختە ناتوانێ قەرزەکە بداتەوە، بۆیە بەدڵێکی سوتاوەوە ناچارە ئەگەر زەوی هەبێ زەویەکەی بداتە خاوەن سەرمایە لەجیاتی قەرزەکە. ئەمەش ڕێگایەکە کە ئاغاکان توانیویانە لەو ڕێیەوە دەست بەسەر زۆربەی ئەو زەویانەدا بگرن کە هەیانە. ئەو دراوەی کە بە پلەی یەکەم بەکاردەهێنرێ و نرخی ئاژەڵ و دانەوێڵەی پێ دیاری دەکرێ لیرەی تورکیە. لیرە بەر لە شەڕ تۆزێك لە پاوەن کەمتر بو، بڕی زێڕی بەکارهاتوش یەکجار زۆرە، حکومەتی بەریتانیا داهاتەکانی تەنها بە ڕوپیە وەردەگرێ. بۆیە بۆتە پارەی تاوتوێ لە شارەکاندا. کاتێك کە ئەو وڵاتەم بەجێهێشت لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠دا، یەك لیرە دەیکردە (١٤) ڕوپیە. ئەو پارە کاغەزەی هیندیش یەکسەر قەبوڵ دەکراو، بەهایەکی زۆریشی پەیدا کردبو، ئەمەش بۆ ئاسانی هەڵگرتنی دەگەڕایەوە، لەکاتێکدا کە پارە کاغەزەکەی تورکی بەهایەکەی تەنیا (١٥٪)ی بەهاناویەکەی بو(القیمة الاسمیة). کێشو مەن

زۆر ئاڵۆزە، نەك تەنیا لە شارێکەوە بۆ شارێك جیاوازی هەیە، بگرە لە گوندێك بۆ گوندێکیشەوە جیاوازە. دانەوێڵە بە قەبارە دەپێورێ، هەر گوندەو پێوانەیەکی تایبەتی بۆخۆی داناوە وەك پێوەرێکی قیاسی. هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە کە کیلۆگرام وەك یەکەی کێش لە هەمو درێژی و پانی وڵات بلاو بکرێتەوە.

هەندێ لە بازرگانەکانی هەولێر پەیوەندی فراوانیان هەیە، ئەوان نمایندەی تایبەتیان لە حەلەب و بەغدا هەیەو، بەر لە شەڕ، نامەنێریان لەگەڵ کۆمپانیای (مارسیلیا) هەبو، ئەوان پسپۆڕی زیرەکن لە قازانج کردن لە گۆڕینەوەی پارە. بەدرێژایی ساڵی (١٩٢٠)، ئەحمەد پاشا بڕێکی زۆری ڕوپیەی دەنارده بەغدا تا بە (حەواڵە) بە پاوەنی ئینگلیزی بیگۆڕنەوە. ئەو حەواڵەشی دەنارده حەلەب تا بەزێڕی تورکی بیگۆڕنەوە، لیرەی تورکی بەرامبەر نۆ ڕوپیە بو، دواتر ئەو زێڕە لە پشتی گوێدرێژ باردەکراو دەهێنرایەوە بۆ (میزۆپۆتامیا) لەمەشدا قازانجی مفت لەهەر کڕین و فرۆشێك (٢٥) لە سەدا بو.

◆

# بەشی حەوتەم

# ئاڵتون کۆپری و یەکەم سەردانی هەولێر

لە مانگی تشرینی یەکەم لەساڵی ١٩١٨ دو هێزی بەریتانیا لە باکوری وڵاتی میزۆپۆتامیادا پێشرەویان دەکرد یەکیان لەگەڵ ئاوەڕۆی دیجلە بەرەو موسڵ و ئەوی دیکەیان بەرەو کەرکوك (١)، کە بەڕێ ی کفریدا دەڕۆیشت. کەرکوك لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمدا کەوتە دەست و لەکۆتایی ئەو مانگەدا سوپاکەمان گەیشتە ئاڵتون کۆپری کە لەسەر زێ ی بچوکە. هێزەکەی موسڵ چەند میلێك لە دوری موسڵ بون کاتێك دەنگوباسی ئەوە بەر گوێ کەوت کە هاوپەیمانان ئاگربەستیان لەگەڵ تورکەکان ئەنجامداوە. (٢)

لەو کاتە لە مەندەلی بوم، هەمو ساتێك بەهیوا بوم کە فەرمانی ڕۆیشتن بەرەو باکورم بۆ بێ. دواجار لە ڕۆژی یەکەمی تشرینی دوەم بروسکەیەك هات کە بڕیاری دامەزراندنی منی وەك (یارمەتیدەری حاکمی سەربازی) بو لە ئاڵتون کۆپری، دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بە ئۆتۆمبێلەکەم کە لە جۆری (فۆرد)بوو تەنیا خزمەتکارێکم لەگەڵدابوو جانتای گەشتیشم کەم شتێکی تێدابوو، بەڕێکەوتم. لەڕۆژی سێیەمی ئەو مانگەو دوای نیوەڕۆکەی گەیشتەجێ.

ئاڵتون کۆپری (یان پردی زێڕین). کە بەناوی ئەو پردەوە ناونراوە، کە پێشتر باسمانکرد شارەکەی بە کەناری چەپی ڕوبارەکە دەگەیاند. باوەڕی بەربڵاویش ئەوەیە کە چەندین سەدە بەر لە ئێستا بە فەرمانی ژنێك بنیاتنراوە، کە ژنێکی جوان بوەو ناوی (ئاڵتون)(٣) بوە. (ئاوا: و.ع). پردەکە ڕوبارەکە دەبڕێ کە پانیەکەی (٢٠) یاردە دەبێ، تاقەکانی لە بەردو گەچ بنیاتنراوەو دینگەکانی دارە. بەشێوەیەك ئەو پردە کورە کە پێویستە هەمو ئۆتۆمبێل و تۆپەکان لەسەری ڕاکێشرێن. هەر هێندەی کە گەیشتمە سەر ڕوبارەکە دیتم کە تورکەکان کاتێ

پاشەکشەیان کردوە ئەو پردەو پردەکەی سەر کەناری بەرامبەریشیان تەقاندۆتەوە.

ولاخ و عارەبانە بە زەحمەت دەیانتوانی لە بوارێکی خوار پردە ڕوخاوەکە، لە ڕوبار بپەڕنەوە ئۆتۆمبێلەکەم لە بینایەیەك ڕاگرت و چومە لای بوارەکە زۆر بە زەحمەت توانیم ئەسپێك وەرگرم و بە سەلامەتی بپەڕمەوە. بە کۆڵانە پیس و پۆخڵەکانی پشتەوەدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە شەقامی سەرەکی و سەرای، واتە خانەی حکومەت. زۆر سەرم سوڕما کاتێ (میستەر کاربت)م لەوێ دیت کە لە هێڵی خزمەتگوزاریە شارستانیەکانی هیند کاری دەکرد، لە بەغداوە گەیشتبو تا تێبینی تۆمارکا دەربارەی سیستەمی داهات لەو ناوچانەی کە تازە داگیر کرابون، بەمەش دەیویست یارمەتی (یارمەتیدەرانی حاکمی سیاسی) بدات کە تازە دامەزراون و تەنیا چەند خولەکێك بەر لە گەیشتنی من گەیشتبو. بە تەواوی سەرقاڵبو بە قسەکردن لەگەڵ هەندێ پیاو ماقوڵانی ئەوێ و تێبینیەکانی یەکسەر تۆمار دەکرد.

بەشی سەرەکی ئاڵتون کۆپری لەتەك یەکدی ڕیز بوە لەسەر بەردێکی ناوەندی زێ. ژمارەیەك دوکان لەوبەر لەوبەری ئەو ڕێگا سەرەکیە هەن کە دەچێتەوە ناو جەرگەی شارۆچکە. کە لەوێ شۆڕدەبێتەوە بەناو تاقێکدا کە بە تونێل دەچێ تا دەگاتە لێواری لای ڕاستی زێیەکە. شوێنێکی فراوانە بەلام ئاوی کەمە. ئەو ڕێیەی ئامارژەمان بۆکرد جارێکی دیکە سەر دەکەوێتەوە تا دەگاتە پلیکانەیەك کە دەگاتە پردی دوەم. ئەو ڕگایە بۆ ئەو شارە بەشدەکاو ڕێ ی تێپەڕینی یەك عارەبانەیە. چەند کۆڵانێکی کەمی پیس و پۆخڵی لێدەبێتەوە، کە بەهۆیانەوە مرۆڤ دەگاتە هەندێ ماڵی بەتەك یەکەوە. لەسەر هەردو بەری ڕوباریش هەندێ خانوبەرەی فراوان هەن، کە بۆشایی لەنێوانیاندا هەیە، بەلام چۆڵکراون. پێشتر شوێنی سەربازە تورکەکان بوە. لە ئایار تاکو تشرینی یەکەم، لەو کاتەی کە ئاوی زێ نزمە دەوروبەری ئەو بەردە دەبێتە بەشێك لە کەنارو پڕ لە زبڵ دەبێ و خەڵکەکەش دەیکەنە شوێنی ئاودەست. ئەو ماڵانەی لەسەر لێواری بەردەکەن سولاوکەیان هەیە کە چی تێدابێ لە ڕوباری دەکا. لەو شارۆچکەیەو لە دەوروبەریشی ژمارەیەکی زۆری سەربازانی تورك چەند مانگێك خەیمەیان هەڵدابو بۆیە زبڵی نیو ساڵ لەوێ کۆببۆوە.

هەرچی مێشە ئەوا لە باسکردن نایە، هەر هێندەی خواردنێك لەسەر خوان دانرا لە چاوتروکانێکدا توێژاڵێکی ڕەشی لەسەر دروستدەبێ.

لەو سێ هەزار کەسەی کە لەو شارە دادەنیشتن هەزاریان شاریان بەجێهێشتوە ئەوی دیکەی، ئەوەی لە برسان مردون و ئەوەی ماوە. خەڵکانێکی پۆخڵ و بەدبەختبون.

هەرچی گەورەی خەڵکەکەیە پیاوێك بو بەناوی (حەسەن ئاغا)، کە پیرێکی بەد فەساڵی بێدین بو (ئاوا: و.ع) وەکیلی ئەحمەد پاشای دزەیی بو، سەرۆکی شارەوانی– کە پلەکەی وەك عومدە وایە لە ئینگلتەرا– پیاوێکی ڕیش سپی بو وەك سپیاتی بەرەبەیان، خۆشمێربو، بەڵام نەفام بو، زۆر جاران ناخی دەورووژاندم تا ڕادەی گێلی و دەبەنگی. بەبیرم دێ جارێکی پێم گوت من ئارەزو دەکەم کە زێ هەڵسێ و ئەوو دانیشتوانی شاریش ڕامالێ(٤) (ئاوا: و.ع).

(مستەر کاربیت) ڕۆژێك دو ڕۆژ لە ئاڵتون کۆپری مایەوەو هەمو کاتەکەی لە پێشوازی سەرۆك عەشیرەتەکان و موختاری گوندەکان بردە سەر، لەکاتێکدا من ئەو کاتە هەوڵمدەدا حاڵەتی فەوزاکە بگۆڕم بۆ ئارامی و ڕێکوپێکی. ئەو ناوچەیەی بەمن سپێردرابو لە سێ ناحیە پێکهاتبو، پێشتر سەر بە پارێزگای کەرکوك بو. هەمویان دەکەوتنە باشوری زێ. هەندێ گوند نەبێ کەلەسەر لێواری ڕاستی زێیەکە بون. کارێکی وا هاسان نیە کە دەزگایەکی حکومی لە هیچەوە دامەزرێنی. بۆیە دەستم بە دامەزراندنی ئەو کەسانە کرد کە بۆ ژەندرمە دەگونجان و چەکدارم کردن، هەوڵمدا هەندێ پیاوی دڵسۆز دابین بکەم بۆ ئەو فەرمانبەریانەی کە زۆر بون. گەلێ ئەرزو حاڵم لابو کە هی ئەوانەبون داوایان کردبو ئەو پۆستانەیان بدەمێ، بەڵام هیچیان بەکەڵکی ئەو کارە نەدەهاتن. بۆیە دەبوایە هەندێ کەس لە (ئەفەندی)یەکان لە کەرکوکەوە بێنم. لەماوەی چەند ڕۆژێکدا (ژمێریارێکی هیندی) گەیشتەجێ لەگەڵ هەندێ شتومەکی نوسینگە. کاتێکی ئەوەندە تێنەپەڕی نوسینگەکەم ڕێککەوت. بەخێرایی هێزێکم لەو ژاندەرمانە دروست کرد کە لە شەڕانیترین و خراپترین کەسانی بەر خۆر بون(ئاوا: و.ع). ناچار بوم بەهەندێ لە تفەنگی کۆنی لولە درێژ چەکداریان بکەم(٥) کە لە خەڵکی شار کۆکرابونەوە. وە

لە چاکبەختی بو کە لەلایەن ئەوانەوە بەکارنەهات و سودێکی بۆیان نەبو و هیچ ئامانجێکی بۆ دەستەبەر نەکردن.

جەندرمەکان لەسەردەمی تورکەکان بەلایەک بون بەسەر خەڵکەوە لەوڵاتی میزۆپۆتامیا، چونکە کارمەندانی لە خەڵکانی بەرەڵلاو دڵرەق بون و هیچ ڕاهێنان و بیروباوەڕێکیان نەبو و دەسەلاتی خۆیان لە تالان و زەوتکردن بەکاردێناو، ئەو ڕوداوانەش لە ئەژمار نایەن. خەڵکەکە زۆریان ڕق لێیان دەبوەوە، لەبەر ئەوەی کە توانای ئەوەیان نەبو پاروەنانێك بۆخۆیان پەیداکەن، تەنیا بە کلکایەتی حکومەت نەبێ، بۆیە هەمیشە لایەنگرو گوێ لەمستی دەوڵەت بون، ئەوسا دەکرا پشتیان پێبەستێ لە جێبەجێکردنی ئەو ڕێو شوێنانەی کە بۆیان دەردەچو. هەندێکیان لەکاتی تەنگانەدا زۆر ئازایانە ئەو فەرمانانەیان پشتگوێ دەخست. (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) کاتێك دەچوە هەر ناوچەیەکی نوێ دەبوایە هێزێکی کار ڕاپەڕاندن دروستبکا. لەو ناوچانەی کە عەشایەری نەبون لە جەندرمەی سەردەمی کۆنی تورکان زیاتر کەسیدی نەبو. هەوڵێکی زۆرمدا بۆ چاککردنی کەسانی ژاندارمەو دامەزراندنی گەنجان تیایدا. وەکچۆن لە هەندێ ناوچەدا هێزی پۆلیسی نیزامی دامەزرا. بەلام گەورەترین کێشەی (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) ئەوەبو کە چۆن بەر لە چاوچنۆکیان بگرێت کە لە دەرونیاندا بو.

دەسەلاتە شارەوانیە میراتەکانی سەردەمی عوسمانی هێشتا مابون، گەلێ هەوڵمدا تاکو بەهۆی ئەوانەوە کرێکارم دەسکەوێ بۆ چاککردنی باری تەندروستی شار. ژمارەی ئەوان دو پیاوو دوانزدە گەنج بون. بەلام ئەوان بەردەوام کاریان دەکردو زمانحاڵیان دەیگوت سودی نیە، بۆیە پێویستبو واز لە پاککردنەوە بهێنین و ئەو کارە پیرۆزە بۆ داکردنی ئەو هەورانە بەجێبێڵین کە پڕبون لە ئاو.

لە حەوتی تشرینی دوەمدا فەرمانێکم پێگەیی کە بچمە کەرکوك و موقەدەم (نوێل) ببینم کە وەك حاکمی سیاسی کەرکوك دامەزرابو، ڕێنوێنی سیاسەتی دەکرد لە هەمو کوردستانی باشور. ڕۆژی دوایی ئۆتۆمبێلەکەم لێخوڕی، بەناو بارانێکی بەخوڕداو بایەکی سارد موقەدەم نوێل ئەو سیاسەتەی بۆ شیکردمەوە کە مەبەستیەتی پیادەی بکا، کە ئەنجامەکەی ئەوەیە حوکم کردن بەهۆی سەرۆك عەشیرەتەکانەوە بێ و لابردنی فەرمانبەرە تورکەکان و ژەندرمە گەندەڵەکان،

بەپێ ی توانا. لە کاتێکدا کە لە کەرکوك بوم بروسکەیەك هات کە فەرمانی بەوەبو ئەفسەرێکی سیاسی لەگەڵ هێزێکی بچوکی سوارە بەخێرایی بچێتە هەولێر و بۆ ئەوەی بەپێ ی مەرجەکانی ئاگربەست لە تورکەکانی وەرگرێ.

(موقەدەم نویل) منی دەستنیشان کرد بۆ ئەم کارەو (فەرماندەی هێزی کەرکوك) یادخەرەوەیەکی هاکەزایی دامێ، تا بیدەمە (فەرماندەی هێزی تورکی)، کە داوای لێدەکا بکشێتەوە بۆ موسڵ. دوای نیوەڕۆ گەڕامەوە ئاڵتون کۆپری.

لە دوای دواکەوتنێکی زۆر و کۆمەڵی ئاستەنگی گەورەی کۆکردنەوەی هۆیەکانی گواستنەوە گەیشتمە هەولێرو یەك ئەفسەری بەریتانیم لەگەڵدابو، لە (یەکەی سوارەی ١٢)ی هیندی و دو فەرمانبەری بروسکەی بەریتانیایی. ئەمەش لە کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆی (١٠)ی مانگ بو. لە گەیشتنی بروسکەیەك دڵگران بوم کە لە هەمان کاتدا هات و ناوەڕۆکەکەی ئەوەبو کە نەقیب مۆری (کە ئەمڕۆ موقەدەمە) بۆ هەولێر دامەزراوە. لەگەڵ گەیشتنی ئەودا دەبوایە من بگەڕێمەوە ئاڵتون کۆپری. بڕیارماندا کە شوێنی مانەوەمان (گۆڵتەپە) بێ کە لە گوندەکانی دزەییە، من لە پێشەوەڕا ڕۆیشتم، ژمارەیەکی کەمی سوارەم لەگەڵدابو بۆ ئەوەی ڕێو شوێنەکان ڕێکبخەین. توشی هیچ کەسێك نەبوین، دوای ئەوەی چەندین میلمان بڕی توشی کوردێك بوین کە چەند گاو گوێدرێژی لێدەخوڕی. ئەو گوندەی کە لەناو دۆڵێکدا شاردرابۆوەو نیو میل لە ڕێگەکە دوربو ژاندارمەیەکم هەنارد تاوەکو هەواڵی گەیشتنم بگەیەنێ، هەمو نێرینەکانی گوندەکە هاتنە پێشوازیم. (مەحمود یابە)ی موختار تەوقەی لەگەڵدا کردم کە ئاغایەکی سەربەخۆیەو خزمایەتی لەگەڵ هیچ کام لە سەرۆکە دزەییەکان نیەو دواتر لەسەر سەرینێك لە دەرەوەی دیوەخان دانیشتم.(٦) ئەو پیاوێکی قۆزەو لە ناوەڕاستی تەمەندایە، کە سەرەتا دیتم بە پیاوێکی درۆزنی فێلبازم دانا (ئاوا: وەرگێڕ) کاتێ گەڕامەوە هەولێر و حاڵی ئەوم پرسی زانیم کە پیاوێکی زۆر ڕاستگۆیە. کاتێکیش کە لەو کێشانەی کە تایبەت بون بە سەرۆك هۆزە ڕکابەرە (دزەییەکان) پێویستیم بە ڕایەکی بێلایەن بوایە ئەوا پرسم بەو کابرایە دەکرد. یەکەم شتێکی کە پێیگوتم: (تۆ دەگەڕێیتەوە هەولێر، لەوێ ئەحمەدەفەندی برادەرم دەبینی، ئەو پیاوێکی باشەو یارمەتیت دەدا). ئەوە یەکەم قسەبو کە لە دۆستێکی کە لەناو

ڕۆژهەڵاتیەکانم گرتبو، گوێم لێبێ پیاوێك کە لە هەمو ئەو کەسانەی بینیومن پتر پابەندی بیروڕا سونیەکان بو. هەر هێندەی دانیشتم ئیدی پیرەمێردەکانی گوند لە دەورم ئاڵقەیان بەست، بەهۆی یەکێکیانەوە کە فارسی دەزانی، پرسیار بارانیان کردم: بەریتانیەکان بۆچی هاتون؟ چۆن دەسەلأت بەڕێوە دەبەن؟ ئایا سەرۆك و موختارە زاڵمەکان لەناو دەبەن؟ بڕی ئەو باجە چەندە کە دەیسێنن؟ ئەو چاکسازیە کشتوکاڵیانە چین کە دەیهێنن؟ هێڵی ئاسن ڕادەکێشن؟ ئیدی بەو جۆرە... بۆ ئەم شتانە هەوڵمدا باشترین وەلأم بدەمەوە. لە ڕاستیدا تاقیکردنەوەیەکی سەیر بو: شەو داهاتوەو منیش لەناو کۆمەڵێك کورد دانیشتوم کە منیان خستۆتە بەر ئەم ئەزمونە وردە، ڕەنگە من یەکەم ئینگلیز بوبم کە قسەیان لەگەڵدا کردوە. وام بە خەیاڵدا هات، لەو یەکەم سەردانەمدا، کە دزەییەکان خەڵکانێکن دڵسۆزیان نیەو میوان دۆست نین. بەلأم دوایی زۆرم خۆشویستن و وەهام سەیر دەکردن کە باشترین کوردانی میزۆپۆتامیان و لە دانیشتوانی گردەکان ئاقڵترو زیرەکترن.

خۆر ڕو لە زەردی بو و بە کڕوکپی سەیری ئاوابونیمان دەکرد دەنگی بانگدەرەکە هاتە گوێمان کە بانگی برادەرەکانمی دەکرد بۆ نوێژکردن. دوای ماوەیەکی زۆر مەحمود ئاغا شێوی بۆ هێنام کە بریتی بو لە برنج و گۆشت، وەك ڕێزلێنان و بەخێرهێنانێك. (سوارە)کان نزیکەی سەعات شەش و نیوی ئێوارە گەیشتن.

کە کازیوەی داو خەو ڕۆیی لەڕۆژی دوایی ئیدی لێك جیابوینەوە، ئەودەم میلی کاتژمێر ئاماژەی بۆ سەعات حەوتی تەواو دەکرد. سێبەرێکی نەرم بەهێواشی کەوتبو. دوای سەعاتێك بەلای خانوێکدا تێپەڕین کە پێدەچو کەسی تێدا نەبێ. لەناکاو یەکێك لە سوارەکان هاواری کرد کەوا چەند کەسێك لە تورکەکان لە دوامانەوە دێن. بەرەو دوا گەڕاینەوە بینیمان کە خانوەکە بڕە گەنمێکی تێدایە یەکێك لەوان پاسەوانی دەکا. ئەفسەرە تەپڵەك لە سەرەکە سوربو کە بیداتە دەست ئێمەو خۆی گەڕایەوە بنکەکەی لە هەولێر. نەماندەتوانی کە پاسەوانەکەی بە یەکێك لە سەربازانی خۆمان بگۆڕینەوە، بۆیە پێویست بو کە سەرۆکی گوندەکە بانگ بکەم. کە ئەو گەنجێکی هەژدە ساڵان دەبو، ناوی عەلی ئاغا بو. ئەو جلێکی

ئاوریشمی نایابی لەبەردابو و پشتوێنێکی بەستابو کە نزیکەی چواردە ئینج دەبو. پەیمانی دا کە ئاگای لە گەنمەکە دەبێ تاکو پاسەوانێکی بۆ دەدۆزینەوە.

ئیدی سواربوین و بۆ ماوەی سەعاتێك دوان لەو ولاتە چۆڵ و وشك و بەرزو نزمەو هەورازو نشێوە ڕۆیشتین تا گەیشتینە شوێنێك کە بەرزترین گردی تیا دەبینراو نزیکەی چوار میل دور دەبو، کە لەو دەشتاییەدا وەك باڵۆنێك بە ئاسماندا چوبو، بازنەیی و گەورە بوو لەسەر تەپۆلکەکەیدا کۆمەڵێ خانو کرابون. ئەوە هەولێر بو شارە پیرۆزە کۆنەکەی ئاشوریان کە لە (١٨٠٠ پ. ز)(١٠)ەوە هەمان ناوی هەڵگرتبو. پاشاکان لەوێدا نوێژیان دەکردو داوایان لە خواوەند دەکرد کە سەرکەوتوبن، وەك چۆن سەرکەوتوە مەزنەکان پێستی دیلەکانیان لەبەردەم کوشتارگەی هەشتتار (عشتار)دا دەگرو (ئای لەو دڵڕەقیە !). ئا لێرەدا ئەسکەندەری گەورە دوای سەرکەوتنە مەزنەکەی، دوای (دارا) کەوت کە شکستی خواردبو، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیتوانی نێچیرەکەی بگرێ بەلام دەستی بەسەر گەنجینە پاشاییەکەیدا گرت، هەر لێرەداو، لەسەردەمێکدا، بەناوبانگترین کورد، مەبەستم سەلاحەدینە فەرمانڕەوایی کردوە.(١١)

لە ڕێیەکی هەڵەوە لە شار نزیکبوینەوە بۆیە ناچاربوین کە لە کۆلانە تەسکەکانی پشتەوەڕا ڕێگە بگرینە بەر. تا دواجار گەیشتینە شوێنێکی بەرکراوەی بچوك، کە قاوەخانەکان لە بەرێك و (بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیش) لە بەرێکدابو: سەرەڕای کەشو هەواکەش کۆمەڵێ خەڵك لەوێدا کۆببونەوە، ژاندارمەکان ڕیزیان بەستبو، فەرماندەکەیان یەکەم کەسبو کە بەخێرهاتنی کردین. دوای ئەو سەرۆکی شارەوانی (موتەسەریف) پارێزگاری هەولێر هات، لە شارەوانیدا چاو قاوەی پێشکەش کردم، هەر هێندەی بینیم کە سەربازەکان بەجوانی جێگیربون ئیدی دەستی گرتم و بەرەو پلیکانە مەزنە بە بەرد ڕوپۆشکراوەکان کە دەیگەیاندیە ئەو شارە کە لەسەر گردەکەدابو، بردمی. دەرگاکە بۆ شاری سەرەوە دەچێ (سەرای، خانەی حکومەت)، لەوێڕا مرۆڤ دەتوانێ دیمەنێکی جوانی شارۆچکەی خوارەوەو ئەو دەشتەی دەوروبەر ببینێ.

هەولێر بە بەرزیە قایمەکەی و (قەلا) و منارە هەڵچوەکەی لە دەرگاکەیەوە دیمەنێکی نایابی هەیە، شارۆچکەی سەرەوە لەسەر گردێکی خڕ بنیاتنراوە کە

بەسـەر دەشـتی دەوروبەریـدا دەڕوانــێ و وەك قەڵایـەکی مـەزن دەردەکـەوێ. دیوارەکانی دەرەوەی بەرزن و چەند پەنجەرەیەکی ڕوانین بترازێ شتێکی دیکـەی تێدا نیە، کە بچوکن و لە دەلاقە دەچن، تەنیا چەند بەرهەیوانێك نەبێ کـە هەنـدێ لە ئاغا دەوڵەمەندەکان دروستیان کردوە، تەنیا لە دو دەرگای گەورەوە دەتـوانی بچیتە نێو قەڵاوە، یەکێکیان فراوانەو دەکەوێتە لای باکور، بـەبن (سـەرا)دا دەڕوا، ئەویدی بچوکەو لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆی دەچێ.

هەرچی شـەقامەکانی ناوەوەیـەتی ئـەوا سـەخت و بەرتەسـکن، داشـقەی پێـدا ناڕوا، دەڵێن ئەم شارۆچکەیە بەر لە دو سێ سەدە بنیاتنراوە، خـەڵکی گونـدەکان ناچار کراون کە کاری تێدا بکەن، تەنانەت دروستکردنی تەنیشتەکانی قـەڵاش کـە هەر بەرزیەکی (٩) مەتر دەبێ و لە ناوەویشیدا ڕەنگە شوێنەواری ئەوتۆی تێـدابێ کـە زۆر لەوانـەی نەینـەواو ئاشـور بـەنرختر بـن، بـەڵام هـەڵکۆڵین ئەسـتەمە بـێ ڕوخانـدنی شـارەکە، شارۆچـکەی خوارەوەشـی لـە دولا کۆبۆتـەوە، باشـور و ڕۆژهـەڵاتی قەڵاکـە. ئـا لێـرەدا بـازاڕی گەورەیـە کـە بریتیـە لـە دو تـاقی جـوان دروسـتکراو و دو تـاقی ڕوخـاو کـە ڕەنگـە بـەو زوانـە بنیاتبنرێتـەوە. هەرچـی دوکانەکانی دیکەشە ئەوا لە سەکۆیەك تێپەڕ ناکەن کە شتومەکی لەسەر خراوەتـە ڕو، کە بازرگانەکان بەیانیان دەیهێنن و شەوان لە خانەکان هەڵدەگیرێن. بازاڕەکـە کاڵاو شـتومەکی باشـی تێدایـە کـە کوردەکـان بـۆ کـڕین لـە هـەمو لایەکـەوە لێـی کۆدەبنەوە.

لەکاتی شەڕە گەورەکەدا هەولێر ڕۆژێك لەڕۆژان مەیدانی شەڕ نەبوە ڕوسـەکان گەیشتنە ڕەواندوز، ئینگلیزەکانیش گەیشتنە ئاڵتون کۆپری و دەوروبەری موسـڵ، بەڵام هەروا مایەوە بێئەوەی کەسێك دەستی بۆ ببا. خەڵکەکەی توانیـان ئـەمباری گەنم بشارنەوە، لەبەر ئەوە خەڵکەکەی لـەکاتی گرانیـە گەورەکـەدا زۆر نەفـەوتان کەمێکیان نەبێ.

لە کێڵگەکانی کە دەکەونـە لێـواری شـار، منارەیـەکی مـەزن هەیـەو بەپێوەیـە بەرزیەکەی دەگاتـە نزیکـەی (١١٠) پـێ چیوەکەشـی لـە بنکەکەیـدا نزیکـەی (١٢) پێیە، لە قایە (کەرپوچ) دروستکراوە، لای سەرەوەی بە نـاڕێکی ڕوخـاوە. هەنـدێ اشـی ڕەنگـاو ڕەنـگ و جوانکـاری درشـتی هەیـە. لـە خـوارەوە لـە بنکەکەیـدا

داخوراوەو ئەگەر هەوڵی پاراستنی نەدرێ بێگومان دەکەوێ هیچ شوێنەوارێك لەو مزگەوتەوە نیە کە گومانی تێدا نیە منارەکە بەشێکی ئەو بوە، بەڵام زەویە ڕو نارێکەکەی کێڵگەکانی دەوروپشتی وا لە مرۆڤ دەکا بۆ ئەوە بچێ کە شارە کۆنەکە لێرە بوە. دەماو دەم گێڕانەوەی خەڵکی شار بۆ ئەوە دەچێت کە ئەم منارەیە لەسەردەمی خەلیفەکانـدا بنیـاتنراوەو ئـەوێ ناوەنـدی شـار بـوەو سـوڵتانێکی سەربەخۆ حوکمی تێدا گێڕاوە. (١٣)

نانی نیوەڕۆم لەگەڵ (ئەحمەدەفەندیدا) خـوارد. ئـەو پیـاوێکی لێوەشاوەیەو تەواو کامڵەو، نزیکەی (٤٠) سـاڵ دەبـێ، ئـەو سـەر بـە یـەکێك لـە خێزانـە هـەرە بەڕێزەکانی هەولێرەو کوڕە مامی مـەلا فەندیـە(١٤) (خـوا لێیخۆشبـێ– وەرگێـڕ) یەکێك لە پێشەنگە ڕۆحیەکان لە کوردستانی باشـور. بـاوك و باپیریـشی بـەر لـەو پیاوی ئایینی بون، وەك ئەو تاقە برایەی کـە هێـشتا لـەژیان مـاوەو لـە سـەرەتای گەنجیدا چوەتە کاروباری دادوەریەوە، لە کـاتی دەسـەڵاتی تورکـەکان لـە هـەولێر پۆستی (داواکاری گشتی) هەبوەو بـەر لـە داگیرکردنمـان بـۆ هـەولێر بـە سـەرۆکی شـارەوانی هەڵبـژێردراوە. درێـژی ئـەو پیـاوە (٥) پـێ و (٩) ئینـج دەبـێ. ئـەو کۆمیەکی (قەمبور) ئاشکرای هەیە روکاری گشتی نـەرم و نیانـە بـەڵام ڕوخساری تونـدەو لـوتێکی قـەڵەنگی درێـژی هەیـە، چـاوەکانی بەشـێوەیەکی نـاوازە دەدرەوشـێنەوەو ڕەنگـە درەنـگ یـان زو ببێتـە نێـچیری نەخۆشـی (سـیل) کـە نەخۆشیەکە تەمەنی هەمو ئەندامەکانی خێزانەکەی بڕیوەتەوە. ئەمـەش قـەدەری خوایە (کە ناگەڕێتەوە) کە بۆیان هاتوەو بونەتە خۆڵ لەژێر خاکدا. ئەو بە ئاسایی جل و بەرگی ئاوروپی لەبـەر دەکـا، لـە هـەمو سیفەتەکانیـشی باشـتر ئەوەیـە کـە دیموکراسـیەکی ڕاسـتەقینەیەو بەرژەوەندیـەکانی میللەتەکـەی بـە تایبـەتی خانەوادەو کەسانی دەستکورت لە قوڵایی دڵیدایە. ئەو هەمیشە بەرامبەر ئاغاکـان لەگەڵ ئەواندا دەوەستێ ، بۆیە ئاغاکان ڕقیان لێیەتی، ئـەو لـە ڕۆژانـی تەنگانـەدا پـشتیوانی حکومـەتی دەکـرد، بەهـەر جۆرێـك بوایـە، چـونکە دەزانـێ شـڵەژان و پـشێوی بەدبـەختیان لێ پەیـدادەبێ و بـە پلـەی یەکـەمیش بەسـەر هەژارانـدا دەشکێتەوە، ئەو لە سەردەمی تورکەکاندا دوجاری شار ڕزگـار کـردوە: جارێکیـان کە (موتەسەریف) پارێزگاری شاربوە هەڕەشەی پیلانگێڕی هەمو ئاغاکانی لەسـەر

بوە، بۆیە (برایماغای) لاسدا (أغری) تا بێتە شارو ڕزگاری کا. جاری دوەمیان هۆزەکان خۆیان ئامادەکردبو بەسەر شاردا بدەن، ئەمەش بەر لە هاتنی من، ئیدی هەولێدا بەزۆر شێوە دوریانخاتەوەو پاسەوانی لەسەر ئەمبارەکانی دانەوێڵە دانان نەوەك تالأن بکرێن، جارێکی دیکەش کە لە ئەیلولی (١٩٢٠)(١٥)دا پشێوی ڕویدا بەر لە هەمو کوڕانی شار دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردم، تا بەناو ئەو گێژاوە ڕوخێنەرەدا تێپەڕم. لە هەمو بارودۆخێکدا هیوایەکی گەورەم پێ ی هەبوو هەرگیز خۆشاردنەوەو خەڵەتاندنێکم لێینەدی. بێ پێچ و پەنا گوێڕایەڵی ئەو بۆ من ڕاستگۆیانە بو. گومانیشم لەوەدا نیە کە ئەگەر بارودۆخێك بێتە پێشەوە ئەو گیانی خۆی بەخت دەکا لەپێناوی مندا.

هەر هێندەی لە سەعات سێدا نانی نیوەڕۆم خوارد بەرەو سەربازگەی تورکی، کە دەکەوتە ڕۆژئاوای شار، ڕێگام گرتەبەر، تاکو ڕێوشوێنی ڕێزگرتن پێشکەشی سەرکردە تورکەکە بکەم. ئەو پیاوێکی گرنگی سەمەرە بو، خەڵکی قەوقاز بو، بە تورکیەکی ناحاڵی پڕ لە گرێو گۆڵ قسەی دەکرد، لانیکەم وا دیار نەبو کە بە بینینی من دڵخۆشە. هەرچۆنێك بێ فەرمانی دەرکردو هاواری کردە بەردەستەکەی و قاوەو جگەرەیان هێنا. ئەو نوسراوەی کە بەمن درابو دامە دەستی. لەبەر ئەوەی ئەو سەرکردەیە فەرەنسی دەزانی توانی وشەیەك لێرەو وشەیەك لەوێ ی تیا بخوێنێتەوە، خۆیشی وا دەرخست کە لە ناوەڕۆکەکەی گەیشتوە، ڕەزامەندی دەربڕی کە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بڕوا، بەڵام پێشنیاری ئەوەی کرد کە نەخۆشەکانی لە هەولێر بمێننەوە. بەڵام من سوربوم کە دەبێ دکتۆرێکیان بۆ جێبێڵێ کەچی ڕەتی کردەوە، لە کۆتاییدا بەڵێنی دا کە نەخۆشەکانی لەگەڵ خۆیدا ببا، کەچی دوای ڕۆیشتنی بینیمان کە هەمویانی بەسەرماڵەکانی شاردا دابەش کردون. ئەفسەرێکی تورکم لەگەڵ خۆمدا برد تاکو کۆگەو ئەمبارەکانی دانەوێڵە وەرگرم. ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی ئەو کارە بوم، چونکە بڕێکی زۆری گەنم و جۆ لە یەکەمیاندا هەبو. لە یەکێك لە مەرقەدەکانی (مەزار) یەکێك لە گۆڕستانەکان پتر لە (٥٠٠) گونیەم دۆزیەوە، لە جۆرەها دانەوێڵە. دواتر نانی ئێوارەم خواردو لە دیوەخانی ئەحمەد ئەفەندیدا(١٦) خەوتم، دەرگاکانی ئاسمان کرانەوەو بارانێکی بە لێزمە باری، بەدرێژایی شەو ڕەهێڵە بەردەوامبو بۆیە ئاو لە

بنمیچەکە کە بە قوڕ بانی گیرابو وەك جۆگەلە دەهاتە خوارێ. ڕۆژی دوایی شوێنەکە وەك دەریایەکی قوڕی لێهاتبو، پێم وابو کە دەبێ بۆ ڕێزگرتن سواری ئەسپەکەم ببم و بۆ ماڵئاوایی سەرکردە تورکەکە بچم، بەڵام وەك دەردەکەوێ، ئەو پێیوابو بۆ ئەوە چوم کە گاڵتە بە ڕۆیشتنی ئەو بکەم، لە بارودۆخێکی ئاوای کە مایەی شکۆمەندی نەبو. شارەکە پڕ ببو لە فەرمانبەری تورکان، زۆربەیان وەك ئەو ژاندارمەو سەربازە بەرەڵلا کراوانە لە کەرکوك و شوێنانی دیکەوە هەڵاتبون.

دەزگای کۆنی تورکی لە سەرای لە کارکردن بەردەوامبو، وام پێباش بو کە کارەکان تا هاتنی نەقیب (مۆری) وەکخۆی لێگەڕێم. تەنیا سەرو سەودای کارە بە پەلەکانم کرد، لەگەڵ ئەو بروسکە بە پەلانەی کە دەگەیشتن. دوای نیوەڕۆ هەمو پیاو ماقوڵان سەردانیان کردم، بە قوڵی قسەم لەگەڵدا کردن، بەڵام شتەکانی ئەوان کە دەکرا قسەی لەسەر بکرێ شتێکی ئەوتۆ نەبو. ڕۆژی (١٣)ی مانگ نەقیب مۆری گەیشت و کارەکانم دایە دەستی و، جارێکی دی گەڕامەوە ئاڵتون کۆپری، لەو گەشتەمدا تەنیا دو پۆلیس و خزمەتکارەکەم لەگەڵدابو کە سواری هێسترێك ببوو نوێنی منی لەسەر بو.

دەبوایە بەڕێی دیبەگە داو بە کەندێناوەدا بگەڕێمەوە، چونکە هەرێی سەردانی بنکەیەکی سەربازی بچوکم دابو کە سەربازەکانی بۆ ڕەوانە کرابون. میلێك یان دو میل دور لە (گوڵ تەپە) گەواڵەیەك لێیداین و لە ئاسۆوە بروسکی دەدا، جلەکانم بەشێوەیەك تەڕبون کە ئاو گەیشتە پێستەم، ئیدی بە ناچاری دەبوا جارێکی دی پەنا بۆ (مەحمود یابە) ببەمەوە. ئەو بەخێری هێنام و بەرەو دیوەخانەکەی بردم، هەندێ دڕك و داڵ و حوشترالوکی کۆکردەوەو ئاگری تێبەردا، ئاگرەکە ڕوناکی و گەرمیەکی زۆری هەبو. جلەکانم گۆڕین و لەبەر ئەوەی کاتەکە درەنگ بو بڕیارمدا شەو لەوێ بمێنمەوە. لەگەڵ کوردەکاندا لەسەر زۆر مەسەلەی مەترسیدار قسەمکرد، بەتایبەتیش دەربارەی ئەو دانەوێڵانەی حکومەت پرسیارمکرد کە دزەییەکان لە هەندێ لە ئەمبارەکانی ناوخۆ تاڵانیان کردبو. بەبیرم دێ کە پرسیارێکم لە (مەحمود ئاغا) کرد، دوای تەسبیحات کردنێکی درێژ بە عارەبی، وەڵامی دامەوەو وەڵامەکەشی لە درۆیەکی گەورە بترازێ چیدی نەبو. دوای شێوێکی سوك لە ساوار و هەندێ سەوزە پێکهاتبو، (سەیدێکی) پیر

بەسواری ئەسپێکەوە هات کە ناوی (شێخ ڕەزا)بو بەڵام خەڵکەکە پێیان دەگوت (شێخە شێتە). ئەو پیاوێکی گاڵتەچی خۆشبو و زیرەکیەکی گەورەی هەبو. ڕەنگە هەر ئەوەش بوبێ کە وای لە کوردەکان کردبێ بەشێتی دانێن. گفتوگۆیەکی دورو درێژی لەگەڵدا کردم، دواتر بەهاوڕێی نزیکی خۆی دانام، تا ڕادەیەك کە دەربارەی کێشە خێزانیەکانی پرسی پێدەکردم. ئەو نوێژەکانی بەدەنگی بەرز دەکردو دواتر دەیبڕین تاکو هەمیشە بەشداری قسان بکا، لەگەڵ مەحمود ئاغادا خەریك بو شێتم بکەن ئەگەر ئەو تۆزە ئەقڵ و ئەو بڕە سەبرەم نەبوایە، چونکە دوای چونە ناو نوینم بۆ نوستنیش ئەوان هەر بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. هەر هێندەش لە قسان بونەوە ئیدی پیرە شێخ دەستی بە کۆکین کردو بەدرێژایی شەو تفی فرێدەدا.

ڕۆژی دواتر کاتێك کازیوە دەرکەوت بە گوندی (قورشاغلو)دا ڕۆیشتم کە هی (ئەحمەد پاشایە)، ئەو بەخۆی لەماڵ نەبوو چوبوە پرسەیەك لەناوچەی خۆشناوەتی، لێرە دەبوایە لە ڕێگاکە بپرسم، زۆر سەرم سوڕما، کە کەسێك ناوی خواردنەوەشی نەدامێ– کە ئەمەش کارێکی زۆر دورە لە گوندێکی کوردی. لە کاتێکدا کە دەشتی هەولێرم دەبڕی لە هەمو لایەکەوە دەنگی تەقەم دەهاتە گوێ. ڕەنگە کوردەکان خۆیان پێوە سەرقاڵکردبێ، چونکە ئەوان لە هەموو خەڵك پتر حەزیان لە بەفیڕۆدانی فیشەکە ئەگەر زۆریان هەبێ. هەر کە گەیشتمە(دیبەگە) (١٧) بینیم کە (نەقیب ماریۆس)و دەستەکەی بە ئارامیەوە شوێنی خۆیان گرتوە. نانم لەگەڵ (ڕەسول ئاغا)دا خوارد کە لە هەر چوار سەرۆکە دزەییەکان کەم ناوبانگ ترە. ئەو پیاوە نەرم و نیانیەکی زۆری لەگەڵدا نواندم. ئەو پیاوێکی کەتەیە، کەلەشێکی گەورەی هەیە، خاوەن ڕەوشتێکی هارو هاج و بێئەقڵانەیە، بەڵام تا ڕادەیەکی باش خوێندەوارە. لەڕۆژی دواتر گەڕامەوە بنکەکەی خۆم.

هەمو مانگی داهاتو سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروبارە دوبارەکان بوم لە ئاڵتون کۆپری و بە ناوچەکەشدا دەسوڕامەوە. لە هەژدەی ئەو مانگەداو لە گوندێکی دەرەوەی شارۆچکەکە (مەحمود ئاغا)م بینی کە یەکێکە لە سەرۆك هۆزەکانی (شێخ بزێنی)و لە ناوچەی کۆیەدا نیشتەجێیە و تا ئێستاش لەژێر دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی تورکاندان، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە ئارەزوی ئەوەی دەربڕی کە بێتە

ژێر سایەی دەسەڵاتی بەریتانیا، بۆیە بۆ بەغدام نوسی و تکای ڕێگەدانی سەردانی ئەو گوندەم لێکردن، وڵامێکم بەدەست گەیشت کە ڕێگەی ئەوەی پێدەدام و پرسیاری ئەوەم لێکرابو کە لە کاتی گونجاودا بچمە کۆیەو کاروبارەکانی وەرگرم، منیش یەکسەر بە بەڵێ وەڵامم دایەوە.

ڕۆژی ٢٥ی مانگ لە کەناری لای ڕاستی زێ ی بچوکەوە سوار بوین تا گەیشتینە گوندی (سارتك) کە گوندی مەحمود ئاغایەو پێشتر باسمان کرد ئەو پیاوێکە ڕۆژگار قاڵی کردوەو گەلحۆیەو باڵایەکی کورتی هەیە، بەڵام ئیرادەیەکی بەهێزی هەیەو، زرینگ و دوربینە. لەگەڵ ئەوەی کە زۆر گومانـاوی نیـە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئاغاکانی دیکەی هۆزەکەی بەراورد بکرێ کە کۆمەڵە کەسێکن، لەوانەی مـن تا ئێستا بینیومن کە هەرە زۆڵ و ڕاڕان، ئەوا لەڕوی پیاو چاکی لەهەموان باشترە، کە ئەوان نە لەولاو نە لەولان، (مەبەستی نە لایەنگیری تەواوی تورکان و نە ئینگلیزن). ئەو پیاوە بوە برادەرێکی زۆرباشی من.

هەر کە لەڕۆژی دواییدا بەیانیدا، ئیدی لە (کەڵەکی) تایبەتی مەحمود ئاغاوە پەڕیمەوە، ئەو لە جۆری (هیس ڕۆبنسۆن)ە. لە کۆمەڵە تەختەیەکی بچوك دروستکراوە کە بە بزماری گەورە چەسپکراون، سەوڵی لوسنەکراو پاڵیپێوەدەنێن، کە لە نزیك دەستگیرەکەیدا زیادەی وەك درکی سروشتی هەن کە بەلای کۆڵەگەکەدان. جیرەو تەقەیەکی زۆریان لێدەهات. بەهێزێکی گەورەی سەوڵ لێدان بە سەلامەتی (گەیشتینە ئەوبەری. لەوێشەوە بەهۆی قاڵدرمەی لێژەوە گەیشتینە تۆقەڵەی گردەکانی (شوان)، لەوێشەوە مرۆڤ دەتوانێ دیمەنی جوان ببینێ، دەریایەك بو لە گردۆلکەی چۆڵ و هۆڵ کە دەکەوێتە لای ڕۆژهەلات و سنورێك دروستدەکا، لەخوارەوەشماندا زێ کیفەی دەکرد بە ئاوەکەی وەك مارێك لەناو بریقەی بەردی سپی، کە پانیەکەی دەگاتە نزیکەی میلێك، کە لێرەو لەوێ بێشەلانی داری چناری سەوز دەیڕازێنێتەوە. لەدوای گەشتێکی خۆشی درێژی چەند سەعاتی بەخاکێکی پڕ لە درەختی هەنجیرو چنارو سورە چنار، کە زەوی زەرکەشیەکەی وەرگرتبوو بەخشڵی پایزێکی خێرا، گەیشتینە (ڕێدار) بنکەی ناحیەی شوان. ئا لێرەدا توشی تەنگژە بوم کە هەوڵمدا (چواردە بنچینەکەی سەرۆك ویلسۆن) کە باسی مافی چارەنوسدەکا، بەسەر دو هۆزی نەزانی کوردانـدا

جێبەجێبکەم. هەریەك لەو دو هۆزە لانی کەم یەکی چوار پاڵێوراویان هەبو بۆ سەرۆکایەتی و، هیچ کامیان پەرۆشی خەڵکەکەی خۆی دەستەبەر نەکردبو. تاکە شتێکی کە کورد لە مافی چارەنوسدا تێیدەگەن ئەوەیە کە حاڵەتێك دروستبێ مرۆڤ حەزی لەچیبێ بیکا، بە واتایەکی دی: حاڵەتی فەوزا. لە یەکێك لە گوندەکاندا تا رادەی هەڵبژاردن چوم و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا.

لە (٢٨)ی تشرینی دوەمدا گەڕامەوە ئاڵتون کۆپری و دەستم کرد بەپێدانی قەرزێکی کشتوکاڵی بە خەڵکەکە. چونکە هەر هێندەی کە تورکەکان دەستیان بەسەر دانەوێڵە و مەڕو ماڵاتدا گرتبو، ئیدی یارمەتی دانی جوتیار بۆ دوبارە دەستپێکردنەوەی کارێکی زۆر پێویست بو. منیش ڕێگەم پێدرابو کە (سلفەی)باش بدەم بەرامبەر مەرجی ئاسان، ئیدی ڕاگەیاندنم بە هەمو ناوچەکاندا ناردو هانی خەڵکەکەم دا تا بێن برە پارەکە وەرگرن. باران دەستی پێکرد، مەترسیەکی خۆی هەبو، ئاوی ڕوبارەکە ئەو ناوەی بە بۆگەن پڕکردەوە، ئیدی دەبوایە ئەو پردە بزۆکەی کە لایەنی سەربازی دروستی کردبو تێکدەین، ویستم بە کۆنە کەشتیەکەمەوە شەپۆڵەکانی ئاوەکە ببڕم و بچمە ئەوبەری، بەلام ئاو بردی بۆ چەند میلێك خوارتر، هێنانەوەی بەرەو سەرەوە چوار سەعاتی ڕەقی خایاند. ناچار بوم لەبەری ئاڵتو کۆپری دانیشم و پارەکانیشم پێبو سەیری ئەو سەدان جوتیارە برسیانەم دەکرد کە لە بەرەکەی دیکە چاوەڕێبون بەلام بێهودە کە هەلێکیان بۆ ڕێککەوێ تا لە ڕوبارەکە بپەڕنەوە.

لە هەمان کاتدا بروسکە لە کۆیسنجەقەوە لەسەر یەك دەهاتن تاکو (حاکمی سیاسی)بۆ بچێ. حاکمە تورکەکە نەخۆشبو و بەهەر حاڵ دەسەڵاتێکی نەبو، حاڵەتەکەش هەمو ڕۆژێك پشێوی و شڵەژانی پتر دەبو. لە بەغداوە فەرمانم پێگەیشت کە بەزوترین کات بچمە ئەوێ، بەلام من بە مەبەستی دەرکردنی قەرزە کشتوکاڵیەکان دواکەوتم. لە دواییدا لەڕۆژی (١٢)ی کانونی یەکەمدا بروسکەیەك لە کۆیەوە هات، باسی ئەوەی دەکرد کە هۆزی پیران هێرشیان کردۆتە سەر شارەکەو تالان و بڕۆی تێدا دەکەن، بۆیە بروسکەم بۆ بەغدا کرد داوام لەو کەسەی ئەوێ کرد کە هەر ئێستا بچمە کۆیە. لە سەعاتی یەکی بەیانیدا نامەیەکم لەسەر هێڵی کراوە پێگەیشت کە ڕێگەی پێدەدام بڕۆم و هەمو دەسەڵاتێکی

پێدابوم تا چارەسەری پشێویەکە بکەم. ئیدی بە پەلە هۆکارەکانی گواستنەوەم کۆکردەوەو سەعات دەی بەیانی رۆژی (١٣)ی مانگ بەرێکەوتم.

بەشی هەشتەم

کۆیەو رانیە (١)

گەشتەکەمان کە رۆژێك بەسواری بو ئێمەی گەیاندە (سارتك) گوندی مەحمود ئاغا(٢)، کە بەڵێنی پێدابوم لەکاتی چونم بۆ کۆیە پاسەوانم بۆ ئامادە بکا. هەر هێندەی رۆژی دواتر بەیانیدا دەستەیەك کە لە (١٥)کەسی چەکداری ئازاو بەجەرگ پێکهاتبون و زیتەیەکی ردێن رەش سەرکردەیان بو ناوی عەباس ئاغا بو سەرکردایەتی دەکردن، پەیدابون. مەحمود ئاغا سوربو لەسەر ئەوەی کە خۆیشی لەگەڵماندا بێت. جگە لەو کورانەی عەشیرەت من هەشت پۆلیسم هەبون کە کورتەك و شەروالی شینی کالّیان لەبەردابو لەگەڵ خزمەتکارە دڵسۆزەکەم، جەعفەرخان، کە لوری بوو کلاوێکی بەرزی لەسەر بوو خەڵکی پشتکۆ بو پیاوێکی تێکسمڕاو بوو شەش پێ بالای هەبو سەرو قژێکی پڕو تێکچڕژاوی هەبو، ئەو هاورێ و خزمەتکار بو لەولاتی غەریبی چ بۆمن و چ بۆخۆی.

لە سارتك دابڕاین، کەشەکەی دژبو، دوای ئەوەی چەند میلێك بە لێواری زێی بچوکدا رۆیشتین، باماندایەوە ناو گردو تەلانانی نزم کە هەموی تەمۆخی سوربو، ئەمەش تایبەتمەندی ناوچەی کۆیەیە. پێنج سەعات رێمان کردو رێگەکەمان هەر ئەوەتە دیاربو، چونکە بارانی بەخوڕ رایماڵیبو، خوارو خێچ و پەناو پێچ بو، لەسەر تەپۆلکەی پانی سور، کە تەنیا ناوە ناوە دەستە پوشی درێژ دەیڕازاندەوە، جۆگەلە ئاوی سەر بەرەو خواری پێدا دەهات و دار ژاڵەو (لورك) قامیشی بەرزی تێدا هەڵچوبو. ئەو چەند گوندە کەمەی ئەو ناوچە وشك و برینگە لە نێو دۆڵی نێوان گردەکاندا دور حەشار درابون. تەنیا بەهۆی تاکە درەختێکی توەوە بۆ رێبوار دەردەکەوتن.

هاوسەفەرەکانم، لای نیوەرۆ بۆ نوێژکردن وەستان، لە قولأیی دۆڵێك لای ئاوێك نوێژیان کرد، نزیك سەعات سێ ی دوای نیوەرۆ لە گردۆڵکەکان دەرچوین و بۆناو دەشتێکی چکۆلەی بەرزو نزم و هەر خێرا گەیشتینە گوندی (ئیلنجاخ) و بڕیارماندا شەو لەوێ بمێنینەوە. لەبەر ئەوەی ئەو گوندە تەنیا جوتیاری لێبون و

دیوەخانێکی لێنەبو کە شایانی ئەو ناوەبێ، ئیدی دەبوایە شوێنێك و خواردن لە یەکێك لە ماڵەکان پەیدا بکەم. کە لە ڕێگا بوین نامەیەکم لە (حەماغا)وە پێگەیشت، لە کۆیەوە، نامەیەکم بۆ نوسیەوەو بە (حاکمی شار) قسەم لەگەڵ کرد، ڕاشمگەیاند کە ڕۆژی دواتر لەگەڵ گەردو گوڵی بەیانی دەگەمە ئەوێ.

بەر لە گەیشتنە کۆیە بەپێویستی دەزانم بەکورتی باسی کاروبارەکانی ئەوکاتی بکەم، بەدرێژایی چەند سەدەیەك دو دەستەی دوژمنکارو ڕکابەر شارەکەیان ماندو کردبو، ئەوانیش (خانەوادەی غەفوری) و (خانەوادەی حەوێزی) بون، ئەمانە دو خانەوادەی کوردی بون کە زۆربەی گوندەکانی دەوروبەری شارۆچکەکە موڵکی ئەوان بون.

ئەوکاتەی کە دەمەوێ باسی بکەم، سەرۆکی خانەوادەی غەفوریەکان (حەماغا) بو کە پێشتر باسمکرد، پێیان وتم کە خوا تەمەنی گەیاندۆتە (١٢٠)ساڵ، بەلآم هێشتاش توانا عەقڵیەکانی لەدەست نەداوە. لەبەر ئەوەی دەستەکەی ئەو خەڵکی زیاتر بوو لەبەر ئەوەی لەخواترسی و تەمەنەکەی ڕێزێکی پتریان لە هەردولا پێ بەخشیبو، بۆیە (موقەدەم نوێل) پێشنیاری کرد کە بە حاکمی هەڵبژێرم.

سەر دەستەی خانەوادەی حەوێزی، هەرچەندە لە بەرامبەر غەفوریەکان لاواز بون، بەلآم شانازیان دەکرد کە پیاوانی لێهاتوتریان هەن و، لەناویشیاندا خودی (عەبدوڵلآغا)، تورکەکان بەلای ئەویاندا دەشکاندەوەو بۆ چەند ساڵێك دەسەلآتێکی تەواوی لە شارەکەدا هەبو، هەر هێندەی دەسەلآتی تورکان دوای ئاگربەست لاوازبو ئیدی (خانەوادەی غەفوری) بڕیاری سەلماندنی خۆیان داو هەندێکیان کە حەماغا لەوان نەبو هەلەکەیان قۆزتەوەو هانی (سواراغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی پیرانیان دا کە زنجیرەیەك تاوانی تالآن و برۆ بکا کە موڵك و ماڵەکانی عەبدوڵلآغای کردبوە ئامانج و دواتر خودی شاری کۆیە. کاتێك دەستەیەك لە یەکە پیاوانی عەشیرەتی بلباس گەمارۆی ماڵی عەبدوڵلآغایان داو یەکێك لە کوڕەکانی بە سەختی بریندار بو، حەماغا لە نوێنی نەخۆشیدا هەڵسایەوەو لەژێر باڵی تاریکی شەودا هەرایەکەی کپ کردەوە.

ئەو ڕوداوە تەنیا دو ڕۆژ بەر لە بەڕێکەوتنم لە ئاڵتون کۆپریەوە ڕویدابو. ڕۆژی پازدەی ئەو مانگە ڕۆژێکی ساردبوو بایەکی توندی دەهات، دەبوایە بەر لەوەی بگەینە شوێنی مەبەست، نزیکەی (١٤)میل لە زەویەکی بەرزو نرم و بێ دارو درەخت ببڕین کە دۆڵی سوری قوڵی لە بەیندابو. سەعاتە ڕێیەك دور لە شار نزیکەی (٥٠) سوارەم دیت کە لەسەر گردێك چاوەڕوانی هاتنی منیان دەکرد، ئەوەش پێشوازی یان ئەو دەستەیە بون کە بۆ پێشوازی من هاتبون لەناویاندا پیاوێکی دەموچاو کەسکون: عەبدوڵلاّغا بەخۆی و جلە ئەوروپیەکەی و عەبدوڵلاّغای پیرەمێرد بەخۆی و جلە جوانەکانی و ڕیشە سپیەکەی کە دەتگوت بەفرەو سینگە کوڵکنەکەی، کە تەنانەت لەو کەش و هەوا ساردەشدا کراوەبو. زۆر کەسی دیکەشیان لەگەڵدابو، کەسێکی وایان تێدانەبو کە کەسایەتی و ڕای هەبێ. دیتم کە دەموچاویان کەسکون ببو لە تورەیی تۆڵە سەندنەوە، کە تەنیا لەم دنیایەدا ئەوە نیشانەی مرۆڤەکانە. یەکەم کەسێکی کە بەخێری هێنام عەبدوڵلاّغا بو، بەلاّم من یەکسەر پرسیاری حەماغام کردو بەسەر پشتی ئەسپەوە بە تەکیەوە ڕۆیشتم، ئەوە زۆری تورە کرد، هەوڵیدا بە لایەنێکی دیکەوە خەریکم بکا. کەشەکە ئەوەندە ساردبو کەڵکی گفتوگۆی نەبو، بە بێدەنگی بەناو گۆڕستان و کەلاوەکاندا ڕۆیشتین تاکو چوینە ناوشار، لە دامێنی شاردا تاقمی گاوران پێشوازیان کردم و لە بەرابیاندا قەشەکەیان کە تەیلەسانە ڕەشەکەی لەبەردابوو زۆر دڵخۆشبو لەو بیرۆکەیەی کە بۆیهاتبوو پوختەکەشی ئەوەبو کە من بۆ ئەوە هاتومەتە شارەکەی تا لەو چەوسانەوەیە ڕزگاری بکەم کە چەند سەدەیەکە بەردەوامە. هاتنی من لە ڕۆژێکدا کەش و هەوایەکی ناخۆشی هەبو، نوقلاّنەیەکی خێری هەبو، چونکە کەسێك لە کاتێکدا دێ کە دەرگاکانی ئاسمان بە باران کرابێتەوە تا خێر و بەرەکەت لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

سەرەتا بردمیانە سەرای کە ژورێك بۆ پێشوازی کردنی من ئامادە کرابو. هەمو پیاو ماقوڵانی شار، وەك مەلاکان، کۆببونەوە دوای پێشکەش کردنی چاو قاوە موفتی شار (موحەممەد مەلا فەندی) کە کەسایەتیەکی ئایینی بو وتارێکی بەخێرهێنانی درێژی، بە فارسیەکی مەرابیکەرانە پێشکەش کرد، ئەوەندەی لە توانامدابو بەشێوەیەکی باش وەلاّممدایەوە.

ئا لێرەدا پێویستە وەسفی ئەو دەوڵەمەندو پیاو ماقوڵانە بکەم کە لە پێشوازی کردنمدا بەشدار بون. لەپێش هەموویانەوە حەماغا دێت ئەم پیاوە بەهێمنی و بێدەنگی دانیشت، تەنیا ئەو مشەمشێکی دەمنادەم لێدەبیسترا. ئەو نمونەی باوکێکی بەسۆزە، بەردەوام ئەو قلیانەی دەکێشا کە درێژیەکەی دو پێ یان زیاتر دەبو و باسکەکەی نەخشێنرابوو قومقومەکەی لە بەردی ڕەش دروستکرابو. کورتە بنەیەکی نێوشان پان بو، ئەگەر تەمەنەکەی لەبەر چاو بگرین لەگەڵ هێزە جەستەییەکەیدا، ئەو پیاوێکی نایابی خاوەن تەندروستی بو. دەڵێن بەدرێژایی ژیانی تەنانەت لە ساردترین ڕۆژەکانیشدا ئاوی گەرمی بۆ خۆشوشتن و دەستوێژ بەکار نەهێناوە. تەمەنی ڕاستەقینەی ئەو لەنێوان ٩٥ تا ١٠٠ ساڵ دەبێ، ٦٠ ساڵ دەبێ ئەو سەرۆکایەتی خانەوادەکەی دەکاو، ڕێ ی ژیانیشی پڕ لە چەرمەسەری و کێشە بوە. ئەو ئەوکاتەی بەبیردێتەوە کە هێشتا منداڵ بوە، کێشە لەنێوان پاشاکانی ڕەواندزو سلێمانی دروستبوەو هەردەمەی یەکێکیان کۆیەیان دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیان. لە سەرەتای گەنجیدا شەڕی تورکانی کردوەو دوای ڕژانی خوێنێکی زۆر دەستگیر دەکرێ و دەخرێتە بەندیخانەوەو پازدە ساڵ تیا مایەوە. لەکاتی ئەو ململانێیەدا گوێچکەی خەریکدەبێ لێبێتەوە، دواتر برینەکەی یەکدەگرێتەوە بەڵام بەردەوام کێمێکی لێدەهات ئەویش بەردەوام پاکی دەکردەوە. گەلێ پێکدادان لەنێوان ئەو و هۆزەکانی دەوروبەری کۆیە ڕویانداوە. کە هەمەوەندەکان(٤) هێرشیان کردە سەر گوندەکانی بانگی عەشیرەتی شێخ بزێنی کرد تا بۆ دەرکردنیان یارمەتی بدەن. دوای ئەو سەرکەوتنە ئیدی تواني شێخ بزێنیەکان دەرکاو بیاننێرێتەوە شوێنی خۆیان. ئەو نزیکەی پەنجا گوندی لە ناوچەکانی دەوروبەری کۆیە هەیەو بنچینەی سیاسەتەکەشی ئەوەیە کە نەهێڵێ عەشیرەتەکان هێرشی بکەنە سەر. ئەو هەمیشە پەردەی نائومێدیەك بە سەریدا هاتبو کە لانەدەچوو تاپۆی هیوایەك خۆی بۆ دەنواند کە ڕادەستی نەدەکەوت، چونکە منداڵەکانی هەمو بە بچوکی مردبون، ئیدی میراتگرێکی نەبو. لە کۆتاییدا...کاتێك گەیشتە نەوەت ساڵی یەکێك لە مەلاکان هات و هەواڵی ئەوەی دایە کە خودای گەورە کوڕێکی دیکەی دەداتێ. دەبێ ناوی بنێ (موحەممە زیاد) دەبوایە کوڕەکە هەر کە چاوی بە دونیا هەڵێنا لە دایکی دور بخرێتەوەو، هەرگیز

لە کۆیە نەژی. ئەو پەرجوە (معجزە) لەکاتی خۆیدا بەڕێچوو ئەو دەمای من گەیشتمە کۆیە موحەممەد زیادی چکۆڵە تەمەنی هەشت ساڵان بوو، لە گوندێکدا دەژیا کە چەند سەعاتێك لە کۆیە دوربو. حەماغا پیاوێکی دەمو دو خۆش و خۆش مەعشەر بو، هەمو بێهێزیەکانی بە ساڵاچونی پێوە دیاربو، ئەو شەیدای ئەوەبو، بە تایبەتی کاتێك دەوروژێنرا، چیرۆکەکانی سەردەمانی چوی بگێڕێتەوە، ئەگەرنا لەکاتی قسەکردندا خەو دەیبردەوە، خەندەیەکی نەرمی لەسەر لێوانبو، ئەو گیانی لەخۆبوردەیی و بەرامەی لێبوردن بو، چونکە باسیان دەکرد کە ئەو تاکە پیرەمێردێکە لە کوردستاندا کە ڕژدو ڕەزیل نیە. ئەو لەگەڵ دڵپاکی و شێوە بەردڵەکەیدا، زگماك، لاملێکە کە لاملی وەکخۆی نیە. ئەو بەرامبەر خزمەکانی زۆردارێکە بێ حەوسەڵەو دەغەرەو هیچ کام لە دوژمنەکانی نابورێ، بۆیە کۆنە قینی بێ مانای ئەوتۆ دێنێتەوە گۆڕێ کە ساڵانێکی بەسەردا تێپەڕیون. خۆشەویستی و ڕق و کینەی تایبەتی خۆی کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر ڕەفتاری هەیە.

ئەوەی جێ ی داخە دەبێ لە قسەکردن لەسەر ئەو پیرە خۆشەویستە (حەماغا)وە بچینە سەر قسەکردن لەسەر گەورەی خانەوادەی حەوێزیەکان (عەبدوڵلا ئاغا). ئەو پیاوێکی لاوازی تۆزێ کۆم بو نزیکەی (٦٥)ساڵ دەبو دەموچاوێکی ڕەنگ بواردوی هەبو کە ساڵان کاری خۆیان تێدا کردبو، برۆیەکانی چڕو بە بۆیەیەکی ڕەش بۆیە کرابون کە بەسەر شیندا دەیروانی هەمیشە ڕوخسارێکی تورەی هەبو، بەتایبەت کە جلی ئەوروپی لەبەر دەکرد. ئەو لە پیلانگێڕیدا بالابو. کە من گەیشتم هێشتا لە پۆستی سەرۆکی شارەوانیدابو، بەلام زۆربەی خەڵکەکە ڕقیان لێ ی بو. خزمەکانی خۆی چارەیان نەدەویست بەلام بەتوانا عەقڵیەکانی سەرسامبون، لەمەشدا زۆری لە سەرەوەی حەماغا بو.

دیارترین خزمەکانی جەمیلاغای کوڕە مامی بو کە بەڕاستی پیاوێکی لەباربو. باوکی کە کاری تەواوبو، لە بەر ئەوەی کوڕبو بە حەماغای سپارد، دواتر جەمیلاغا کچە مامی ئەوی هێنا، بۆیە پەیوەندیەکی بەتینی بە هەردو خانەوادە ڕکابەرەکەوە هەبوو، پایەی ئەویش لە نێوانیاندا پایەی کەسێك بو کە هەمیشە هەوڵی گونجاندنی دەدا. وە وەك کوردێك کە من دیومە ئەو لە پیاوە هەرە

ڕاستگۆو ئەمینەکان بو. ئەو نمونەی لە خودا ترسی بو، بەڵام بەهەر حاڵ ئەو دەمارگیر نەبو، خەڵك بەوە دەیانناسی کە پشتیوانی جوەکانە. کە لە گەڕەکەکەی ئەودا نیشتەجێبون، جوەکانیش وەك گاورەکان هەندێکیان وەك جوتیار لە زەویەکانی ئەودا کاریاندەکرد. لە سەرەتای لاویدا لە پۆستی (سەرۆکی شارەوانی شارۆچکە)دا کاریکردبو بۆ ماوەی چوار ساڵ. ئەو تاکە کەسبو کە ئەو پۆستەی بۆ بەرژەوەندی شارۆچکەکەی بەکارهێنا نەك بۆ بەرژەوەندی خۆی، ئەو پیاوێکی باڵابەرزی قیت و قۆزبو، دو برۆی باریکی هەبون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەم و چاوی لاوازبو، ئەو لە پشێویدا قوربانی بەهەمو شتێك دەدا لەپێناو ئارامی و ئاشتی. دوبرای هەبون (جەلال) و (جەلیل) کە هەر دو پیاوی زیرەکبون.

بە گشتی لە کۆیە مەلا زۆربون کە عەمامەیەکی سپیان لەسەر دەنا، لەپێش هەموشیان مەلا موحەمەد ئەفەندی کە ناوی (مەتران)مان لێنا (ئاوا: وەرگێڕ) ئەو لە ناوەڕاستی تەمەندابو، باڵایەکی بەرزی هەبوو خاوەن زانست و مەعریفەیەکی باشبو. ئەو بەهرەیەکی چاکی هەبو لەزۆر قسەکردندا، لە هەر شوێنێکیدا بوایە قسەکردنی پاوان دەکرد. خۆشبەختانە ئەو خۆرسك بەهرەیەکی وای هەبو کە وایلێدەکرد کە لە کەسە هەرە بەردڵەکان بێ، ئەو هەمیشە شانازی بەوەوە دەکرد کە زاناترین زانایانی کوردستانە، ئەمەش یەك لە سیفەتەکانی توێژەکەی ئەوبو، لەژێر سایەی بەڕێوەبردنی ئێمەدا بوە (حاکمی شەرع) لە کۆیە. لەگەڵ ئەوەی کە زانستی ئەو لە سەروی گومانەوە بو بەڵام دروستی حوکمەکانی زۆرجار دەکەوتنە بەرپرسیار، ئەو ڕوحانیەکی دنیایی بو، پەرۆشی کۆمەڵگاو کەلاوەی دنیابو.

هەر هێندەی ڕێورەسمەکە تەواوبو لە سەرا، ئیدی بەرەو ماڵێك کە حەماغا بۆی ئامادە کردبوم ڕێگام گرتەبەر. ئەو پیاوە پیرە لەگەڵمدا هات، هەوڵیدەدا بە تێکەڵێکی سەیری فارسی و تورکی قسەم لەگەڵدا بکا، ئەو دەنگێکی گڕی هەبوو حاڵیبون لە وشەکانی شتێکی ئەستەم بو، کە توانیشم وەڵامی بدەمەوە ئەو نەیدەتوانی، بە دەگمەن نەبێ، لە وشەکانم حاڵی ببێ چونکە گوێی گرانبو. دوای پێشکەشکردنی نیوەڕۆ خوانێکی نایاب حەماغا خۆی کێشایەوەو دوای نیوەڕۆم بە بینینی خەڵکانی پایەدار بەسەر برد. کۆمەڵە کێشەیەکی زۆرم لەبەردەمدا بو، کە گرنگترینیان سوڵحی نێوان خانەوادەی غەفوری و حەوێزی بو لەگەڵ ڕێکخستنی

دەسەڵات لە شارەکە بەشێوەیەك کە بۆ هەردو لایان گونجاو بێ، دواتریش وەرگرتنی قەرەبو لە سواراغای پیرانی بەرامبەر ئەو زیانانەی کە لە عەبدوڵلاغا کەوتبو. من بڕیارم دابو کە حەماغا ببێتە حاکمی شارۆچکەکە، بۆیە پێویستبو کە پۆستەکانی دیکە بەشێوەیەك دابەشکرێ هاوگونجانیەك لەنێوان دەستە ڕکابەرەکاندا دابین بکا.

ڕۆژی دواتر توانیم حاڵ و باڵی شارۆچکەکە بزانم، شارێکی پێکداچوەو دەکەوێتە نێودۆڵێکەوە، کە نزیکەی (١٨٠٠)پێ لە ئاستی دەریاوە بەرزە، لەلای ڕۆژهەلآت و باکور گردو چیا دەوریانداوە کە بەرزیەکەیان (٣٠٠٠) پێ پتر دەبێ. ئەو دەشتە بچوکەی شارەکەی تێدایە لە لایەکانی دیکەوە زەویەکی پڕ لە بەردی تەمۆخی دەورەی داوە کە لە پێشتر باسم کرد. کە شەڕ کۆتایی هات دانیشتوانی شار لە (١٠:٠٠٠) کەسەوە ببونە (٤٠٠٠) کەس، ئەمەو نیوەی ماڵەکانی شار چۆڵ و هۆڵن و ڕوخاون، خەڵکەکەیشی لە هەژاریەکی بێوێنەدا بون. نرخەکان کە پێشتر بەشێوەیەکی نا ئاسایی بەرز ببونەوە، دوای چەند ڕۆژێك لە گەیشتنی من سەدا پەنجا دابەزین، وە بە مەبەستی کەمکردنەوەی چارەڕەشی کە هەمو لایەکی گرتبۆوە خانەیەك بۆ نەداران کرایەوە کە (٣٠٠٠)کەسی لەخۆگرت و هەر هەموشیان هەتیوبون. کۆڵانەکانی شارۆچکەکە تەسکن کە لە دو ڕێگای بەرز پێکهاتبون و لەنێوانیاندا ڕارەوێك هەیە کە تا ئەو ڕادەیە فراوانە وڵاخێکی بەبارەوە پێدا تێپەڕێ.

ئۆردوگا کۆنەکەی تورکان دەکەوێتە سەر گردێکی گەورەی لای ڕۆژئاوای شار، لەسەر بانەکەیەوە کە بەرزەو بەسەر دەوروبەرەکەیدا دەڕوانێ توانیم دیمەنەکە بەدیکەم، گوندەکان بەراون، شارۆچکەکەش بەمزگەوت و درەختەکانیەوە لە خوارەوەی من بون. کە بە گشتی تۆزاویەو ئاو نادرێن، پشتیشی بریتیە لە گردۆڵکەی ڕەش کە مێژەرێکی دڵارای هەوری پڕ لە ئاوی ئاسمان سێبەری لەسەر کردوە. ئەودەم دەگژ فکران ڕاچوبوم، بە زنجیرەی ئەو بارودۆخانەدا دەچومەوە کە منیان هێناوەتە ئەو زەویە دورەدەستەو فڕێیانداومە نێو ئاژاوەیەکی خانەوادەیی، کە چەند سەدەی بردوە.

لە ئێوارەیەکدا کاتێ لە سەرای بوم نێردراوێك گەیشتبو هات و وتی: ئەفسەرێك و دەستەیەك سەرباز خەریکە دێنە ناوشار بۆ ئامادەکردنی شوێنێك بۆ (شێخ عەسمان) کە لەلایەن شێخ مەحمودەوە کراوەتە قایمقامی کۆیە. بەر لە چەند هەفتەیەکی کەم موقەدەم نوێل سەردانی سلێمانی کردبوو، شێخ مەحمود بە حوکمداری کوردستان دانرابو(٨).

کۆیسنجەقی خستبوە سەر ویلایەتەکەی، بەلاَم لە موقەدەم (نوێل)م بیست کە ئەوە کاری منە کەسێکی شارەکە بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێرم، بۆیە لەو کارەی ڕویدا تۆزێك هەناسە سواربوم، بە تایبەتی کە من ئەو پۆستەم دابوە حەماغا. زیاد لەوەش من توشی تەنگژەی پتر ببومەوە، چونکە لەگەڵ ئەوەی هێڵی تەلەگراف کراوەبو بەلاَم کارمەندەکانی خەڵکی ولاَت بون لەبەر ئەوە هەر نامەیەکی کە دەمنارد، بەڕاستی، دوای چەند سەعاتێك دەبوە هەواڵێکی بەر بلاَو.

شێخ عەسمان ئەو شەوە لەگەڵ (شێخ عەبدوڵلاَ)ی کوڕە مامی و کۆنە ئەفسەرێکی تورکان کەناوی (ڕەشید ئەفەندی)بو گەیشتنە جێ. دیتم کە ئەوان هێزێکی (٤٠٠)سەربازییان ڕەوانەکردو بەلاَم من بەشێکیانم دیت. مەبەست لە هاتنی ئەوان هاریکاری منبو بۆ گێڕانەوەی ئاسایش، بە تایبەتیش دابینکردنی گوێڕایەڵی سواراغای پیرانی. شێخ عەسمان بەڕاستی پیاوێکی نەبەردو سالار بو، سروشتێکی بێ وەی و خولقێکی نەرم و نیانی هەبو. ئەو گزگل و لاواز بو، بەلاَم لەش و لاری زۆر جوان بو. سەرەڕای بەژن و بالاَی من کەسێکی دیکەم نەدیوە شکۆدارو مەزن وەك شێخ عەسمان، ئەمەش لەکاتی هاتنی بۆ سەرای بەخۆی و عەباکەیەوە کە با دەیشەکاندەوەو ئەو دەستەو دایەرە درێژەی کە بە دوایەوە دەڕۆیشتن. لە هەمو کاروبارەکانی لەگەڵ مندا ڕاستگۆو ڕون بو، ئەو نیازێکی نەبو کە ببێتە حاکمی(قایمقام)ی کۆیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵکانێك ئارەزوی ئەوەیان دەکرد. شێخ عەبدوڵلاَ پیاوێکی بەهێزترو ڕۆشنبیرتر بو، ئەو هەمو تەونەکانی چنیبو بۆ لابردنی حەماغا و دانانی یەکێك لە کەسانی بنەماڵەی شێخەکان لەو پۆستەدا. لەمەشدا ڕەشیدەفەندی فیڵباز یارمەتی دابو، ئەو کەسەی کە هەمو کاتی خۆی لە بەندکردنی جولەکەکان و گاورەکاندا بەسەر دەبردو پارەی لێبەردەدانەوە. تا ئەو کاتە هیچ بیرۆکەیەکم دەربارەی ئەو دەسەلاَتانە نەبو کە

موقەدەم نوێل بەشێخ مەحمودو نێردەکانی دابو، بۆیە کەوتبومە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە. گفتوگۆیەکی دورو درێژم لەگەڵ حەماغادا کرد، کارەکانم وا رێکخست کە دەسەلاتی ئەو لە ئێستادا بوەستێنرێ. دواتر داوام لە شێخ عەسمان کرد (وەك نوێنەری تایبەتی شێخ مەحمود) حوکمی شارۆچکەکە پیادە بکا. واتە بەو مانایەی کە هاتوە کاری تۆڵە سەندنەوە کە لەنێوان خانەوادەی غەفوری و حەوێزیدا بەرپابوە یەکلایی بکاتەوە، کاتێك کە ئەمەشی کرد ئیدی بڕواتەوە.
کەس لە کۆیەدا بە بینینی شێخەکان دڵخۆش نەبو، تۆڵەیەك، کەماوەیەکی درێژە، لەنێوان حەماغاو بنەماڵەی سلێمانیدا هەبو. دوای نیوەڕۆ سەردانێکی قایمقامە تورکەکەی پێشترم کرد. پیاوێکی گرگن بو، ئەو خەڵکی (کریت)بو، بە نەخۆشیەکی کوشندە لەناو نوێن کەوتبو. زۆر بەزەییم پێدا هاتەوە کە لەو بارە خراپەیدا لەناو خەڵکانێك کەوتوە کە هیچ رێزێك لە یاسا نانێن. هەر بەڕاستی بە بینینم دڵخۆشبو، قاوەیەکی نایابی ئەستەنبوڵی و خواردنەوەیەکی دیکەی پێشکەش کردم کە لە چا دەچو. بەلام لە (السنا الملكي) ئامادەکرابو و بۆشی دوپاتکردمەوە کە باشترین دەرمانە بۆ چارەسەری ئەو هەلامەتەی کە توشی ببو. سەرەتا بەوە دەستی پێکرد کە کۆمەڵێك دانپیانانی هەیەو دەیەوێ بۆ منیان هەڵڕێژێ، زۆریش خۆشحاڵە ئەگەر گوێ ی لێبگرم. دوپاتی کردەوە کە مەسەلەی کارو چۆنیەتی سەرو بەر کردنە بە موڵك وماڵی تورکیی گشتی. زۆری داوای موچەکانی پێشتری و دەرماڵەی هاتوچۆو خەرجی گەشتی کرد بۆ ئەوەی بگاتەوە ولاتە دورەکەی، لەو بارەوە هەرچی لەدەستم هات بۆ ڕازیکردنی ئەو کردم.

دواتر قسەکانمان بە مەسەلەی پیرانەکان کۆتاییان هات، ئەودەم هەناسەیەکی هەڵکێشاو بە دەنگێکی بەرز وتی: (کاتێك حکومەت بەهێزە ئەو خەڵکانە وەك مەڕی کپیان لێدێ، بەلام هەر هێندەی حکومەت لاواز بێ لەو کاتەدا وەستاو لەناو نوێنەکەی بازیداو هاواری کرد:) ئەوان وەك شێر دەنەڕێنن.

ڕۆژانی دواترم بە هەوڵی ڕێکخستنی نێوانی ئەو دو دەستەیە بەسەر برد لەکاتێکدا کە شێخ عەبدوڵلا بەدرێژایی کات، باشترین هەوڵی دەدا بۆ کۆسپ دروستکردن لەبەردەم پلانەکانی مندا. من وام دەبینی حەماغا بکرێتە حاکم و عەبدوڵلاغاش بکرێتە یارمەتیدەری، هەرچۆنێك بێ حەماغا قبوڵکردنی ڕکابەرە

ناحەزەکەی ڕەتکردەوەو، لەجیاتی ئەو پێشنیاری جەمیلاغای کرد. بەوە ڕازیبوم، خەریکبو فەرمانی ئەو دامەزراندنە دەرکەم، کە هەواڵێك بلاْوبۆوە کەوا (کریم ئاغا)ی برازای عەبدوڵلاْغا یەکێك لە گوندەکانی حەماغای سوتاندوە کە توتنێکی بەنرخی تیابوە.

ئیدی ئاشکرابو کە لە سولحی نێوانیان ڕێگەیەکی نیە، چونکە (پێدرێژیەکە مەودای فراوان بو بو)، ئەگەر فشارێکی توند نەخرێتە سەر هەردولا. بۆیە بەخەیاڵمدا هات کە ئاژاوەگێڕترینیان بگرم و ڕەوانەی سلێمانیان بکەم. بەیانی ڕۆژی (٢٠)ی مانگ پلانەکەم بەشێخەکان ڕاگەیاندو ئەوانیش پێی دڵخۆشبون، سروشتی ئەو تەڵەیە بەدڵی ئەوان بو. چونکە بونی دو بارمتە لە سلێمانی دەسەلاْتی شێخ مەحمودی لەکۆیە زۆر زیاتر دەکرد. ئەوان پەیمانی گرتنەکانیاندا، تەنیا تکای ئەوەیان لێکردم کە (شەو ڕاشکا) سێ چوار سەعات دوای خۆرئاوابون، بچمە ماڵەکەیان. دوای شێوکردن نامەیەك لە شێخ عەسمانەوە هات و ڕێی ماڵی ئەوم گرتەبەر، لەوێ شێخ عەبدوڵلاْ بەهێواشی و دڵخۆشی باسی ئەو پلانانەی بۆ کردم کە دایاننـاوە. لەو کارەدا بەشێوەیەك لەشێوەکان دورو بوم، چونکە فەرمانەکە بۆ هەردو قوربانیەکەمان ڕەوانەکرابو کە تیایا داوای لێدەکردن بێنە ماڵی شێخ و لەوێ بمبینن، هەر هێندەی گەیشتن ئیدی بگیرێن و بەشێوەیەکی نهێنی ڕەوانەی سلێمانی بکرێن، بەدرێژایی دو سەعات لەتەك شێخ عەسماندا هەڵتروشکام، خەڵکەکە لە هاتوچۆو وروژاندابون و (لە چرپە بترازێ شتێکی دیکەت نەدەبیست).

شێخ عەسمان پیاوێکی زۆر لەبارو نەرم بو، کامێرایەکی جۆری (کۆداکی) پێشکەشکردم کە کاتی خۆی پیاوەکانی هێرشیان کردبوە سەر ئەفسەرێکی ئەڵمانی و لێیانسەندبو، دوای سەعات نۆی شەو شێخ عەبدوڵلاْ هات و ڕایگەیاند کە توانیویەتی (محمد امین غفوری) کە گەورەترین برازای حەماغابو بگرێ، کە گەنجێکی زۆر دەبەنگ بو و خوێندەواریەکی باشی هەبو.

دوای کەمێك نێچیرەکەی دیکەمان (کریم ئاغا) هات و دانیشت، برازای عەبدوڵلاْغا بوو لە ڕەنگزەردیدا ملەی لەگەڵدا دەکرد. دواتر باشم ناسی و بینیـنم کە پیاوێکی ڕۆشنبیر و بە توانایە. دوای ئەوەی چەند پرسیارێکم دەربارەی

تەندروستی مامی لێکرد، شێخ عەبدوڵلا ئاماژەی بۆکرد کە بەرەو دەرگا بچێ و لەوێ پێیانڕاگەیاند کە دەبێ بچێتە سلێمانی. ئیدی بە پەلە ڕۆیشت دەڵێم بەداخەوە کە پیاوەکانی شێخ کە بەرەو سلێمانی لەگەڵیدابون سەعات و چ پارەیەکی پێبو لێیانسەندبو. حەزم بەو ڕۆڵە نەبو کە ئەو شەوە یاریم کرد، ئەستەمیشە کە بە نوسین باسی ئەو کەشە شڵەژاوە بکەم، کەشی هەڵچون و تەڵەکەبازی، کە ماوەی دو سەعاتی خایاند لە ماڵی شێخ عەسمان و وێنەکەیم بەڕونی لە یادەوەریمدا نەخش کرد.

تا بەیانی کەس نەیزانی کە ئەو دو (ئاغایە) دورخراونەتەوە، خەڵك وایاندەزانی کە چونەتە کەرکوك. حەماغای پیرە پیاو بەتوڕەیی و هەڵچونەوە هاتە بەڕێوەبەرایەتیەکەم و(بە دڵشکاویەوە) بانگی کرد و وتی: (هێ ی ئەتۆ، چیت لە کوڕەکەم کرد، بینای چاوانم؟ تەنیا ئەو کوڕەم ماوە کێ سەرپەرشتی گوندە دورەکانم بکا، هێی تۆ چیت لێکردوە؟ وەڵامم دایەوە: (ئەو دەچێتە سلێمانی، بۆ سەردانێکی کورت کە. سودی بۆ تەندروستی هەیە) پیرە پیاوەکە وتی: (باشە دەی، تۆ وادەزانی کارەکان ئاوا چادەبن، بەڵام لە پێشتر خراپترت لێکرد، تۆ دڕوت لەبن مەنجەڵەکە ئاورداوەو ئێستا ئاوەکە دەکوڵێ و لە سەریدەڕژێ) پێم وت: (وا بزانم دەزانی کە کەریم ئاغاش ئێستا بەرەو سلێمانی دەچێ) حەماغا لەو قسەیەم سەری سوڕما، مشەیەکی کورتم گوێلێبوو دواتر خەندەیەکی خۆش کەوتە سەر ڕوە مندالآنەکەی.

ڕفاندنی ئەو دو ئاغایە بارەکەی تەواو گۆڕی، ئیدی هەردو دەستەکە ئامادەبون ڕێککەوتنێك بکەن، هەمو شەرمەزاریەکانی ئەو ڕوداوەش بەسەر هەردو شێخەکەدا شکایەوە، بەگشتیش لەلای خەڵك خۆشەویست نەبون. لەسەر ئەوە لە بەڕێوەبەرایەتیەکەی مندا کۆڕێك بۆ هەمو سەرانی خەڵکەکە بەستراو تارێکم بۆ دان، دواتر بەرەو ماڵی حەماغا ڕێگامان گرتەبەر، لەوێ هەموان ڕازیبون کە ئەو پیاوە ببێتە حاکمیان و جەمیلاغاش ببێتە یارمەتیدەری، پێمڕاگەیاندن کە ڕاگەیاندنێك بەو مەبەستە ئامادەکەن و ئیمزای بکەن، تاکو ئامادەبێ (موقەدەم نوێڵ) سەیری بکا، ئەویش ڕۆژی دواتر گەیشت و بە دامەزراندنی ئەو دو پیاوە ڕازیبو.

هەرکە لە مەسەلەی حوکم بومەوە، ئیدی خەمی سەرەکیم لەسەر (سواراغا) سەرۆکی عەشیرەتی پیران چڕبۆوە. هەفتەیەکم لە کۆیە بەسەر برد، لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆژی گەیشتنم حەماغا فەرمانی ئامادەبونی بۆ دەرکردبو بەڵام ئەو نەهات. گوندەکەشی دەکەوتە ئەودیوی چیای هەیبەت سوڵتان، لە دەشتی بیتوێن و چوار سەعاتە ڕێ لە کۆیە دوربو. ڕۆژێك لە کۆیە نزیکبۆوە بەڵام هەر خێرا ترس دایگرت و کشایەوە. من وایبۆدەچم کە شێخ عەبدوڵڵا هەواڵی بۆ ناردبوو ئاگاداری کردبۆوە کە نەیەتە ناو شارۆچکە. چونکە ئێوارەی (٢٢)ی مانگ هاتە دیتنم و وتی کە حەماغا سواراغای دور ڕاگرتوە، ئەگەر من خۆم بۆی بنوسم ئەوا دوا ناکەوێ. پێم وت تۆ بۆی بنوسە، هەر هێندەی ئەو ڕۆیشت، یەکێك لە خزمەکانی حەماغا هەواڵی ئەو ڕوداوەی پێگەیاندو ئاگاداری کردەوە کە سواراغا دەبێ بێت و هاتنەکەشی بەپێ ی قسەی شێخەکانە.

دوای نیوەڕۆی (٢٣)ی مانگ (مەلا ئەحمەد ئاغا)ی برازای حەماغا هاتە نوسینگەکەم و وتی: (سواراغا هاتوە لەماڵی حەماغایە) هەر هێندەی ئەو قسەیەی کرد (ڕەشیدەفەندی) خۆی بە ژورێدا کردو وتی (سواراغا هاتوەو لەماڵی شێخ عەسمانە) خێرا وەڵامم دایەوە کە (من دەچمە ماڵی حەماغا بۆ دیتنی سواراغا) بۆ ئەو شوێنەی ئاماژەم بۆکرد ڕێگام گرتەبەر، کە گەیشتم سواراغا لەوێنەبو، وەك وتیان لە مزگەوتەو نوێژ دەکاو، دوای تۆزێکی دیکە دێتە لامان. ئیدی ئەو دو شێخە هیچ کێشەیەکی دیکەیان بۆ دروستنەکردم.

سواراغا کەسایەتیەکی لێوەشاوەی هەیە، تەمەنی ٢٥-٢٦ ساڵ دەبێ و چەند ساڵێك لەمەوبەر دوای کۆچی دوایی باوکی دەبێتە سەرۆکی عەشیرەتی پیرانی ڕەوەند. ئەو جەستەیەکی ڕێك و ڕۆحێکی گەشاوەی هەیە. بۆیە خەریکە دەست و پێوەندەکانی کە بۆ زۆر هێرش بردن سەرکردایەتی کردون، بیپەرستن. خەندەی سەر لێوانی لەو خەندە هەرە جوان و سیحراویانەیە کە دیومن. باڵای نزیکەی (٥ پێ و ٩ ئینج) دەبێ ڕوخسارێکی ڕێك و جوان و پێستێکی بەهەتاو سوتاوی هەیەو لەگەڵ ڕیشێکی کورت و کەم، دو چاوی چکۆڵەی نزیك بەیەکی هەیە کە هەمیشە گەش و کەمێك دڵرەقیان پێوە دیارە. سەرەڕای جلە ئەستورەکانی و پشتوێنەکەی پشتی و شەرواڵە فشوفۆڵەکەی کە سیفەتێکی سەرۆکەکانی

عەشیرەتی (بلباس)ە وا دەردەکەوێ کە جەستەیەکی پڕی هەیە. ئەو لەسەر خۆو بە فیزەوە رێدەکاو جەستەی بەڕاست و چەپدا دەلەرێنێتەوە. ئەو هەمیشە گاڵتە دەکاو ڕوخۆشە، بەڵام کاتێ سەرکۆنە دەکرێ توڕە دەبێ وەك منداڵێکی نازۆکی هەڵسوکەوت دەکا. ئەگەرچی لەو ڕۆژانەدا لەژێر کاریگەری ڕاوێژکارانی خراپدا بو بەڵام یەکسەر ڕازیبو کە لەگەڵ عەبدوڵڵاغا ئاشتبێتەوە، هەمو ئەو شتانەش بگەڕێنێتەوە کە دزیبونی، بەڵام لە بەدبەختیدا، هەر ئەو کاتەی کە پەیمانی یەکلاکردنەوەی کێشەکانی هەردولا ئامادەی مۆرکردن بو، کوڕەکەی عەبدوڵڵا کەوتە گیانەڵا بەهۆی ئەو برینەیەوە کە لە ئەنجامی پەلاماری هۆزەکەی سواراغا لە ڕۆژی (٢٤)ی مانگدا کردبویان، منیش حەزم دەکرد هاواڵی بکەم بۆیە بڕیاردرا کە سواراغا لەگەڵماندا بێ بەو مەرجەی کە دواتر لەگەڵ مندا بگەڕێتەوە ڕانیە بۆ تەواوکردنی شەکلیاتە پێویستەکان.

کاتێ دەسەڵاتی کۆیەم گرتە دەست موقەدەم نوێل ڕازیبو کە بەشەکانی قەزاکانی تورکی کۆن، واتە ڕانیەو قەڵادزێ کە دەکەونە سەروی زێی بچوك لە قەڵەمڕەوی مندا بن.

شێخ مەحمود یەکێك لە خزمەکانی خۆی کەناوی (شێخ ئەمین)بو لە ڕانیە دامەزراندبو، لە کاتێکدا (بابەکراغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر، یەکسەر دوای ئاگربەست، خۆی لە قەڵادزە دانابو، لەبەر ئەوە دەسەڵاتی بەریتانیا دانی پێدانا، وەکچۆن حکومداری سلێمانیش دانی پێدانا. دەبوایە خۆم سەردانی ئەو دو شوێنە بکەم هەتا موچەی ئەو فەرمانبەرە تورکانە بدەم کە ئیدی پێویستیمان پێیان نەبوو، دامەزراندنی ئەو کەسانەش کە پێویست بو دایانمەزرێنم، ئیدی لەگەڵ موقەدەم نوێل، سەعات دوی شەوی جەژنی سەری ساڵ بەرێکەوتین دەستەیەك پاسەوانمان لەگەڵدابو کە لە عەشیرەتی پیران بون و لەناویشیاندا سواراغای سەرۆك عەشیرەت.

ڕێگاکەمان بەسەر زنجیرە چیای هەیبەت سوڵتاندا درێژدەبۆوە، کە ناوەکەی لە مەزارگەیەکی وێرانەوە وەرگرتوە کە دەکەوێتە لای ڕاستی سەرەتای هەورازەکە. بەڕێیەکی باریکدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە لوتکەکە، لەوێ ڕوانگەیەکی جوان و دڵڕا چاوەڕێی دەکردین، ڕوی باشووری زنجیرە چیاکەی کە لەسەری وەستابوین قوڵەو

دۆڵـی ڕێـك و دوری تێدایـە کـە لـە دیـوارێکی ڕەشـی درێـژبۆوە دەچـێ لەکاتێکدا لاپاڵەکانی باکوری، لە لایەکەی دیکە زنجیرەیەك دۆڵ و گەلی بـە داربـەڕو و پوشـی وشك و چڕ داپۆشراوی دروستکردوە، لەپشتی ئەویشدا زنجـیرە چـیایەکی بـچوکتر هەیـەو ئـەنجا دەشـتی (بیتـوێن)ی سـەوز کـە لـە بـاکورەوە زنجـیرە چـیایەکی لوتکەدارو لە ڕۆژهەلاّتەوە چیایەکی ڕەشی درێژ کە لەکۆتایی باشوریدا دەربەنـدێك کە پێی دەڵێن دەربەنـدی (ڕەمکـان) دەیـبڕێ و لـەوێوە ئـاوی زێـی بـچوك بـەرەو خواردێ ئەو دیمەنە هەموی بەبـەفری گەلاّلـەو قەنـدیلی بریـسکەدار تـاجی لەسـەر ناوە لەگەڵ هەندێ بەرزایی دیکەی هەڵچو. (٩)

ئێستا گردە ڕوتەکان و دەشتەکانمان لەپشت خۆمانەوە جێهێشت و چوینە ناو ولاّتی ڕاستەقینەی کوردستان کە بەرگەکـەی بـەجوانترین شـێوە چـنراوە. زۆر بـە هاسانی بەرەو خوار ڕۆیشتین، بەڕێگایەکدا کە لە هەردو بەریـدا بـە دارسـتانی چـڕ داپۆشرابو– ئەمەش دیمـەنێك بـو کـە چـەندین سـاڵ بـو نەمـدیبو– تـا گەیـشتینە نزمایییەکی بچوك کە درەختی بەڕوی هەڵچوی تێدابو، ئەمەش نیـشانەی گۆڕسـتان بو، دوای ڕۆیشتنێکی کە یەك سەعاتی بردو لەبواری ئاوێـك پـەڕینـەوە، گەیـشتینە (سـەرخمە)(١٠) گوندەکـەی سـواراغا. ئێـستا کـە دنیـا تاریکـداهاتبو ئیـدی نەمانـدەتوانی بەباشـی دەوروبـەری خۆمـان ببیـنین. لـەجیاتی ئـەوەی بمانبەنـە دیوەخان، چوینە ژورێکی بچوك لەماڵی خانەخوێکەمان، لەوێ بینیمان مامەنداغای سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆو هەندێ لە خزمانی سواراغاو لەنێوانیاندا کوڕەکـەی کـە تەمـەنی پێـنج سـالاّن بـو، منـداڵێکی جـوانی کوڵمـە سـور بـو نـاوی (قـادر)بـو، چاوەڕێیان دەکردین. خواردنێکی نایابیان پێشکەش کردین کە بریتـی بـو لـە پـلاّو برنج و گۆشتی لەبن ئاخنرابو لەگەڵ سینییەك کە هەمەجۆر شلەی چڕی لەسەر بوو پلـە گۆشـتی تێکرابـو لەگـەڵ تـرێ ی تـەڕ. ئـەو ئێوارەیـەمان بەقـسەکردن و پرسیارگەلێکی کە لە ئەژمار نایەن، دەربارەی گوندەکانی دەوروبـەرو دانیـشتوانی و شێوازەکانی کشتوکاڵ کردن، بردە سەر.

لـە سـپێدەی ڕۆژی داهـاتودا، شـنەبای فێنـك و دەشـتی پـان و سـەوزی دەوروبەرمان کە جۆگە ئاوی بە بریسکەی وەك دەنوی زیوینی پێدا دەهات لەگـەڵ ئـەو گـردە بـەرزو نزمانـەی بـە ناوچـەکەدا بـەربلاّوبون و سـەریان بـە بـەفرێکی

بریسکەدار ڕازابوۆوەو لەسەروی هەموشیانەوە ئاسمانێکی شین، هەر هەمویان دیمەنێکیان دروستدەکرد کە لە یادەوەریدا ناسڕێتەوە. بەیانیەکی دیتم کە ئەو خانوەی شەو تێیدا خەوتین لە ناوەڕاستی ڕێگایەکە کە بەسەر گردێکی گەورەدا درێژ دەبێتەوە، لە ترۆپکەکەیدا دیوەخانەی سەرەکی بنیاتنراوە.

ئەو گوندەی کە لە داوێنی بەرزاییەکەی ڕۆژئاوادا بنیاتنراوە نزیکەی (٤٠) کوخت دەبێ لەو خانوە باوانەی هەن، لەگەڵ هەندێ کەپری قوچەکی کە لە قامیش دروستکرابون. لەنزیکمانەوە ژمارەیەك کانی هەبون کە دڕکە هەنجیر نیشانەبو بۆ دیاریکردنی شوێنیان لەگەڵ هەندێ دەوەنی دیکە، لەکاتێکدا کە جۆگە ئاوێك سەد یاردە لە ڕۆژهەڵاتی دور دەڕژایە ناو ڕوبارەکەی کە دوێنێ شەو لێی پەڕینەوە.

گەلێ جۆرە پوش و پەلاش و هێلانە ئاماژەن بۆ ئاوەڕۆی جۆگە ئاوەکەو، بەرازی کێوی کە لەو ناوچەیەدا زۆرە هاتوچۆ دەکەن، بۆ خۆشوشتن چومە سەر یەکێك لەو چاوگانە، هیواداربوم کە ئاوەکەی ساردبێ، چونکە هێشتا بڕێك شەختە لەسەر زەوی هەبو، بەڵام ئای لەو سەمەرە خۆشە هەرکە دەستم پیاکرد بینینم ئاوەکەی شڵەتێنە.

کە ڕانیەمان بەجێهێشت میلی کاتژمێر ئاماژەی بۆ نۆی بەیانی دەکرد، سواراغاو سی سوارچاکی پیرانەکانمان لەگەڵدابون. لەدوری هەشت میل بەرەو پێش چیایەکی بەردین هەبو کە لە چینی شاوڵی پێکهاتبوو بەرەو پێش چوبو لە دەشتەکەداو لەسەر شێوەی زنجیرەیەکی پێچاو پێچ بو.

شێوەی پاسەوانەکانمان زۆر جوان بو: بەڕیشووی شۆڕبوەوەی مێزەرەکانیان کە ڕەنگی بریقەداریان هەبو، لەگەڵ شەرواڵە فشوفۆڵەکانیان و هەر یەکەشیان چوار فیشەکدانی لەپشت بوو تفەنگێك و دەمانچەیەك و خەنجەرێکی پێبو. ئەوان سواری ئەسپەکانیان ببون کە هەمیشە فرمەیان دەهات و ئارامیان نەبو، ناوە ناوەش ئەوانەی کە سەریان گەرم دەبو بە چوار ناڵە بەپێشمان دەکەوتن، هێندەشی نەدەما لمۆزی ئەسپەکانیان بەر لمۆزی ئەسپی ئێمە بکەوێ. لەناکاو دەگەڕایەوەو سوارچاکەکە تفەنگەکەی لەسەر سەری هەڵدەشەقاندو هەندێ فیشەکی بە هەواوە دەنا. بۆ ئەوەی یەکێك لەوان دەریخا کە چەند لێهاتوە،

لەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بە ئەنقەست و بەیەکدەست تفەنگەکەی لەسەر ناوشانی سوارەکەی پێشەخۆی دادەنا، ئەمەش کردارێکی زۆر مەترسیدار بوو زۆر جاریش کارەساتی لێکەوتۆتەوە. لەکاتێکدا کە لە چیا بەردینەکە نزیك دەبوینەوە کە پێشتر باسم کرد ڕیزێك سوارمان بینی کە بەرەو دامێنی دەهاتنە خوارێ.

ئێستا پاسەوانەکانمان خۆیان کردە یەکڕیزو لەودیو لەودیومان بون، لە کاتێکدا یەکێکیان یان دوانیان بەچوار ناڵە لەپێشمان دەڕۆیشتن و دەگەڕانەوە ئەو دەستەیەی بەرامبەریش کە لەنزیکەی پەنجا سوار پێکهاتبون و لەڕانیەوە بۆ پێشوازی ئێمە هاتبون، هەمان شتیان کرد. ئەوان بەدەم زیرەی زوڕناو گیزەی تەقەوە لەسەرخۆ لێمان نزیکدەبونەوە. ئەو دو دەستە کوردە کە جلی نایاب و سەیرو جوانیان لەبەردابو لە بەیانی ڕۆژی جەژنی لەدایك بون، لەسەر ئەو دەشتە سەوزەی کە خۆری لێهەڵاتبوو گردی کەوێڵ بەبەفر ڕازاوەی تێدا بڵاو ببۆوە، بەیەکدەگەیشتن، ئەمەش دیمەنێکی ئەوتۆی دروستدەکرد کە ئاستەم بو بەهاسانی لە خەیاڵدا بسڕێتەوە یان لەبیر بکرێ. هەر هێندەی گەیشتینە یەك ئیدی پێکناساندنی ئاسایی دەستی پێکرد، چونکە ئەو وەفدەی بەپیرەوە هاتنە زۆربەی سەرۆکە دیارەکانی لەخۆگرتبو، یەکەمیان (شێخ ئەمین) بو حاکمی ڕانیە، کە کەسێکی پشت کۆم بو و وا دەردەکەوت کە کەسێکی فێڵباز و بە مەکربێ، دو چاوە فیڵبازەکانی لەژێر (شۆڕابە) ڕیشوی جامانەکەیدا کە شۆڕببونەوە کە لە ئاوریشم بو شاردبۆوە، دوای وی (بابەکراغای گەورە) سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر و حاکمی قەڵادزە بو، کە لە هەمو کوردستانی باشوردا بەهێزترین پیاوە، ئەو پیاوێکی هەرە نەبەردە، دەستە پیاوێکی نە کورتی نەدرێژە، بەڵام جەستەیەکی بەهێزی هەیە، لوتێکی قەڵانگی گەورەی هەیە، خەندەکانیشی نیشانەی هەرە بەسۆزی ئەو مرۆڤەیە. ئەو چەکمەی سوارچاکی لەپێدابو لەگەڵ شەرواڵێکی شینی کاڵ، جامانەیەکیشی لەسەردابو کە چاوی ڕاستەی (ئەو چاوەی کە هەرگیز کەس نەیبینیبو) داپۆشتبو، ملپێچێکی زەرکەشیش ژێر چەناگەی داپۆشیبو، دوای ئەویش (بایزاغا) بو کە سەرۆکی ڕەمزی پەیمانی بلْباسان بو، ئەو پیرە پیاوێکی لەدڵدا شیرینە، هەر ئەویش بو کە بەر لەشەڕ میوانداری (لیژنەی سنوریی تورکی-فارسی) کردبو، تا ئێستاش هەر باسی ئەو سیکارانە دەکات کە سیکاری قەڵەو

بون و پیشکەشی کرابون. لە کۆتاییشدا (کا حسین) کوڕی بایزاغا لـە عەشـیرەتی مـەنگوڕ کـە جلێکـی ڕەشـی لـە باشـترین مـاددە دروسـتکراوی لەبـەردابو لەگـەڵ پشتوێنێکی سپی و جەمەدانیـەکی گـەورە کـە ڕیشوی لـە هـەمو لایەکـەوە شـۆڕ ببونەوە کە بە ڕەنگی سپی و زێڕ نەخشابو. ئەو گـەنجێکی جـوان بـو تەمـەنی ١٧ سـاڵ دەبـوو ڕوخـسارێکی سـورەی هـەبو کـە نـەرم و نیـانی پێـوە دیـاربو. ئـەو سەرۆکانە دەست و پێوەندو خـزم و کەسـی خۆیـان لەگەڵدابو، ئـەوان شـەرکەری ئازاو گەنجی تازە هەڵچوو بون کە جوانترین جل و بەرگیان لەبەردابو، ئێستا بوینە یەکدەستە لەسەر ئاوازی زوڕنا بـەرەو ڕانیـە کەوتینـە ڕێ، کاحوسـێن و هەنـدێکی دیکـە لەپێـشمانەوە بەسـواری یاریـان دەکـرد. دەرکـەوت کـە ڕانیـە لـە گونـدێکی بچوکی پۆخڵ تێناپەڕێ کە لەنزیك سەرچاوەیەکە مەرەزە دەوری داوە.

لـە هاوینـدا گـەرما تونـد دەبـێ و مـەلاریا بـڵاو دەبێتـەوە، هـەروەها لـەپایزو زستانانیشدا کێچ و ئەسپێ بڵاو دەبنەوەو ئیدی خەوتن بابەتێك نیە لە ئـارادا بـێ. ئا لێرەدا لەڕێگەی سەردانواندن و دەست بە سنگەوە گرتن کە نیشانەی ڕێزگرتنـە قایمقامی تورکی پێشوازی لێکردین، کە ئەویش شـێخ موحەممـەد خالیـسی کـوڕی شاعیری گەورە شێخ ڕەزابو. دواتر لە ڕۆژدا سەردانمان کرد، ئەو پیاوێکی زانایـەو خوێندەوارێکی باشە، ئەو ناوی (دەروێش)ی لەخۆیناوە و ژیانێکی سـادەو سـاکار دەژی. ئەو شعرێکی درێژی باوکی بۆ خوێندینەوەو ناڕەزایی خۆی لەسـەر لابردنـی دەربڕی لەبەر ئەوەی ئەو کوردەو تـورك نیـە. کـارێکی زۆرم هـەبو کـە دەبـوا لـەو شوێنەدا ئەنجامیدەم، خۆم سەرقاڵی دەرکردنی فەرمانبەرو پۆلیس کردو هەندێکی دیکەم دامەزراندن لەگەڵ خەملاندنی موچەی خانەنشینی و پێدانی ئـەو موچـەیە، لە کاتێکدا کە موقەدەم نوێڵ گفتوگۆی لەگەڵ سەرۆکەکان دەکرد.

شەومان لە شوێنەکەی شێخ ئەمیندا بەسەر بـرد کـە شـوێنێکی نـابوتو پـڕ لـە ئەسپێ بو. لە سەعات ١١ی بەیانی ڕۆژی دواتر موقەدەم نوێڵ بەرەو ڕواندوز چـو، منـیش بـە هـاوڕێی بابـەکراغاو کاحـسێن و ژمارەیـەکی زۆری پاسـەوانان بـەرەو قەڵادزێ چوم. تەواو لە دەرەوەی شار دو ڕێویمان بینی کاحسێن ڕاوی نـان و زۆر دڕندانە تەقەی لێدەکردن، ڕێگەکەمان بەلێواری دامێنی چیایەکی شـاوڵی بـو، کـە چـیایەکی ڕەشـەو لوتکەکـەی وە ددانـە بـەرزو نزمـەو پێـی دەڵـێن کێـوەڕەش.

گەیشتینە دەربەند کە تەنگەبەری ئاوی زێ ی بچوکەو گوندێکی کەلاوەی لێیە لەگەڵ قەلایەکی ڕوخاو هەشتا ساڵ پتر بەر لە ئێستا حەماغا لەوێ نیشتەجێبو وەك پاشای ڕەواندوز کە ئەودەم لاوبو، ئەو سەرانەی لە عەشیرەتەکانی دەوروبەر وەردەگرت لەگەڵ باج وەرگرتن لەو کاروانانەی کە بەوێدا تێدەپەڕین، ئەو دەربەندە شوێنێکی گرنگە چونکە بەسەر تاکە ڕێگادا دەڕوانێ جگە لە هەندێك ڕێچکەی سەخت کە ولاتی فارس و دەشتی پشدەر بە بیتوێن و کۆیە دەبەستێتەوە.

ئاوەڕۆی ڕوبارەکە قوڵەو ئاوەکەی ڕونە ئەو گەروێکی بەرتەنگ دەبڕێ کە ڕێگاکەی بۆ ماوەی چارەکە میلێك بەردین و سەختە. لە ئەنجامی باران بارین کانیەك لە ناوەڕاستی ڕێگاکە دەتەقێ، لێرەوە بە لێواری لای ڕاستی زێی بچوکدا ڕۆیشتین کە پشتێنەیەکی سەوزایی دەوریداوەو پڕە لە گژوگیا و زەل، لەوەڕگای ژمارەیەکی زۆر لە جوانەماین و ئاژەڵ و گامێشە. بایەکی ساردی تونَد کە لەسەر بەفرەوە دەهات، هەورێکی لە تۆزو گەرد وروژاند بە تەریبی هەمو کەناری زێیەکەدا. لەلای چەپمانەوە پارچە زەویەکی بەرزو نزم هەبو کە کۆمەڵە چیایەك دەوری دابو بەرزیەکەیان دەگەیشتە پتر لە (١٠٠٠٠) پێ. بە گەڵ گونددا تێپەڕین کە هەریەکەیان لە ١٠–٢٠ کوختی قوچەکی پێکهاتبون. لەنزیکەی سەعات دو و نیوی دوای نیوەڕۆ گەیشتینە قەلادزە.(١٢) ئا لێرەدا بەڕاستی چیای مەزن دەوری دابوین کە بەفر تۆقەڵی دەڕازاندنەوەو بەسەر ئێمەیاندا دەڕوانی و زنجیرەی پێکداچو لە یەکی جیا نەدەکردنەوە. خانەخوێکەم بابەکراغا بوو، خواردنێکی نایابی پێشکەش کردین کە کۆتاییەکەی هەرمێ ی بەلەزەت و گوێز و باسوق بو کە بە جێلی دەچێ (JELLY)و لە ئاوی ترێ و ئارد دروستدەکرێ. هەر خێرا زانیم کە ئەو پیاوێکە زۆر بیرۆکەی دروست و ڕاستی هەن. ئەو هەمیشە بە دەنگێکی (تێکەڵاو) قسەی دەکردو زۆر بە نەرمی و بە وردیەوە قسەی دەکرد، وشەی پەرت و بلاو نەدەکردو بوارێکی بۆ کەس نەدەهێشتەوە تا ڕەخنەی لێبگرێ. نەمزانی ئەو چاوەی چیەتی، وەکچۆن خۆشی ئاماژەی بۆ ئەوە نەکرد، ئەو نزیکەی پەنجا ساڵ دەبو، لەو پیاوە هەرە بەڕێزو سۆزو خۆش مەشرەبانە بو کە خۆشبەختی وایکرد بیانبینم.

ڕۆژی دواتر بۆ گەشتەکەم ڕۆژی گەڕانەوە بو، لەکاتی دیاریکراودا گەیشتمە کۆیەو بینیم هەمو شتێك ڕێکو پێکە، حەماغا لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی بەرەو سەر چوبو، هەمو ڕۆژێك سەردانی بەڕێوەبەرایەتی دەکردو، هەمو ئەو گلەییانەی هەڵدەڕشت کە سەردەمێکیان بەسەردا تێپەڕیبون و ئەو وەبیری دەهاتنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە کاتی گەیشتنم ڕاگەیاندنێك دەرچوبو کە ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتی بو دەربارەی ئەو تاوانانەی کە بەر لە یەکی کانونی یەکەم ئەنجامدراون؛ کەچی هەولێکی زۆرمدا تا ناچاری کەم ڕابردو لەبیر بکا کەچی ئەو بە کۆمەڵێکی بێ ئەژمار لە یادەوەری وەڵامی دەدایەوە. (ئاساییە کە ئەو شتە یان ئەمە ڕویداوە کاتێ تۆ گەنجێکی خورت بوی) کاتێکی زۆر تێپەڕی بەر لەوەی کە پێشکەوتنێك بەخۆوە ببینین.

لە ڕۆژی ٣٠ی مانگ کاری نێوان سواراغاو عەبدوڵلاغا یەکلایی کرایەوەو بەپێی ئەو عەشیرەتی پیران ڕازیبون خوێنبایی کوڕی دوەم بدەن و هەمو ئەو ماڵ و شتە دزراوانەش، یا بەهاکانیان ڕەتکەنەوە.

◆

## بەشی نۆیەم

## سەردانی خۆشناوەتی(١) و هەندێ سورانەوەی دیکە

سێ هەفتەی یەکەمی کانونی دووەم بەهێمنی تێپەڕین، دەستم بەکار کرد تا کاروبارەکانی بەڕێوەبردن لە ناوچەکەدا ڕێچکەیەکی ڕێك و پێك وەرگرن. هەمیشەش بڕێکی زۆری کاروباری فەرمی هەبوون تا گرنگیان پێبدەم، وە بەگیانی ئەو سیاسەتەی بڕیار درابوو هەوڵمدا بەهۆی (ئاغا) ناوخۆییەکان کاربکەم، بەڵام ئەوانە یەك دوانێکیان نەبێ بێ تواناو خراپ بوون، بۆیە بەرەو پێشچوونی خێراو بە پەلە ئاستەنگی دەهاتە پێش. پشتیوانی یەکەمم جەمیلاغا بوو(٢) کە بە هۆیەوە توانیم دەستبەسەر حەماغای پیرەمێردا بگرم و ڕێگە لە هەر کردەوەیەك بگرم کە زاڵمانە بێ. زۆربەی کاتی خۆم لە نوسینگە بەسەر دەبرد، بەر لە ڕۆژئاواش ڕێگایماڵەوەم دەگرتە بەر، کە پیاو ماقوڵانی شارۆچکە دەهاتن و قسەیان دەگۆڕیەوە و بەزۆریش شێوم لە ماڵەکانی ئەواندا دەکرد. لەگەڵ هەمووشیان پەیوەندیەکی باشمان هەبوو تەنیا عەبدوڵلاغا نەبێ کە ناوە ناوە سەردانی نوسینگەی دەکردم، پرسیاری ئەو پۆستەی دەکرد کە دەیدەمێ و ئەو موچەیەی کە لە بەرامبەردا وەریدەگرێ چەندە؟ ئامانجم ئەوە بوو کە تا دەتوانم دەسەڵاتی ئەو کەمکەمەوە. لە بەرامبەردا دەسەڵاتی جەمیلاغا پتر بکەم، ئامانجیشم لەو کارە ئەوە بوو کە جەمیلاغا ببێتە سەرۆکی خانەوادەی حەوێزی، بەڵام ئەم کارە بێسوود بوو.

لە شارەکەدا ڕێك و پێکی بەشێوەیەکی زۆر باش و وەك ناوچەکانی دەوروپشتی بڵاوبۆوە. نرخ لە بازاڕەکاندا دابەزی و دوکانی نوێ کرانەوەو هەموو شتێك دەهات. (خانەی یەککەوتەکان)— کە گرنگیەکی زۆرم پێدا، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی دەربازکرد. فەرمانبەرە تورکەکانم دەرکردوو، ئەوانەی کە

سەربازە دیلەکانی شەڕو کوژراوەکان بەخێویان دەکردن مانگانەی خانەنشینیم بۆ بڕینەوە، وەکچۆن بۆ سیاسەت و پێویستیش باشبوو کە موچەیەك بۆ ئەو مەلایانە ببڕینەوە کە موڵکە وەقفەکانیان لە کاتی شەڕدا وێران ببون. هەروەها تەرخانکردنی بڕێ پارە بۆ پێداویستیەکانی تەکیەکان. خەڵکێکی زۆر، کە من پێم وایە ڕاستدەکەن، دەیانگوت: ئەگەر حکومەتی بەریتانیا ناردنی نوێنەرێکی خۆی مانگێك دواخستایە ئەوا خەڵکەکەی ڕەویان دەکردوو چۆڵیان دەکردوو دەبوە کەلاوەو سەدان کەسیش لەبرسا دەمردن.

بارانێکی زۆر باری، مژدەیەك بوو بۆ بەرهەمێکی باش، هەموان ئاوێکی دیکەی ژیانیان تێگەڕاو، هیوایەك لە دەرونی هەمواندا پەیدابوو.

لە (٢٣)ی مانگ چوومە ناوچەی خۆشناوەتی، نوسەرێکی پیری قەڵەو کە هەمیشە لەگەڵ خۆمدا دەمبرد لەگەڵم هات، کە ناوی (مەلا ڕەسول) بوو، لەگەڵ هەندێ پۆلیس ڕێگاکەمان بەسەر زەویەکی بەردینی تەمۆخیدا درێژ دەبۆوە گەیشتینە گوندی (بانە قەلاّ)، ئەودەم سەعات گەیشتبووە پێنجی ئێوارە. دوو جوتیاری پیری کورد لەوێ میوانداریان کردین کە ئەوانیش (کوێخا حەوێز) و (کوێخا سالّح) بوون. ئەوان دوو پیاوی ئاش و بۆش و ساویلکە بوون، بە تایبەت ئەوەی یەکەمیان کە زۆری نوکتە دەگوت، ئەوەی تۆزێك بێزاری کردم هاتنی پیاوێکی شێتۆکەی کەڕو لاڵ بوو، گرنگیەکی تایبەتی پێدەدام، مشەی دەکردوو ڕووی گرژ دەکردوو سەری بۆ دەلەقاندم. بەیانی ڕۆژی دوایی دوای ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد کە پێکهاتبوو لە نان و فرۆ، ڕۆیشتین، ئەودەم میلی کاتژمێر ئاماژەی بۆ کاتژمێر هەشتی بەیانی دەکرد. دەمانویست بچینە گوندێکی سەر بە (حاجی وسو) کە پیاوێکی وردیلەی گزگل و بە هەرا کە پێوەیەوە دیاربوو تەمەنێکی کردووەو بەری چاوانی مۆر ببوون و ناوی (حەسەن ئاغا)بوو نانی نیوەڕۆی داینێ. لێرەوە لەسەر هەمان خاکە بەردینەکە بەرەو (ئەشکەوت سەقا) بەڕێکەوتین، کە گوندی (غەریباغا)ی سەرۆکی هۆزێ کۆیەی کوردی بوو.

سەرەتای بەهار لەسەر خاکدا بەدەردەکەوت، هەواش پێچەوانەی ئاسایی خۆی فێنك بوو گیاش لە هەموو شوێنێك لە خاك سەری دەردێنا، وەکچۆن هەندێ گولاڵە سورەم دی کە تازە گەشابوەوە. لەگەڵ ڕوناکیەکی زەرد لەسەر چڵی یەکێك لە

درەختەکان دەڕژاو دەتگوت (laarnum) (وەزال)ە. لە ڕێگادا غەریباغا توشمان بوو کە پیاوێکی پیری بێتاقەت بوو کوڕەمامێکی خۆی لەگەڵدابوو کە ناوی (شێمحەمەداغا)بوو کەتەیەکی برۆ ئەستوور بوو ئێمە هەمیشە پێماندەگوت (فێلباز، چەپخون) (ئاوا: وەرگێڕ) ئەو دوو پیاوە ئێمەیان بردە (ئەشکەوت سەقا) لەوێ بە دڵفراوانیەوە میوانداری کراین. لەگەڵ ئەوەشدا کە (کوردی) تایەفەیەکی بچووکن بەڵام سەرۆکەکانی خۆیان لە ئاغاکانی هۆزەکانی دەوروبەریان بە گەورەتر دادەنێن.

لە ڕۆژی (٢٥)ی مانگدا بەرەو باکوور ڕۆیشتین هەر خێرا گەیشتینە ئەو کەلێنەی کە دەکەوێتە ئەو زنجیرە بەردینە گەورەیەی کە دەوری زەویە لماویەکەی دەدا کە دەکەوێتە لای باکووری ڕۆژهەلأت. لەپشت ئەوە ئێمە لە ناوچەی خۆشناوەتی بووین، دیمەنێکی جوان بەخێرهاتنی چاوەکانی کردین. لەلای ڕاستمان چیایەکی بەرز بەپێوە بوو کە پێیدەڵێن (چیای سەفین) کە هەور هەمووی داپۆشیبوو، لە کاتێکدا دۆڵێك ڕوو لە کۆیە بەرەو باشوور درێژ دەبۆوە، لەلای چەپ هەندێ گردی پێکداچوو هەبوون و لەنێوان ئەوان و لەنێوان چیای سەفین زەویەکەی جۆرەها دارودرەخت داپۆشیبوو، گەڵێ ڕەزی تریێ، کە زۆرن و دەکەونە سەر لاپاڵی چیاکان، بەرچاو دەکەون. ئێستا ئەوەی دەوروبەر دادەپۆشێ ئەو سورە تاریکە نیە کە سیفەتی بەردە تەمۆخە. بەڵکو ئێستا بەردی قسڵەو ڕەنگی سپی و سوور و شینی هەیە. خۆشناوەتی لەو دو ناوچەیە خۆشترە کە لە کوردستان ناسیمن و سەیر نیە ئەگەر خەڵکەکەی کاتێك لێی دوردەکەونەوە بۆی شەیدا بن. دوای ئەوەی لە دەروەکە تێپەڕین یەکێکمان دیت کە لەگەڵ کۆمەڵێ دەست و پێوەند بۆ لای ئێمە دەهات، ئەو پیاوێکی کەتە بوو، نەبەرد، لە ناوەڕاستی تەمەندا بو، دو چاوی زەقی هەبون، دەرکەوت کە (میرانی قادر بەگ)ە کە دواتر زۆر جار دەیبینین، (میران) نازناوێکە کە سەرۆکانی خۆشناو بۆ خۆیانی دادەنێن.

بەپێویستی دەزانم کە کەمێك بەلادا بچم و تۆزێك باسی (خۆشناو بکەم: دەبێ بڵێین: دوا سەرۆکی (میر مەحمەڵی) ئەو هۆزە بە توانایە پیاوێك بوو ناوی (میرانی بایز بەگ)و ئەو پیاوێکی قەڵەوی کەتەبوو بەجۆرێك کە جارێکیان لە گەشتێك بۆ کۆیە چوار ڕۆژی پێدەچێ کە تەنیا ٣٢ میل دورە. ئەو سێ ئەسپی لەوانەی کە

سواریان دەبو تۆپاندبو، خۆیشی بە نەخۆشی ئەنفلەوەنزاو لە سەرەتای تشرینی دوەمدا مردبو، ئەودەم منداڵەکانی هێشتا تەواو پێڕا نەگەیشتبون. ئیتر جێنشینی دەکەوێتە نێوان دو براکەی، ئەوەی گەورەتریانن واتە قادر بەگ لە دایکی سەرۆکی پێشتر نەبوو، لەبەر ئەوەی لەکاتی مردنی بایز بەگدا ئەویش ئالودەی نەخۆشی ئەنفلەوەنزا بوو لە نوێنی مردندابو، بۆیە کاتێ کە بەر گوێی کەوت خزمانی دایکی بایز بەگ کە دایکی رەشید بەگیشە، رەشید بەگیان بەمیر داناوە، هیچ نارەزاییەکی دەرنەبڕی. ئەمەو لە هەمان کاتدا وڵات کەتبوە ژێر سایەی بەریتانیاو سیاسەتی حوکم بەهۆی سەرۆك هۆزەکانی کە موچەخۆربون بڕیاری لەسەر درا. قادر بەگ لە نەخۆشیەکەی هەستایەوەو، کاتێك درکی بە حەقیقەتی بارەکە کردو درکی بەو ئەنجامانەی بارودۆخە نوێیەکە کرد ئیدی لە پەشیمانی ئەو دەست لەکارکێشانەوەی ددانی لە جیڕەوە دەبرد. من ئەو دەم سەردانی شەقڵاوەم دەکرد تا بڕیار بدەم کێ بە حاکم دابنرێ بۆ شەقڵاوەو بۆ سەرۆکایەتی عەشیرەت: قادر بەگ یان رەشید بەگ؟.

وەك هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی قادر بەگ پیاوێکی کەتە بو، چونکە لەگەڵ باڵا بەرزیەکەی قەڵەویش بو. ئەو دەموچاوێکی خڕی ریشداری هەبو. هەمیشە بە (هێنری هەشتەم) ناومان دەبرد لەبەر ئەو وێکچونەی لەنێوان ئەو و لەنێوان وێنەکانی ئەو پاشایەدا هەبو. ئەو خوێندەواری هەر نیەو تەنیا بە کوردیش قسان دەکا، بۆیە دەبینی کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری نوسەرە نارەزاکان و خزمە پیلانگێرەکانی و لە رۆژانی تەنگانەشدا کاروباری بیرکردنەوە بۆ ئەو ئەستەمە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی ئەو پیاوێکی دەستپاك و نیاز پاکە، بێگومان ئەو سەرۆکی خەڵکەکەیەتی و ئەگەر راوێژکارێکی باش یارمەتی بدا ئەوا دەبێتە سەرۆکێکی نمونەیی.

ئەودەم، ئەو لە گوندەکەی خۆی، واتە: قەلاسنج، ژیانی دەکرد، لە کاتێ کە رەشید بەگ لە شەقڵاوە بو بۆ سەروکارکردنی بنەماڵەی برا کۆچکردوەکەی و موڵکەکانی. ئێمە چوینە شوێنی یەکەم و چاوەڕێی نانی نیوەڕۆمان کرد، قادر بەگ خۆی لە نانْ ئامادەکردن دەگنخاند تاکو ناچاربم شەو لەوێ بمێنمەوە. ئیدی سەبرم نەماو سوربوم لەسەر ئەوەی بێنان خواردن بچمە شەقڵاوە، ئەگەر ئێستا

نەیهێنن، ئەوسا ڕێزێك قاپیان هێناو لە ناوەڕاستی ژورەکەیان دانان. هەر هێندەی دەست و پێوەندەکان (بسم الله)یان کرد دەستمان بە خواردن کرد. دو سەرۆکی دیکە لەوێبون لەو نانخواردنە کە دواتر پێیاندەگەینەوە، یەکێکیان پیلانگێڕی گەورە (ئاوا: وەرگێڕ) میرانی سالّح بەگ بو، سەرۆکی لقی (میر یوسفی یان میروسی) ئەگەرچی لەسەر سەرۆکایەتی گەلێ ڕکابەری هەبوون. ئەو پیاوێکی توندو کەتە بوو زۆر جوان پێشوازی دەکردی و بەخێری دێنای و چەند مانگێك بوە هاوڕێم، ئەو هەمیشە هەستێکی گەرموگوڕی بەرامبەر بە من هەبوو هەمیشە شانازی بەوەوە دەکرد کە کورد نیەو (ئاوا: وەرگێڕ) چۆنیش خۆی خۆی لەو شێوازو تەڵەکەبازی و تینوێتی خوێنڕشتنە دەرباز کردوە کە خەڵکانی میللەتەکەی دەیکەن.

سەرۆکەکەی دیکەیان: مستەفاغا بو کە خەڵکی کۆڕێ بو، سەرەڕای ئەو دەنگۆیەی کە ئەو چەند براو خزمی خۆی گوشتون، کەچی لە پیاوە هەرە باشەکان بو کە من دیومن و، ئەو وەك مریشك بێتوانا بو، ئەو چەند سەعاتەی کە لە ژێر سێبەری دار توێکی دەرەوەی گوندەکە بەسەرمانبرد خۆشترین یادگاری منە لە کوردستان و من لانی کەم لە بارودۆخێك دا، بە ژیانی خۆم قەرزاری ئەو و پیاوەکانی ئەوم. ئەو لە هەرە ئەو کوردانە بو کە دورن لە خۆپەرستی و دڵسۆزن، زۆریش سەر سوڕمانە کە برادەرێکی نزیکی ئەحمەدەفەندی ئەربیللی بێ.

ئەو ڕێگایەی دەچۆوە شەقلاوە بەناو دیمەنی جواندا درێژ دەبۆوە، کە ئێستا هەور کەمێك ڕەوییبۆوە و بەفری جوان کە سەری سەفینی گرتبو دەردەکەوت. ڕێکردن بەناو ڕێگایەکی بەر تەسکی دادەبردین کە بەناو ڕەزی ترێ و بێستانەکاندا دەچون، تا گەیشتینە دۆڵێکی بچوك کە لەسەر جۆگە ئاوەکە بو، پیاوێکی پیری بە تەمەن پێشوازی لێکردین کە تەربوشێکی لەسەر بو پاڵتۆیەکی گەورەی لەبەردابو، کە ئەفسەرە روسەکان لەبەریاندەکرد، دەرکەوت کە ئەوە خورشید بەگە کە سەرۆکێکی هەکاری بوەو ڕێوشوێنێکی هەبوە، کە تاڵان و برۆی ڕوسەکان لە کوردستانی باکور وەدەرێناوەو پەنای بۆ خۆشناوەتی هێناوە. ئەو لە (سوارەی کوردیدا) کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دوەمی عوسمانی دایمەزراندبون پلەی موقەدەمی هەبوەو خاوەنی ناوبانگێك بو کە کەس ئێرەیی پێنەدەبرد. ئیدی

بوە بەڵایەك كە هەمیشە هەرەشەی لە ژیانم دەكرد، چونكە ڕاهاتبو هەمیشە لەپێشم خۆی ڕادەنا بەوەی كە ڕەسەنزادەو خاوەن جێو ڕێیە لە وڵاتەكەی خۆیداو هەمیشە گلەیی لە كەمی ئەو دەرماڵەیە بو كە حكومەت بۆی دانابو. ئەو پیاوێكی پیری هیچ و پوچ بو، ترسی دەخستە دڵی ئەو چەند كەسەی پەنابەربون و لەگەڵ ئەودا هاتبون، ڕێگەی بەهیچ كامیان نەدەدا لەلای ئەو دانیشن یان جگەرە بكێشن. دواتر هەوڵمدا كە خۆی و پیاوەكانی لە گوندێكی چۆڵكراو نیشتەجێبن، بەڵام ئەوان ڕازینەبون كە بۆ بژێوی خۆیان كارێك بكەن. لە دواییداو لە بەهاری ١٩٢٠دا ڕێگەی وڵاتی خۆیان گرتەبەر.

ئێستا لە دەوری كلكەی باكوری ڕۆژئاوای چیای سەفین سوڕاینەوەو بەرەو شەقڵاوە سەركەوتین، بەڵام تا تاریكی هەمو دنیای دانەپۆشی نەیگەیشتینێ. تەواو لە دەرەوەی شەقڵاوە میرانی ڕەشید بەگمان گەیشتێ. لەگەڵ دو كوڕی خوالێخۆشبو بایز بەگ، مەبەستم (عومران) و (سلێمان)ە. میرانی ڕەشید بەگ پیاوێكی باڵا بەرزی سەرو ڕیش ڕەشە، زۆر قەڵەو نیە، بەڵام لە قادر بەگ چوست ترەو چاویشی خێلە. ئەو خوێندەواریەكی باشی هەیە، دەتوانێ بە توركی و فارسی قسە بكا لەگەڵ كەمێك عەرەبی، جگە لە زمانی ڕەسەنی خۆی: كوردی. ئەو لەبارەی پیلانگێڕی لە براكەی لێزانترە، كە تا ڕادەیەك عەقڵێكی ساكاری هەیە.

ئێوارەكەم هەمو بە گفتوگۆ دەربارەی سەرۆكایەتی بەسەر برد. ڕەشید بەگ دانی بە مافی براكەیدانا، چونكە برای گەورەیە، بەڵام هەر چۆنێك بێ داوای كرد كە لە شەقڵاوە دانیشێ. ئەو دەریخست كە مەبەستی لەو مانەوەیە سەروكاركردنی موڵك و ماڵ و ژنەكانی بایز بەگەو شوێنێكیش جێی هەردوكیانی تێدا نابێتەوە. دواتر هاتە سەر چۆك و تكای لێكردم كە خەریكبوو چاوەكانی بدوێن (بێنە قسە ئەگەر چاویش قسەی بكردایە) كە شتێك نەكەم ئەو و براكەی لێكبكا، ئەودەمای من گەیشتبوومە بڕیارێك بە دامەزراندنی قادر بەگ وەك حاكم، وە لەبەر ئەوەی دەبوایە لە بنكەی ناوچەكەی دانیشێ، بەڵام تاكو بەیانی ڕۆژی دواتر نەمتوانی وا لە ڕەشید بەگ بكەم ملبداو خۆ بەدەستەوە بدا. ئیدی شتێك ڕێكخرا كە ئەو و قادر بەگی برای پەنا بۆ مامە پیرەكەیان (عەزیز بەگ) ببەن لە بالیسان و سوێند

بخۆن کە دڵسۆزی یەکتر بن. بەڵام ئەمە هەرگیز ڕوینەداو پێکدا هاتنی نێوان ئەو دو برایە بەهۆی ئیرەیی بردن بوە سەرچاوەی پشێویەکی بەردەوام بۆ هەموو ئەو (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی)یانەی کۆیە کە لەدوای یەك هاتن. بەر لەوەی بڕۆم بە فەرمی قادر بەگم کردە حاکمی شەقلاوە کە دەسەلاتی بەسەر هەر سێ لقەکەی خۆشناوو هۆزی (کۆڕێ)دا هەبوو لەکاتێکدا کە ڕەشید بەگ بە فەرمی کرایە سەرۆکی لقی (میر مەحمەلی)و سالح بەگ بە ڕەسمی سەرۆکی لقی (میر یوسفی) بوون. بەگشتیش قادر بەگ سەلماندی کە سەرکەوتوترین حاکمە.

(حاجی نەورەس ئەفەندی) کە خەڵکی ڕەواندزەو بەڕێوەبەری پێشتری شەقلاوە، لە دانوستانەکەدا یارمەتیدام، ئەو پیاوێکی ناشیرینەو لە بنەچەیەکی فارسەو سەری وەك سەری قەلەمون دەچێ. لە دەرونیدا لایەنێکی باوی فێڵبازی ڕۆژهەلات و شلەژانی دەماری تێکەڵ کردبوو. لەو بارودۆخەدا زۆربەی کات لەگەڵما بوو لەپێی تا تەوقیسەری دەلەرزی. ئەو زمان گیران و تەتەڵەکردنێکی هەبوو، پێم وابێ سەرچاوەی ئەوەش ترسی ئەو بوو نەکا لە خراپەکاریەکانی ڕابردوی بکۆڵمەوە. ئەو ڕۆژی کە شەقلاوەم جێهێشت ئەویش گەڕایەوە ڕواندز، کە لەو نزیکانە بەیەکدەگەینەوە.....

بەیانی ی ڕۆژی ٢٦ی مانگ کاتێکم هەبوو لە گەڕان بە ناوچەکانی دەوروبەرمدا بەسەری ببەم.

شەقلاوە، کە ژمارەی دانیشتوانەکانی نزیکەی (٣٠٠٠)کەس دەبێ و نیوەیان گاورن، دەکەوێتە سنووری باکووری چیای سەفین، کە باکگراوندێکی بەردینی بەرزی لێژ دەداتە شارۆچکەکە. کە ئێستا بە بەفرێکی سپی داپۆشراوە، خانوەکانی یەك لەسەر یەك بنیاتنراوە، بۆیە دەبینی مرۆڤ لە دەرگای ماڵی خۆیەوە دەچێتە سەربانی دراوسێکەی. لەسەر ڕێگای سەرەکیش کە بەناو شارۆچکەکەدا دەڕوا، تەلاری بەرزو ڕێك دەبینرێن کە ماڵی میرانە. مزگەوتێکی بچوکیش هەیەو، لە ناو شارۆچکەکەشدا ژمارەیەکی زۆر کانی هەن ئاویان لێهەڵدەقوڵێ و بەرەو خوار خوڕە دەکەن و بێشەی فراوان وبێستانی دورو درێژ بە تەریبی دۆڵەکە تا ماوەی چەند میلێك ئاو دەدەن. لەوێ درەختی چناری زۆرو بێستانی سێوو هەرمێ و خۆخ و قەیسی و هەنجیر و هەنارو درەختی دیکە

بڵاوبونەتەوە و لەگەڵ درەختی گوێز و چنار تێکەڵاون. ئەو بێستانانە لە هاویندا فێنك و دڵخۆشکەرن بەلام لە زستاندا بێزارکەر و تاریکن. (حاجی نەورەس) دەستی گرتم بەرەو کۆشکی هاوینەی خوالێخۆشبوو (بایز بەگ)، ئەو تەلارێك نیە کە ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بێ، بەلام دوو درەختی چناری بەرز لە دەرەوە هەن کە وەك لەشعری باوی ئەوێدا هاتوە زانیمان (٥٠٠) ساڵێك دەبێ کە لەویدا گەشە دەکەن. وەکچۆن حەوزو ئاوێکی جوانی لێیە کە لەم دواییەداو بەهۆی دووبارە هەڵکۆڵینەوە دۆزراوەتەوە.

ئێستا ڕێگەی کەنیسەمان گرتەبەر، هەرچەندە کە حاجی نەورەس بە شڵەژانێکی دەرونیەوە ناڕازیبوو، چونکە بەپێ ی قسەی ئەو شایانی بینین نەبوو. بەلام من سەرم لەوە سوڕما کە چیلێکردووە: هەر هێندەی گەیشتین بینیم کە کەلاوەیەکە و پڕ لە مێوژو و گەنمە کە بەشی حکومەت بوون لەو دو بەرهەمەو لە کەنیسەدا دایکردبون. لێرە لە گۆڕەپانێکی والآدا چوار پێنج قەشەم دی کۆببونەوەو خاچیان پێبوو، کۆمەڵێکی سرود خوێنی جلی کەهەنوتی لەبەریش، کە لە کۆمەڵە منداڵێکی چڵکن پێکهاتبوون لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر. هەر کە منیان بینی دەنگی یەکێك لە مەزمورەکانیان لێبەرز بۆوە. ئەوەی کە زۆر بێزاری کردم ئەوەبوو کە ئەو کەژاوەیە بەدوای مندا دەڕۆیشتن بە دەنگێکی گڕ دەیانگوت (هەلە لویا).

دەستەیەك ژن دەوریاندام– هەموویان پیرێژنی ناشیرین بوون– دەست و جل و بەرگیان ماچ دەکردم. ئای لەو هەژارە بێدەرەتانانە– من بەزەییم بەوەدا دێتەوە کە هەستیان کردبێ ئاواتە بەرزەکانیان لە ڕۆژانی داهاتودا شکست بهێنێ، کە هیواگەلێك بوون لەو بارودۆخەی ئێستادا بە خەیاڵیاندا دەهات.

لەکاتێکی درەنگی دوای نیوەڕۆ نەبێ، لە تواناد نەبوو شەقلاوە جێبهێڵم، ئەودەم گەڕامەوە کۆیە، شونی ڕێگا سەرەکیەکە بە بناری سنوری باکوری چیای سەفیندا دەگەڕام، هەمیشە ڕێگاکەمان بەناو درەخت و کۆڵانی تەسکی چەپەر بەرزدابوو. لە زۆر شوێندا ڕێگاکە دەبوە ئاوەڕۆی جۆگاکان. بەلای گەلێ دار بەڕودا تێپەڕین کە بە مازوێك قورسببو کە جۆرێکی سەیر و ڕەش و لوس و بریقەدار بو، هێندەی تۆپێکی گۆڵف دەبو. دو سێ سەعات دوای تاریکداهاتن و دوای ئەوەی

کە دو سێ جار بەشوێن جۆگە ئاوێکدا دەڕۆیشتین و وامانـدەزانی ڕێگاکەیـە، ڕێگا دروستەکەمان نەدۆزیەوە تا نەگەیشتینە تافگەی ئاوێکی سەر بەردو خوار...ئیدی مەبەستەکەمان دۆزیەوە، کە گوندی (هـیران)بـوو. شـەوم لـەوێ لەگـەڵ کەسـێکدا بەسەر برد ناوی (عەلی بەگ) بو کە زۆربەی کات لە دژی تورکەکان ڕاپەڕیبوو، ئـەو میوانداریەکی زۆر باشی کردم، ئەمەش شتێکی نائاسـایی بـو چـونکە گوندەکـەیان دەکەوتە سەر ڕێگای نێوان کۆیەو شەقلاوەو میوانێکی زۆر لێیان دەبونە بارگرانی. لەوێ میرانی ئەحمەد بەگی سەرۆکی هۆزی (باشکاڵی)م بینـی کـە پیـاوێکی پـیری داڕوخاو بو، بێتوانـاو بـێ ئیرادەبـو، هۆزەکـەی ئـەو، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان، بـە توانـاو دەسەلات بون، بەلام ئەو چەند سـاڵی لەمەوبـەر خراپـەی لەگـەڵ تورکـەکان کـرد، ئیدی تورکەکان پیرانەکانیان بانگهێشت کردو گوندەکانی ئەوانیان وێران کرد.

هەر هێندەی هەستونی بەیانی ڕۆژی دواتر دەرکەوت، بەرەو کۆیـە بەڕێکـەوتم، دوای سەعاتێك و نیـو گەیـشتمە گونـدی (نـازەنین). لـەوێ گوندنـشینەکان دایـان نیشاندم و قاپێك هەنجیر و مێوژو هەناریان بۆ هێنام. لێرە بێستانی فراوان هەیـەو پڕە لەداری سورە چنارو چنار، ئەو دەنگۆیەش بلاوە کە هەناری نازەنین باشترین هـەناری کوردسـتانە. ئێـستا بـەرەو جۆگـە ئـاوێکی گـۆگردی شـۆڕ بوینـەوەو کـە پێیدەڵێن (چاڵێ)، کە لە ئەشکەوتێکی درێژو باریکدا هەڵدەقوڵێ دەکەوێتـە گـردە بەرزەکان، لە تەنیشتیشیەوە کانیـەکی گـەرم هەیـە کـە پـڕە لـە ماسـی ئاوەکـەی نیشتەیەکی شینی ڕەشباو جێدێڵێ، بۆنێکی کیمیایی تیژی لێدێ و کوردەکـان بـۆ نەخۆشی پێست مەلەی تێدا دەکەن.

لە گەڕانەوەمدا بۆ کۆیە بینیم کە سواراغا نەهاتۆتە ئەوێ، لەگـەڵ ئـەوەی بـەر لەوەی جێیبهێڵم، بەشێخ ئەمینم ڕاگەیاندبوو کە بیهێنێ. بۆیـە سـوپایەکی بـچوکم کۆکردەوەو خەبەریشم بۆ بابەکراغا لە قەلادزە ڕەوانە کرد، ئیـدی ئـەویش هەنـدێ لە کوڕانی هۆزەکەی کۆکردەوەو هاتـە ڕانیـە، دەرکـەوت کـە هەڕەشـەکە بەسـبو، یەکسەر شـێخ ئـەمین هاتـە کۆیـەو سواراغاشـی لەگەڵدابوو، لەگـەڵ دو موختـاری هۆزی پیران کە داواکرابون و ئەوانیش (مراز) و (ئاغای مام زێندین)ی بـون، ئـەوان هەموو چونە ماڵی حەماغا، بۆیە یەکێکم نارد تا سواراغاو یـەکێك لـە موختارەکـان بگـرێ. بـەلام ئـەوەی دیکـەیان (مـراز) هـیچ خەبـەرێکی نـەبوو. یـەکێك لـە

(هـەواڵگران)ی پیاوەکـەم (جەعفـەرخان) وتبـوی کـە (مـەرەن) لـە مـاڵی (مـەلا موحەمەد ئەفەندی)یە، یان وەکچۆن ناومـان نـابو (مـەتران). بۆیـە جەعفـەر خـان چوە لای و داوای (مەرەزی)کرد، بـەلآم ئـەو رۆحانیـە هەڵچوو تورەبوو و وەلآمـی دایەوە: کە ماڵەکەی ئەو لانەی دزان نیە. هەر لـەو کاتـەدا یـەکێك تاقـە سـوارێکی دیتبـوو کـە لـە هەیبـەت سـولتان دەپەڕیـەوە، دوای ئـەوە هـەرگیز (مـران)مـان نەدیتەوە. ئاغای مام زێندین، کوڕێکی ڕوخۆش و قسە خۆشی هـەبوو کـە تەمـەنی نزیکـەی دە سـاڵ دەبـو، بـەردەوام دەهاتـە لام و تکـای لێـدەکردم کـە بـاوکی و سواراغا بەربدەم. لە دواییدا تکای ئەوم قبوڵ کردو ڕێوشوێنی ئاسایشی وا گیرایـە بەر کە بێ مۆڵـەتی مـن هـەولی ئـەوە نـەدەن لـە کۆیـە بچنە دەرەوە، لـە چـەند ڕۆژێکـدا، بـە شـێوەیەکی بـاش، هـەموو کـارە گرنگـەکانم یـەکلا کـردەوە، ئیـدی مۆڵەتیان درا بگەڕێنەوە گوندەکانیان.

لە کۆتایی کانونی دووەم و، لەبەر هەندێ هۆی خانەوادەیی ناچـار بـووم داوای مۆڵەت بکەم تا بچمەوە ئینگلتەراو مۆڵەتم پێدرا. بـەر لـە ڕۆیـشتنم لەگـەڵ نـەقیب (بارکەر) بە گەشتێك هەڵسام، کـە وەك یارمەتیـدەرێکی مـن تـازە گەیـشتبوو، بـۆ ئـەوەی شـارەزایی ناوچـە دورەکـانی رانیـەو قـەلادزێ بـێ. گەشـتەکەمان بـە پـێ دەسـتپێکرد (پیـادەیی) و لـە چـیای هەیبـەت سـولتان پەڕینـەوە، بەڕێگایـەکی کورتترو جیاواز لەو ڕێگایەی پێشتر پێیدا هاتوچۆم کردبو. لەو دیو بە (چـنارۆك)دا تێپـەڕین کـە مـەتران هاوینەهـەوارێکی لەوێـدا هەیـەو بەرهـەیوانێکی لـە بـەرد دروستکراوە. کانیەکی لێ هەڵدەقوڵێ کە لەساردی بەفرایەو درەختی چـنارو گـوڵی کێوی دەوریان داوە. کوردەکان هەستێکی خەملآنـدنی جـوانیی دەگمـەنیان هەیـە لەناو گەلەکانی ڕۆژهەلآتـدا، لەسـەر قـەدپاڵی چیاکاندا ڕەزی تـرێ ی زۆری لێبـو. ئێستا زەوی ڕازاوەیی وەرگرتبـوو بـە مـافورێکی سـەوزی ئاوریـشمی ڕازابـۆوە کـە گولآڵەی سورو سپی دەینەخشاند. لە کۆتایی نشێوەکە گەیشتینە گوندی قەسرۆك کە لەوێ (مام برایم)ی ئامۆزای سواراغا بە گەرمی میوانداری کردین، ئەو پیـاوێکی زۆر پیرە، ئەو کۆمەڵـە منـداڵێکی نـازداری هەیـە کـە جامانەیـەکی بلباسـیانەی بـە ڕێشویان پێشکەش کردم، لە بەرامبەر ئەوەدا بەڵێنم پێدان کـە هەنـدێ یاریـان لـە ئینگلتەراوە بۆ بێنم.

دەنگی گەواڵەیەك تاریكی شەوی شەق كرد، بۆ بەیانی دواتر ڕۆیشتین و باران دەباری. یەكەم ڕووبارمان بە سەركەوتویی بڕی، بەڵام ئەوەی دواییان پەڕینەوەی ئەستەم بوو، ناچار بوین لە گوندی سەرخمە بوەستین، كە قادری بچكۆڵە پسیارگەلێكی دەربارەی باوكی دەكرد، كە هێشتا بەند كرابو. دوای نانخواردن بەهیوای پەڕینەوە لەزێ و لە جێیەكی سەروتر، ڕۆیشتین، بەڵام ئەوەتا فرمێسكی هەور بە بەخشندەیی دایكردەوە. ئیدی گەواڵە بەدوای یەكدا دەهاتن و بروسكە ئاوی چاوانی دەبرد. بۆیە ناچار بوین كە پەنا بۆ كوخێك ببەین لە گوندی (كانی ماران) كە لەوێ لە بەرامبەر ئاگرێكی گەورە جلەكانمان وشك كردەوە، كەشوهەوایەكە تۆزێك خۆشی كردەوە، جارێكی دی هەوڵماندا بڕۆین، كەچی قولایی ئاوەڕۆی ڕووبارەكە بوە بەربەست، هەرچەندە ئەسكیش بو. زۆر بە ئەستەم و بەسەر پشتی ئەسپەكانمانەوە توانیمان پێدا تێپەڕین، لەگەڵ ئەوەی كە زۆر سارد بو– چونكە سەر گردەكان شەختەی كردبو كە سەد پێ لە ئێمە بەرزتر بو– كەچی دو كوردی ڕوت جانتاكانی ئێمەیان هەڵگرتبو. نزیكەی سەعات چواری دوای نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنێك بەرامبەر گوندی (پوكە)ی هێندێ خەڵكی گوندەكە هاتن و بوارێكیان نیشانداین ئیدی توانیمان لە ڕوبارە سەرەكیەكە بپەڕینەوە بێئەوەی كارەساتێكی ناخۆش ڕوبدا، هەر هێندەی گەیشتینە كەناری ئەوبەر ئیدی ئاوەڕۆیەكە وەك تاڤگە داروخا، بەمەش لە ولاخەكانی كە شتومەكی ئێمەیان هەڵگرتبو دابڕاین، ئیدی ئەو شەوەم لە گوندێكی دیكەدا بەسەر برد.

خانەخوێكەمان كە ناوی (ئیبراهیم ئاغا)بو پیاوێكی نەبەردو پیاو چاك بو. ئەو وەك دەردەكەوت پیاوێكی نەدار بو، بڕێكی كەم دەست و پێوەندی هەبون، هەر چەندە سوربو لەسەر ئەوەی بەر لە شەڕ ٤٠ سوارە ئامادە بكا. لەژورێكی بچوكی پڕ لە كەل و پەلی ناومالّ داینایین كە تەنیا پەردەیەكی حەسیر لە ژمارەیەك گامێشی جیا دەكردینەوە. جوتێ تاژی نایابی ڕاویش لە نزیك دەرگاكە وەركەوتبون. لە نانخواردنێكی باشدا بەشداریكردین هەرچەندە كە كەم و سوك بو. لەگەڵ بونی گامێش و ئەسپیش كەچی توانیمان بخەوین چونكە زۆر ماندوو بوین.

لە بەیانی دواتردا ڕۆیشتین، کەش و هەوا خۆش و جوان بو، بە لێواری باکوری بیتوێندا ڕۆیشتین، گردەکان بە بەفری تازە کەتو داپۆشرابون کە تا دەشتەکان دەهاتە خوارەوە، وەکچۆن هەورە پڕەکان بەسەر لوتکەکاندا دەهاتن و دەچون.

هەر هێندەی لەو دەربەندە تێپەڕین کە ئەو زنجیرە گردۆڵکەیە دابڕ دەکا کە لە دەشتی بیتوێن هەن. ئیدی گەیشتینە (سەر کەپکان): گوندی مامەنداغا، سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ. ئەو پیاوێکی وردیلەی پشتکوری کرو کپە، ڕەنگە کە لە سلێمانی بینیم ڕقم لێبوبێتەوە، ئەو ناوبانگێکی خراپی هەبوو (ئاوا: وەرگێڕ) خەڵکی دەگرت و ئازارێکی زۆری دەدان، بۆیە دەسەڵاتی بەسەر بەشی هەرە زۆری خەڵکی عەشیرەتەکەی نەمابو، کە باشترم ناسی زانیم کە بەشێوەیەکی ناوازە پیاوێکی بەڕێز و گران و سەنگینە، لەگەڵ ئەوەی کوردێکی دانیشتوی ئەو جێگە دورە دەستەیە زۆر ئاقڵ بو. دیوەخانەکەی پاك و فراوان و بە جوانترین شێوە ڕێکخرابو.

ئێستا ئێمە لە دۆڵێکی تەسکی باکوری ڕانیەین، ڕێك لەخوار داوێنی کێوە ڕەش. مەبەستی داهاتومان (١٤) میل دور دەبو ئەگەر بە ڕێگادا برۆیشتینایە، بەلاّم خۆی لە شەش میل پتر نەبوو لەسەر گردەکەڕا بۆیە سوربوین لەسەر ئەوەی بەپێ برۆین و کەل و پەلەکانمان بەڕێگایەکدا نارد کە دەسوڕایەوە.

هیوامان وابو کە لەسەر ڕێگا هەندێ کەڵە کێوی ببینین، مامەنداغامان هاندا کە هەریەکەی کوردێکی بەهێزمان بە تفەنگەوە ڕەگەڵ بدا. دوای نانی نیوەڕۆ لەگەڵ دو دەلیلەکەمان دەرچوین، کە جەستەیەکی بەهێز و بالآیەکی کورتیان هەبوو کورتەك و شەرواڵی خەتخەتیان لەبەردابو لەگەڵ گۆرەوی درێژی لە خوری دروستکراو. بە ڕێیەکی بەردینی پێچاوپێچدا سەرکەوتین، لەنیوەی ڕێدا گەیشتینە یەکەم شوێنی بە بەفر. تەواو نزیك لوتکە سێ کەڵە کێویمان بینی، نەقیب (پارکەر) لەپێشەوە بو دەلیلەکەی کە هیچی لە ڕاوکردن نەدەزانی تەقەی لە ئاژەڵەکە کرد، بە هەڵچونەوە نەقیب بارکەر تفەنگەکەی لەدەست ڕاستاند، بەلاّم لە هەمان کاتدا کەڵە کێویەکە چەند میلێ دورکەوتەوە. نزیکەی (٢٥٠٠)پێیەك سەرکەوتین، کە لە سەرەوە هەوا زۆر ساردبو، بێشەکەش بە بریقەو سپی بو چونکە بەفرە بەستوەکە لق و گەڵاکانی داپۆشیبوو، لایەکەی دیکەی گردەکە پڕ

ـە درەخت بو. درەختی چڕو بە پێچاو پێچ پڕ بوو لـە پـۆڕی چـیا، نزیـك خۆرئـاوا گەیشتینە شوێنی مەبەست، مەبەستم گونـدی (دو گۆمـان)ە، بۆیـەش ئـەو نـاوەی لێنراوە چونکە دو گۆمی هەیەو ئاو دەداتە خەڵك. (بالول ئاغـا) سـەرۆکی یـەك لـە ـلقەکانی ئاکۆ، لێرە دەژیا. کـە بینـی ئێمـە بـە پـێ گەیشتوینە ئـەوێ زۆر سـەری سوڕما، چونکە کوردێك لە چینێکی تۆزێ دەستڕۆیشتو بیر لـە ڕۆیـشتن ناکاتـەوە. ئەو پیاوێکی قەڵەوی خۆش مەشرەب بو، بەتەمەن گەورە بو، بالآی کورت بو و بـە (فالـستاف) دەچـو، تـەنیا ئـەوە نـەبێ کـە ئـەو هـەرگیز شـەراب ناخواتـەوە. بـۆ دیوەخان دەستی گرتین، ژنەکانی حەرەمسەرا لە سوچێکەوە سەیریان دەکـردین. سێ لە کوڕەکانی خزمەتیان دەکردین لە کاتێکدا، خۆی یـاری لەگـەڵ چـوارەمیان دەکرد، کە منداڵێکی بچوك بو هێشتا پێنج ساڵ نـەدەبو، ئـەو ئێوارەیـە نامەیـەکم پێگەیشت، بینیم کە نامەیەکە لە هەندێ فەقێوە کە لە گوندەکـەدان، هـاتوە، کـە بە هۆیەوە هیواخواز بون کە بڕە پارەکیان بدرێتی بۆ بژێوی ژیانیان.

ڕۆژی دواتـر زو دو گومانمـان بەجێهێـشت و بـە تـەك لێـواری بـاکوری دەشـتی پشدەردا ڕۆیشتین، هەر خێرا چـوینە ناوچـەی مـەنگوڕان ئـەو گوندانـەی بینیمـان چـکۆڵە بـون، هـەژاریش سـەریتێنابون سـەعات یـانزەو نیـوی بـەیانی گەیـشتینە (شـەروێت) جێگـەی (کـا حوسـێن)ی گـەنج، ئیـدی کەوتـە تاڵوکـە کـە بینیمـان خۆیدەشوشـت. هـەر هێنـدەی جلـەکانی لەبـەرکرد دەسـتیگرتین بردینـی بـۆ دیوەخانێکی جوان و نوێ. ساڵێك دو سـاڵ پـتر بەسـەر دروسـتکردنیدا تێنەپـەڕی بوو کـە لەسـەر دەسـتی بـایز پاشـا دروسـتکرابوو. دیمـەنی ئـەو گردانـەی بەسـەر ئێمەیاندا دەڕوانی زۆر نایاب بو. گەلاڵەش لە سەروی هەموان بو. ئەوێ لێژاییـەکی گەورەی ڕەش بـو کـە بـەفر سـەری دەڕازانـدەوە، دەتتـوانی لـە پـشتیەوە چیای (زێرنە کێوی) و لوتکەی قەندیل ببینی، کە ئەوەی دواییان کۆمەڵێ لوتکـەی هـەبو بە بەفر ڕازابۆوە و دەیانگوت کە درێـژ دەبێتـەوە تـا دەگاتـە (تـەورێز). شـەروێت سەرچاوە ئاوێکی گەورەی تێدابو، بەر لە خۆر ئاوا گەیشتینە قـەلأدزەو شـەوەکەم لەگەڵ بابەکراغا بە قسەکردن بردە سەر دەربارەی ئەو کاروبارانەی گرنگ بون.

بەیانیەکەی خواحافیزیم لێکردو، تا ڕۆژی ئەمڕۆم نەمدیوەتەوە، ئەو لە یادەوەری مندا وەك مەزنترین سەرکردەی کورد دەمێنێتەوە، لەو سەرۆکانەی کە ڕێکەوت وایکرد بیانبینم لە ماوەی ئەو دو ساڵەدا کە لە کوردستان بەسەرم برد.

کە گەڕاینەوە بنکەکەمان ئەرکەکانی پۆستەکەم دا بەدەست نەقیب پارکەر لەبەر ئەوەی جێگرەوەکەم (نەقیب بیل)هێشتا نەگەیشتبو، دوای ئاهەنگێکی ماڵئاوایی خۆش بەرەو بەغدا بەڕێکەوتم.

کە پشتم لە کۆیە کرد خەمێکی قوڵ دایگرتم. چونکە خۆشەویستی ئەو شارۆچکە دورەدەستە بچوکە دلگرە و خەڵکەکەی لە دڵمدا چەکەرەی کردبو، کاری ئەوان سەیر بو. ڕەفتاری ئەوان بۆ ماوەیەکی درێژ بوە هەمان ڕەفتاری من، ئەو شتەی کە شەیدای بون هەمان ئەو شتە بو کە من شەیدای بوم، وەك چۆن هەڵچونەکانیان هەمان هەڵچونی منبو. بە هەستی دڵتەنگی و حەسرەتەوە جارێکی دیکە خۆم لە جیهانی دەرەوەدا دیتەوە. من ئەو دو مانگەی لە کۆیە بەسەرم بردن بە خۆشەویسترین ئەو کاتانەی دادەنێم کە لە کوردستان بەسەرمدا تێپەڕین.

◆

# بەشی دەیەم

## جارێکی دیکە..........هەولێر

کە مۆڵەتەکەم تەواو بو، لەڕێی حەلەبەوە گەڕامەوە میزۆپۆتامیا، ڕۆژی (٣٠)ی حوزەیران گەیشتمە موسڵ. لەوێ فەرمانی لە هەولێر ئامادەبونم پێگەیشت بۆ وەرگرتنی ئەرکی (یارمەتیدەری حاکمی سیاسی) لە (ڕائید مۆری). ڕۆژی (٣)ی تەموز گەیشتمە شارەکە، بەڵام ڕائید مۆری تا (١٣)ی مانگ ئەوێی جێنەهێشت. لەنێوان ئەو دو بەروارەدا گەلێ ڕوداو ڕویاندا کە گوڕەشەی کارەساتێکی خراپیان دەکرد، ئەو دەمای کە ئەرکی پۆستەکەم وەرگرت هەولێر نوێنێکی لە گوڵ نەبو.

لەگەڵ ئەوەی کە ڕەگەزی زۆرینە لە ناوچەی هەولێر لە ناوەندی شار بێ‌ترازێ کورد بون، بەڵام نەخرایە سەر دەسەڵاتی شێخ مەحمود، لە ئەنجامدا سەرۆک هۆزە دزەییەکان وەك دراوسێکانیان لە خۆشناو پۆستی فەرمی قازانج بەخشیان وەرنەگرت. لەوانەش نەبون کە (حوکمداری سلێمانی) خۆشی بوێن. لە ڕاستیشدا ئەوان بەچاوی سوك سەیریان دەکرد. بەڵام نەیاندەتوانی کە، بەبێ دەنگی، خەڵکانێك ببینن کە لە خۆیان بەبێ دەسەڵاتتریان دادەنان، موچەی گەورە وەرگرن و پایەو ڕێزی بەرزیان هەبێ. شۆڕشی (١٩١٩)ی [1] شێخ مەحمود لەگەڵ ئەوەی ناهومێد بو و شکستی هێنا، بەڵام دەریخست کە لە توانادایە کە ڕوبەڕوی حکومەتی نوێ ببنەوە. وەکچۆن شەپۆلی شلۆقی و شڵەژانێکی بە درێژی و پانی وڵاتدا بڵاو کردەوە. سەرۆکەکانی دزەییان بەبێدەنگی مانەوە بەهیوای ئەوەی لایەنگیریەکەیان قازانجێکیان دەسخا کە حاڵ و باڵیان باشترکا. بەڵام جارێکی دیکەش هیوا هەرەسی هێنا. ئەنجا خەملاندنی بەرهەمی جۆ، هات فەرمانبەرە تایبەتمەندەکانی قەبلاندن خەملاندنەکەیان زۆر لە بەرهەمەکە کەمتر کردبو. ئەنوەرەفەندی بەڕێوەبەری مەخمور [2] ئەو ڕاستیەی گەیاندە ڕائید مۆری کە

ئەویش فەرمانی دوبارە خەملاّندنی لە هەندێ ناوچە دا. ئەمە عوزرێکی بە ئاغا دزەییەکان بەخشی، ئەحمەد پاشاو هەر سێ برادەرەکەی ئەرزو حالّێکیان مۆرکردو بۆ (یاریدەدەری حاکمی سیاسی)یان نارد. وتیان کە هەمو فەرمانبەرانی حکومەت گەندەڵ و دەستە پاچەن، ئەوان لەبەر دوژمنایەتی کەسی زێدەڕۆییان لە خەملاّندندا کردوە، بۆ ناوچەکە وا باشترە ئەگەر خۆیان وەك فەرمانبەر حوکمی بکەن. هەر هێندەی کە ئەو نوسراوە گەیشت رائید مۆری فەرمانیدا کە نوسەرانی نوسراوەکە بێنە هەولێر، بەلاّم ئەوان بە هەنجەتێکی ناتەواو ئەوەیان ڕەتکردەوە. ئاگادار کردنەوەیەکی توندیان بۆ ڕەوانە کرا، بەلاّم ئەوان بەگیانی بەرەنگار بونەوەو لەترسی سزایەکی توندی کە بە هاتنیان ڕوبەڕوی ببنەوە، ئیدی لەسەر باری لوتبەرزی و لاملی مانەوە.

ئەوە حالّەتەکە بو کاتێ گەیشتم. هەولێکی زۆرمدا تاکو سەرۆکە دزەییەکان وا لێبکەم ئاقلّ و بەرچاو ڕون بن، بەلاّم لە لایەن کەسانێکەوە کە لەشار دادەنیشتن و بێگومان ڕو لە خراپەکاری بون ڕکابەری ئەو هەولاّنە کرا، ئەو کەسانە نێردەیان نارده لای سەرۆکە دزەییەکان، هانی شۆڕشیان دەدان و دلّنیایان دەکردن کە ئەگەر بێنە هەولێر چارەنوسیان یان لەسێدارەدانە یان دورخستنەوە، ناتوانن خۆیانی لێبپارێزن، ڕوی بارودۆخەکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو نوقلاّنەی ڕۆژێکی لێدەدا کە نەگبەتی لێدەباری، بۆیە زۆربەی فەرمانبەرانی حکومەت کە لە ناوچەی دزەیی کاریان دەکرد پۆستەکانیان بەجێهێشت.

لەناو شاریشدا بارودۆخەکە شلّەژانێکی دروستکردبو، چونکە ڕەفتاری ژاندارمی زۆردارانەو گەمژانە، وەك ڕەفتاری پۆلیسی شار خەلّکەکەی زۆر بێزار کردبو. کۆمەلّەیەکی نهێنی کە چەند لقی هەبوو فراوان و چالاك بو، پڕوپاگەندەی لەدژی بەریتانیا بلاّو دەکردەوە. وەکچۆن هەندێ لە دەستڕۆیشتوانی شار بە توندی پشتیوانیان دەکردن، لە پێشەوەی هەموشیان (حاجید ڕەشید ئاغا)، ئەو پیاوێك بو لە سەردەمی تورکاندا زۆری کێشە دروستکردبون، وەکچۆن چاویشی لەو ڕۆژە بو کە بەریتانیەکان بێن. کە هاتیشن ئەو یەکەم کەسبو کە داوای گەڕانەوەی تورکەکانی دەکرد. ئەو پیاوێکی بالاّ بەرزی ڕوالّەت ڕێك بو، بەتوندی پابەندی ڕێسا کۆنەکانی ڕۆژهەلاّت بو، بەلاّم شانسی لە خوێندندا کەم بو و لە

بیرکردنەوەش کەمتر (ئاوا: وەرگێڕ). ئەو هەمو کاتی خۆی بۆ داگیرکردنی زەوی تەرخان کردبو، زۆر بە هەرابو، بۆیە دوژمنێکی مەترسیدار نەبو. کوڕە گەورەکەشی (عەتەولاّغا) دەبەنگێکی لاواز بو، جلی ئاورووپی لەبەر دەکرد، دەتبینی لەبازاڕدا تەسبێحەکەی بەدەستەوە بوو، هەمو ڕۆژێك دەسوڕایەوە و چالاك بو لە پڕوپاگەندەی دژ بە بەریتانیەکان. وە لە پێوەرێکی جیاوازدا (عەلی پاشا) دەهات، ئەو پیاوێکی کەتە بو هێشتا گەنج بو، ڕەفتاری شیرینکارانەو پەروەردەیەکی جوانی هەبوو، ئەو سامانێکی کۆکردبۆوە و لەکاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا ئەو نازناوەی بەدەستهێنابوو، ئەندامێکی چالاکی (جەمعیەی ئیتیحاد و تەرەقی) بوو، کاتێکیش بەریتانیەکان هاتن، ئەمانەتەکەی ڕێگەی پێنەدا کە بە ئاشکرا بڵێ کە ئەو تورکەکانی پێباشترە، بەلاّم، دواتر ئەو بە ئاشکرا پڕوپاگەندەی دژی بەریتانیەکان بلاّو نەکردەوە، من بەوە هەڵخەڵەتام کاتێکی زۆر خۆی لە حکومەتی نوێ نزیك دەکردەوە. بەلاّم لە پیلانگێڕیدا دەستێکی بالاّی هەبوو. چونکە (لەسەر زاریەوە نازانی چی لەدڵدایە) بە قسە نەرم و خۆشەکانی و خەندە ناسك و گەرمەکانی ئەو کۆمەڵە پیلانێکی دەشاردەوە کە بۆ لەناوبردنی من دانرابون و لە ئەژمار نەدەهاتن، بەلاّم مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا ئەو خۆی توش نەدەکرد، ڕوداوێکی گەورە لەدواییدا ڕێگای توشبوونی بۆ کردەوەو، لێرەدا خۆشە باسی ئەوەش بکەین کە هەریەك لە حاجی ڕەشیداغاو عەلی پاشا هانی دەستە ڕێگرەکانیان دەدا، کە ئەندامەکانیان لە زەمانی تورکەکان، لەو بەرەلاّیانە بون کە سەر بەوان بون و بەرامبەر کردەوەکانیان کرێیان وەردەگرت. بەهۆی ئەوانەوە دەوروبەری هەولێر لەسەر ئاگر دەکولاّو ترس وەك ئاگری ناو پوشو بلاّوبۆوە. قایمەقامە تورکەکە نەیدەتوانی سنورێك بۆ ئەو بارە دابنێ، بەزۆریش واپێدەچێ بوبێتە ئامرازێك بەدەست ئەو دو ئاغایەوە.

هەروەها کۆمەڵێك لەو فەرمانبەرە تورکانەی کە پۆستەکەیان لەدەستدابو پشتیوانی پڕوپاگەندەی دژ بە بەریتانیایان دەکرد. لەگەڵ هەندێ خەڵکی دیکەی کە ئەوەندە دیارنەبون و پەیداکردنی پارەوە نانەکە بەڕێگایەکی پاك بۆ ئەوان گران بو. لەوانەش (حاجی سەعید ئاغا) کە سەرخۆشێکی ناسراو بو، لەگەڵ خانەوادەکەی.

لە ڕۆژی نۆی تەموز ڕوداوێك ڕویدا کە لەو کاتەدا خەڵکەکەی تۆقاندو بوە هۆی ئەوەی هەندێ کەس گیانیان لە دەستبدەن، بەڵام یارمەتیدەر بو بۆ پاك کردنەوەی کەش و هەواکەو بەدرێژایی ساڵێکیش ڕێگای لە ڕودانی کێشەی مەترسیدار لە شارەکەدا گرت. بەیانیەکەی هەمانڕۆژ، سکالآیەکم لە حاجی سەعید ئاغاوە، کە پێشتر باسم کرد، پێگەیشت، باسی لەوە دەکرد کە لە ئێوارەی ڕابردو لەلایەن پۆلیسێکی عارەبەوە سوکایەتی بە (یونس)ی کوڕی کراوە. ئەمەش لە شانۆی هەولێردا ڕویداوە، بۆیە فەرماندا کە لەڕۆژی دواتردا خەڵکە پەیوەندیدارەکە هەمویان لەبەردەمم ئامادەبن. تا خۆم لە مەسەلەکە بکۆڵمەوە. بەڵام (سەعیداغا) بە جۆرێکی دیکە بیری دەکردەوە، ئەو بڕیاری دابو کە پشێوی و شڵەژان دروستبکا. لە ئێوارەی نۆی مانگدا هەریەك لە عەبدوڵلا فەندی، کە فەرمانبەرێکی پێشتری تورکان بوو، (بوبو)ی جولەکە کە خاوەن باڕ بوو، (ئەمینی سەرتاش)ی بانگهێشت کرد بۆ ماڵەوەو هەریەك لە (یونس)ی کوڕی و ئەحمەد بەگی کوڕی سالح بەگی سەرۆکی خۆشناویش لەوێبون. ئەوانەی کە لە گەورەکان بون بە ئازادی نانیان خوارد، کە لە نانخواردنیش بونەوە هەمویان ڕێگای شانۆیان گرتەبەر. سەعیداغاو برادەرەکانی چونە لای پشتەوە یەکێك لە قەنەفەکانیان لەسەر ئەویدی دانا، دواتر لەو شوێنە بەرزە دانیشتن و دەستیان بە یاری پۆکەر و ئارەق خواردنەوە کرد. لەنیوەی کاتی شانۆگەریەکەدا سەعیداغا بازێکی دایە سەر شانۆکە، کە خۆی پیاوێکی کەتە بو جنێوی دەداو وشەی ناشیرینی لە دەم دەردەچو بەرامبەر بە شانۆ کارەکان و فەرمانی پێدان ڕاوەستن. دواتر ڕوی لە خەڵکەکە کردو جنێوی پێدان چونکە دوێنێ ئێوارە بەرامبەر بەو پۆلیسە یارمەتی کوڕەکەیان نەداوە، کە جەماوەرەکە بینی ئەو ماستە بێ مو نیەو بارەکە بەرەو خراپی دەچێ، ئیدی شانۆکەیان بەجێهێشت، لە کاتێکدا کە (عەریف میسۆن)و دوای ئەویش (عەریف کینارد) بۆلای حاجی سەعید چون تا سزای ئەو ڕەفتارەی بدەن، کەچی ئەو دانەنیشت و بێدەنگ نەبو، (عەریف میسۆن) هەوڵیدا بیباتە دەرەوەی شانۆ. دوای ئەوە هەراو هۆریایەك بەرپابوو دەنگی چەند تەقەیەکی خێرا بیستراو (عەریف میسۆن) کوژراو، حاجی سەعید بەسەختی بریندار بو و، وەکچۆن عەریف کیناردو یەکێك لە پیاوەکانی حاجی سەعیدیش بەسوکی بریندار

بون. دوان لە ژاندارمی ناوخۆ کە لەناو شانۆ بون دیتران کە لەژێر کورسیەکان دەخشین، بەڵام سەرۆك عەریفانی پۆلیس (باشچاوش) عیزەددین بەکارێکی نایاب هەڵساو هاوەڵانی سەعیداغای دەستگیر کرد، تەنیا یونس و ئەحمەد بەگ نەبێ کە لە بەشێکی دیکەی شانۆکە دانیشتبون و توانیان ڕابکەن و (شەویش ڕاکردنەکەی شاردنەوە) لە نیك بەختیدا خەڵکەکە ئارەزوی خۆ خستنە ناو ئەو پشێویەیان نەبوو.

ڕۆژی دواتر یونس ئاغا دۆزرایەوە کەخۆی لەژێر زەمینێك شاردبۆوە، لەکاتێکدا دەیویست خۆی بدا بەدەستەوە تەقەی لێکراو بە سەختی بریندار بو. ئەو تەقە لێکردنەش لەلایەن کەسێکەوە بو کە دەیگوت سوکایەتی پێکردوەو ناویشی (عەبدولوەهاب) بو. نەخۆی و نە باوکیشی بۆ چەند هەفتەیەك بەکەڵکی دادوەری نەدەهاتن، لەژێر فشاری ئەو بڕوایەی کە بکوژەکە یونس ئاغا خۆیەتی، عەبدوڵلافەندی و بابۆو ئەمینی سەرتاشم بە کەفالەت بەردا. ئەحمەد بەگ بەرەو گردەکان ڕایکردبوو ماوەیەکی زۆری خایاند تا توانیم باوکی ڕازیکەم بیهێنێتە هەولێر. هەر هێندەی هات، ئاماژەیەکی دا کە ناچاربوم دەستەیەك بنێرم بۆ پشکنینی ماڵی عەبدوڵلا فەندی، لە سوچێکی تاریکدا سەندوقێکی ئاسنی قورسیان دۆزیەوە، ئیدی ئەوسا لەناکاو خاوەنەکەی لە دڵێکی گەرمەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا، چونکە لەناو سەندوقەکەدا دەمانچەیەك دۆزرایەوە ڕێك وەك ئەو دەمانچەیە بو کە عەریف (میسون)ی کوشتبو، چونکە گوللەکەیان لەدڵی دەرهێنابو. لە ئەنجامی داوەریەکی کە لە ئەیلولدا کرا، عەبدوڵلا فەندی لە سێدارە دراو حاجی سەعیداغاو یونس خرانە زیندانەوە، کە یەکەمیان پێنج ساڵ و دوەمیان تا هەتا حوکمدران. عەریف میسونمان بەخاك سپارد، لەدەستدانی ئەو خەمێکی لە دەرونی ئێمەدا هەبو، گۆڕەکەی لە دەرەوەی گوندی گاوران بو کە ناوی عەنکاوەیە. گۆڕەکەی لەسەر گردێك و لەتەنیشت یەکێك لەپیاو چاکانی ئەوێ یە. خاچێك ئاماژەی گۆڕەکەیەتی و خەڵکی ئەوێ تا ئەمڕۆش گرنگی پێدەدەن.

ئێستا پێویستە بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی دزەیی، چونکە قسە لە سەر کردەیەکی سەربازی دەکرا، کە ئەمەش، هەر چۆنێك بێ، کارێك بو دەمانویست خۆمانی لێبەدور بگرین، چونکە سەرۆکە دزەییەکان کارێکیان نەکردبو قابیلی

لێبوردن نەبێ. ولآتەکەشیان ئاوەدان بوو، هەر ڕێو شوێنێکی تەمێ کردن، بە ئاسایی، ڕەنجەڕۆیی و مالۆێرانی بۆ هەزاران کەسی بێگوناه بەدواوەیە. دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دەیەم بە ڕازیبونی ڕائید مۆری سەردانی سەرۆکە دزەییەکانم کرد وەك هەولێك تاکو بێنەوە سەر ڕێی ڕاست و عەقڵ، گەشتەکەشم بە ئۆتۆمبێل و لەگەڵ فەرمانبەرێکی حکومی بو کەناوی (ئەنوەر ئەفەندی) بو. هەر هێندەی گەیشتمە گوندی میرخوزار لەسەر ڕێ پیاوێکی بچکۆلە ڕایگرتم کە لە ناوەڕاستی تەمەندابو، بینیم حاجی پیرداودە یەکێك لە چوار سەرۆکەکانی دزەیی. ئەو پێی گوتم کە سێ سەرۆکەکەی دیکە لە دیوەخانی ئەون. بۆیە ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت و لەگەڵیدا چوم، لە هەمانکاتدا هیچ دیاردەیەکی یان نیشانەیەکی وام نەدی کە دوژمنکارانە بێ.

ئەوە یەکەم جاربو کە ئەو سێ پیاوە هەرە بە دەسەلآتە ببینم، بە پێویستی دەزانم یەك بەیەك پێشکەشی خوێنەریان بکەم، چونکە لە بەشەکانی داهاتوی ئەم کتێبە هەنگاوەکانمان دەچەسپێنن.

لەپێش هەموویانەوە برایماغا دێ، ئەو پیاوێکە کە حەفتا ساڵی تەواو کردووە، بەلآم بەهۆی ڕەشکردنەوەی سەرو ڕیشی کەم تەمەنتر دەردەکەوێ. ئەو پیاوێکی بالآ مامناوەندییەو پەرچەمێکی بەرزی هەیەو دو چاوی ڕەشی بە بریقەو لوتێکی بەرزی هەیە. سالآنی پڕ لە خەم و ماندوبون لۆچیان بەسەر دەم و چاویەوە جێهێشتوە، کە بە ژیانە پڕ لە مەینەتیەکەی دا ڕابردون. چونکە لە ئەنجامی کوشتار و ماندوبون، ئیدی تەمەنی تێپەڕیوە، بەلآم کەسایەتی قالبوە وەك ئەو زێڕەی تازە لە ئاگر دەرکرابێ. لەبەر ئەوەی کەسایەتیەکی زیرەکی هەبو، خزم و کەس و دەستو پێوەندەکانی خەریك بو بیپەرستن. ئەو بە سۆزێکی گەرمەوە و بە دڵنیاکردنەوەیان ڕوبەڕوی هەستی ئەوان دەبوەوە. ئەمەش شتێکە بە دەگمەن لای کوردێك دەیدۆزیەوە. ئەو پیرە پیاوێکی لێزان و زیرەك و دیپلۆماسی و قسەکەرێکی نایاب بو، قەریحەیەکی ڕونی هەبو. ئەو لە ناوخۆدا دروستکەری مێژو بو، چونکە بە درێژایی (٣٨) ساڵ و لەسەردەمی باوکیدا سەرکردایەتی دەستەك لە کوردەکانی کرد لەڕێگای چیای قەرەچوغەوەو مەخموری دامەزراند. لەوێ دوای چەندین ساڵ شەڕی عارەبە شەمەرەکان و دواتریش تورکەکان، لە دروستکردنی

قەوارەیەك بۆخۆی سەرکەوتوبو. زۆر کەسی دیکە دوای ئەوان هاتن بەڵام گۆڕینی دەشتی قەرەچوغ لە بیابانێکی وشکەوە بۆ دەشتێکی داچاندراو و ئاوەدان بۆ دەستپێشخەری ئەو دەگەڕێتەوە، دواتر توشی شەڕی گرانی سەرۆکە دزەییەکان بو کە ڕکابەری بون، وەکچۆن پێشتر باسمان کرد کە کوڕە تۆبەرەکەی لەدەستدا. کوڕەکەی دیکەی کە ماوە، مەبەستم (مشیراغا)یە، گەنجێکی بیست ساڵانەو دەستبلاَّوو سەر گەرمە. هێشتا ئەو کاتە نەهاتوە کە تێبگا ژیان تەنیا یاری و ڕابواردن نیە، بەڵکو هەوڵ و کۆشش و دروستکردنە. دەڵێن برایماغا خۆشی لە سەرەتای تەمەنیدا وابوە، بۆیە هیوایەك هەیە کە کوڕەکەش بچێتەوە سەر ڕێی باوکی.

بەڕاستی برایماغا، بێ ڕکابەر؛ سەرۆکی دزەییانە، هەمو تاکێکی ئەو عەشیرەتەش، تەنیا خزمە نزیکەکانی نەبێ، دان بەو دەسەڵاتەیدا دەنێن. ئەو لەگەڵ براکانی نزیکەی (٣٠) گوندیان هەیە، لە کاتێکدا زۆربەی خەڵکەکەی دیکە بە سەرۆکی خۆیانی دادەنێن. ئەو لەگەڵ خزمەکانی دیکەی بەناوی بنەماڵەی (بایز) ناسراون لەناو دزەییان کە بەناوی باوکی کراوە. دەتوانم ناوی حەوت هەشتێکیان بێنم کە لەڕوی جەستەو ڕەفتارەوە زۆر لە سەروی ڕکابەرەکانیانن لەناو ئەو عەشیرەتە، جگە لە (خدر)ی کوڕی ئەحمەد پاشا نەبێ.

با ئێستا بێینە سەر ئەو (ئەحمەد پاشا)یە، ئەو زۆر قسە دەکاو، جەستەیەکی چکۆڵەو پتەوی هەیە، تەمەنی (٦٠) ساڵ بەسەرەوەیە، لە خوێندندا شانسی وەك هەڵسوکەوتی، کەمە، ئەو پتر لە بازرگانێك دەچێ کە مەبەستی قازانج بێ نەك سەرۆك هۆز، بەناوی (کافرۆش)ەوە ناسرابو، تاکە ئامانجی کۆکردنەوەی سامان بو، ئەو نەیدەتوانی زمانی خۆی بگرێ و ئاقڵیش نەبو، مرۆڤ ئارەزو ناکا نە دۆستی بێ و نە دوژمن. شێوازی ژیانی سەیروسەمەرەیە. لە سەرەتاکانی تەمەنی نەدار بوە پوشێکی نەبوە، لە قاوەخانەکانی هەولێر و لەڕێی یاری (نەرد) بژێوی ژیانی پەیدا دەکرد. هەر کە لەو کارەش بێزاربوو دو هێستری دزی و بەرەو کەندێناوە هەڵات، دەیویست نیشتەجێبێ، دەستی بە دروستکردنی گوندێك کردو ژمارەیەك کشتیاری ڕاکێشان، بەڵام بەروبومی ساڵی یەکەم نەهاتبو. داوایەکی پێشکەشی حکومەت کردو داوای قەرزی بۆ خۆیی و دەوروبەرەکەی کرد تا بتوانن بۆ بەهاری

داهاتوو تۆو بکرێن. هەر هێندەی برە پارەیەکی زۆری دەستکەوت ئیدی بۆخۆی گلدایەوە، کە دەبوایە بەسەر کشتیارەکانیدا دابەشی بکا. ئیدی پارەی دەدانێ بەسوێکی زۆر. ئیدی دوای ئەوە ناوو دەنگی بلاوبۆوەو حالو بالی باشبو لەگەڵ کورانی عەشیرەتەکەی نزیکەی هەژدە گوندیان هەبوو وەك دەڵێن (٢٠٠٠٠) جونەیهی زێری لە ماڵەوەدا هەلگرتوە ئەمە جگە لە برێکی زۆری پارە کە بە سو بە خەڵکیداوە. بەو دەوڵەمەندیەی هەمیشە دەیتوانی پشتیوانی حکومەتی تورکی بکرێ. ئەمەش لە زەوی داگیرکردن و ململانێی لەگەڵ (برایماغا) کە ئەوەی دواییان پیاوێکی هەژارە، چونکە ئەو بەزۆر پارە لە جوتیارەکانی وەرناگرێ برێکی کەم نەبێ و پارەش لەڕێ ی میوانداری کردنەوە خەرج دەکا.

لەبەر ئەوە (ئەحمەد پاشا) هەر هێندەی بینی کە دادپەروەری بەریتانیا ناکرێ ئیدی بە پەلە (وەك شەبەنگێ کە لە وەنەوزێکدابێ) لایەنگیری خۆی بۆ حکومەت دەرخست، کە ڕەنگە ئەو دادپەروەریەش بزوێنەری یەکەمی پشێویەکانی ئێستا بێ.

حاجی پیرداود جۆرێکی جیاوازە. ئەو پیاوێکی وردیلەی ڕوکار جوانە، پەنجاو پێنج ساڵ دەبێ، دو چاوی ڕەشی تیژو سمێڵێکی درێژ، دەنگێکی خۆش و نەرمی هەیە– گوێم لەهیچ کەسێك نەبوە وەك ئەو شیعری فارسی بخوێنێ، بەلام دڵی شەیتانی هەیە. خۆی و ئەندامانی خانەوادەکەی — هەمویان موسورن و جەستەیان لەخوار مامناوەندیەو زۆربەیان نەخۆشن– لە هەولێر بە (نەفرەتلێکراو ناسراون (ملعون)(٧) ئەمەش وشەیەکە کە ئەگەر بەڕاستی تەرجەمەی بکەی مانای پیاوی خراپ دەگەیەنێ. (ئاوا :وەرگێڕ).

ئەو خوێندەوارێکی باشەو پیلانگێڕێکی لێهاتوە، ئەو پەنجەی لەگەڵ (ئەحمەد ئاغا) لێکدابو بەرامبەر حکومەت، ئەقڵی ڕاوێژکەری پێشکەش بە بزوتنەوەکە کرد، وەکچۆن هاوبەشەکەی پارەو ماڵی بۆ دابینکردن. ئەو پیاوێکە بەهەوەسی خۆی دەکاو فێڵبازێکە جڵەو ناکرێ. بەلام هەمیشە لەخواترسیەکی بێوێنە نیشاندەدا، چوەتە حەج، و دەڵێن لەبەر ئەوە چوە چونکە ئەودەم بارودۆخی ولاتەکەی کەشەکەی بۆ ئەو گەرم بو، خۆی و خەڵکانی عەشیرەتەکەی نزیکەی (١٨) گوندیان هەیە.

چوارەمی دەستەی سەرۆكەكان (ڕەسول ئاغا)یەو پێشتر ناسیمان و ئەگەر بەوانیدیكەی بەراورد بكەین لەحاڵی نەبو دایە!

ئەوانە ئەو كەسانە بون كە لە دیوەخانی (مێرخوان) دا بینیمن. ئێستا لەترسان یەكیان گرتوە، هەریەك لەوانیش چاوێری ئەویدی دەكا نەكا هەوڵدا بەتەنیا بێتە هەولێر و بەر لە هاوڕێكانی و سودێكی پێ ببڕێ. نەمدەتوانی هیچ مەرجێكیان بخەمە بەردەست، چونكە من هێشتا ئەركەكانی پۆستەكەم لە ڕائد مۆری وەرنەگرتبو، ئەوان وایان بەخەیاڵدا دەهات كە چەندین جۆر ئازار چاوەڕێیانە. پێشنیاری برایماغام كرد كە بە ئۆتۆمبێلی من لەگەڵم بێ، بەلآم ئەوانی دیكە نەیانهێشت. دواتر و دوای گفتوگۆیەكی زۆر هەموان ڕازیبون كە ڕۆژی دواتر بێنە ماڵی (مەلا فەندی) لە باداوە كە تەواو لە دەرەوەی هەولێر بو، ئەمەش بۆ وتو وێژی مەرجەكان لەگەڵ ڕائید مۆری.

سەرانی دزەیی بەڵێنەكەیان بەجێنەهێناو، ڕۆژی دواتر ئامادە نەبون، ئازایەتیش بە هانایانەوە نەهات تا لە باداوە كۆببنەوە، تەنیا دوای ڕۆیشتنی ڕائید مۆری نەبێ. چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوە، بەلآم لە مەبەستی من بەگومان بون، بەشێوەیەك كە لەژێر تاریكی شەودا دەكشانەوە یەكێك لە گوندەكانیان، بەهۆی مەلافەندی و ئەحمەدەفەندی سەرۆكی شارەوانی مەرجەكانی خۆم گەیاندە ئەو سەرۆكانە كە بریتی بو لە سزایەك بڕەكەی (٢٠٠) تفەنگ و ١٥٠٠ لیرەی عوسمانی بو، لەماوەی شەش مانگ دەبوایە بیدەن. هەوڵمدا برایماغا لەوانیدی دابڕم و ڕێزێكی لە هەولێردا هەبێ، بەلآم ئەحمەدەفەندی كە لەجیاتی من قسەی دەكرد نەیتوانی بەتەنیا قسەی لەگەڵدا بكا. سێ چوار ڕۆژ تێپەڕی و تیایاندا دانوستانێكی زۆر و بێبەرهەم كران. كارەكان ئەودەم بە هاتوچۆ دەكران، هەر كە ڕۆژی (٢٠)ی مانگیش بەیانیدا، سەرۆكەكانی دزەیی باداوەیان بەجێهێشت و چونەوە گوندەكانی خۆیان.

ڕەشبینی لە دەرونما هیوای بەزاند، لە داواكردنی ڕێو شوێنێكی سەربازی بترازێ چارەیەكی دی نەما. بەلآم كارەكان شتی ناكاویان هەیە، لەكاتێكدا لەسەریان دانیشتبوم، لەهەمان ئێوارەداو دوای ئەوەی كە خۆر بەرەو ئاوابون ملی دەنا، سەرم سوڕما كە سوارێكم بینی بەشكۆو مەزنیەوە بەرەو ماڵەكەم دەهات،

هەرچەندە ماندوو بێهێزبو. بەر لەوەی بگاتە جێ، ئەحمەدەفەندی بەدڵخۆشیەوە هات و وتی: ئەوە برایماغایە. ئەو پیرە پیاوێکی زۆر تورەو توند بو بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت تا گەیشتە سەربان بەلأم من دڵخۆشیم سەری کردو لەخۆشیاندا گریام.

بەوجۆرە قەیرانەکە بەسەلامەتی تێپەڕی، ئیدی وەك میرێك ڕوبەڕوی بومەوە نەك وەك مرۆڤێکی چروك. بەشداری چاو قاوەی لەگەڵدا کردم، هەر خێرا بوینە دو هاوڕێی گیانی بەگیانی، بەر لەوەی شارەکە جێبێڵێ شەوەکەی لەماڵێك بردەسەر کە لەوێ هەیبو، بەڵێنی دا کە خەبەر بۆ سەرۆکەکانی دیکە بنێرێ تا بەیانی بێنە هەولێر.

هەرچەندە ئەحمەدەفەندی لە باداوە نەیتوانیبو بەتەنیا قسە لەگەڵ برایماغا بکا، بەلأم شتێکی بەیەکێك لەدەستو پێوەندەکانی گەیاندبو، کە ئێمە هەر ئەو ڕۆژە سواربوین و گەڕاینەوە، ئەو پیرە سەرۆکە ئەنجەتی سەراوێ دەگرێ و کابراش نامەکەی ئێمەی پێدەگەیەنێ، ئەو یەکەم هەل دەقۆزێتەوە و پارچە کاغەزەکە بە هاوڕێکانی نیشاندەداو دواتر دەگەڕێتەوە هەولێر.

ڕۆژی دواتر نزیك نانی نیوەڕۆ، ڕەسولأغا گەیشت کە ئارەقی دەردەدا، دوای ئەویش بەچەند سەعاتێك ئەحمەد پاشاو حاجی پیرداود هاتن.

تفەنگەکان لەکاتی پێویستدا هاتن و پارەکەش هەمو وەرگیرا، تەنیا (٥٠) لیرە نەبێ کە مشتومڕێکی زۆری لەسەر کرا، چونکە هەریەك لە برایماغاو ڕەسولأغا سوربون لەسەر ئەوەی ئەحمەد پاشا دەبێ بیدا، لەکاتێکدا کە ئەحمەد پاشاو حاجی پیرداود دەیانگوت ئەوە پشکی ڕەسولأغایە، لە دواییدا ئەحمەد پاشا پارەکەی دا، بەلأم ئەو دو دەستەیە لەماوەی ئەو ڕۆژانەی لە هەولێردا بەسەرم برد هەر ناحەزی یەکتر بون.

هەر کە سەرۆکە دزەییەکان ئەو سزایەی لەسەریان بو دایان ئیدی تا لەتوانا دایە دەبوایە سەیری سکالأکانی ئەوان بکرێ، ئەمەش بە بەخشینی پۆست بۆ برایماغاو ڕەسولأغاو حاجی پیرداودو لە هەرسێ ناحیەکە بەحاکم دابنرێن لە ناوچەی دزەییاتی. هەردو سەرۆکەکەی یەکەم ڕازیبون، بەلأم حاجی پیرداود بە لەخۆباییبونەوە ڕەتی کردەوە، لەکاتێکدا کە ڕازی نەبونی ئەحمەد پاشا بەهیچ

کارێك شتێکی ئاشکرابو، بۆیە برایەکەی دیکەی برایماغا، واتە ڕەحماناغام لـەجێی ئەو دانـا. بـۆ هـەمو عەشـیرەتەکەش برایماغـا بـە شـێوەیەکی فـەرمی بـە سـەرۆك دانیپیانرا. بەو جۆرە هەمو پۆستەکان کەوتنە دەسـت لایـەنی برایماغـا، لـەو کاتـە بەدواوە، بەردەوام یارمەتیم دەدان، لـە بەرامبەریـشدا باشـترین پاداشـتم وەرگـرت چونکە ئەو یارمەتیە لە کاتێکدا کە قەیران لە هەولێر دروستبو، دەربازی کردم.

(جەمیل ئاغا) سەرۆك هۆزی گەردی، لـە ڕوبەڕوبونـەوەی دزەییـەکان بەرامبـەر حکومەت، هاوسۆزی نەکردن. بۆیـە لەیەکـەم هـەلی بـۆم ڕێککـەوت سـەردانم کـردو سوپاسی ئەو هاوسۆزیەییم کرد. ئەو لە گوندی بەحرکە دادەنیـشێ کـە دەکەوێتـە نزیك چـۆمی بەسـتۆڕە، سـنوری ناوچـەی بـاکوری ڕۆژهـەلات. جـەمیلاغا سـەر بـە خراپترین جۆری کوردەکانە (ئاوا: وەرگێڕ). ئەو تـەماعکارو بـەفیزو لوتبـەرزە زۆر شەیدای ڕوکارە، بیر لە شتێك ناکاتەوە ئەگـەر سـودێکی بـۆوی لەپـشتەوە نـەبێ، ساڵان چرچ و لۆچیان لەسەر ڕوی دروستنەکردوە، ئەو جەسـتەیەکی ڕێکـی هەیـە. پەرچەمی بۆ خوارەوەیە. دو چاوی ڕەشی هەن کە هەردەم دەیـانگێڕێ، دەمێکـی هەیە کە هەردەم بێزاری دەردەبڕێ و خیانەت لە خاوەنەکەشی دەکا. سـەرەتا بـە قسە شیرینەکانی و پەیمانە ماستاوچیەکانی خەڵەتانـدمی. بـەلام دوایـی زانـیم کـە کوڕی چینێکە مادام لەوە دڵنیان کە سود و قازانجێکیان دەستگیر دەبێ، خزمـەتم دەکـەن. دیوەخـانێکی جـوانی هـەبو، چـەند کورسـیەکی بەقەدیفـە داپۆشـراوی لێـدانابو، کـە باشـترین دارتاشـی هـەولێر دروسـتی کردبـو. خـواردنێکی نایـاب و ناوازەی پێشکەش کردم، دواتـر پیرێکـی دلارا کـە ڕیـشێکی سـپی هـەبو، هەولێـدا بەهەندێ گۆرانی فۆلکلۆری باوو بەربلاو گوێچکەمان چاخ بداتەوە. لـەو ئێوارەیـەدا باسی ئەو کەسانەمان کرد کە دەیانویست لەناوچەی ڕەواندوز پـشێوی بنێنـەوە. جەمیلاغا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتـی (ئـاه– ئەوانـە لـە هـیچ و پوچـە سەرچـڵی کەرەکانن، ئەگەر کارەکە بۆمن لێگەڕێی بەیانی بە دوسەد سـوارەوە دەچـم و بـەر لـەوەی چـاو بتروکێنـی کاریـان تـەواو دەکـەم) لـە ڕاستیـشدا عەشـیرەتەکەی نەیدەتوانی لە پەنجا سوار زیاتر بەچەکەوە ئامادە بکا، ئەگەر بـە ڕواڵـەت بـاوەڕم بە قسەکانی بکردایە، ئامادەبو هەزارو یەك عوزر بهێنێتەوە.

هەر هێندەی کێشەی دزەییەکانم یەکلاکردەوە، ئیدی هەمو سەرنجی خۆم خستە سەر مەسەلەکانی داهات، چونکە مەسەلەکان لەسەر خەملاندنی گەنم بەشێوەیەکی ترسناك تێکچڕژابون. داهاتەکان زۆربون، بەڵام ڕون و ئاشکرا دیاربو کە خەملێنەران، حسێبە تایبەتیەکەی خۆیان تۆمار نەکردبو، بەڵکو ئەو شتانەیان تۆمار کردبو کە ئاغاکان پێیانوتبون، یان ئەو شتانەیان بەرامبەر بەرتیلێك کە پێیاندرابو تۆمار کردبو. بۆیە لەم ڕۆژانەی دواییدا لەگەڵ خواجە سێبیێ ی عەنکاوەیی و (١٠) هەندێ لە فەرمانبەرانی داهات گەشتێکم کرد بۆ وردبونەوە لەو کارانەی ئەنجامدراون، سەردانی نزیکەی (٣٠) گوندی ناحیەی قوشتەپەم کرد، گەرماش لە ئەوپەڕی تینی دابو، لە سەعات پێنجەوە تا پانزەی نیوەڕۆ کارماندەکردو دواتر لە سەعات سێ تا حەوتی ئێوارە. لەو دەشتە وشکەو لەو کەش و هەوایەی باکور، لە گەرمترین ڕۆژەکانی ساڵ ئەستەمە کەسێك لەمانای سواری حاڵیبێ، خۆر لەو بەرزاییەوە تیرە گەرم و سەختەکانی خۆی دەهاوێشت و ڕوی زەویە ڕوتەکەش بەهەمان توندی دەیدایەوە. هەمو شتێك لە مژێکی کە ڕەملی دەکرد نقوم ببو، هەندێ گەشتیارت دەبینی کە بەو دەشتەدا تێدەپەڕین و دەمامکی خۆیاندابوو خۆیان پێچابۆوە وەك ئەوەی بەگێژەنێکی بەفر بارینداتێپەڕن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەر چەندی گەرما بەرزتر بێ خەڵکی ئەو وڵاتە جلی زیاتر لەبەردەکەن، ئەوان هەست بە مەترسی کەوتنە بەر هەوای گەرم دەکەن، خەملاندن بە هیچ شێوەیەك کارێکی ئاسان نیە قرشەکە لەسەر خەرمان کۆ دەکرایەوە، دەبێ مرۆڤ لە دەوری بسوڕێ و بەوردی تێبڕوانێ، مەبەستم ئەوەیە حاڵیبێ لەوەی کە پەستراوەتەوە یان نا. دەبێ شتێك گوڵ لەدەستی بگرێ تا ڕێژەی دان و کایەکەی بزانێ، دواتریش دەبێ جۆر و کێشەکەی بزانێ. هەر هێندەی ئەوانەی کرد ئیدی کێشی گشتی دانەوێڵەی بەرهەم هاتوی هەر جۆخینێك دوای جەنجەرو کوتانی دەکا. پسپۆڕی وەك خواجە سێبیێ بەشێوەیەکی ئاسایی دەگەنە ڕێژەیەك کە بڕەکەی (١٠٪)ی هەمو بەرهەمەکەیە. کەچی ئەوانەی پیشەیان نیە، هەرچەندە بەهۆی شارەزاییەکی کەمەوە، دەتوانن نۆ جۆخین بەوردی بخەملێنن، بەڵام لە دەیەمدا هەڵەیەکی گەورە دەکەن.

لە هەولێردا ڕۆژەکانی هاتی تێدەپەڕین و بانگی یەکتریان دەکرد. کارەکان زۆربون، لەوە زۆرتر بو کە بەتەنیا بتوانم بیانکەم، هەمو ڕۆژێك نزیکەی (٣٠) ئەرزو حاڵم پێدەگەیشت، پەیوەندی بەهەمو کارێکەوە هەبو کە بەخەیاڵی مرۆڤدا بێت. دەمتوانی زۆربەیان حەواڵەی لای فەرمانبەرە ناوخۆییەکان بکەم، ڕاهاتبوم کە بەیانیان جارێك دەچومە بەر هەیوانی دەرەوەی نوسینگەکەم، کە خاوەن سکاڵاکان لەوێدا چاوەڕێیان دەکرد. لەوێدا ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵدا دەکردن، بۆیە هەر کەسێکی بیویستایە من ببینێ دەیتوانی بمبینێ. ئەگەر وانەبوایە زۆربەی خاوەن ئەرزو حاڵەکان لەلایەن فەرمانبەرە گەندەڵەکانەوە پشتگوێ دەخران. ململانێکانی زەوی و کارەکانی سزادان بە تایبەت کاری من بون و زۆربەی کاتیان دەبردم. وەکچۆن دو یان سێ سەرۆك لە دەرەوەی هەولێر دەهاتن و هەمو بەیانیەك چاویان بەمن دەکەوت و ئەمەش کاتێکی زۆری دەبرد. ئەمەش جگە لەو پەیوەندیکردنە ئاساییانەی کە دەبوایە سەیر بکرێن و لەگەڵ ئەو مەسەلە ڕۆتینیانەی پەیوەندیان بەداهات و شارەوانی و نەخۆشخانەو پەروەردەو...تاد. هەبوو، هەمیشە چەند ڕۆژێکیشم بۆ گەڕان و سوڕان تەرخان دەکرد، هێندەی ئەو ڕۆژانەی کە لە نوسینگەکەم بەسەرم دەبرد. لە کۆتایی مانگی ئابدا (حاکمی سیاسی لە موسڵ) یارمەتیدەرێکی بۆ ڕەوانە کردم کە (مولازم کرتن)بوو لە تشرینی یەکەم (نەقیب برادشۆ) کە لە مۆڵەتەکەی گەڕابۆوە شوێنەکەی ئەوی گرتەوە، ئەو پۆستە لە پێشدا هی (ڕائید مۆری)بو وەك یارمەتیدەر. کە دو ساڵ لەگەڵما مایەوەو من تا ڕادەیەکی زۆر قەرزاری ئەوم، چونکە ڕوحێکی ڕێکخەر و حەوسەڵەیەکی لەبن نەهاتوی هەبو.

بۆ پاراستنی ڕێکوپێکی و بەرز ڕاگرتنی یاسا کۆمەڵێك لە پیاوانی پۆلیس یارمەتیان دەدام، کە ژمارەیان (٣٥)کەس دەبوو لەژێر فەرماندەیی (میستەر ڕۆپێنز) بون، کە ئەو لەپیاوانی هەواڵگریی سەربازیی و زیرەك و لێهاتوبو، لەگەڵ (١٥٠) ژاندارمە کە عەریف (کینارد) ڕاهێنانی بۆ کردبون، کە بەخێرایی زامەکەی چاکببۆوەو، ئەوان ئەفسەرێکی ناوخۆ سەرپەرشتی دەکردن و لەتشرینی یەکەم بەدواوە عارەبێکی سوری سەرپەرشتی دەکردن کە ناوی (سەید عەلی ئەفەندی)بو. ئەو گەنجێکی زیرەك و چالاك بو، تەمەنی (٢٦) ساڵ و سروشتی لە بزوزیدا وەك

جیوە بو. زۆر گلەیی دەکرد، بەڵام لەوانەبو کە بە چالاکیەکی بێوێنە کار دەکەن و، ئازایەتی شێری هەبو زۆرم خۆشدەویست و، ئەویش وەك بزانم لە هەرە دڵسۆزەکانبو بۆمن. لە بارودۆخێکدا ئەگەر ئەو نەباو لەبەر ئازایەتی و چالاکی ئەو نەبا من دەفەوتام. عەریف کیناردیش لە ڕاهێنانی ژاندارمدا زۆر کاری چاکی کردن، هەرچەندە کە بەردەوام توشی تالێهاتن دەبو، کە لە پایزی (١٩٢٠)دا هەولێرم بەجێهێشت ئەو لەگەڵ مستەر ڕۆبنز لەوێبون.

دوای نیوەڕۆی هەردو ڕۆژی هەینی و یەکشەم پشو بو بۆمن، ڕۆژی یەکەمیان پیاو ماقوڵانی شار سەردانیان دەکردم و بەخواردنەوەی چاو قاوە لە مەسەلە گرنگەکان دەکۆڵرایەوە. من ئەمەم ناونابو (پەرلەمانەکەم) چونکە هەلی ڕاوێژی ڕای گشتیم تیایا هەبو دەربارەی مەسەلەکانی حوکم. ئەوانەی بەردەوام دەهاتن بریتیبون لە مەلافەندی و سەید عەبدوڵلا پاشاو موفتی و عەلی پاشاو حاجی ڕەشیداغاو ئەوانی دیکە بون کە پلەو پایەیان لەوانە کەمتربو. لەهەموان بەڕێزتر مەلافەندی بو، کە زۆر جار لە گوندەکەی خۆی لە باداوە سەردانم دەکرد. کە ئەو گوندە شانۆی ئەو دانوستانەبو لەگەڵ سەرۆکە دزەییەکاندا کرا. باداوە شوێنێکی جوانە، بێستان و کەپری مێو دەوریانداوە. لەلای ڕۆژهەڵاتیشیدا حەوزی ئاوێکی لێیە کە گوڵی وەرزیی گەشاوەی لێچێندراوە. لە نزیکیەوە بۆنی گوڵاندێ و بینایەکی دو نهۆمی کە لە هەر یەکێکیان ژورێکی فراوانی ڕو لە باکور هەبوو لە خواریشەوە ئاوپرژێنێك (نافورە)، ژوری سەرەوە بە دارێکی کە بەنەخشێکی جوان هەڵکوڵرابو لەهەوای دەرەوە جیا دەبۆوە. ژووری ناوەوە زۆربوو بە بەڕەو ڕایەخی جوان فەرش کرابون، لە هەندێکیاندا کورسی و داری نەخش تێچەنراوی (تطعیم) نایابی لێبو. شێوازی بینایەکە بەگشتی خاوەن نەخشێکی نایاب بو، بنمیچەکەی بەزۆر جۆر بۆیەی کراوە بۆیە کرابو، هەندێ پارچە مایکاش لێرەو لەوێ هەبون. مەلافەندی ڕۆژی لە مزگەوتی گەورەی هەولێر بەسەر دەبا، ئێوارانیش دەچێتەوە ماڵەکەی، ناوی ڕاستەقینەی (ئەبوبەکر)ە بەڵام هەمیشە بە مەلافەندی یان مەلای گچکە ناسراوە. باڵای کورتەو شێوەیەکی هەڵۆیی هەیەو کاری لە خواترسانە. هەرگیز دەستی ناسکی وەك دەستی ئەوم لە ژیانمدا نەدیوە، ئەو هەمیشە جبەیەکی شۆڕی ڕەنگ خۆڵەمێشی لەبەر دەکا کە دەگاتە سەر پێیەکانی،

تەربوشێکیش لەسەر دەنێ کە بە قوماشێکی موسڵی (موسلین)ی شینی کاڵ دەورە دراوە. ئەو لە هەموو کوردستاندا ڕێزی هەیەو خەڵکەکەی بە قسەکانی دڵخۆشدەبن و دەگەشێنەوە وەك گەشانەوە بەبۆنی گوڵان، ئەمەش هەموی لەبەر زانست و لەخوا ترسی ئەو. باپیرانی ئەویش ڕێزو پایەیەکی لەو جۆرەیان هەبوە، دەڵێن کە کەسێك لە خانەوادەی ئەو هەرگیز شکاتی لەکەسێك نەکردوە، لەگەڵ ئەوەی کە خانەوادەکەیان زۆر دەوڵەمەندن، کاری ئەوقافی مزگەوتی گەورە لەدەست مەلافەندیدایە. ئەو هەمیشە ڕۆژانی هەینی خوتبە بۆ نوێژکەران دەدا. بەپێچەوانەی هەمو ئەندامانی چینەکەی، ئەو پێشکەوتنخوازە، ئەو بڵاوکراوانەی کە لەمیسرو تورکیاوە دێن دەیانخوێنێتەوە، قسەکردنەکانی زیرەکانەن و بابەتە سیاسی و زانستیەکان لەخۆدەگرێ. ڕۆژێکیان دەربارەی باری سەرنجی خۆی لەسەر ئەو بارودۆخەی لە میزۆپۆتامیا هەیە پرسیارم لێکرد، لە وەڵامدا وتی: هەمو کەسێك شەیدای ئەوەیە نیشتیمانی (دایك)ی ئازاد بێ، بەڵام ئێمە ئێستا، بەهەر حاڵ، ئێرەیی بەرامبەر یەکتر بەخراپترین شێوە لێکی کردوین، کەسێکیش نیە شایەنی حوکمڕانی بێ. دەمانەوێ ئێوە کاروبارەکانمان بەڕێوە ببەن تا ئاشتی و ئاسایشمان بۆ دەگەڕێتەوەو دەتوانین حوکمی خۆمان بکەین. بەرامبەر بەو سیاسەتەش بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی مایەوە هەرچەندە کە ئەو لە حکومەت و حکومەتیش لە ئەو نزیك بو کەچی هەمو پۆستێکی حکومی ڕەتکردەوەو هەمیشەش بە هەمو توانایەوە یارمەتی حکومەتی دەدا. ئەو لە هەمو کەس زیاتر سەرۆکی ڕای گشتی بو لە هەولێر. ئەحمەدەفەندی ئامۆزاشی، کە زۆر پشتیوانی دەکرد، هەمیشە بە ئامۆژگاری ئەوەوە کاری دەکرد. هەمو ئەندامەکانی بنەماڵەی مەلافەندی دوچاری سیل بون. بۆیە ژنەکەی و سێ کچەکەی مردبون و تەنیا کوڕە بچوکەکەی کە تەمەنی (١٥) ساڵ دەبو مابو.

لە نێوان پیاو ماقوڵانی دیکە بەلای عەلی پاشاو حاجی ڕەسوڵاغادا تێپەڕین...سەید عەبدوڵلا پاشاش (نەقیب) یان (سەردەستەی سەیدان)ە لە شارەکە. ئەو شێخێکی خاوەن پایەو بەڕێزەو لە دەرەوە دەبینرێ بە سواری ئێسترێکی سوری نایابەوە.... ئەو دەوڵەمەندە، بەڵام سەروەت و سامانی زۆر خۆشدەوێ. وە لەبەر ئەوەی زۆر سوننەتی نیە ئیدی لایەنی ئەو سیاسەتە دەگرێ

کـە جانتـای سـامانەکەی بـێ کـەم و زیـاد بـۆ بپـارێزێ (ئـاوا: وەرگێـڕ) ئـەو خوێندەواریـەکی باشـی هەیـەو سـەردانی میـسر و سـوریاو ئەسـتانبۆلی کـردوە. (موفتیش) بـرای (سـەرۆکی شـارەوانی)، پیرەمێردێکـە زۆر قـسان دەکـاو، ڕۆژانـە دەهات تا فارسی بەیەکەوە بخوێنینەوە. ئەوانەی کە تێکەڵی دەبـن مرۆڤێکـی زۆر ڕوخۆشی تیا دەبینن کە گاڵتەی پێناکرێ.

لە هەفتەی یەکەمی مانگی ئەیلولدا بەبۆنەی جەژنی قوربانەوە ئاهەنگ گێڕدرا، ئەو جەژنە یەکێك لە دو جەژنە گەورەکـەی موسـڵمانانە، ئێمـە بـە چـوار ڕۆژ پـشو ئاهەنگمان بۆ گرت. شار جوانترین شێوەی بەخۆوەگرت. هەریەك لـە خـەڵکی شـار جوانترین و نایابترین جلێکی هەیانبو لەبـەریان کـرد. بـە تایبـەت منـداڵان، بـەجلی ئاوریشمی جۆراوجۆر و ڕەنگاو ڕەنـگ و بـەزێڕ ڕازاوە دەرکـەوتن. زۆر بـە (بـازاڕی لادێ)ی ئینگلتەرا دەچێ، لەنزیك ڕێگای قەڵا جۆلانەو چەرخ و فەلەك دانـران، هـەر یـەکیان بـە (عانەیـەك) سـەردەکەوتی، لـە بەرامبەریـشیدا (کوشـك) دانرابـون کـە شیرینی و یاریان تێدا دەفرۆشرا، دیمەنەکە بە گشتی خۆشی بەخش بو.

لە سەعات هەشت و نیوی بەیانی یەکەم ڕۆژی جەژن سەردانی سەرام کـرد، بـە تەقانـدنی تۆپێـك هـاتنی مـن ڕاگەیـەنرا دیـتم (سـەید عـەلی) لەگـەڵ (پاسـەوانی شـەرەف) لـە ژاندارمـەکان لای دەرگاکـەی منـە. هـەر هێنـدەی لـە نوسـینگەکەم دانیشتم، ئیدی سەردانیکەران هاتن. دەستەی یەکەم پیاو مـاقوڵان بـون، گـەورەو بچوکیان و، سەر دەستەی بازرگانەکان، ژمارەی ئەوانەش دەگەیـشتە (٣٠)کـەس، تەوقـەم لەگەڵـدا کـردن. هەریـەك لـەوان شـیرینی و جگەرەیـەك و پیاڵـە چایەك و فنجانە قاوەیەکیان نۆشکرد.

ئەودەم پیرۆزبایی بۆنەکەم لە خەڵکەکـە دەکـردو لـە بابـەتی ئاسـایی دەدوام. دوای ئەوان فەرمانبەرانی حکومەت هاتن و هەمان شت دوبارە بوەوە. ئـەوەی کـە لە دەرونمدا جێی خۆی کـردەوە ئـەو ڕیـزە دەسـتە بـون، کـە هەنـدێکیان وشـك و پێکداچـو بـون و هەنـدێکیان لاواز و شـێدار، دەسـتەی سـێیەم و کۆتـاییش لـە جولەکەو گاورەکان پێکهاتبون.

ئەرکی سەرشانم بو کە ڕۆژی دواتر سەردانی پیاو ماقوڵانی شار بکەمەوە. نزیك (١٠) تا (١١)ماڵ هەبون کە دەبوایە بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـەردانیان بکـەم. لـە هـەر

یەكیاندا چارەكە سەعاتێك مامەوە. هەر كە دەگەیشتم فنجانێك قاوەی شیرینم پێشكەش دەكرا، دواتر سینیەك شیرینی، دواتر شەربەت (خۆشاو) و پیاڵەیەك چاو لە دوادواش فنجانێك قاوەی تاڵ. بەجێگەیاندنی ئەو هەمو شتەش كاتێكی دەویست و لە چەند سەعاتێكدا دە جار توشی ئەو مامەڵە لەگەڵ كردنەدا بوم.

لە سەرەتاكانی ئەیلولدا (٣)ڕۆژ مۆڵەتم پێدراو سەردانی ناوچەی خۆشناوەتیم كرد تا جارێكی دیكە هەوای پاكی چیاكان هەڵمژم، بە ئۆتۆمبێل تاكو بەستۆرە چوم كە لەوێ ئەسپەكەم چاوەڕێم بو. هەر هێندەی لە ئاوەكە پەڕیمەوە، ئیدی لە ناوچەی مستەفاغا بوم. رەسولآغا پێشوازی كردم و، بردمیە گوندی (سێوەكە)و چاو قاوەی پێشكەش كردم.

دواتر گەشتەكەمان دەستپێكردەوە بەلای كەلاوەی قەلآیەك و گوندێكدا تێپەڕین، دواتریش بێستانێكی هەنجیری سەوز كە لە دامێنی بو. دواتر بە چیایەكی بڵنددا هەڵگەڕاین، دەركەوت كە لوتكەكەی بانێك بو كە بە دار بەڕو داپۆشرابو، لەژێر یەكێك لە دارەكاندا كوپەیەكی پڕ ئاومان بینی كە بەخشندەیی مستەفاغا بو، بۆ ئەوەی ڕێبواران كە بێرە دادێن ئاوی لێبخۆنەوە. لێرەوە دیمەنی جوان دەبینران، لەسەر زەوی و گردۆڵكەكانەوە. لەپڕ دیمەنی (كۆڕێ) دەركەوت كە دەتگوت هێلانەیەكەو لە دۆڵێكی بچوكدا دروستكراوە، لەوێ مستەفاغامان بینی لەژێر سێبەری درەختێكی گەورەی تودا جێ ی بۆ ڕاخستم لەنزیك جۆگە ئاوێك كە خوڕەی دەهات و لێوارەكانی بەگوڵ ڕازابۆوە، سەماوەر گیزەی دەهات و قاپی میوە لەپێشم دانرا. كۆڕێ گوندێكە دەكەوێتە سەر گردێكی كۆتایی دۆڵێكی درێژو باریك. لە دامێنی گردەكەدا جۆگە ئاوێكی گەورە هەیە لە هەردو بەریدا بێستان هەیەو هەنجیر و هەنارو میوەی دیكە دەدەن، درەختی چنارو سورە چناری بەرزو جوانی لێیە، ئەوەندەی لە كوردستان بوم مەگەر دەگمەن ئەگەرنا گوندێكم نەدیت لە كۆڕێ جوانتر بێ. ئەو بەهەشتێكی هەمیشەییە بۆ ئەو ڕێبوارەی یەكسەر لە دەشتە وشكە ڕوتەكانی هەولێرەوە بێ. مستەفاغا گرنگیەكی یەكجار زۆری بە پێداویستیەكانی من دا. زۆر بە زەحمەت توانیم ڕازیكەم كە ڕێگام بدا گەشتەكەم بەرەو شەقلاوە بكەم.

دوای نیو سەعات ڕۆیشتن بەسواری گەیشتینە گوندەکەی (خورشید بەگ) کە سەرۆکێکی پەناهەندە بو و لەبەشی رابردو باسم کرد، چایەکی بەرەنگی لێناو پێشکەشی کردم، ئیدی لێرەوە ڕێگاکە دیارو ئاشکرا بو...گەیشتمە شەقڵاوە. دیتم کە میرانی قادر بەگ چارداغێکی گەورەی لە گۆرەپانێکی کراوەی نێوان بێستانەکان دروستکردوەو بە مافورو بەرەو ڕایەخ و مێزی داری جوان نەخشکراو ڕازاندویەتیەوە. ئا لێرەدا بە شکۆوە دانیشتبوو، ژمارەیەکی زۆری دەستوپێوەندی لە دەورە بو، ئێستا ئەو تا ڕادەیەکی زۆر لەدەستی نوسەرەکەیدا بو کە ناوی ئەحمەد میدحەت ئەفەندی بو کە نەخوێندەواری گەورەکەی قۆستبۆوە. بە گەرمی پێشوازی کردم و میوانداریەکی چاکی کردم.

ڕۆژی دواتر کە نانم خواردو هەندێ دۆم خواردەوە بەناو بێستانەکاندا بەپێ ڕۆیشتم و بەرەو ئەو جۆگە ئاوەی کە لە قولایی دۆڵەکەدا بو. ئەوە بەڕاستی دیمەنێکی جوان بو، گەڵاکانی سەر سەرت بەرەو زەردی پایز دەچون، هەمو خەڵکی شەقڵاوە لەسەر دار گوێزەکان بون و دەیانهەژاندو گوێز دەکەوتنە خوارێ. درەختەکانی هەنجیرو کرۆسك و هەرمێ و هەنار هێشتا لەژێر باری بەرەکانیان بون.

دوای نیوەڕۆ سوربوم لەسەر برینی چیای سەفین کە بەرزیەکەی ٦٥٠٠ پێ دەبێ لەڕوی دەریاوەو، سەردانی گوندەکەی سالح بەگ کەپێیدەڵێن (خۆران). لەو گەشتەدا سێ پیاوی قادر بەگ لەگەڵمدا هاتن، ڕێگایەکی سەختمان گرتەبەر بەڵکو توشی کەڵە کێویەك بین و ڕاوی بکەین. دوای سەرکەوتنێکی ئەستەم کە چەند سەعاتێکی خایاند گەیشتینە خەرەندێکی بەردین کە کانی و ئاوێکی لێبو و بەدرەختی هەرمێ ی پڕ بەری تەرو تازە دەورە درابو. ئەودەم ڕەوە کەڵە کێویەکمان بینی، کە وێنەی تاپۆکانیان گەیشتبوە ئاسمان و لەسەر بەردەکانی سەرەوەی ئێمە وەستابون. بەڵام لە مەودای تفەنگ دوربون و منیش ماندوبوم بۆیە نەمتوانی بەدوایاندا بچم.

جێگای سەرسوڕمانە کە لە شوێنێکی ئاوادا بانێکی پان و پۆڕ ببینم کە گیای وشك و پاشماوەی سمڵ و گوڵی دیکەی وشکی پاشماوەی بەهارێکی پڕ لە گوڵ و گژوگیا دایپۆشیوە. بەڕاستی دیمەنێکی جوان بو. لەو بانە ڕا بەشی لای

خوارەوەی زێی گەورەو بەشێکی دیجلە دیاربون، دەیانگوت کە لە ڕۆژێکی هەوا پاك بێ دەتوانی کەرکوکیش ببینی، بەلای ڕۆژهەلاتیشدا دەشتی هەریر(١٢) بە گوندە زۆرەکانیەوە ڕاکشابو، وەك دەشتی بیتوێن گردەکانی ئەوێش گەورەو لەچینی سەریەك پێکهاتبون. بە لێواری دۆڵەکەدا چەند میلێك ڕۆیشتین، گەیشتینە ئەو چاڵەی کە لە هاویندا بەفر بۆ هەولێر دابیندەکا. دواتر بەرەو خوار شۆڕبوینەوە تا گەیشتینە کەپری پڕ لە مێوەو ئاوێکی کە وەك بەفر ساردبو، زۆر دڵم بەوە خۆشبو، چونکە چەند سەعاتێك بو هیچم نەخواردبۆوە. ئەحمەد بەگی کوڕی سالح بەگ لەسەر ڕێگا پێشوازی لێکردم، خەریك بو تاریکدابێ گەیشتینە خۆران. خانەخوێکەم دەستی گرتم و بردمی بۆ شوێنێك کە لە بانیژەیەك دەچو لەسەر داری ئەستور دروستکرابێ. لەوێ میوانداریەکی باشی کردم، دو شەو لە خۆران مامەوە، دواتر سالح بەگ لەگەڵم بەرەو کۆیێ هات.

ئەو ڕۆژە دەی موحەڕەم بو، دیتم کە سالح بەگ و مستەفاغا بەڕۆژون، چونکە یەکێك لە دەروێشە گەڕۆکەکان پێیگوتبون کە باشترین ڕۆژە بۆ قەرەبوکردنەوەی ڕۆژە لە دەستچوەکانی ڕەمەزان. هەر چۆنێك بێ، کە خواردن هات، هەردوکیان لایەنەکەی دیکەیان هەڵبژاردو لەگەڵ مندا دەستیان بە خواردن کرد. کاتێ لە خۆران بوم سالح بەگ چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە دەربارەی خەڵەتاندنی فەرمانبەرە تورکەکان و خۆ دزینەوە لە باج، بینیم کە چۆن گوندەکەی ئاوەدان و گەشاوەیە. لەدواییدا دیتمان ئەو پیاوە دەیەوێ هەمانشت لەگەڵ ئێمەشدا بکا. دیتنی فشە گاڵتەو دەربڕینی گەرمی لایەنگیری، لەو هۆکارانە بون کە بۆ ئەم کارە هەڵیگرتبون، هەر هێندەی بینی کە ئێمە چاوپۆشی لە تەڵەکەکانی ناکەین ئیدی بوە کەسێکی فێڵبازو مەکربازی ئەوتۆ کە چیای دەڕوخاند.

کە گەڕامەوە هەولێر، سەرقاڵی خەملاندنی بەروبومی برنج بوم، تا کۆتایی مانگ و تا ئەوکاتەی هەندێ کاروباری گرنگ ناچاریان کردم بچمە بەغدا.

◆

# بەشی یازدەهەم
# دروستکردنی لیوای (پارێزگای) هەولێر

تاکو تشرینی دوەمی ساڵی ١٩١٩ قەزای هەولێر بەشێك بو لە لیوای (پارێزگای) موسڵ، کە حاکمە سیاسیەکەی (عەقید لچمان) بو، تاکو سەرەتاکانی تشرینی یەکەم بەو حاڵە مایەوە، کاتێك کە لەو پۆستەدا (مستەر بیل)ی سەر بە هێڵی خزمەتی هیندی شوێنی ئەوی گرتەوە. ماوەیەکی زۆریش بو کە هەندێ پێشنیار خرابونە ڕو دەربارەی دروستکردنی لیوای هەولێری سەربەخۆ کە هەریەك لە قەزای کۆیە – کە ئێستا سەر بە لیوای سلێمانیە – و قەزای (ڕەواندوز) لەخۆ بگرێ. لە ڕەواندوز یارمەتیدەری حاکمی سیاسی سەربەخۆ بوو، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بەغداوە دەکرد. ئەم ڕێکخستنەش سودێکی زۆری هەبو، چونکە تاکە ڕێگایەکی کە بە کەڵکی هاتوچۆبێ بۆ ڕواندز لە هەولێرەوە (١) تێدەپەڕی، کۆیەش دەیتوانی زۆر ئاسانتر پەیوەندی بە هەولێرەوە بکا، نەك سلێمانی، کە زێی بچوك لێکی دادەبڕین.

بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژی (٢٩)ی تشرینی یەکەم چومە بەغدا تاکو ئەو پێشنیارانەی پێشتر باسکران لەگەڵ (عەقید ویلسۆن)(٢) تاوتوێ بکەم، بە هیوای ئەوەی کە دەربارەیان بگەینە بڕیارێك، کارەکە هەر چۆنێك بێ عەقید ویلسۆن ئارەزوی جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیەی نەبو، تا خۆی سەردانی مستەر بیل دەکا لە هەولێرو پێشنیارەکانی بخاتە ڕو. لە هەمان کاتیشدا هەندێ ڕوداو ڕویاندا کە بارەکەیان سەراو بن کرد.

لەو سەفەرەمدا بۆ بەغدا ئەحمەدەفەندی (سەرۆکی شارەوانی)م لەگەڵ خۆمدا برد، کە ئەو شەمەندەفەرەی لە (شەرگات)(٣)ەوە پێی ڕۆیشتین سەرنجی ڕاکێشاو چێژێکی پێبەخشی چونکە پێشتر شەمەندەفەری نەدیبو.

چوار یان پێنج ڕۆژ لە بەغدا ماینەوە.

ئێوارەی سێی مانگ، سەعاتێك یان دو سەعات بەر لەو کاتەی کە بڕیارم دابو بگەڕێمەوە، عەقید ویلسۆن بردمیە لایەك و پێی ڕاگەیاندم کە (بنکەی گشتی) هەواڵێکی پێگەیشتوە ناوەڕۆکەکەی دەڵێ: کە (مستەر بێڵ) حاکمی سیاسی موسڵ و نەقیب. کەی. سکۆت یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە قەزای ئاکرێ(٤) لە (پیرە کەپرا) لە ناوچەی زێبار کوژراون. ئەم هەواڵە خەمێکی گەورەو گران بو، بەدڵێکی شکاوو بێ سەبریەوە وەرمانگرت دوای چەند ڕۆژێکیش نەبێ هیچ وردەکاریەکمان دەربارەی ڕوداوەکە نەزانی.

ئاکرێ بنکەی ناوچەیەك بو کە زێی گەورە لە هەردولای باشورو ڕۆژ هەڵات دایدەخست، ئەو تەنیا بەو زێیە لە ڕەواندوز دادەبڕا، کە دەکەوێتە بناری چیایەك کە درێژ بوەوەی (کێوە ڕەش)ە کە بەناو دەشتی بیتوێن و چیای هەریردا ئەو بەرگرە بەرزەی کە بەسەر دەشتی هەریردا دەڕوانێ.

عەشیرەتی سورچی لە لێواری کەناری ڕۆژهەڵاتی زێیەکە، لە ڕۆژئاوای ئەو چیایەدا نیشتەجێن، لە کاتێکدا زێباریەکان لە ناوچە گردۆڵکەییەکانی لای ڕۆژهەڵات و، لەناوچەی سەرەوەی پێش پێچ کردنەوەی زێ، لەلای باکوری ڕۆژئاوا، نیشتەجێن. لەناوچەی (بارزان) کە پێشتر سەر بە ڕەواندوز بو، شێخ ئەحمەد لەوێ نیشتەجێیە، لاوێکە لەتەمەنی بیست ساڵیە. ئەو لە بنەماڵەیەکی ڕۆحانیەو، بۆ ماوەیەکی دورو درێژ خاوەنی دەسەڵات بون. پیرۆزی ڕۆڵەکانی دەسەڵاتێکی پێبەخشیون، بەشێوەیەك کە فەرمانیان لە ناوچەکانی دەوروبەر بێ سێو دو جێبەجێدەکرێ. بەبەردەوامی چقڵی چاوی تورکان بون، بۆیە ڕۆژگارێك تورکەکان کوردەکانی ڕەواندوزو هەولێریان کۆکردەوەو هێرشیان کردنە سەر. ئەودەم شێخی دەسەڵاتدار، برایەکی شێخ ئەحمەد بو، بەرەو باکور ڕایکردو سەرەتا شکاکەکان لە بەندیان هاوێشت، دواتر دایانە دەست حکومەت، هێنرایە موسڵ و لەوێ لە سێدارە درا(٥).

زێبارییەکان و بارزانییەکان و دراوسێکانیان مەبەستم عەشیرەتی شێروانە، لەناو کوردان و لە هەمو کوردستانی باشور بە دڕندەیی و دەبەنگی ناسراون.

لە ڕۆژی یەکەمی تشرینی دوەم، نەقیب سکۆت کە تازە وەك یارمەتیدەری حاکمی سیاسی ئاکرێ دامەزرابو لەگەڵ (مستەر بیل)ی حاکمی سیاسی سەردانی (پیرە کەپرا)ی بنکەی ناوچەی زێباریان کرد، بە مەبەستی تاوتوێکردنی هەندێ مەسەلەی دیاریکراو، لەگەڵ سەرۆکە ناوچەییەکان: فارس ئاغاو بابەکر ئاغا. ئەو دوانە هێرشیان کردە سەر هەندێ شتی کە لەو گفتوگۆیەدا گوترابون و، هەر ئەو شەوە پیلانیان بۆ کوشتنی هەردو میوانەکەیان دارشت، لە ڕوبارەکەوە، ناردیانە لای شێخ ئەحمەدیش تاکو لەو کارەدا پشتیوانیان بکا. ئەو دو پیاوە بەیانی ڕۆژی دواتر دەرچون و پیاوەکانی خۆیان و برایەکی شێخ ئەحمەدیان لەگەڵدابوو بەڕێگەی ئاساییدا ڕۆیشتن. هەر هێندەی هەموان لە گوند دەرچون و لە مەودای بینینی گوند چونە دەرەوە، ئیدی یەکێك لەوان تەقەیەکی کردو لە ئەنجامدا مستەر بێڵ بەلادا هات. مستەر سکۆت دەمانچەکەی ڕاکێشاو لە دەستیان داو دەمانچەکەی لەدەست فڕی. ئیدی پەنای بۆ بەردێك بردو بەهۆی تفەنگێکەوە کە لەدەستی پاسەوانێکی خۆی ڕاستاند، توانی یەك یان دو کەسیان بپێکێ لەوانەی هێرشیان کردبوە سەری. بەڵام هەمو ژاندارمەکانی پشتیاز بەردا تەنیا یەکێکیان نەبێ. هەر خێرا کاری تەواو بوو کوشتیان. ئەودەم عەشیرەتەکان بە بینینی خوێنی ڕژاو خرۆشان و ڕاپەڕین و چیاکانیان بڕی و بەرەو ئاکرێ شۆڕبونەوە و لە چاوتروکانێکدا ژاندارمەیان دەرکردو دەستیان بە تاڵان و بڕۆو وێرانکاری کرد. سورچییەکان هاتنە یارییان بەناوبانگترین شێخ (سەرۆك) مەبەستم شێخ عوبەیدوڵڵایە کە لە گوندەکەی خۆی (بجیل) مایەوەو جوڵەی نەکرد.

دوای ئەوەی عەشیرەتەکان دو یان سێ ڕۆژ لە ئاکرێ مانەوەو خەریکی تاڵان و بڕۆی خۆیان بون، بە سەرکەوتویی گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

کە لە چواری مانگدا گەڕامەوە هەولێر، هێشتا هەواڵی ئەو ڕوداوەی تیادا بڵاو نەبۆوە، دوای چەند ڕۆژێك نەبێ نەکەوتە سەر زاری خەڵك، ئای ئەو بەربەستە چەند گەورەیە مەبەستم زێی گەورەیە! . لە ڕۆژی پێنجی مانگدا بروسکەیەکم

پێگەیشت تیایدا کرابوم بە حاکمی سیاسی لیوای (پارێزگای) هەولێری نوێ، کە لەڕۆژی یەکەمی مانگی تشرینی دوەمەوە دامەزرێنرابو.

هەردو قەزای کۆیەو ڕەواندوز یەك لەدوای یەك لەژێر دەسەڵاتی نەقیب (ڕندڵ) و (نەقیب کێرك) بون کە ئەمەیان ئێستا لە باتاس لە دەشتی هەریر دادەنیشت. بڕیارمدا لە یەکەم هەلی کە بۆم بلوێ سەردانی ئەو دو قەزایە بکەم، بەڵام ئەو ڕوداوانەی ئەودەم ڕویاندا وا پێویستی کرد کە لە هەولێر بمێنمەوە.

هەواڵی کوشتن و، بەسەردادانی ئاکرێ، کە بڵاوبونەوە، کارێکی ئەوتۆیان لە هەولێر نەکرد، بەڵام گومانی تێدا نیە کە کارەکە بۆ قەزای ڕەواندوز جیابو، ڕەواندوز دەستی بە هەژان و پێکداهاتن کردبو، هەر هێندەی کە نەقیب (کێرك) بیستی کە شێخ عوبەیدوڵڵای بجێلی تا ئێستا لایەنگیری حکومەتە، بڕیاریدا کە سەردانی بکا تا ئەو شتەی دەیەوێ بیکا بەهێز بێ، چونکە هەڵگەڕانەوەی ئەو، بێگومان، کاریگەریەکی مەترسیداری دەبو لەسەر سورچیەکانی باشوری زێ. منیش کە زۆر خەمی سەلامەتی ئەوم بو، بۆیە نەقیب (لیتل دیل)و کۆمەڵی ژاندارمم بۆ یارمەتی ئەو ڕەوانەکرد. نەقیب (لیتل دیل) پێشتر لە موسڵ بوو پێش چەند ڕۆژێك گەیشتبوە هەولێر تا سەرپەرشتی ژاندارمی پارێزگا بکا. لەبەر ئەوەی زۆر شارەزای قەزای ئاکرێ بو چەند ڕۆژێك پێشتر بانگێشت کرا تاکو ببێتە یارمەتیدەری ئەفسەری سیاسی ئەو سوپایەی کە چوبون تۆڵە لە بکوژان بکەنەوە.

لە سەرەتاکانی کانونی دووەم جارێکی دیکە هاتەوە لای من. نەقیب کێرك بە سەلامەتی گەیشتە بجێل، هەر هێندەی لە دڵسۆزی (شێخ) دڵنیابو، ئیدی بەرەو مەترسیدارترین شوێن، بەرەو خودی ئاکرێ چو، کە خەڵکە عەشیرەتیەکە لەوێ چوبونە دەرەوەو جێیان هێشتبو، دوای چەند سەعاتێ کە لەوێ مایەوە، ئیدی بەرەو موسڵ کشایەوەو هەر خێرا بە سەلامەتی گەیشتە ئەوێ. نەقیب (لیتل دیل)ش هەمان ڕێگای گرت، لە شوێنێك کە لە کونی دەرزی تەنگتر بو لە بۆسەیەك دەربازی بو، ئەمەش بەهۆی ئەو سەرپەرشتیە وریایەوە بو کە سەید عەلی ئەفەندی هەیبو و لەگەڵ ئەودا بو. من ئەوکاتە لە هەولێر لەسەر ئاوو ئاگر بووم چونکە ئەوەی کە مرۆڤ زۆر هەراسان دەکا ئەوەیە کە مەترسی لەسەر ئەو کەسانە

هەبێ کە ئەو بەرپرسیارە لێیان، نەك خودی خۆی لە بەرامبەر مەترسیەکەدا بێ. ئەو کاتەی هەواڵم پێگەیشت کە هەموان سەلامەتن زۆر دڵخۆش بوم. سەید عەلی ئەفەندی پلەی بۆ نەقیب (یوزباشی) بەرز کرایەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو رۆڵەی کە لەو بارودۆخەدا گێرای، کە نەقیب کێرك لەوێ نەبو چەندین نامەم پێگەیشت باسی ئەوەیان دەکرد کە نەقیب (توزەر)، فەرماندەی سەربازی لە باتاس لەم نزیکانە توشی هێرشێك دەبێ، کە عەشیرەتەکانی دەوروبەری باتاس پێی هەڵدەستن، بەڵام خۆشبەختانە هیچ شتێکی ترسناك روینەدا، پێموایە کە ئەو هەرەشانە شتێکی مەترسیدار نەبون.

دوای ماوەیەك شاڵاوە سەربازیەکە هەریەك لە ئاکرێ و (پیرە کەپرا)و بارزانی گرتەوە، هەندێ گوند وێران کران، بەڵام بکوژەکان دەرباز بون، چونکە ئەستەمە بۆ سوپایەکی لەسەرخۆ بڕوا، بتوانێ کوردێکی فێڵباز و لێزان، لە نیشتیمانە چیاییەکەی خۆی بگرێ.

لە دواییدا لە رۆژی (١٨)ی مانگ بە مەبەستی سەردانی کۆیە سەفەرم کرد، و کورتترین رێگام لە هەولێرەوە گرتەبەر کە بە گوندی (حاجی وسو)دا دەڕۆیی. بەر لە مەودایەکی کە دو سەعات رێ لە شوێنی مەبەست دور بو، شاندێکی پێشوازی گەیشتە من کە هەمو پیاو ماقولانی تیا بو جگە لە (حەماغا) کە ئێستا بە دەگمەن دەهاتە دەرەوە و عەبدوللاغا کە ئەو دەم لە بەغدا بو. نەقیب (رندڵ) تەواو لە دەرەوەی شاردا بە پیرمەوە هات، یەکەمین شتێکی کە دوای گەیشتنە شار کردم سەردانی حەماغا بو بینیم وەك خۆیەتی تەنیا تۆزێك بە ساڵادا چوبو. دو یان سێ رۆژ لە کۆیە مامەوە، گفتوگۆی دورودرێژم تیایا لەگەل کۆنە هاوالەکانم کرد.

لەوەتەی لە شوباتەوە بەجێم هێشتبو، کۆیە ئەوەندە نەگۆڕابۆ. دوای من نەقیب بیل وەك یارمەتیدەری حاکمی سیاسی شوێنی گرتمەوە، کە تاکو ئایار لەو پۆستە مایەوە، کاتێك لە رەواندوز دامەزرا، نەقیب رندڵ یارمەتیدەری حاکمی سیاسی ئێستا شوێنی گرتەوە.

لە نیساندا رانیەو قەڵادزە کرانە یەکەیەکی بەڕێوەبردنی سەربەخۆ، رانیە کرایە سەنتەری ئەو یەکەیەو، نەقیب (بارکر) کرایە یارمەتیدەری حاکمی سیاسی ئەوێ. ئەوانەی دوای من هاتن هەندێ لە ئاغا ناشایستەکانیان لادا کە من لە

سایەی سیستەمی کۆن بەناچاری دامەزراندبون، جگە لەوانەی دەستەی فەرمانبەرانی شارەوانی وەکخۆی مابوو، هەریەك لە حەماغاو جەمیلاغاو مەتران (٩) پۆستەکەی خۆیان پاراستبو. مەتران بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردم و، وتی: (لە جاری یەکەم کە هاتی، بارانت لەگەڵ خۆت هێنا، ئەگەر ئەمجارەش نەیهێنی ئەوا لە شارۆچکەکەمانت دەردەکەین). خۆشبەختانە لە چەند چرکەیەکدا باران پروشاندی لەو هەنجەتەی ئاماژەی بۆ کرد دەرباز بوم.

شتێکی ئاساییە کە لە دوای (شۆڕشی شێخ مەحمود) کاتێکی شڵەژانی مەزن دروستبێ. یارمەتیدەری حاکمی سیاسی لەو بنکەی گشتیەیە دابڕابو کە سەر بەو بو. هەواڵی پێنە دەگەیشت، بۆیە دەبوایە ئەنجامی کارەکانی خۆی لە ئەستۆ بگرێ. حەماغای پیر هەڵوێستێکی سەرکەوتوانەی هەبو، هەر هێندەی بیستی پیاو ماقوڵان خەریکن کۆبونەوەیەك بکەن بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخەکە، هەڕەشەی ئەوەی کرد کە هێز بەکاردێنێ بۆ بڵاوە پێکردنی کۆبونەوەیەکی ئاوا، وتیشی پێویست بە کۆبونەوەی ئاوا ناکاو پێویستە لایەنگیری حکومەت بکرێ، دەسەڵاتی ئەو کارەکانی بەباشی ڕێکخست. عەبدوڵلاغا ڕۆڵێکی تەڵەکە بازانەی گێڕاو ویستی لە یەك کاتدا لە هەردو بەرە بێ، یاریدەدەری حاکمی سیاسی تەونەکەی ئەوی ئاشکرا کردو بۆ ساڵێك بۆ بەغدای دور خستەوە. میرانی قادر بەگیش چەند نامەیەکی لە شێخ مەحمودەوە پێگەیشت زۆری بیر لێ کردەوە، بەلام بە لایەنگیری حکومەت مایەوە.

ئەمڕۆ کۆیە لە باشترین حاڵەتی گەشەکردندایە. بازاڕ پڕ لە کالایەو بازرگانی ژیاوەتەوە، زۆربەی دانیشتوان لەبرسان لەسەر لێواری مەرگ بون، ئێستا گەڕاونەتەوە سەر کارەکانیان، بینیان کە دەکرێ زۆربەی ئەو (هەتیوانەی) کە لە خانەی بێدەرەتانان دابون فێری پیشەی ناوخۆ بکرێن، بۆیە ژمارەیەکی کەمی خەڵکەکە لەو خانەیە مانەوە، دیمەنی شارۆچکەکەش گۆڕاو بارودۆخەکەی باشتر بو، زبڵ و پاشماوەکان لادران، وەکچۆن هەوڵێکی مەزن درا بۆ چاککردنەوەی ئاوەڕۆکان، لە بەد بەختیا ئەوە ئاشکرابو کە کۆیە لە هاویندا تەندروست نیە، هەمو ئەفسەرەکان توشی تا لێهاتن دەبون. ڕەشە باش (١٠) بە توندی هەڵیدەکرد هەمو شەو ڕۆژێك و لە هەمو مانگەکانی هاویندا، ئیدی ژیانی لەو شارەدا تاڵکردبو.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێستا هیچ پەیوەندیەکم بە حوکمی کۆیەو قەڵادزێوە نەمابو، بەڵام ئەو ڕوداوانەی لەوێ ڕویاندەدا، بۆ من گرنگ بون. شۆڕشی شێخ مەحمود شڵەژانێکی لەوێدا دروستکردبو و بارەکەش تەنیا لە ئەنجامی هەوڵەکانی نەقیب بارکەر ڕزگاری بو کە وەستان و لاوازی نەدەزانی و، لەگەڵ دڵسۆزی بابە کراغا کە چاوپۆشی لێناکرێ (حیزبی بەرهەڵستکار) لە پشدەر هێشتا سەرچاوەی پشێویەکی گەورە بون، لە سەرەتای پایزدا سوپایەك بەرەو دەربەند چون بۆ یارمەتیدانی بابەکراغا، چونکە تەنیا بونی ئەو سوپایە سەرۆکی بەرهەڵستکارەکانی ناچار کرد کە لە گردەکاندا بمێننەوەو تاکو بەفر هەمو ڕێگاکانی گرت و بارەکە خۆشبۆوە.

بە یارمەتی هەمان ئەو سەربازانە توانرا سواراغا دەستگیر بکرێ و بۆ بەغدا دورخرایەوە. لەکاتی شۆڕشی شێخ مەحمود دا لە هەمو کات چالاکتر بو لە دژایەتی کردنی حکومەت و، یەکێك لە خزمەکانی تەقەی لە نەقیب بارکەر کردبو، ئەو ڕۆژەی کە لە نزیك سەرخمە لە ڕوبار دەپەڕیەوە. دواتر سواراغام زۆر دیت چونکە دوای ئەوە چەند مانگێك لە بەغدا مایەوەو دواتر بەمنیان سپارد تا لە هەولێر نیشتەجێبێ.

لە کۆیەوە بەرەو شەقڵاوە ڕێگام گرتە بەر، بەبناری سەفیندا ڕۆیشتم و شەوێکم لە خۆران لەگەڵ سالح، بەمیوانی لەسەر ڕێ بردە سەر، لە دەرەوەی ئەو گوندە توشی بەفرو بایەکی توند بوین. ئیدی ئەو شەوە زۆر سارد بو. نانی نیوەڕۆم لە شەقڵاوە لەگەڵ قادر بەگدا خوارد، بینیم کە زۆر گرژە چونکە وایدەزانی من گرنگیەك بە سالح بەگ دەدەم کە لە شوێنی خۆی نیە. وەك دەردەکەوت سالح بەگ لێرەو لەوێ شانازی بەوەوە کردوە کە دەسەڵاتی ئەو لای من هۆی دامەزراندنی قادر بەگ بوە بە حاکمی شەقڵاوە، ئیدی دڵنیام کردەوە کە سالح بەگ، بە تێڕوانینی من، ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەودا نرخێکی نیە. (خودا خۆی نهێنیەکە دەزانێ: وەرگێڕ).

بە ڕێگایەکی سەختا لە شەقڵاوە شۆڕبوینەوە، بەڵام ڕێیەکی جوان بو، بەرەو جۆگە ئاوێکی خوارەوە دەچو، لە تەنیشتیدا دەربەندێك لە چیایەکدا هەبو بەرامبەر شەقڵاوە، لێ ی چوینە دەر، دوای ئەوەی چیایەکی دیکەمان بڕی بە

ڕێگایەکی هاساندا بەرەو کۆتایی سەرەوەی چیایەکە، یان باشوری دەشتی هەریر گەیشتین. ئەمەش دەشتێکی پان و ڕاستی زۆر جوان و فراوانە، وەك دەشتی بیتوێن دەکەوێتە زەویەکی گردۆلکەیی و، پسپۆڕە جیۆلۆجیەکان دەڵێن: ئەو دەشتە شێوازێکی ناوازە (شاذ)و نا سروشتی هەیەو، بەگشتی شێوەکەی قوچەکیەو بنکەکەی زێی گەورەیە. لە لای ڕۆژئاوا زنجیرە چیایەکی پڕ لە دارو درەخت دەوری داوە، لە کاتێکدا کە ڕێبوار لە بەرامبەریدا چیای هەریری بێ پسانەوە دەبینێ، کە هەمو لەبەردی تیژ پێکهاتوە، ئەو چیایە نزیکەی (٣٠٠٠) پێ لە ڕوی دەشتەکە بەرزترە. ڕێگایەکی کورتی سەخت دەشتی هەریر بە دۆڵی بالیسانەوە دەبەستێتەوە، دۆڵەکەی دواییشیان بەرەو دەشتی بیتوێن شۆڕ دەبێتەوە، درێژی دەشتەکە نزیکەی (٢٩) میل دەبێ، ڕوەکەی بەرزو نزمە، بە تایبەت دەوری لێوارەکانی و ژمارەیەکی زۆری جۆگە ئاوی تێدایە. لەکۆتایی لای سەرەوەی کۆمەڵێ گوندی بچوکی جوان هەن و هەریەك لەو گوندانە باخچەی میوەو داری سەروی هەیەو مولکی عەشیرەتی خۆشناون لەسەر لێواری ڕۆژهەلآتیش ڕیزە گوندێك هەن کە هی دەوڵەمەندەکانی ڕواندزن، لە کاتێکدا عەشیرەتی سورچی لە کۆتایی باکور، نزیك ڕوبارەکە نیشتەجێن. گوندەکانی خۆشناوان لەژێر دەسەلآتی یارمەتیدەری حاکمی سیاسی کۆیەن لە کاتێکدا بەشەکەی دیکەی ئەو دەشتە بەشێکن لە قەزای ڕەواندوز.

عەشیرەتە ڕەوەندەکان خەریکی هاتنە خوارەوە بون لە گردەکان، بەلای کۆمەڵێ هۆبەی خەیلانیەکاندا تێپەڕین. ئەوانە بەباشی پڕ چەکن، لە سیمایانا ئازایەتیەکی بێوێنە دەردەکەوێ، ئەوان بە تالآن و بڕۆو ئازایەتی مەیدانی شەڕ بەناوبانگن. خۆر لە ئاوابوندابو گەیشتینە (بشور) دوا گوندی خۆشناوەکان، کە ڕۆیشتنێکی خۆشی هاسان لەو زەویە ڕاستەدا بۆ ماوەی پتر لە (٣) میل، ئێمەی گەیاندە (باتاس)، ئەو گوندە (٦٠) ماڵیە کە لەسەر بەرزایی دوا گردۆلکەی دامێنی چیای هەریر بنیاتنراوە. جۆگە ئاوێکی بەخوڕ لە پشتیەوە بێستانە فراوانەکانی ئاودەدا، کە هەنجیر و هەناریان دەدا، دواتر لە دەورەی بەرزاییەکە دەسوڕایەوەو دارستانێکی بچوکی سورە چناری لەخوار ماڵآن ئاودەدا، ئیدی بە دەشتەکە

کۆتایی دێ. لەبەری دیکەی ئەو ئاوەو ڕێك لای پێچ کردنەوەی، ماڵی عەبدوڵڵا پاشایە.

کاتێ گەیشتم دیتم سەربازەکان سەنگەرێکی نایابیان بۆ بەرگری کردن دروست کردوە، کە نیو میل لە گوند دورە، لە کاتێکدا نەقیب کێرك و نوسینگەکەی لە ماڵێکی پەرپوتی ئەو گوندەبو. ئەو لەژێر بارگرانی بارودۆخی کە لەبەشی داهاتودا باسی دەکەین، ناچار بو ڕەواندز جێبهێڵێ و لە باتاس نیشتەجێبێ بۆ کاتێکی دیاریکراو. ئەو دەمای من لەوێ بوم بروسکەیەك گەیشت کە داوای لە نەقیب کێرك دەکرد لە کۆتایی مانگدا بچێتە ئاکرێ، کە ئاسایشی تیا بەرکەماڵەو ڕێك و پێکی بۆ گەڕاوەتەوە، تاکو پۆستی (باریدەدەری حاکمی سیاسی) وەرگرێ. دوای ڕۆیشتنی ئەو نوسینگەکەی بەدەست میستەر سکۆت مایەوە، کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی بروسکە بو و سەرۆکی نوسەران، مستەر تەتەر، یارمەتی دەدا، تا لە کانونی دوەمدا داخرا.

ڕۆژی دوای گەیشتنم سەردانی عەبدوڵڵا پاشامان کرد، ئەو ڕێیەمان گرتە بەر کە دەگەیشتە ماڵەکەی و ساڵێك لەمەوبەر کوڕەکەی (سەعید ئاغا) لەوێ کوژرا. عەبدوڵڵا پاشا پیاوێکی لێوەشاوەیەو تەمەنی لەنێوان نەوەدو سەد ساڵدایەو تەمەنی لە تەمەنی حەماغا نزیکە. ئەو شێوەی لە حەماغا ناکا، کە پیاوێکی کەتەو جەستەیەکی بەهێزی هەیە. هەر چەندە لەڕوی عەقڵەوە تۆزێك خەڵەفاوە. عەبدوڵڵا پاشا جەستەیەکی بچوك و بێهێزی هەیە دەستەکانی و سەری دەلەرزن، لە کاتێکدا ئەقڵێکی چالاکی هەیە. ئەو زۆر قسە دەکا و زۆر جاریش قسەکانی دوبارە دەکاتەوە، ڕیشێکی کەم و کورتی هەبو. دەم و چاوێکی سپیکەڵەی خاڵداری هەبو کە ساڵان نەخشی خۆیان لەسەر کێشابو. چاوەکانی ڕەش و برۆکانی بۆیاخ کرابون، باڵای پێنج پێ و سێ ئینج دەبو، جلەکانی شەپو شۆڕبون و جلێکی درێژو پاڵتۆیەکی کۆنی لەسەر لەبەر کردبون. کڵاوێکی زەرکەشی زۆر کۆنی لەسەر بو ئەو لەسەر خۆو بەگۆچان دەڕوا. ئەو تا ئەوپەڕی ڕادە ڕەزیلەو دەڵێن شەوان لەسەر سەندوقی پارەکانی دەخەوێ. (۱۱)

خزمەتە دورو درێژەکەی لە حکومەتی تورکیدا، کە نازناوی پاشای پێ وەرگرتوە، وایلێکردوە کەسێکی زۆر هۆشمەند بێ و پیرێکی زیرەك و قاڵبو. دوای

ئەوەی گەلێ پۆستی لە ناوچە دورەکانی قەزای ڕەواندز بینی، یازدە ساڵ کرایە قایمقامی هەولێر وەکچۆن سەردەمێك بە وەکالەت (بریکار) بو بە موتەسەریفی لیوای سلێمانی. بەهۆی شارەزاییە باشەکانی دەربارەی کوردان و شێوازی هەڵسوکەوتیان حکومەتی تورکی لەکاتی تەنگانەدا پەنای بۆ دەبرد. جارێکیان نێردرایە سلێمانی تاکو نێوانی شێخەکانی ئەوێ و موتەسەریفی تورکی چاك بکاتەوە. جارێکی دیکەش میداڵێکی لە (شای فارس) وەرگرت چونکە کێشەی نێوان هۆزەکانی سەر سنوری چارەسەر کردبو. لەبەر ئەوەی کە فەرمانبەرێکی دڵسۆزی پێشتری تورکان بوو، لایەنگیری دڵسۆزی بەریتانیاش بوو، دەکرا پشت بە پرس و رایەکانی ببەستین، ئەگەر ئەو پرس و رایانە دوژمنە کەسیەکانی نەگرتباوە، یان پەیوەندی بە پارەکانیەوە نەبا. ساڵی پار کورە تاقانەکەی کوژراو، نەوەکەشی (اسماعیل بەگ) ئێستا لە ڕەواندز دادەنیشێ.

بارودۆخەکە لە باتاس ئارامی و دڵنیایی دەبەخشی. لەگەڵ ئەوەی کە سورچیەکان بەر لە چەند هەفتەیەك، خەریکبون کارێکی شەڕانگێزی بکەن، بەلام بونی سوپای تەمێکردن لە ناوچەی ئاکرێ ڕێی لەو کارە گرت. سەرچاوەی دو دڵی ئێمە عەشیرەتی هەرکی بو، کە لەو کاتەدا بەرەو گەلی ڕەواندز شۆڕدەبونەوە، چونکە ئەگەر لەدەست دەرچونایە کۆنترۆڵ کردنیان ئەستەم بو، چونکە لە توانایاندابو کە شەش سەد شەرکەری پڕ چەك ئامادە بکەن و، لە باشترین شەڕکەرانی ئەم بەشەی کوردستان بون.

لە (٢٤)ی تشرینی دوەم بەڕێی (ماوەران) و کوڕێدا گەڕامەوە هەولێر، گوندی یەکەمیان لە دۆڵێکی تەسکی بچوکی خۆیدایە چیایەکی بەرز لە دەشتی هەریری جیا دەکاتەوە. هەر لە کۆنەوە شوێنی نیشتەجێی خانەوادەیەکی مەلایەکان بوە، کە زیرەکن و بە حەیدەری ناسراون. ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو گوندە (٢٠٠-٣٠٠) ماڵی تێدابوە کە کۆمەڵێ بێستان دەورەیان دابون، بەلام ئەو ئاوەی کە ئەو بێستانانەی ئاو دەدا لە بێستانەکانی شەقلاوە کۆتایی دەهات، بەلام ئێستا تەنیا یەك جۆگەی بچوکی تیایە کە بە دۆڵەکەدا دێتە خوارەوەو کە بەناو دێدا دەڕوا ئاوەڕۆکەی فراوان دەبێ و گۆمێك دروستدەکا کە ئاوەکەی لەچاوی قرژاڵ ڕونترە. یەکێك لە حەیدەریەکان ئەمڕۆ لە قوستەنتینیەیە (ئەستانبول) و لەم دواییانە پۆستی

(شێخی ئیسلام)(١٢)ی وەرگرتبو. بەشێکی زۆریش لەو خانەوادەیە ئێستا لە هەولێر نیشتەجێن، و ئێستا نوێنەریان لە (ماوەران) عەزیزاغایە، کە بە خۆرسك ساویلکەیەو نەخوێندەوارە، سێ ژاندارمەی لە دیوەخانەکەی خۆی کوشتبو، سەیر لەوەدایە لەو ڕۆژەدا کە من ئەم وشانەم دەنوسمەوە، نامەیەکم پێگەیشتوە باس لەوە دەکا کە گوندەکە بەهۆی تۆڵە سەندنەوە وێران بوە.

ئا لێرە، سەرکەوتنی چیایەکی دیکە ئێمەی گەیاندە سەر ڕێگای نێوان هەولێر و شەقلاوە، هەر خێرا خۆمان لای مستەفاغا دیتەوەو لە کۆڕێ نانمان دەخوارد.

هەمان ئێوارە گەڕامەوە هەولێر، ڕۆژێك یان دو ڕۆژ دواتر تایەکی گەرمم گرت و لەناو جێ کەوتم، لە کاتی پێویست دا چاکبومەوە، تا پێشوازی و بەخێراتنی مستەر ویلسۆن بکەم، کە لە (٢٩)ی تشرینی دوەم بەڕێگای ئاسمان گەیشتە هەولێر. لە هەمان ڕۆژیشدا نەقیب کێرك لە باتاسەوە هات، کە دەچوە ئاکرێ. لە ئێستا بەدواوە ڕاستەوخۆ کاروبارەکانی ڕەواندزم بەڕێوە دەبرد. مستەر ویڵسۆن لە ڕۆژی (٣٠)ی تشرینی دوەم گەڕایەوە بەغدا، هاتنیشی بە مەبەستی دیتنی نەقیب کێرك بوو لەگەڵ تاوتوێکردنی دوارۆژی کوردستان لەگەڵ مندا. دوای گەڕانەوەی ئەو بە ئۆتۆمبێل چومە سلێمانی بۆ سەردانی ڕائید سۆن، ئێستا چەندین ساڵ بەسەر لابردنی شێخ مەحمود تێپەڕیوەو، لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی ڕائید (سۆن)ی چالاکدا گیانی ناوچەکەو ڕوکاری تەواو گۆڕاوە، دوای سێ ڕۆژ گەڕامەوە هەولێر، جارێکی دیکە چومەوە باتاس، هیوام زۆر بوو کە بارودۆخەکە ڕێگەم پێبدا بچمە ڕەواندز، کە ئەوێ شوێنێکە زۆرم دەربارە بیستوەو زۆر شەیدای بینینیم.

◆

# بەشی دوازدە
## ڕەواندوز و دەربەند (گەلی)

بەر لەوەی کە لەسەر گێڕانەوەکەمان بەردەوامبین باسی شتەکان بکەین، پێویستە باسێکی مێژوویی ئەو شوێنە دڵارایە بکەم، مەبەستم ڕەواندوزە، کە شارۆچکەیەکە بەدرێژایی دە مانگی داهاتو ببوە بنکەیەك بۆ باڵەفڕی بیرو هیواکانم.

لەگەڵ ئەوەی گێڕانەوەیەکی بەروداو مێژوەکەی دەگێڕێتەوە بۆ سەدەی حەفدەی زاینی، بەڵام وردەکاریەکان دەربارەی کەمن، تاکو لە ساڵی (١٨٢٦)دا موحەمەد پاشا کە چاوی تانەیەکی هەبوەو بە (پاشای کۆر)(١) ناسراوە، جڵەوی کاروبارەکانی گرتە دەست.

لەبەر ئەوەی ئەو سەرۆکی خانەوادەی دەسەڵاتداری ناوچەکە بو، هەر خێرا هەوڵی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی لە ڕەواندوز (٢)دا. دوای چەند ساڵێکی کەم هەریەك لە ڕانیەو کۆیەو هەولێرو ئاکرێ و ئامێدی(٣) و زاخۆی داگیر کرد. تاکو (جەزیرە) و (ماردین) پێشڕەوی کرد. کاتێك کە دەسەڵاتی تورکی لە دەسەڵاتی ئەو ترسان، لە ساڵی (١٨٣٨) شاڵاوێکی بەهێزی کرایە سەرو بە ئاسانی تێکیان شکاندو دەستگیرکراو کوژرا. ناوچەکەش ئەمڕۆ پڕە لە پاشماوەی کارگە(٥) کە دروستی کردبون بۆ دابینکردنی گوێڕایەڵی عەشیرەتەکان و، بۆ پاراستنی ناوچەکەش لە هێرشی بابانەکان (لە سلێمانی)(٦).

نەوەکانی توانیان بارەکە بە نیمچە سەربەخۆیی بهێڵنەوەو، ئەم بارەش دە ساڵ بەردەوام بوو، دواتر حکومەتی تورکی بە ئانقەست هەڵسا بە بەڕێوەبردنی ناوچەکەو، هەمیشە حامیەیەکی (سەربازگە) لەوێ دەهێشتەوە کە ژمارەیان لە

(٨٠٠) سەرباز کەمتر نەبو. دەسەڵاتی بەسەر عەشیرەتە دورەکاندا کەمبو، باجگرەکان هەمیشە بە هامرایی دەستەیەك سەرباز دەسوڕانەوە.

ئەو شارۆچکەیە بەر لە شەڕ شانازی بە ژمارەی دانیشتوانەکانی کە (١٠٠٠٠) کەس زیاتر بون و بە مزگەوت و گەرماو و بازاڕە فراوانەکانیەوە، دەکرد.

لە سەرەتاکانی (١٩١٦)دا ڕوسەکان ڕەواندوزیان داگیر کرد، دەستەیەك لە گاورەکانی فارس و ئەرمینیا، لەگەڵ سەربازانی ڕوس، لادێکانیان وێران کردو ئەو زۆردارانە، هەرچی کارێکی نا شایستە کە بە خەیاڵتدا دێ کردیان. شارەکە هەموی بوە دارو بەردو و کەلاوە، تەنیا گەڕەکە بڵندەکەی نەبێ، کە ئەفسەرە ڕوسەکان لەوێ نیشتەجێبون. ئەو جۆرە تۆقاندن و ڕقەی کە تاوانەکانی ڕوسەکان دروستیان کرد بوە هۆی ئەوەی کوردەکان لە هەولێرو کۆیەو ڕانیە ڕایان بکەن بە یەك و لەڕوی پێشڕەوی کردنی ڕوسەکان بوەستن، بە هەزارانیان چونە ڕیزی هێزەکانی تورکیا کە لە چیای کۆڕەکی بەرامبەر شارۆچکەکە سەنگەریان گرتبو، هەر سەرۆکێکی کە ئێستا دەیناسم لەوێبو، لەوانەش (حەماغا) کە دەیانوت لە بارودۆخە هەرە تەنگەکاندا زۆر بە هێمنی دەخەوت. گوێم لە هەندێ سکاڵای گشتی بو دەربارەی هەڵسوکەوتی ئەفسەرە تورکەکان لەو بارودۆخەدا. دوای چەند ڕۆژێکی کەم کوردەکان بە گلەییەوە کشانەوە. لەوانەیە فەرماندە تورکەکە بە ئاستەمی زانیبێ کە خۆراکی ئەو هەموە بدا، ئەو کۆبونەوە مەزنەش کە هیچ مانایەکی ڕێك و پێکیان نەدەزانی، دەبنە بارگرانی بەسەریەوە، نەك هاریکار. ڕوسەکان نەیانتوانی بەسەر چیای کۆڕەك بکەون و شوێنە مکۆمەکانی بگرن، بۆیە دوای دو مانگ یان سێ مانگ ناچاربون بکشێنەوە. ئەودەم سوپای تورکەکان شارۆچکەکەیان داگیر کردەوە، و هێندەی نەبرد وەك ڕەوە کوللە چی مابو لەو شارۆچکەیە، لێیاندا، داری بەرداریان بڕی و کردیانە سوتەمەنی، کە پێشتر ڕوسەکان دەستکاریان نەکردبو، لەکاتی ئاگربەستی ساڵی (١٩١٨)، لە دانیشتوانی شار تەنیا نزیکەی ٢٠٪ مابون، ئەوانیش لە بارودۆخێکی نالەبار و نەبونیدابون، کە گومانی تێدا نیە ئەگەر فریاکەوتنی بەریتانیا نەبوایە لەکاتی پێویست کە وەك ڕزگارکەرێك بو، هەموان دەفەوتان. چەند ڕۆژێك دوای داگیرکردنی هەولێر لەلایەن بەریتانیاوە، لە کاتێکدا کە لە جۆگەئاوێکی سەر ڕێیەك دەپەڕیەوە کە بۆ ماڵی

باوکی دەچو لە باتاس (سەعید بەگ)ی کوڕی عەبدوڵڵا پاشا کوژرا. ئەو پیاوێکی ئازاو بە جەرگی ڕەواندوز بو، خەڵکێکی کە لەناو بێستانەکان خۆیان مەڵاسدابو تەقەیان لێکرد. هەموان لەسەر ئەو ڕایە بوون کە ئەو سەردەستەو پێشڕەوی ناوچەکەیەو، لەکاتی دەسەڵاتی تورکان، جارێك یان دو جاریش کرابوە حاکمی ئەوێ. وەك چۆن دەسەڵاتی لەناو عەشیرەتەکان بێوینە بوو. ئەگەر بە زیندویی بمابایەوە گەلێ کێشەو خەرجی لەکۆڵ بەریتانیەکان دەکردەوە. چونکە بە مردنی ئەو تاکە سەرۆکی بە توانای ناوچەکە، کە دەیتوانی هەمو ناوچەکە کۆنتڕۆڵ بکا، مرد. کوڕە تاقانەکەی خۆی، ئیسماعیل بەگی لە پاش خۆی بەجێهێشت.

یەکەم (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) بەریتانی لە کاتێکی درەنگی کانونی یەکەمی ١٩١٨ لە ڕەواندوز دامەزرێنرا. بەهەر حاڵ ڕائید (نوێل) چەند ڕۆژێکی کە دواتر گەیشت و دەستی بە ڕێکخستنی حکومەتی ناوخۆ کرد. پۆستە سەرەکیەکان بەسەر پیاو ماقوڵانی شارۆچکەکەدا دابەشکران، چونکە دەرکەوت کە مەحاڵە یەکێکیان بکرێتە گەورەی هەموان. وەکچۆن موچە بۆ سەرۆك عەشیرەتەکان بڕایەوەو لەو شوێنانەی سەر بە ڕەواندوز بوون کرانە دادوەر، هەریەك لە ناوچەی نیشتەجێبونی خۆی، قەرزی کشتوکاڵیش بەشێوەیەکی هاسان و بەخشندانە بەخشرایەوەو بەمەش ئەو دانیشتوانەی کە خەریکبو بمرن توانیان لە زستاندا خۆیان ڕاگرن و بڕێکی کەمیش گەنم بۆ وەرزی دروێنەی داهاتو بچێنن.

تا سەرەتای تەمموز، کاتێ نەقیب کێرك لەوێ دامەزرێنرا، سێ (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) یەك لەدوای یەك ناوچەکەیان بەڕێوەبرد. ئەو (واتە کێرك) دیتی کە بەڕاستی ڕوبەڕوی مەترسیەکی ڕاستەقینە بۆتەوە، چونکە (شۆڕشی شێخ مەحمود) گورزێکی ڕاستەقینە بوو لە درێژی و پانی کوردستاندا بەر دەسەڵاتی بەریتانی کەوت. حکومەتیش لە ڕەواندوز بڕێکی کەمی دەسەڵات و ڕێو شوێنی هەبو تا پشتگیری بێ. نزیکترین ئۆردوگاش بۆ ئەوێ لە هەولێر بو، کە نزیکەی (٦٨) میل لێی دور بو. لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ژاندارم هەبون، بەڵام ئەوان زیاتر دەستو پێوەندی ئاغاکان بون نەك لە خزمەتی حکومەتبن، بۆیە ئەو ژاندارمانە مەترسیەکی ڕاستەقینە بون. ئاغاکانی ناوچەکە کە لەڕێی موچەیەکی بەخشندەو قەرزی کشتوکاڵیەوە لە مردن ڕزگار کرابون، کاتێ ئەو قەرزانە وەستان

و مانگانەکان کەمکرانەوە دەستیان بە منگە منگ و گلەیی کرد. هەر خێراش بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر بەشێوەیەکی ناڕێك جولأنەوە، حکومەت هۆکارێکی ئەوتۆی لەبەر دەست نیە بۆ ئەوەی بۆڕیان پێبدا. نوری کوڕی (باویلاغا)کە ئەفسەرێکی گەنجی ژاندارمەبو کەسایەتیەکی دیاری هەبو، لە کاتی شۆڕشی سلێمانیدا رەتی کردەوە گوێرایەڵی فەرمانەکانی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) بیّ.

لە ژێر قورسایی ئەو بارودۆخانەو، لە بەرامبەر ئەو کوشتارە نوێیانەی کە ئامێدی بە خۆیەوە دیت و، بە لەبەر چاو گرتنی ئەو تێچوە (خەرجی) زۆرەی کەلە رێی بەرێوەبردنی ناوچەکە خەرج کراو، ئەو بەرهەمەی بوی، ئەوەندەی کە پەیوەندی بەو ئامانجەوە هەبو کە خرابوە گەڕ بۆ بەرێوەبردنی ناوچەکە و ئەو ئامانجەش کە هەوڵمان بۆدەدا و بۆی دەچوین و،تەنیا بەرهەمێکی کەمیشی هەبو، بۆیە بڕیاری چۆڵکردنی رەواندوز درا، بەرێوبەرێتی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) گواسترایەوە (باتاس) .بۆیە هەندێ سەرباز رەوانە کران بۆ یارمەتی دانی نەقیب کێرك تا بە سەلامەتی لە شارۆچکەکە دەرچێ .

نوری دەستگیر کرا، بەلأم ئەو لە مەودای چەند خولەکێکی کەمدا توانی لە چنگی پاسەوانەکەی دەرچێ و خۆی لە چیا گلۆر کردەوە بەرەو خوارێ. هەمو هەوڵەکانی کە بۆ دوبارە دەستگیرکردنەوەی دران مایەپوچ بون. لە دەی ئابدا ئەو دەستە سەربازە توانیان بیّ ئاستەنگ لەگەڵ بکشێنەوەو، (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) لە باتاس دامەزرا. دەستەیەکی بچوکم بۆ سەپاندنی دەسەلأتی ئەو لەگەڵدا هێشتەوە.

دانیشتوانی ڕەواندوز لە کشانەوەی حکومەت ناڕازی بون و وەك ئەو بەخیلە وابون کە ئەنگوستیلەیەکیان لە خۆڵە پۆکدا ون کردبیّ. ئەمەش چونکە هەستیان بە دوژمنداری حکومەت نەدەکرد، یان هەرگیز هەستیان بەوە نەکردوە. لە مەودای چەند ڕۆژێکی کەمدا نەقیب کێرك سەردانی هەمو پیاو ماقوڵە گرنگەکانی ئەو ناوچەیەی کردو، لەسەر داوای ئەوان نەورۆز ئەفەندی، کە ئەو کەسە بو پێشتر لە شەقلاوە بینیمان، کردە نوێنەری حکومەت لە شارۆچکەکەدا. وەك چۆن چەند فەرمانبەرێکی کەمیشی بۆ هاریکاری کردنی ئەو دامەزراندن. بەلأم سەرۆك

عەشیرەتەکان هەموان موچەیان بڕا، شێخ محەمەد ئاغای سەرۆکی باڵەکی لێدەردەچێ، کە بەرپرسی ڕێگەی فارس بو لەگەڵ یارمەتی دانی حکومەت بە بەردەوامی.

دەشتی هەریر ڕاستەوخۆ لە باتاسەوە سەروکاری دەکرا، لەکاتێکدا ناحیەی (دێرە) کە لە زەویەکی گردۆلکەیی نێوان ناوچەی هەولێر و دەشتی هەریر پێکهاتبو لەژێر فەرمانداری یەحیا بەگی بەڕێوەبەری ناحیە بو.

وەك منداڵی فێلباز، خەڵکی ڕەواندوزو دەوروبەری لەسەر هەڵسوکەوتی باشیان بەردەوامبون، لە پشتی ئەو کارەشیان مەبەستیان ئەوەبو کە حکومەت (دایك) وا لێبکەن بگەڕێتەوە.

نوری لە گوندێکی دەرەوەی شارۆچکەکە کە چەند میلێك دوربو بە دورخراوەیی دەژیا. جارێکیان فرۆکە بۆردومانی کرد، بەڵام چەند خولەکێك دوای ئەوە لە دەشتی (دیانا)ی بەرامبەر ڕەواندوز کەوتە خوارەوە، فڕۆکەوانەکەو نەقیب کێرك کە چاوساغی بو (رصد) بە سەلامەتی گەیشتنەوە باتاس.

لە سەرەتای تشرینی دوەمدا، بکوژان لە (پیرە کەپرە) بارودۆخەکەیان گۆڕی و، تالان و برۆ لەسەر ڕێگای گشتی بەر بڵاو بو و بەشەنەی کرد، لەبەرایی پیادەکەرانیشی یوسف بەگ و محەمەد ئەمین بەگی خەڵکی دەرگەڵە بون کە دەکەوێتە سەر ڕێگای فارس (ئێران)، لەپاڵ ئەوانیش هەندێ لە نەیارانی شێخ محەمەد ئاغای عەشیرەتی باڵەك بون. لەگەڵ هەناردنی هەڵمەتێکی سەربازی بۆ ئاکرێ بارودۆخەکە تۆزێ باشتر بوو میر محەمەد ئەمین بەگ هات و دەستەبەری ئەوەی خستەڕو کە لە ڕۆژانی داهاتودا هەڵسوکەوتی باش بێ. بەهەر حاڵ، ناڕازیە ڕق هەڵساوەکان لە (باڵەك) شتێکی وایان نەخستەڕو کە نیشانەی پەژیوانی بێ، لەکاتێکدا کە زۆرداری یوسف بەگ ڕو لەزیاد بوو خەریکی ڕێو شوێنێك بو کە لە ڕەواندوز بۆ پایەیەکی گەورە بەرزی بکاتەوە. حاجی نەورۆزی خەزوریشی لە هەوڵی جڵەوکردنیدا مایە پوچ دەرچو، نەیتوانی بەگشتی چارەی بارودۆخەکە بکا، بۆیە ناوە ناوە نامەی دەناردو تکای دەکرد دەست لەکار کێشانەوەی قبوڵ بکرێ.

ئـەو پـشێویانە بـۆ یاریـدەرەکانی سیاســی ئـەو دەوروبـەرە بـوە هـۆی ناڕەحەتیـەکی زۆر، ئەگـەر ڕێگـە بـە بـەردەوامی درابـاو جڵـەو نـەکرابا ئـەوا بـۆ ناوچەکانی دەوروبەریش تەشەنەی دەکرد.

لەبـەر ئـەوە لـە ڕۆژی شەشـی کـانونی یەکـەم لـە هـەولێرەوە ڕێگـەی باتاسـم گرتەبەر. دەمویـست ئەگـەر بـۆم بلـوێ لـەوێوە بچمە ڕەواندوز. ئەمـەش هـەموی ئەگەر بۆم بکرێ هۆکارێك بۆ ڕێگە گرتن لە دروستبونی پشێوی دیکـە بدۆزمـەوەو، ئەگەر بارودۆخ ڕێگە بدا ئەوا تاوانبـاران سـزا بـدەم. هیواخـوازی ئـەوەش بـوم کـە جۆرێك لە دەسەڵات لەوێ دروست بکەم کە پتر جێگیر بێ.

لەسەر ڕێگەی سەرەکی بەڕێکەوتم و توانیم هەژدە میلی یەکەم بە ماشێن بـبڕم و بگەمە (دێـرە). نـاوی (دێـرە)ش لـە نـاوی (دێرێکـی) گاورانـەوە هـاتوە کـە لـەو دەوروبەرە بوەو، لەبەر ئـەوەی کەوتۆتـە سـەر ڕێگـای سـەرەکی، لـەکاتی شـەڕدا (مەبەستی شەڕی یەکەمی جیهانیە) بە تـەواوی لەناوچـوە. لـەدوای خۆشـیدا یـەك قـەڵای سـەختی لەسـەر گردێکـدا بەجێهێـشتوە لـەو بەرزیـەوە، کـە یەکێکـە لـە پاشماوەکـانی (پاشـای کـۆرە) پاشـای گـەورە. بەهـەر حـاڵ مەجیـد ئاغـای بـرای جەمیل ئاغای سەرۆك عەشیرەتی گەردی بەشێکی گەورەی ئەو گوندەی بە دەست هێنـاوە، جارێـك بـەکڕین و جارێـك بـە دەسـت بەسـەرداگرتن و، ئـەمڕۆ ئـەو لـە کوختێکدا دەژی کە ڕێك لەخوارەوەی قەڵاکەدا دروستی کردوە. کابرایەکە تەمەنی کـردوەو دەمـو چـاوێکی هەیـە کـە کـەش و هەواکـە سـوتاندویەتی و ڕیـشی نیـەو (کۆســەیە) لـەو کاتــەی ســاڵدا جلێکـی شـینی لەبەردایـە کـە بەبـەری تەنگـەو قۆپچەکانی (شێرو خورشیدی)ی ئێرانیـان لەسـەرە. لەبـەر ئـەوەی ئـەو پیـاوە لـە جەمیل ئاغا بە تەمەنترە، دەبوایە ئەو سەرۆکی عەشـیرەتی گـەردی بوایـە، بـەڵام لەبــەر ئــەتوارە ســەیرەکانی لادراوەو دەســت بەســتەی کــردوەو، پێــچەوانەی برایەکەیەتی کە کەسایەتیەکی کراوەترو لەبارتری هەیـە. کێشەش لـە بـەینی ئـەو دوبرایە بێ چارەو بەردەوامبو، کـە هەمیـشە بـۆ بێزارکردنـی غەنیمەکـەی بـەرپای دەکرد. دوای تاقیکردنەوەیـەکی چـەندین مـانگی، کـە هـەردوکیانی گرتـەوەو، بـە تایبەتی جەمیل ئاغا، هەوەسی لە تەلەکە کاری زۆر بودەڵە بوو، من مەجید ئاغـام پێ باشتر بوو، چونکە دیتم کە لەنێوان هەردوکیاندا ئەو دڵسۆزترو ڕاسـتگۆ تـرە.

یەکێك لە ئاواتەکانی کە خۆی دەری بڕی، ئەوەبو کە ببێتە بەڕێوەبەری دێرە، بۆیە بۆ هەر کەسێکی کە ببوایە بەڕێوەبەری ئەویّ، دەبوە سەر یەشەیەکی گەورە. هەر چەند جاری سەردانی ئەو شوێنەشم بکردایە ململانێیەکی گەورە دروستدەبو بەهۆی ئەوەی کە کامیان میوانداریم بکەن، ئەو، یان یەحیا بەگ.

یەحیا بەگ نەوەی (کوڕەزای) ڕەسول پاشایە کە دوا فەرمانڕەوای سەربەخۆی ڕەواندوز بوو، لەلایەن دایکیشیەوە نەوەی (عەبدوڵلاّ پاشا)ی پیرەمێردەو ئامۆزای ئیسماعیل بەگە (ڕەنگە ئەمە هەڵەبێ و خاڵۆزاو پورزابن) (و.ك). لە کەرکوك لەدایك بوەو لەوێش خوێندویەتی و نە لە شێوەو نە لە ڕەفتاری بە کوردان ناچێ. دەم و چاوێکی سپی نەرمۆڵەی هەیەو قسەکردنی گرژو توڕەیە. لە سەرەتادا ئەو کەسە کاریگەریەکی لەلا دروست نەکردم، بەڵام دواتر دیتم کە فەرمانبەرێکە لەو فەرمانبەرانەی زۆر پابەندی خزمەتکردنی حکومەتەکەیانن و زۆر لێهاتو و دڵسۆزن، بۆیە ئەو لەو کەم خەڵکانەن کە پشتم پێ دەبەستان. ڕقی لە کوردەکانە و ئەو هەڵچونەی کە زۆر جاران دەیگرت وایلێکردبو کە لە ناوچەکەدا کەسێکی خۆشەویست نەبێ. دوای ئەوەی لە قەلاّکەدا خواردنێکی ئاسایی پێشکەش کردم، کە ڕێگەی باتاسم گرتەبەر لەگەڵم هات.

لە چەند میلێکی کەمی سەرەتادا لەو گەشتەمان بەلای چەندین چیای نزمی دوای یەکدا تێپەڕین کە هەمویان (کلسی) قسلّی و لمی بون، تا گەیشتینە (دوین). ئێرە پێتەختی یەکێك لە خانەوادە فەرمانڕەوا بەهێزەکان بوە، بەڵام ئێستا لە قەلاّیەکی وێران بترازێ شتێکی دیکەی لێ نەماوە، کە ڕێگایەکی بەسەر زنجیرە گردێکدا دەڕوا. لە ناوچەکانی دەوروبەریدا عەشیرەتی (زراری) نیشتەجێن کە خەڵکێکی نەزان و بودەڵەن (ئاوا: و.ع) و گوندەکانیان لە ڕێگەکەوە نابیندرێ. لای دیکەی چیای دوین دەوەن و گیاو گوڵ داپۆشیوە. ئەوێ ناوچەیەکی جوانە لەکاتی بەهارداو بەگوڵ ڕازاوەتەوە. لێرە هۆبەو ڕەشماڵێکی گەورەی هەرکیەکانمان دیت کە عەشیرەتێکن لەسەر گردەکانەوە دەهاتنە خوارێ. پەردەو چیغەکان کە لە چڵی دار چنرابون و دیواری ڕەشماڵەکانیان بون بۆ دواوە هەڵدرابونەوەو، لە کاتێکدا ئێمە بەڕێگەدا دەڕۆیشتین دەتوانرا ئەو پیاوو ژن و منداڵانە ببینرێن کە لە بەر خۆرەکە خۆیان گەرم دەکردەوە. ئەوان دیمەنێکی

جوانی ئەوتۆیان هەیە کە بینەر دڵشاد دەکا، بەڵام ئەوان جلەکانیان دڕاوو چڵکنە. سەگی گەورەو دڕیان هەیە کە لەکاتی تێپەڕینماندا بۆمان هاتن و وەکچۆن ژمارەیەکی زۆر ئەسپ و مەڕو ماڵاتیان هەیەو لە هەورازو نشێوەکاندا دەلەوەڕان. لە جۆگەیەکی گەورە پەڕینەوە، کە هەمان ئەو جۆگەیە لە شەقڵاوە هەڵدەقوڵێ و بەماوەراندا تێدەپەڕی. ئیدی بەو ناوچەیەدا سەرکەوتین کە بەداربەڕو و بەشێوەیەکی جوان داپۆشراوە. ئیدی چوینە ناو دەشتێکی سەوزی بچوک کە کانیەکی گۆگردی تێدایە، تا گەیشتینە (بابە جیجك) کە گوندێکی بچوکەو بنکەیەکی ژاندارمی تێدایە، لەگەڵ قاوەخانەیەك کە ئەو کاروانانەی بەو ڕێیەدا دەڕۆن لەوێ دەمێننەوە. دوای ئەوەی لە دەروێکی نێوان چەند گردێکی نزمدا تێپەڕین، بەرەو دەشتی هەریر شۆڕبوینەوە، دواتر دوای بە سواری ڕۆیشتنێك کە ماوەی یەك کاتژمێری لە ناوچەیەکی بەرزو نزمدا خایاند، ڕێگا سەرەکیەکەمان بەرداو ئەو پێنج میلەی بۆ گەیشتنە باتاسمان بڕی.

چوار ڕۆژم لەوێ بەسەربرد، دو ڕۆژیان لە سەربازگەکەو، دوانەکەی دیکەشیان لە ماڵی عەبدوڵڵا پاشا. شەوی یەکەمیان کە چومە سەربازگەکە ڕائید میدڵتۆن، کە سەر بە یەکەی (٨٧)ی نەجابیەیەو، ئێستا فەرماندەیەتی، بە بەخشندەیی خۆی میوانداری کردم. بەیانی دواتر سەردانی (پیرە پاشا)م کرد، دیتم نوسراوێك لە (محەمەد سەعید بەگ)ەوە هاتوە،– کە لە برادۆستەکانە– باسی ئەوە دەکا کە بە یارمەتی عەشیرەتەکانی دەوروبەری هەڵساوە بە بڕینی ڕێگەکانی ڕاکردن، کە لەبەردەم بکوژانی (مستەر بل)و (نەقیب سکۆت) کراوە بون و، ئەگەر حکومەت دەستی یارمەتی بۆ درێژکا ئەوا دەتوانێ دەستگیریان بکا. پاشا ئەوەشی پێگوتم کە (ئەحمەد ئاغا)، کە لە عەشیرەتەکانی (شێروان)یە، لە ڕەواندوز سەردانی نەوەکەی کردوەو بەلێنێکی هاوشێوەی داوە. بۆیە بروسکەیەکم بۆ بەغدا لێداو داوام کرد ڕێگەم پێبدرێ بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەو سەرۆکانەو ئەگەر بشتوانم بۆ دەستگیرکردنی بکوژان بچمە ڕەواندوز. ڕێگەدانەکە یەکسەر هاتەوە، وەکچۆن لەلایەن دەسەڵاتە سەربازیەکانەوە بە ڕائید (میدڵتۆن) ڕاگەیەندرابو کە تا کانی وەتمان بەرەو سەر بڕوا، تا دەرگی گەلی بۆ ئەوەی فریاد ڕەسم بێ. بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ هەولێر کردو داوای هاتنی (سەید عەلی ئەفەندی)م کرد لەگەڵ

زۆرترین ژمارەی ژاندارمە کە دەتوانیّ کۆیان بکاتەوە. (٨) لەکاتی پێویستدا گەیشتەجیّ کە نۆی مانگ بو، بەو سەربازانەی ئەو هێنابونی و ئەوانەی لە باتاس بون، ئێستا پاسەوانێکی (٥٠) کەسیم هەبوو، بەر لەوەی بکەومە ڕێش وام بە پێویست زانی کە سەرۆك عەشیرەتێکم لەگەڵدابیّ بۆ پشتیوانی کردنم، بۆیە هەناردمە دوای جەمیل ئاغا کە لە عەشیرەتی گەردیە، کە خێراتر لە چاوتروکانێك بگاتە لام و پازدە کەسیش لەگەڵ خۆیدا بهێنیّ.

لە کۆتاییدا ڕۆژی دەی مانگ لەگەڵ ئەو دەستە کۆبووەوەمدا بەڕێکەوتم. ڕێگاکەمان مەودای چوار میل دەبوو، بە دۆڵێکدا دەڕۆیشت کە دەکەوتە نێوان چیای هەریر و کەڵەکە گابەردێکی درێژەوە. بە سیّ یان چوار گونددا تێپەڕین و ڕێگاکەمان سەخت و بەردین بو. گەیشتینە سەر ڕێگەی سەرەکی و ئەنجا بەرەو گەلی سپیلك شۆڕبوینەوە، خۆمان لە ناوچەیەکی زۆر جیاوازدا دیتەوە، کە زۆر بالآترو شکۆمەندتر بو. لای چەپمان چیایەکی پڕ لە دارو درەخت بو کە لەو ناوچەیە بە (چیای سورچیان) ناسراوەو، بەرامبەریشمان چیای کۆڕەك بو، کە بەشێوەی زینی ئەسپەو نزیکەی ٧٥٠٠ پیّ بەرزە. ئێستا بەفر داپۆشیوەو چین لەسەر چین لەسەری کەوتوە، لەکاتێکدا کە لای ڕۆژهەلآتی چیای هەریر (بەنی هەریر) زۆر جوان بە دار بەڕو داپۆشراوە.

لەنێوان ئەو دو زنجیرە چیایەشدا دەمانتوانی درێژبونەوەی دۆڵێکی تەنگ ببینین، کە لە سەرەوەڕا چیایەکی سەرکەشی گەورە کە بە ستونێکی مەزن دەچیّ بەسەریدا دەڕوانیّ و، جۆگەیەکی وەك بریسکەی زیوی پێچاو پێچ بەدڵی دۆڵەکەدا بەرەو خوار دەچیّ. ڕێگاکەمان بەبناری چیای سورچیاندا درێژ دەبۆوە لە مەودای دو تا سیّ میل نزیك دەربەندی سپیلك لە باکوری خۆماندا قاوە خانەیەکی لاتەریکمان بینی کە لە سەروی ئەوێڕا گوندی کەڵەکین لەچاو وندەبو کە چەتەی بەناوبانگ حەمادەشین لەوێدابو. دوای دو تا سیّ میل لە هەڵگەڕان بەڕێگایەکی سەختدا گەیشتینە گوندی (کانی وەتمان). ئەویّ بەپلەی یەکەم بۆ وەستانی کاروانەکان ئاوەدان کراوەتەوەو سیّ (خان)ی تێدایە بۆ پشودانی کاروانەکان. ئەوانەش خانوی سەیرو سەمەرەن پەنجەرەیەکیان تیا نیە تاکو روناکی بچێتە چورەوەو، بنمیچەکانیان زۆر نزمەو ژمارەیەك ئەستونی داریان دراوەتە بەر.

ژاندارمە لەو دێیەدا هەبون و بنکەیەکی (مەکس)ی (گومرگ)ی لێبو بۆ پشکنینی ئەو کاروانانەی لە فارسەوە (ئێران) دەهاتن. لێرەوە مرۆڤ دەتوانێ سەیری دیمەنێکی زۆر جوان بکا، دیمەنی ئەو دۆڵەیە کە پێشتر باسمان کرد. وا دەردەکەوێ کە بەرەوپێشچون بەچەند میلێك ئاستەنگێکت دێتە پێش، چ ئاستەنگێك، دیوارێکی بەردینی مەزنە کە بەشەکانی چیای کۆرەکەو تەنیا یەك دەروی وەك پیتی (V) ئینگلیزی تێدا دەبینرێ، کە لەو دەروەوە ڕێگاکە بەرەو ناو گەلی دەچێ (گەلی عەلی بەگ).

لە کانی وەتمانەوە بەرەو خوار شۆڕبوینەوەو خێرا گەیشتینە دەشتێکی بچوك کە پێیدەڵێن (خەلیفان)و لێواری ئەو جۆگەیەی کە لە مەودایەکی دور دەمانبینی و بە دۆڵەکەیدا دەچوە خوارێ. دوای سوکە لۆقەیەکی ئەو دەشتە پان و بەگیاو گوڵ داپۆشراوەو لە مەودای پتر لە میلێك دوان و، لەگەڵ ئاوەڕۆی جۆگەکەدا چوینە ناو دەروە تاریکەکانی کە دەگەیشتە (گەلی).

زۆرم دەربارەی سەمەرەیی ئەو شوێنە بیستبو، بۆیە بە هەستێکی سەیری تێکەڵ لە ترس و دڵڕایی چومە ناوی. لە دەرەوە هەتاو و گەرمی بە هەمو لایەکدا پەخش دەبو، بەڵام لێرەدا تاریکی باڵی کێشاوەو سەرما توندەو، چەند گۆلاوێکی لێیە کە سەهۆڵ بەستویەتی. تێپەڕین بە گەلیدا ماوەی دو کاتژمێر تا سێ کاتژمێری دەوێ و، مەوداکەی (١٠)میل دەبێ.

لە سێ میلی بەراییدا ڕێگاکە لەگەڵ جۆگە ئاوەکەدا دەڕواو، بۆ یەکەمجار بەهۆی پردێکی پەرپوتدا بەسەریدا دەپەڕێتەوە. دامێنی لای ڕاستی هەموی داری ڕەش و گابەردی خۆڵەمێشی ڕەنگەو لای سەریشی گابەردێکی گەورەی تیژە کە بەرزیەکەی وردە وردە زیاد دەکاو، گومانی تێدا نیە کە بەرزیەکەی ٢٠٠٠ پێ دەبێ. لە بەرامبەریشیدا چیایەکی سەرکەش هەیەو دوری نێوانیان لە هەندێ شوێندا لە سەد یاردە تێناپەڕێ. ڕێگاکەش بە پێچ و لولەو بە نێوان گابەردی زلدا تێدەپەڕێ، لە شوێنێکیدا پێچێکی چاوەڕوان نەکراو دەکاو، دواتر لەگەڵ لێواری جۆگەکەدا دەڕواو، ئیدی دەبێتە پردێك کە بە گابەردێکی گەورەوەیەو بەرزیەکەی دەگاتە (٣٠)پێ و، ئیدی دەگاتە تەختاییەکی بچوك کە کاروانەکان لەوێ پشویەك دەدەن و پارچە زەوی بە ماش چێنراوی لێیە. دوای سێ میل ڕێگاکە لە جۆگەکە

جیا دەبێتەوەو ڕو لە بەرزبونـەوە دەکا. ئا لێرەدا گابـەردەکێکی زلی گـەورە لـە ناوەڕاستی گەلیدا هەیە کە وەك ستونێکی مەزنە. دواتر گەلیـەکی دیکـە دەبینـرێ کە بە گۆشەیەکی وەستاو لەبـەری ئەوبـەری لـە گـەلی جیـا دەبێتـەوە. ئـا لێـرەدا ڕێگاکـە پێـچاو پێـچەو بەسـەر چـیاکەدا بـەرز دەبێتـەوەو ئەگـەر ڕێبـوار سـەیری خوارەوە بکا ئەوا وا دەزانێ دەکەوێتە ناو جۆگەکـەوە، چـونکە ئێـستا گەیـشتۆتە جۆگەی ڕەواندوز و، ئەو جۆگەیەو جۆگەکەی پێشتر بەلای گەلیدا بەرەو ژێی سەرو شۆڕ دەبنەوە. لێرەدا ڕێبوار چوار تا پێنج میلی دیکە سەردەکەوێ، ئیدی جۆگەی ڕەواندوزی وەك هەودایەکی زیـوی باریـك و لەمـەودای (١٣٠٠) پـێ بـەرەو خـوار لێ بەدیار دەکەوێ، لەکاتێکدا چیایەکی بەردینی هەیە کە لە هەزار پێ پتر بەرزە. لـە بەرامبەریشیدا چیایەکی بەرزی بـەردین هەیـە کـە بەرزیەکـەی خـۆی لـە ٣٠٠٠ پـێ دەدا.

ئا لێرەدا دارو درەخت و گیاو گـوڵێکی زۆر هەیـە، چـونکە ڕەگـەکانی دەتـوانێ خۆی بە لایەکانی ئەو خەرەندە جوانەوە بگرێ. چـونکە لێژاییـەکانی لـە دامێنیـدا تەواو پێچ دەخواتەوە. کە بـۆ یەکـەمجار بەسـواری بـەو گەلیـەدا تێپـەڕیم جـوانی گەورەیی و شـکۆیەکەی گرتمیـەخۆ و خـەریکبو هۆشـم ببـا. دێڕەکـانی (بـراونینگ Browning)(٩) لە قەسیدەکەی (چایلد ڕۆلاند Childe Roland)م هەمیشە دەهاتـەوە خـەیاڵ، چـونکە ڕەوانـدوزی وەك (تـاوەری ڕەش) دەهێنامـە بەرچـاو، هەرگیز سروشتم بـەو جوانیـەی ئێـرە نـەدیوە. سروشـت بـە چ گـورزێکی تۆقێنـەر توانیویەتی ئەو کۆمەڵە چیایە مەزنە لەت و پەت بکا، یان بەچەند سـاڵی کـارکردن توانیویەتی ئەو تونـاو تونـە مەزنانـە هـەڵبکۆڵێ؟!. لـە بـەرزترین خـاڵی ڕێگاکـەدا بانێکی بەتاڵ هەیە کە بەهێزترین شـوێنی سـەنگەری پێـشتری ڕوسـەکان بـوە. ئـا لێـرەدا دەکـرێ تێبینـی ئـەوە بکـرێ کـە گەلیـە بـچوکەکە بـەرەو لای ڕاسـت پـێچ دەکاتەوە، لە کاتێکدا گەلیەکی بـچوکتر لـە پێـشەوە هەیـە لەبەرامبەریـدا دێتـەوە سەر ئەو گەلیە. ئەگەر ڕێبوار بەوردی سەیر بکا لـە کۆتـایی سـەرەوەیدا پـەردوی پردێکی گەورە دەبینێ کە ڕۆژێك لـەڕۆژان جۆگاکـە بەژێریـدا دەڕۆیـی و دواتـریش گوندی باڵـەکیان دێ. لەپـشت ئەوەشـەوە نیگـای دڵخۆشـکەری دەشـتێکی سـەوز دەکرێ کە چیای مەزن دەوریان داوەو لوتکەکانی بەبـەفر ڕازاندراوەتـەوە. ئێـستا

بەرەو خوار شۆڕ دەبینەوەو خێرا بەرەو لای ڕاست کێڵ دەبینەوەو، بەو ئاراستەیەش گەلی بە مەودای یەك میل ڕاست و ڕاستەو، دواتر بەتوندی بەرەو چەپ پێچ دەکاتەوە. بەدرێژایی ئەو میلە چیا بەردەکان وا دەردەکەون کە ئەوەندە بەرز نین و ڕك ترن و جۆگە ئاوەکەش بەزۆری لەگەڵ شۆڕبونەوەی ڕێگاکە بەشێوەیەکی شاقوڵی دەبینرێ. چیای ئەوبەر ڕوتەنەو بەچینی ئاسۆیی نەخشاوە، ڕێگایەکیش بە لێواری قولاییدا دەڕواو دەگاتە هەندێ ئەشکەوتی کە لە چیاکەدا هەڵکۆڵراون و لە دەرەوەیدا پارچە دارو شیاکەی ئاژەڵی سوتاو دەبینرێن. لەپێچ کردنەوەی گەلیە سەرەکیەکەدا بەلای چەپ دەربەندێکی لاوەکی لێدەبێتەوە کە کورتەو بەلای ڕاستدا دەڕواو، لە سەرەوەی ئەوێدا ڕێگاکەی ئێمە پێچ دەخواتەوە. ئا لێرەدا تاڤگەیەکی گێژەن کردوی کەفچڕ لە ئاوەڕۆیەکی تەسکدا دێتە خوارێ و دەوروبەری پڕە لە چنارو کاژو گوڵی کێوی و توترك. ڕێگاکەش سێ جار لە جۆگەکە دەپەڕێتەوەو دوا پەڕینەوەش ڕێك لە خواروی تاڤگەی بێخاڵدایە.

ئەو سەرچاوەیە لە وەسف بەدەرە، ئێرەو (تاج مەحەلی ئەکرا) دو دیمەنی هەرە جوانن کە نوسەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بینیویەتی.

لە دەربەندە تەسکەکەدا کە چیای ڕەشی گەورە بەسەریدا دەڕوانن و لەو کەلێنەی کە بە پیتی (V) دەچێ و ڕێبوار تیایدا جارێکی دی دەچێتەوە هەوایەکی کراوە، لەناکاو و لەخاڵێکی گابەردەکەدا کە پەنجا پێ بەرز دەبێ تاڤگەیەك دێتە خوارەوە کە ئاوەکەی کەفچەڕێنێکی سپیەو وەك پانکەیەك دەسوڕێ و لە هەمو چرکەیەکدا گەورە دەبێ و کەبەرەو خواریش دێتە خوارێ هاژە دەکا تا لە قولاییدا جۆگەیەکی تەسکی پڕ ئاو دروست بکا کە لە بەرەو خوارچونیدا ئاوەکەی بەسەر گابەردەکاندا بازدەداو لەو ئاوەڕۆیە کورتە دلگرەیدا کەف دەکاو تا لە کۆتاییدا دەگاتە جۆگەی ڕەواندوز. تەنانەت لەچلەی هاوینیشدا ئاوەکەی گەرو دەتەزێنێ و هەوا فێنك و خۆش دەکا. گۆڕاییەك لەوێ هەیە کە پڕ لە دار گوێز و شوێنی حەوانەوەیەك بۆ ڕێبوارە ماندوەکان دابین دەکا.

بە هەست بەخۆشی کردنەوە لە دەروەکە سەرکەوتم و بەرەو شوێنە کراوەکە چوم، ئێستا خۆمان لە پانابیەك دیتەوە کە گرد دەوری داوەو ئەگەر ئەو دەروە نەبوایە کەلێی هاتینە دەرەوە دەبوایە دەریاچەیەك دروست ببوایە لەوێ.

لەگەڵ ڕێکردنماندا بە کەلاوەی گوندێکدا تێپەڕین کە پێیدەڵێن (بێخاڵ)، ئیدی بە چیایەکدا سەرکەوتین و لەسەرەوەی دا دەستەیەك چەکدارمان بینی و دەرکەوت کە هەندێ لە ژاندارمەکانی حاجی نەوڕۆزن و بۆ پێشوازی ئێمە هاتون. لێرە بیرم لەوە دەکردەوە کە بەڕاستی دەتوانرێ ڕەواندوز ببینرێ، بەڵام وانەبو.

ڕێگاکە بۆ مەودای دو میل بەداوێنی گردەکەدا بەرەو ناوو بەرەو دەرەوە پێچاو پێچ بو، تا لە خەرەندە قوڵەکەدا سوڕاینەوە، ئەوەتا ڕەواندوز لەبەر چاومانە، دیمەنەکە سەر سوڕماوی کردم (خەریکبو لە خۆشیان بفڕم) کاتێ نیگام نارد بۆ دیتنی پیاوێکی لەش و لار بەهێز کە لەسەر جۆگە ئاوێکی تەك ڕێگاکەدا کاریدەکردو، هەر هێندەی نزیك بوینەوە خێرا ڕایکرد، ئەو (نوری)بو.

لە دەرەوەی شارۆچکەکەدا جەمیل بەگ پێشوازی کردم، لەگەڵ ئەودا ڕێککەوتبوم کە میوانی بم، ئیدی بەناو کۆڵانی تەنگەبەرو بەناو ڕیزێ ڕوخساری ماندوو و چاوی ئەبڵەقی ڕوانین دا بەرەوماڵەکەی خۆی بردم، ئا ئەوەتا بەشێکی دیکەی مێژوی ڕەواندوز دەستی پێکرد، تۆ بڵێی کۆتاییەکەی بەچی بگا؟.

◆

# بەشی سێزدە
# یوسف بەگ

چوومە ماڵی ئیسماعیل بەگ و کۆمەڵێك چەکدار دەوریاندا بووم، بە پلیکانێکی تەسکدا سەرکەوتم، دواتر دەستی گرتم و بردمی بۆ دوو ژوور کە بۆی ئامادەکردبووم. یەکێك لە ژوورەکان تەنیا کورسیەك و مێزێك و چەند ڕایەخێکی لێبوو دەبوا وەك نووسینگە بەکاری بهێنم، ژورێکی ڕوناك و باگۆڕی هەبوو، دوو پەنجەرەش کە بەسەر شەقامەکەدا دەیانڕوانی و دەرگایەکیش کە دەچۆوە سەر بالکۆنێکی بچووك. هەرچی ژورەکەی دیکەیە بچووك و تاریك بوو تایبەت بوو بەبەکارهێنانی خۆم و ئاگردانێکی گەورەی لەناوەڕاستبوو دوو پەنجەرەی بچووکی هەبوو. لەسەر هەموو دیوارەکاندا مافوری ئێرانی جوانی لە ئاوریشم دروستکراو هەڵواسرابوون، وەك چۆن ژورەکەش بەڕایەخی نایاب و مافوری جوان ڕازابۆوە. زۆر شتی لێدانرابوو کە دڵخۆشیان دەکردم، لەوانەش ئامێرێکی نوێ ی ئامادەکردنی قاوەو، سەعاتێکی زەنگلێدەر و ژمارەیەك مەسینەی قاوەی زیوو هەندێ دەگمەنی دیکە کە خوالێخۆشبوو (سەعید بەگ) کۆی کردبونەوە، ژورێکی دیکەش بۆ (سەید عەلی ئەفەندی) و سەرۆك عەشیرەتە میوانەکانی دیکە ڕازاندرابۆوە.

تا لە ڕەواندز بووین سەید عەلی ئەفەندی بەچاوی بازەوە چاودێری دەکردم، دوو یان سێ ژاندرمەش بەدواومەوە دەڕۆیشتن.

ئیسماعیل بەگ گەنجێك بوو ١٩–٢٠ ساڵ دەبوو، جلی ئەورووپی لەبەردەکرد و تەربوشێکی سووری لەسەر دەنا. ئەو ڕواڵەتێکی جوانی هەبوو پتر بەلای لاوازیدا بوو. ئەو روخسارێکی ناسك و جەستەیەکی لاوازی هەیە، رەفتارێکی ناسك و هەڵسوکەوتێکی نەرمی هەیەو، دوورە لە گرێوگۆڵ و خانە خوێیەکی لە دڵا شیرین

و زۆر خەمخۆرە. ئەو هەمیشە وریایە و، هەوڵدەدا کارێك بکا کە دروستبێ، بەڵام لەو ڕۆڵە ناسکترە کە داوای لێدەکرێ. تا لە توانای دابووە پەروەردەیەکی باش کراوە، هەرچەندە خوێندەواریەکی باشی نیە، سروشتی ئەو مەیلێکی ڕەوەندانەی تێدایە، ڕەنگە ناچاری بکا کە هەندێ کار بکا کە لە خوێنڕشتنیش ئەولا تربێ. تاپۆی کوژرانی باوکی وەك دێوەزمە بەسەریدا زاڵە، ئەو هەمیشە وادەزانێ کە دووچاری مەترسی دەبێتەوە و دەکوژرێ. (١) بۆیە بە هەر شێوەیەکی بۆی بکرێ هەوڵدەدا دوژمنەکانی لەناو ببا. باوکی بەشێوەیەکی سەر و ئاسایی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردووە، ئەمەش لەبەر ئەو هێزەی کە باوکەکە هەیبوە یان، شەرمەندەیی کورەکە هۆی ئەوە بووە لەبەر لاوازیی، بۆیە وایکردووە لەدونیای دەرەوە تەریك بێ، ئەو ڕێگەی پێنەداوە بچێتە دیوەخان یان تەنانەت فێری ئەسپ سواریشی بکا. هەرچۆنێك بێ باوکی لەلایەنی خوێندەواریەوە تەنگی پێهەڵنەچنیوە، ئەو تورکی و فارسی باشدەزانێ و شارەزاییەکی باشی لەمێژوو هەیە و ئێستا خەریکە فێری فەرەنسیش ببێ. بەهۆی ئاکاری باوکیەوە، بەشێوەی نەمامێکی لەماڵێکی گەرمدابێ، گەشەی کردووە، بەتوندی کەوتۆتە ژێر کاریگەری دایکی. دایکی ترس و گومانەکانی گەورەتر دەکرد، زۆربەی شەوان سەری ژورەکەی دەدا، بۆ ئەوەی دڵنیابێ کە نەبۆتە نێچیری بکوژێك. لە کۆتاییدا ببوە کەسێکی دەسبڵاو، بەپێچەوانەی باوکی کە ڕەزیل و قەمتەر بوو، ئەو بە بەخشندەییەوە دیاری دەدایە هەموو میوانەکانی و، باشترین خواردنێکی کە ئەوسا لە کوردستان هەبوو پێشکەشی دەکردن.

نیوەڕۆکەی گەیشتم.

لە نووسینگەکە دانیشتم، لەکاتێکدا نانی نیوەڕۆ ئامادەکرا. لەناکاو گوێم لەهەرایەك بوو کە لەسەکۆی دەرەوەڕا دەهات، دەنگێکی پیر چەند جار بە ژاندرمەکانی دەگوت (برۆ بەحاکمی بڵێ: (واتە ئەفسەری سیاسی) من لێرەم، زانیم ئەو کەسە کێیە، دڵخۆش بووم کە وشەی (ئەز)م بیست کە تایبەتە بە دیالەتێکی باکوور دوای ئەوەی لەنانی نیوەڕۆ بومەوە ڕێگەمدا بێتە ژورەوە، پیرەمێردێکی وردیلەی ڕیش تێکچڕاو بوو، سپی بوو و بەهەموو لایەکدا بڵاوبیوەوە، دووچاوی

تیژوو لوتێکی هەبوو پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشی لەسەر جل و بەرگە درێژەکەی لەبەر کردبوو جەمەدانیەکی شل و شەوی و هەرزانی لە لۆکە دروستکراو.

باویلاغای باوکی نوری دەستی بەگێڕانەوەی چیرۆکێکی مەترسیدار کردوو، بە کەسەرەوە گلەیی لەدەست ئەو بەدبەختی یە دەکرد کەبەرۆکی خۆی و کوڕەکەی گرتوە و ئەو هەژاریەی کە تووشی بووە. خۆی بەوە هەڵنا کە لە هەموو پیاو ماقولآنی ڕەواندوز ڕەسەنترە، ئەوەی کە لەڕاستیدا دەیویست لێبوردن بوو لە کوڕە خۆشەویستەکەی، بەلێنم پێدا کە ئەگەر نوری خۆیم دەخالەت بکا، واتە سەرم بۆ دانەوێنێ ئامادەم کە مەرجی بەخشندەی بۆ دانێم. باویلاغا پیاوێکی پیری بەدبەخت بوو، تاپۆیەکی ترسناك هەمیشە بە دوایەوە بوو، جێ ی سەر سوڕمانە کە مرۆڤ ئەو دەستی قەدەرە ببینێ کە هەمیشە بەر ئەو ناوچە چیاییە دەکەوێ. کەشەکەی نارێك بوو، پێشهاتی کارەساتی دەکرد. وەك ئەوەی کە هەر ماسێکی (عفریت) زۆڵ کار بۆ ئەوە بکا کە ڕەواندوز بەکۆنی بهێڵێتەوە و کۆسپ بخاتە بەردەم هەموو ئەو پلانانەی کە بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی دادەنرێن.

یەك لەدوای یەك، دوای نیوەڕۆ، پێشوازیم لە هەموو ئەو پیاو ماقولآنە کرد کە بەرێکەوت لە ڕەواندوز بوون. یەکەم کەسێکی کە هات (شێخ موحەمەد ئاغا) بوو سەرۆکی عەشیرەتی باڵەك. شێخ موحومەد ناوێکی دیارە لە کوردستان و هیچ پیرۆزیەك هەڵناگرێ و شتێك بە هەڵگرەکەی نابەخشێ. ئەو چ لەڕواڵەت و چ لە ڕەفتار زۆر بە بابەکراغای پشدەر دەچێ ئەگەر تەواو وەك ئەویش نەبێ. ئەو پەنجا ساڵ دەبێ، بالآی مامناوەندیە و کەتەیە، دەمو چاوێکی خڕو لوتێکی قەلآنگی هەیە، تۆزێك کۆمە و دەنگێکی بەهێز و ئەستووری هەیە، ئەو لەجۆری قسەکردندا ڕەوانە. جلەکانی لەشێوەی جلی خەڵکانی چیایە کە بە ئاسایی ڕەنگیان تۆخە. پیاوێکی ئاقڵە و زۆریش وریایە، بۆیە بەسەر دوبرای لەخۆی گەورەتردا بازیداوە و بۆتە سەرۆك. ئەوان دەسەلآتی ئەویان ڕەتدەکردەوە و بەزۆری بەربەرەکانیان دەکرد. بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە بەدرێژایی ئەو شەش ڕۆژە بەکێشەیەی لە ڕەواندوزدا بەسەرم بردن، ڕاوێژکاری سەرەکیم بێ. بۆیە من ڕێزم لە ئەمانەت و شێوازە نەرمەکانی پڕ لە سۆز و بەزەیی ئەو دەگرت. ئەو سەرۆکە بەتوانایە بوو کە پێشتر پشتیوانی هەموو (یاریدەدەرەکانی حاکمی

سیاسی) ڕەواندوزی کردبوو، لەو کێشانەی کە لە تەنگانەکاندا بەرەو ڕویان دەبۆوە. کە هەواڵی شۆڕشی سلێمانی گەیشت بەر لەوەی بلاْوبێتەوە، (نەقیب بیلّ) و (نەقیب کێرك) لە گوندەکەی خۆیدا کە ناوی (والاش)ە سەردانیان کردوو تاقیان کردەوە، کاتێك کە بەباشە باسی شێخ مەحمودیان کردوو هانیاندا کە ئەویش بەشداری ئەو پیاهەڵدانە بکا، بەلاْم ئەو بەهەر حاڵ، نەکەوتە ناو تەڵەکەوەو بەڵگەی دڵنیاکەرەوەی ئەوتۆی دانێ کە لایەنگیری ئەوی دەسەلماند. ئەو باسی بۆ کردم کە باوکی تەمەنی خۆی لە (١١٠) ساڵ داو، ڕۆژێك کوڕەکانی کۆکردەوە و ئامۆژگاری کردن و وتی: (هەمیشە حکومەتێك لەسەر دەسەلاْتە، کە هەندێ کات لاوازە و هەندێ کاتی دیکە بەهێز، ئەگەر بەهێز بێ ئەوا گوێڕایەڵی کردنی پوشێك ناهێنێ، بەلاْم کاتێ لاوازە، ئەوا کاتی ئەوەیە کە لایەنگیری خۆتانی بۆ دەربڕن).

شێخ موحومەد کاری بەو ئامۆژگاریە کرد. لەگەڵیدا قسەم کردوو لەکاری ناوخۆدا پرسم پێکرد، ئەویش دوپاتی ئەو شتەی کردەوە کە چەندین جار بیستبووم و یەکەمجاریان بەر لە دوو مانگ و تۆزێك، لە ساڵح بەگی خۆرانیم بیست کە یوسف بەگ هۆی سەرەکی هەموو کێشەکانەو، ئەگەر بکرێ لابردرێ ئەوا هەموو کێشەکان لادەچن.

هەر کە شێخ موحەمەد ڕۆیشت حاجی نەورۆزەفەندی و کەریماغا پێکەوە هاتن. پێشتر باسی حاجی نەورۆزم کرد، باپیری ئەو کە فارس بوو، لای پاشای گەورە چەکی دروست دەکرد. یەك یان دوو کۆنە تۆپی لای شارەوانی گەواهی ئەوە دەدەن. بۆیە پیاو ماقوڵەکانی دیکە بە غەوارەیان دادەنا. لەماوەی ئەو چوار مانگەی دواییدا بە پلەی یەکەم لەڕێ ی یوسف بەگەوە پارێزگاری لەشوێنەکەی خۆی کرد، مادام ئەو خزمەتی ئامانجەکانی یوسف بەگ دەکا، یوسف بەگیش پشتیوانی لێدەکرد، وەك چۆن لەڕێ ی زمانە پیس و جنێو فرۆشەکەیەوە دەیتۆقاند. پشێویەکانی تشرینی دووەم مێشکیان ماندو کردبوو، ئەو نەیدەزانی کە دەبێ پتر لایەنگری کامیان بێ: یوسف بەگ، یان حکومەت.؟ ئەو بەقسەکردنە خێراو پچڕ پچڕەکانی زۆری دەگوت و هەمیشەش قسەکانی دەربارەی بێتوانایی

خۆیبــو لەڕوبەڕووبونـــەوەی بـــارو دۆخەکـــە و تکـــاکردنی لـــە مـــن کـــە دەستلەکارکێشانەوەی قبولّ بکەم. بەلآم لەوکارەدا بە ئارام بووم.

ئەنجا محمود علی ئاغا و خەلیفە ڕەشـیدی بـرای هاتنـەژور. یەکـەمیان پیاوێـك بوو کە جەستەیەکی تۆکمەی هەبوو، لە ناوەڕاستی تەمەندابوو نێوچەوانێکی نزم و دەموچاوێکی کالیاری درێژی هەبوو، جل و بەرگی لە جل و بـەرگی بـاوی کـوردانی ناوچە شاخاویەکان بوو، ئەو بە سروشت لە جوتیارێکی سـاویللکەی بێبیرکردنـەوە و هەڵـسوکەوتی، تێنەدەپەڕانـد. ئـەو گـەلێ گونـدی هـەبون و نزیکـەی بیـست دەسـتوپێوەندی چەکداریـشی هـەبوو، برایەکـەی جبەیـەکی درێـژو عەمامەیـەکی لەسەرە لەوانەی کە پیاوە ئاینیەکان لەبەریدەکەن. خەلیفەش بەکەسێکی تۆبەکار دەوترێ، لە دوای گەنجیەکی پڕ لە کردار، چوبێتە ناو ژیانی ئـاینی، ئـەو پیـاوێکی پیری تائەو پەڕی ڕادە بێوەیە. دوای ئەوان قازی و پیاوانی ئاینی ناو چـەکە هـاتن و لەناو ئەویشدا (مەلا سەعید ئەفەندی) کـە پیـاوێکی لـە خواترسـی سـاویلکەیە و هیچ ئامانجێکی دنیایی نیە و لەتاریکترین ڕۆژەکانیـشدا ئـەو بەدڵـسۆزی حکومـەت مایەوە.

لە کۆتایی هەمواندا یوسف بەگ هات کە براگەورەی شـەش برایـان بـوو، چـەند گوندێکیان لە بەری ئەو دیوی لای چیای ڕەواندوز هەبوو. (ڕائیید نوێڵ) بە حاکمی ناوچەکانی دەوروبەر داینا، بۆیە دەسەڵاتێکی زۆری لە ڕواندوز و دەوروبەری پـەیدا کرد، ئەو خاوەن کە سایەتیەکی بەهێزبوو لەگەڵ زمانێکی توندی خەڵەتێنەر، بۆیە تـوانی والـە خەڵکەکـە بکـا کـە لێیبترسـن و زەنـدەقیان لێـی بـچێ. دامەزرانـدنی ئامرازی بەردەستی و خەزوری(حاجی نەورۆز) وەك حاکمی شارۆچکەکە دەسەڵاتی ئەوی پترکرد. زوڵمی ئـەو هـیچ سنورێکی نـەدەزانی، بـۆ چەسـپاندنی دەسـەڵاتی خۆی هەموو هێـزی بـەکارهێنا بـۆ چاندنی تـۆوی دوبـەرەکی لـە نێـوان سـەرۆك و ئاغاکـانی دیکـە، ئـەو خـاوەن ناوبـانگێکی خـراپ بـوو، زۆرجـاران دەچـێتە مـاڵی هەژارەکان و ژنی یەکێك لە باوەشی مێردەکەی دەردێنێ.

لەگەڵ ئـەوەی کەخەڵکەکـە بەگشتی قێزیـان لێدەبێتـەوە، بـەلآم کەسـێکیان تێدانیـە کـە جورئـەتی ڕوبەڕوبونـەوەی بکـا. بـەو کوشـتارەی کـە (پـیرە کـەپرە) بەخۆیەوە بینی و لەگەڵ لاوازبونی دەسەلآتی حکومەت، بیرۆکـەی ئـەوەی بۆهـات

کە خۆی بکا بە حاکمێکی سەربەخۆ. ئەو چەندین پیاوی هەناردەلای بارزانیەکان بۆ پشتیوانیکردنیان و، هانی براکانی و هەڵگەڕاوەکانی باڵەکیدا تاکو پشێوی و تەنگ و چەڵەمە بنێنەوە، ئیدی ترسو تۆقین لە ناو چەکەدا بلاّوبۆوە. چەند ڕۆژێك بەر لە گەیشتنم چەنجەی لەگەڵ کەریم بەگ و میر محەمەد ئەمین بەگ، کە ئەوەی دواییان خەڵکی دەرگەڵەیە، تێکە ڵکردبوو، بەنیازی ئەوەی خەزورەکەی لابداو خۆی بچێتە شوێنی ئەو، دەیویست باجی زەوی لە شوێنەکانی دەوروبەر کۆکاتەوە لەگەڵ داهاتی گومرگی هەموو کاروانەکانی کە بە وێدا دەڕۆن. هەموشتێکی ئامادەکراو بوو بۆ دەستەبەر کردنی هێزێك کە دەسەلاّتی ئەو بپارێزێ، کاتێك هاتە دیتنم، کەمێك نەبێ، شتێکی ئەو تۆم دەربارەی ئەو کارانەی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەی کە هەستم بە هێزی ئەو و کاریگەریە خراپەکەی دەکرد. ئەو پیاوێکی بالاّبەرز و تێکسمڕاوبوو، دەموچاوێکی درێژی هەبوو کە دەتگوت تەپشووە و بە چەناگەیەکی پتەو کۆتایی دەهات. ڕوخساری، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕواڵەتدا ناشیرن بوو، بەلاّم بەخەندەیەك جوانی کرد بوو. ریشوی درێژ لە جەمەدانیەکەیەوە بەسەر چاوەکانیشیدا دەهاتنە خوار، بە شێوەیەکی پلتەزمانی گاڵتەجارانە دەربارەی(حکومەتی بلیتانی) واتە حوکومەتی بەریتانیا، قسەی دەکرد، ئەگەر پێشتریش هیچ شتێکم دەربارەی نەزانیبێ ئەوا کەسایەتی ئەو هەموشتێکی پێدە گوتم. قسەکانمان هاکەزایی و سروشتێکی پابەستبونی نەبوو. لەڕۆژی دواییدا بوارم هەبو تابە شارۆچکەکەدا، یان بڵێین ئەوەی کە ماوە، بسوڕێمەوە. ڕەواندوز دەکەوێتە سەر پانابیەکی بچوك کە بەسێ چین دێتە خوارەوە. لەپشتەوەشی گرد هەنە کەبە چیایەك کۆتایی دێ کە دوێنێ بەسەریدا تێپەڕین. لە هەردو تەنیشتیدا دوو دۆڵی گەورە دەوریانداوە، کە هەریەکەیان سەدان پێ قوڵە، ئەو دۆڵەیان کە لەبەری ڕۆژهەلاّتە لە(دۆڵی ئاکۆیان)ڕا دێتە خوارێ. کە لەلای سەرەوەی شاردا درێژکی پان و بەرینە و هەردولای ڕکەو لە بەردی خۆڵەمێشی لوس پێکهاتوە، بەلاّم خوارەوەی دورشۆڕدەبێتەوە تا ئەو جێگای کە ڕێگای ئێران لێیدە پەڕێتەوە لەسەر دووریانی(جۆگەی ڕەواندوز) کە پیاوێکی چالاك دەتوانێ بازبداو لێی بپەڕێتەوە، لەلایەکی دیکەش

دەربەندی(جۆگەی ڕەواندوز) دەوری زەویەکەی داوە، کە لێرەوە بەرەو دڵی چیایەکە دەچێ.

دیمەنە سروشتیەکان لێرە زۆر جوانن، لە باکورەوە دۆڵی ئاکۆیانە کە بە کۆمەڵێ لوتکەی سەر بەبەفر کۆتایی دێ، لەلای ڕاستەوە چیای کۆڕەك دەوری داوە، کە زنجیرەیەك لوتکەیە و شێوەی دەمە مشارێکی گەورەی وەرگرتووە. لە باکوریشەوە ئەو چیا گەورە لوسەی کە پێیدەڵێن(هندرێن) و، بەرزیی (٨٠٠٠) پێ دەبێ و زیاتریش، سەریشی بەفر چەند مانگێك دەیگرێ. ئەم چیایە هەموو دیمەنی لای ڕۆژهەڵات داگیر دەکا تاکو لەگەڵ دۆڵی(جۆگەی رەواندوز) سەرەنجمان پێکدە گەیەنێ و وێنەیەك دەخاتە بەر چاو لە لوتکەی تیژ کە بەهەڵگوردی گەورە کە بەرزیەکەی(١١٠٠٠) پێ دەبێ کۆتایی دێ. لەپشت(جۆگەی ڕەواندوز) و لەنزیکەوە چیای زۆزك کە بەرزیەکەی دەگاتە(٨٠٠٠)پێ بەسەر شارۆچکەکەدا دەڕوانێ. ڕوبارەکە لەو شوێنەدا(١٥٠٠)پێ لە ڕوی دەریاوە بەرزە، بەو جۆرە دەتوانی کاریگەری ئەو بەرزیانە لەسەر دەرونی مرۆڤ درك پێبکەی. بەلای باکوری (جۆگە) دا ڕیزێك گردۆلکەی نزم هەن، بەرزیەکەیان قەڵایەکی کۆنی پاشای کۆرەی لەسەرە، دوای ئەوە دەشتێکی بچووکی بازنەیی دێ کە دەشتی دیانانە، دواتر ڕیزێك لە چیای سەخت کە لە مەودا دورەکاندا نامێنن. لە ڕۆژئاوا و لەسەر زەویەکی بڵند دەکرێ ئەو دەروەیشی کە لە نێوان چیای باڵەکیان و چیای کۆڕەك دایە کە دەڵێ ی زینی ئەسپە. جاچ کە بەرگی سپی زستانی لەبەر دابێ یان لە ژێرتیشکی هەتاوی هاوینی بەبریقەدا خۆی بشوا، من کەم دیمەنم دیوە هێندەی ڕەواندوز دڵگیر بێ.

ماڵەکەی سمایل بەگ دەکەوێتە ئەو بەشەی شارۆچکە کەماوە — واتە گەڕەکی سەرەوە. لە هەردوو بەری ڕێدا چەندین ماڵی گەورە و بچوك هەن کەپێویستی بە چاکردنەوە هەیە. هەندێ دوکانیش هەن لەگەڵ هەندێ بێستانی کە ناوە ناوە لەگەڵ ماڵەکاندا تێکەڵ دەبن، هەندێ ماڵ هەن کەدوور لەو ڕێگایە بنیات نراون، لەسەر نشێوەکان لە نێوان درەختەکانی میوە. بەرەو خوار بەبەڕێوەبەرایەتی تەلە گرافدا و بە هەندێ قاوەخانەدا ڕۆیشتین کە لەلایەن پیاوێکی ڕەشتاڵەوە بەڕێوە دەبرا کە جلێکی شینی لەبەر دابوو، کە نیگایەکی لە چاوانیەوە دەنارد

شەڕەنگێزترین دەموچاو بوو کە من بینیبم، ئەو بەمستەفا ڕێوی ناسراوە، ئیدی گەیشتینە شوێنێکی سەوزی کراوە کە لەلایەکەی دیکەوە نشێوێك دەوری داوە بەدرێژایی(٥٠٠)پێ و دەگاتە دۆڵەکە. ئەوێ ئەو شوێنەیە کە دەبێ بازاڕە پێشنیار کراوەکەی لێدروستبکرێ. پاریدە دەری حاکمی سیاسی پێشتر نەخشەی بۆ کێشاوە. ئائەوەتا بناغەی لێدراوە، لە کاتێکدا کە لە باکوری ئێمەدا خانوێکی نوێ هەیە کە حاجی نەورۆز لەو دەسکەوتەی بنیاتی ناوە کە لە بەڕێوەبەریی (مەکس) دەستی کەوتوە. دواتر بەنشێویەکی قوڵدا شۆڕبوینەوە بۆ مەودای نیومیل و لەسەر ڕێگایەکی ڕێکخراوی لەبناری بەردەکان، تاکو گەیشتینە شارۆچکەی خوارەوە، کە ماڵەکانی لە هەرە خوارێ ی زەویەکە بەتەکیەکەوە بنیاتنراون، جگە لەو ماڵانەی کە بەبەرزی دوسەد پێ دەبن و ڕێك دەکەونە سەر روبارەکە. ئێستا هەموو شتەکانی کۆمەڵێ وێرانە و دارو پەردون، هەندێکی کەم نەبێ لەو دیوارانەی کە لێرە ولەوێ بەهێزترن و نیشانەی بونی مزگەوت و بازاڕن کە پێشتر ڕێك و جوان بون. تۆزێك بەلای ڕاستداو لە لێواری روبار و بەسەر ئەو پردەی کە لەسەر دۆڵەکە دروستکراوە و ڕێگای ئێرانی بە ناو شارۆچکەکەیدا پێدا تێدە پەڕی، ماڵی موحوممەد عەلی ئاغا بوو ئەو تاکە ماڵە کە لە وێرانکردن ڕزگاری بوبو چونکە ڕوسەکان پێیان وابوو کە بۆ ئاشپەز دەستدەدا، لەگەڵ کۆمەڵێ خانوی دیکەی نوێ کە بۆ دەست و پێوەندەکانی دروستکراون، بەلام ئەوانە شێوەیەکی تەواو لە ماڵچویان نەبوو. لە کۆتایی ئەو پارچە زەویە ڕاڕەوی دەرگایەکی بچوك هەیە کە دەگاتە پردێك درێژیەکەی(٢٠)پێ دەبێ و لە مەودای(١٠٠)پێ بەرەو خوارەوە و، لە نێوان گابەردەکانەوە ئاوی(جۆگەی ڕەواندون) دێتە خوارو لێرە دا تەسك بۆتەوە. لە پشت ئەوەش ڕێگایەکی چاککراو هەیە کە دەگاتەوە سەر ئەو ڕێگەیەی بەرەو دەشتە دیانان دەپەڕێتەوە بەرەو ناوچەی عەشیرەتی دێوانە.

زۆربەی ئەو ڕۆژەم لە دیتنی دەسترۆیشتوانی خەڵکی ناوچەکە بەسەر برد، لەگەڵ وەرگرتنی هەندێ ئەرزو حاڵ کە هەمویان داوای دامەزراندن بون و ئەو فەرمانبەرە تورکانەی پێشتر پێشکەشیان کرد بوو کە لە کارەکانیان قالببونەوە، یان داواکاری قەرەبو کردنەوە بون و بازرگانەکان کە، سامانیان لەسەر ڕێی فارس تالان کرابون پێشکە شیان کرد بوو، لەگەڵ هەندێ شتی دیکەش. تاکە میوانم میر

موحوممەد ئەمین بەگی دەرگەڵە بوو کەڕێکرێکی تائەو پەڕی ڕادە بە ڕواڵەت ڕێکوپێك، کورتە باڵایەکی، ئادگار خاوەن هێڵی قوڵ و تۆخو ڕیشێکی کورتی ڕەش بوو. ئەو شتەی کە زیاتر تێبینی دەکریّ جامەدانە گەورەکەی سەری بوو کەبە زێڕ و ئاوریشم زەرکەشی کرابوو، لێوارەکانی دەهاتنەوە سەر نێوچەوانی. ئەو شەرواڵێکی بەرینی خەتخەتی لەبەر دابو کە دەرەلنگەکەی شێوەی زەنگی هەیە، ئەمەش ئەو شێوە شەرواڵەیە کە بە ئاسایی خەڵکی ڕەواندوز لەبەری دەکەن و فیشەکدانی لەسەر دەبەستن ئەو پیاوێکی خراپ نیە و لەناوەوە کەمتر دڕندەیە نەك وەك لەڕواڵەتی دەردەکەویّ.

گفتوگۆیەکی دوورودرێژم لەگەڵ شێخ موحەممەد ئاغا کرد، چەندین کاتم بەبیرۆکەی سەیر بەسەر برد. ئێستا حاجی نەورۆز دەستی لە کار کێشاوەتەوە و، تەواو، هیچ کامیش لە ئاغاکانی ناوچەکە ئەو پۆستەی قبوڵ نەدەکرد، ئەگەر ڕێگا بە یوسف بەگ بدرایە بیّ بەربەست لەسەر کارەکانی بەردەوام بیّ. بۆیە پێویست بوو کە هەموو شتێك بدرێتە دەست یوسف بەگ. ئەمەش لەگەڵ هەموو ئەو خراپەکاریانەی کە هەیبو، ئێستا کاتی ئەوە بو کەیان پۆستی حاکمی شاری پێشکەشکریّ یان لێی دەربازبین. وەلە بەر ئەوەی کە تەنیا(٥٠)ژاندارمەم هەبوو، لەبەر ئەوەش کە کەمشتێکم دەربارەی باری ناوخۆ دەزانی و وەگ چۆن شتێکی ئەو تۆم دەربارەی ئاغاکانی ناوچەکە نەدەزانی، ئەوا ئەگەر تەنگژە و ئاستەنگ دروستبونایە پەنام بۆ کاری یەکەم دەبرد: (دەستتان مەخەنە ناو ئاگر) . هەرچۆنێك بیّ، قەدەر هات و، ڕۆژی دواتر بەشێوەیەکی دراماتیکی کارەکەی تا ئەو پەڕی ڕادە بۆ یەکلا کردمەوە.

دوای نیوەڕۆ سەردانی حاجی نەورۆزم کرد، دەستی گرتم و بردمی بۆ دیوەخانە جوانەکەی و لەپیاڵەی ژێرکاسە زیودا چای پێشکەش کردم یوسف بەگیش لەویّ بوو، وتی ئەوشەوە دەچێتەوە بۆ گوندەکەیان تکام لێکرد بۆ ڕۆژی دوایی بمێنێتەوە و سرتەی ئەوەم بۆ کرد کە مانەوەی بۆ ئەو سودی تێدایە.

ئەو ئێوارەیە بۆ یەکەم جار ، چاوم بە کەسایەتیەکی سەرچلی دیکە کەوت کە قەدەر کردیە بەلایەك بەسەرماڵەکەی و شارۆچکەکەی و تارادەیەکیش بەسەرمنیشدا، مشتومڕەکە بەکوردی هێند درێژەی کێشا تاگەیشتە ئاستی

بێزاربون، وا دەرکەوت کە کۆتایی نەبێ ئەمەش لەژورێکدا بو کە گەرمایی تیدا بەرزببۆوە بۆیە لەگەڵ(سەید عەلی ئەفەندی) ، ئەفسەرە عەرەبەکەم بەسەر گردێکی بچوك کەوتین کە کێلی گورەکانی گۆرستانی تێدابلاو ببۆوە و دەکەوتە سەرەوەی شارۆچکەکە دودرەخت لەسەر لوتکەکەی هەڵچوبون، لە ژێریاندا وەستاین و سەیری دیمەنە جوانەکەمان دەکرد و چێژمان لە هەوا پاکەکە وەردەگرت. یەکسەر باویلاغام دیت لەگەڵ گەنجێك لەتەنیشتیەوە دەڕۆیی لەگەڵ دوپیاو کە لە تەنیشتیانەوە دەڕۆیشتن زانیم کەگەنجەکە نورەیە بۆیە وەستانێکی ناپلیۆنانە وەستام و چاوەڕێی هاتنی بوم گەیشتنەجێو لەبەردەمم وەستا دەمێك شەرمن و دەمێك ڕکابەر لە کاتێکدا باویلاغا بە کۆمەڵێ ئاماژەوە قسەی دەکرد، تکای لێدەکردم کە لە کوڕەکەی خۆشبم و بەباشی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەم، ئەو خۆبەدەستەوە دانە زۆر سەیربوو، ئەوە نوریە و پرچەکە، دەمانچەو خەنجەری پێیەو، دوو پیاویشی لە پشتەکە تفەنگیان پێیە، لەکاتێکدا لە دەمانچەك زیاترم پێنەبوکە لە گیرفانم دانابو ژاندرامەیەکیش لەوێ نەبو. ئەو بێگومان سەرنج ڕاکێشبو، بالآبەرزێکی زۆر لاوازبوو، بەفێڵ و فرو زیرەك، دو چاوی تیژو تاڕادەیەکیش زەق، کە دەم و چاوێکی درێژو بێڕەنگیان داگیر دەکرد، ئادگاری بە شێوەیەکی نایاب ڕێکو، وەك سەرکردەیەك دەچو کە لە هەولێدا شکستی خواردبێ. وتم: (شێوەی ئەو دەخالە تە چۆن؟) ئاماژەم بۆ چەکەکەی و دوپیاوەکەی کرد، فەرمانم پێدا کەبڕواو سبەینێ بێتەوە تاکو ملکەچی ڕاستەقینەم پێشکەش بکا و بەڵێنم پێدا کە مەرجەکانم هاسان دەبن ئەگەر وابکا.

بێ ئەوەی وتەیەك بڵی ڕۆیشت، ئەو دەم باویلاغا منگەی دەهات. ڕۆژی دواتر، واتە(١٢)ی کانونی یەکەم ڕۆژێك بو کە لەبیر ناکرێ بەیانیەکەیم لە ژورەکەمدا بەسەر برد و کارەکانی خۆم دەکرد و ئەو کەسانەم دەدیت کە دەیانویست بمبینن نزیك نیوەڕۆ لەکاتێکدا بە باڵکۆنە بچوکەکەدا ڕۆیشتم کە بەسەر شەقامەکەدا دەیڕوانی، هەرایەکم بەرگوێ کەوت کە لەشارەکەدا دەنگیدەدایەوە، دیتم خەڵك بە هەمو لایەکدا ڕایان دەکرد، هاواریان لەشارۆچکەکەدا دەنگی دەدایەوە، دەرگا دادەخران و دوکان دادەدرانەوە، کەشێك بوو کە ڕەنگە مرۆڤ نەتوانێ ناوەڕۆکەکەی بزانێ، تەنیا ئەوانە نەبن کە خەڵکی شارێکی سەرەتایی ڕۆژهەلآت

بن کاتێك پێشوی لە ناکاو دەکەوێتەوە. ژاندارمەکانم بە خێرایی کۆبونەوە، فیشەکیان لەتفەنگان داگرتەوە، هەرچی لە ماڵەکەدابو بەبێدەنگی و شڵەژاوی و وریایی مانەوە. هیچ تەقەیەك نەکرا، لەناکاو هەرایەکە بەهەمان خێرایی کە دەستیپێکرد، کپ بوەوە. خەڵکەکە دەستیان بەکارە ئاساییەکانیان کردەوە، کەسێکم نارد تا لەسەر چاوەی ئەو شتە بکۆڵێتەوە کە شاری پڕ ترس و تۆقین کرد. کاتێك کە لەباتاس بوم عەبدوڵلا پاشا باسی ئەوەی بۆ کردم کە یوسف بەگ رانە مەرێکی، کە هی یەك لەجوتیارەکانی بوو ناوی(خورشیدبەگ) بوو، موختاری گوندی (باپشتیان)بوو وەپێش خۆ دابوو، عەبدوڵلا پاشا نوسراوێکی پێدابو کە داوای لەو تاوانبارە دەکرد کە ئاژەڵەکان بۆ خاوەنی بگێڕێتەوە. ئەوەش کە لەڕاستیدا ڕویدا بوو ئەوە بوکە لەو چرکەیەدا خورشید بەگ لە دەرەوەی ماڵی حاجی نەورۆزدا یوسف بەگ دەبینێ و نامەکەی دەداتێ و داوای ئاژەڵەکان دەکا. یوسف بەگیش یەکسەر ئەو پیاوە بەدبەختەی بەوەتاوانبارکرد کە لە بەرامبەر پاشادا ناوی زڕاندوە و، ئیدی کۆڵێ جنێوی پێدەدا و دواتر بانگی دەست و پێوەندەکانی دەکاو ئەوانیش دەوری ئەو پیاوە بەدبەختە دەدەن و بەقۆنداخان لێی دەدەن. ئیدی شەڕ دەقەومێ، لە کاتێکدا کە هەردوو دەستە لەوە دەبن کە تفەنگەکانیان وەگەڕخەن، حاجی نەورۆز لە ماڵەکەی دەردەپەڕێ و وەك باوی خۆی هەڵدەچێ و داوای لە هەردو دەستە کرد کە لەوێ نەمێنن، ئەو دەم لێکدەبنەوە و هەریەك بەڕێی خۆیدا دەڕوا لەو هەواڵە زۆر تورە بوم، چونکە پێم وابو کە هەولێکی ئاشکرایە و یوسف بەگ بەهۆیەوە سوکایەتی بە دەسەلاتی من دەکاو هەوڵدەدا کە بمترسێنێ تاکو شارۆچکەکە جێبێڵم، بە دوای هە دوو دەستە کەمدا نارد کە هەر ئێستا بێن، تاکو گوێم لە بیروڕای هەریەکەیان بێ و کارەکە یەکلاکەمەوە. وەکچۆن بە دوای هەریەك لە سمایل بەگ و شێخ موحەممەد ئاغا و حاجی نەورۆزم دا هەنارد تابێنە نوسینگەکەم و پشتیوانم بن لە ناوبژیەکەدا، فەرمانیشم لە حاڵەتی ئامادەباشی دانێ لە دەرەوە و چەکی ئەوانەش داماڵێ کە دێنە ژورەوە هەردو دەستە ڕکابەرەکە یەکسەر ئامادەبون، گوێم لە یوسف بەگ بو کە لای دەرگاکە مشتومڕی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا، دەمانچەو خەنجەرەکەی دانا، لەلای ڕاستم لە نزیك پەنجەرەکە دامنا، لە کاتێکدا خورشید بەگ لە نزیك

دەرگا لە کۆتایی بەرامبەری لە ژوورەکە دانیشتبو. یوسف بەگ هەوڵیدا قسە بۆ من بکا بەڵام من ڕوم لەویدی کرد و وتم لەبەر ئەوەی کە داواکار ئەوە، یەکەمجار گوێ لەو دەگرم. ئەویش دەستی بەقسان کرد، بەڵام یوسف بەگ هەموو دەقیقەیەك قسەی پێدەبڕی، چەند جار پێمگوت چاوەڕێکا تا نۆرەی دێ، لەدواییدا کە بینیم وازناتهێنێ روم تێکرد و بەڕەقی فەرمانم پێدا کە دەمی خۆی بگرێ. ئەو دەم داوای ڕۆیشتنی کرد، داوام لێکرد بمێنێتەوە، ئەو دەم هەڵساو ڕوی لە دەرگا کرد، ئامارژەم بۆ سەید عەلی کرد و ئەویش بەخێرایی بروسکە تاویدایە.

ئەنجام ململانێ ڕویدا، چونکە یوسف بەگ وەك شێر بە هێزبوو، بەڵام کارەکە هەر چۆن بێ سەید عەلی بەسەریدا زاڵبوو بە هەولێکی زۆر توانی بیجوڵێنێ و لەنزیك پەنجەرە بە دیواری دابدا لەناکاو یوسف بەگ ڕوی وەرگێڕاو سەیری خوارەوەی شەقامەکەی کرد و بانگی پیاوەکانی کرد و هاواری کرد:(وەرن ئەو کافرانە بکوژن) . ئالێرەدا سەید عەلی جارێکی دیکە شالاوی بۆ برد، لەلای پەنجەرەکەی ڕاکێشا و سوڕاندی و بەلایداهێنا، وەك پشیلەیەك بەهاوار و تورەیی هەڕەشەی لێکرد. زنجیرەی تاوانە زۆرەکانی ئەوی بۆ دەژمارد: (تۆنەبوی لەبێخاڵ هێرشت کردە سەر کاروانەکە؟ تۆنەبوی........؟) تاکو بەیدەستی کرد و، پێنج شەش ژاندارمە لەهەمانکاتدا هاتنەژورەوە و قەمەیان لە تفەنگەکانیان خستبو. ئەو دەم یوسف بەگ وازی لەملەکردن هێناو بەگلەیی و شلی پشتی بە دیوارەکەدا. لێرەدا لە شوێنەکەم هەستام و لە پەنجەرەکەوە ڕوانیم، بیست یان سی ژاندرمەم دیت کە چەکەکانیان ئامادەکرد بوو لە ناو شەقامەکەدا، لە کاتێکدا تەواو لەبەرامبەر یان لە بەرامبەر دیوارەکان و چەپەرەکان و لە پشتیانەوە دەستەی بەرامبەر دەهاتن و دەچون، ئەوان هێندە نزیك بون کە ژاندارمەیەکم توانی بەهاسانی لولەی تفەنگەکەی دوژمنەکەی بگرێ.

هیچ تەقەیەك نەکرا، خۆشبەختانە یوسف تەنیا هەشت کەسی لەگەڵدابوو. پیاوەکانی حاجی نەورۆزیش نەچونە پاڵ ئەوان چونکە گەورەکەیان لەژورەوە لەگەڵ مندابو، بۆیە دوای دەقیقەیەك یان دوان، بەخێرایی بەرەو گوندەکانیان چون و هەواڵەکانیان ڕاگەیاند، بۆ ئەوەی عەشیرەتەکەیان بوروژێنن لەو کاتەدا لەژورەکەم دا دەهاتم و دەچوم و بیرم لە ئەنجامەکەی دەکردەوە، تەنیا شتێك

ڕون و ئاشکرابوو، ئەویش ئـەوە بوکـە هـەر هـەوڵێك بـۆ لەشـار چـونە دەرەوە بـە کارەساتێك دادەنرێ. حاجی نەوڕۆز خێرا هاتەبەر دەمم و خۆی لە بەرپێدا فرێـدام و داوێنی گرتم و داوای بەزەیی.کرد تاکو زاواکەی بەردەم و پەیمانیدا کـە لەئێـستا بەدواوە کێشە و ئاستەنگێك دروستناکا. ئامادەبوانیش دەنگی خۆیان خـستە پـاڵ دەنگی ئەو، ئەمەش هەر روکـار بـوو زیـاتر نـەك سـۆز بـێ بەرامبـەر ئـەو زۆرداره. لەدواییدا فەرمانم بە سەید عەلی کرد کە کۆت و بەنـدی یوسـف بکـا و لـە ژورێکـی دیکەی داخراوی دابنێ. پاسەوانی بۆ دانێ. دوای بیرکردنەوەیـەکی زۆر، بڕیـارم دا بۆ (ڕائید مید لتۆن)ی بنێرم، ئەو لەگەڵ دەستەیەکی پیادە بو لای کانی وەتمـان، تکای لێبکەم کە لە یەکەم هەلدا ڕەوانەی هەولێری بکا.

لەهەمانکاتدا ئاغاکانی ڕەواندوز هـەمویان هاتنـەلام و خزمـەتی خۆیـان خستە بەردەستم، ئەگەر عەشیرەتی یوسف بەگ هێرش بکەن. ئەوانـە بـرا دەرانێـك بـون کـە پێـشهاتی مەترسـیان دەکـرد، بـەلام مـن تـەنیا(موحەمـەد عـەلی ئاغـا) و (مـیر موحەممەد ئەمین بەگ)م لەگەڵ خۆمدا هێشتەوە. دوای نیوە ڕۆمان لە بارێکی پـڕ مەترسیدا بردەسەر. ئەگەر هێرشە کە بهاتایـە ئـەوامن نـەردێکی بردنـەوەم هـەبو، مەبەستم یوسف بەگ خۆیەتی، بۆیـە ڕامگەیانـد کـە دەبـێ لەگـەڵ یەکـەم تەقـەدا بکوژرێ .

ئێوارەکەی هەموو پیاو ماقوڵانی ڕەواندوز، یەك لە دوای یـەك، هـاتن و تکایـان دەکـرد کـە ئـەو پیـاوە بـەردەم، ئـەم عـورف و عادەتـە شـتێکی سـەیرە، چـونکە کەسێك، ئەگەر دوژمنـی سەرسەختی خۆی بکەوێتە دەستی حکومەتەوە، ئـەوا دێ و تکای بۆ دەکا، ئەویش وەك پێشتر باسم کرد دڕندەیەکی بێ وێنەیە و نابێ هـیچ کوردێك بکەوێتە بەر کەڵبەکانی، لەم حاڵەتەدا تکاکاران پێیان وابو کە لەکۆتاییـدا هەر بەرەڵای دەکەم و، ئیدی کـاری چـەو سـاندنەوە و زوڵـم دەکـا و لـە جـارانیش زیاتر، بەلام بۆ ئەوانەی کە لە کاتی تەنگانەدا دەستی یارمەتیان بۆ درێژنـەکردوە. لەسەر لاملی خۆم مامەوە، ئیدی ئێوارە داهات و شـاندێك لـە هـەمو پیـاو مـاقوڵان هاتن تکای بەرەڵاکردنی ئەو پیاوەیـان دەکـرد و پرسـیان کـە ئەگـەر بەرەڵاشـی نەکەم چی لێدەکەم؟ بۆ ئەوەی گومانێکیان نەبێ بەڕونی باسم لە سزایەك کرد کە ژمارەیـەك تفـەنگ و دابینکاریـەکی پـارە کـە بـدرێ وتکـام لێکـردن کـە تابـەیانی

چاوەڕێکەن، ئەودەم من بڕی داواکراوم دیاریکردوە. دواتر تکا یان لێکردم ڕێگە بدەم یوسف بەگ قسەم لەگەڵدا بکا، سەرەتا ڕەتم کردەوە، بەڵام پتر داوایان کرد، ئیدی بانگم کرد

بەکەلەمچەکراوی هێنایان و پاسەوانی لەدەورەبو. لەبەردەمم بەچۆکداهات پێکەنینێکی بیمارانەی کرد و، سوێندی بەئیمان دەخوارد و بەپلتەپلت دەیگوت کە تاماوە دڵسۆزی(حکومەتی بەریتانیا: بلیتیش گۆڤرمێنت)ەو لانادا، ورە بەرزەکەی نەماو لەگەڵ مەترسیدا توایەوە ئێستا دیمەنێکی ترساوی هەبو، بەسوپاسەوە وەڵامی پێشنیارەکەی ئەوم دایەوە، وتم کە لەکاری سزادانەکەی دەکۆڵمەوە و بڕیار لەسەر شێوازو مەو داکەی دەدەم، لە کاتێکدا کە وەستاوەکان بەو هیوایە دڵنیایان دەکردەوە کە سبەینێ بەرەڵلا دەکرێ. بردیانە دەرەوە و جارێکیدی دەمو چاویم نەدیتەوە. هەر هێندەی میوانەکانم ڕۆیشتن بانگی(سەید عەلی) م کرد کاروباری ئەو پاسەوانانەم ڕێکخست کە لەگەڵ بەندیەکەیانداو لە نیوە شەودا بەڕێدەکەون. ئەو شەوە زوچومە ناو جێگاوە بەلام نەمتوانی بخەوم. بەرلە سەعات دوازدەی شەو لە ژورێکی نزیکەوە ڕستێك هاواری ترسێنەرم گوێ لێبو کە لەگەڵ پاڕانەوە لە خودای گەورە و میهرەبان و هاواری یارمەتی بۆ شێخ موحەمەد ئاغا ئیسماعیل بەگ و ئەوانی دیکە تێکەڵ دەبو،(هاوار) کردنە خەڵك یان داوای بەهانا هاتنی عەشایەری لە کاتێکدایە کە پێویستی کوردێك بۆ کوردێکی دیکە لە ئەو پەڕی ڕادەی پێویستی دایە، بەشێوەیەکی ئاساییش دەبێ بەهانایەوەبێن. بەلام ئێستا هاوارە تێکەڵ بە بێ هیواییەکەی یوسف بەگ کەس بەهانایەوە نەهات، ئەو هاوار هاوارە پێنج تا دە دەقیقەی خایاند، دواتر دەنگی پێ ی کۆمەڵێك کەس لە حەوشی خوارەوە هات، هاتمە خوارەوە بینیم کە سەید عەلی لەوێیە، پێی گوتم کە پێنج کەس لە پیاوە بەهێزەکان توانیویانە بەندیەکە دەمبەست بکەن و بیگوازنەوە و لەو کاتەدا دەستی دۆسێیەکیانی گەستوە. ئەو لەسەر پشتی ئەسپ دانەنیشت و هەر بۆی هەڵکەوتایە خۆی فریدەدا خوارەوە، دواتر ناچار بەسەرپشتی وڵاغەکەیانەوە بەستەوە، لە تاریکیەکەوە توانیم گرمۆڵەیەکی خڕکراوە لەسەر پشتی یەکێك لەئەسپەکان ببینم. شەوێکی بێدار و بە دڵەڕاوکێم بەسەر برد، بەلام دواتر خەو لە باوەشی کردم، سەعات حەوتی بەیانی

لە ناکاو لەخەو ڕابوم و بینیم کە سەید عەلی بەتەکمەوە وەستاوە، ڕەنگی تێکچو بو، هاوارم کرد: (چیە ئەو ڕایکرد؟) وەلآمیداوە: (نەخێر ئەو مرد). لەو هەواڵە تۆقیم، بەلآم لە قولآییمدا شاردمەوە. یوسف بەگ کە بەزیندویی بارمتەبو لەبەر دەستمدا بەهایەکی گەورەی هەبو، لە کاتێکدا مردنی ئەو هۆزەکەی دەوروژێنێ یەکسەر ڕادەپەڕن.

ڕاستی مردنەکەی شتێکی سەیر بوو، سەید عەلی بۆی گێڕامەوە: نیومیل لە دەرەوەی ڕەواندوز ژاندرمەکان تێبینیان کرد کە جەستەی ئەو لە هەناسەدان کەوتوە، هەرکە سەیریان کرد بینیان مردوەو دەمی خوێنی لێدێ، مردنەکەش بۆ خنکان دەگەڕێتەوە، ئەگەر ئەو توندو تیژیە لەبەر چاوبگیرێ کە نیشانیدابوو دەبوایە بەتوندی دەمبەست بکرێ. لەکاتی بەستانەوەیدا وەك گیانەوەری کێوی لەزۆراندابو، لەو چەند دەقیقەکەمەی گە شتەکەشدا لەبەر ئەوەی هێزی نەمابو نەیتوانیبو هەناسەی تەواو هەڵکێشێ و هەناسەدانی ببوژێتەوە.

پاسەوانەکانی، کە دوازدە کەسبون، لەژێر فەرماندەیی کوردێکی سلیمانی بون کە ناوی(ڕەسوڵ چاو ڕەش)بوو. کە حازر بەدەستێکی زۆر باشبو، هەر هێندەی بەمردنی بەندیەکەی زانی ئیدی لەسەر گەشتەکەی بەردەوامبو، وەك ئەوەی هیچ شتێك ڕوینەدابێ. کە لەناو دەربەندەکەبون و دیتبویان کۆمەڵێ خەڵك بەرەو ڕویاندێن و، دەرکەوت کە بریتین لە جەمیلاغای گەردی و دەستو پێوەندەکانی و، من بانگێشتم کرد بون. چاوڕەش کاروانەکەی خۆی شاردبۆوە نەوەك پرسیاری ناخۆشی لێبکرێ. هەر کە گەیشتبوە کانی وەتمان، سوربو کە ئەفسەرە هیندیەکان دەبێ (رائید میلتۆن) بەخەبەر بێنن، تاکو ئەو نوسراوەی بداتێ کەمن بەکورتی تێیدا نوسیبوم: (ئەوە یوسف بەگە، پیاوێکی زۆر ترسناکە، ڕاکردنی ئەو دەرەنجامێکی خراپی دەبێ، تکایە لە پاسەوانی کردنیدا وشیاربن، لە یەکەم هەلیشدا ڕەوانەی هەولێری بکەن). رائید میلتۆن، لەخەو ڕادەبێ، بەلآم لەبەر شۆك گرتن دەلەرزێ کە دەبینێ بەندیەکە لاشەیەکی ساردە.

دوای ئەوە پێیوتم کە هیچ شتێکی لە دەم و چاوی مردوی یوسف بەگ ناشیرنتری نەدیوە، دەیەوێ کە تەرمەکە بەرەو باتاس بنێرێ، بەلآم ڕەسوڵ چاوڕەش ڕازیدەکا بەوەی کە پاراستنی نهێنی تاکو لە توانای دایە، کارێکی

پێویستە وەکچۆن سوربو لەسەر ئەوەی کە لاشەکە هەر ئێستا بنێژرێ. هەندێ لە ئەفسەرە هیندیەکانی نارد تاکو بێل و پاچ بهێنن و لەتاریکیدا تەرمەکەی یوسف بەگ بشارنەوە. لە ڕائید میلتۆن و چەند ئەفسەرێکی هیندی و هەندێ پاسەوان بترازێ، کەس بەو هەواڵە نەزانێ.

هەواڵەکە بلاّونەبۆوە تەنیا ئەو دەم نەبێ کەمن کاتەکەیم هەڵبژارد واتە دوای(٤٨) سەعات چونکە نهێنی گۆڕەکەی یوسف بەگ شاراوەبو کەسێك لەسەر ڕێگا ئەوی نەدیبوو، دانیشتوانی کانی وەتمانیش هەواڵێکیان نارد بوو کە یوسف بەگ لەگەڵ سەربازەکانیشدا نەبوە، هەمو ئەمانە خێرا گومانی خەڵکەکەی وروژاند. نهێنیەکەم لای شێخ محەمەد درکان، لەسەرەتادا تۆقی، دواتر لەگەڵ مندا لەسەر ئەوە ڕێککەوت کە ئەوە باشترین شتێکە کە ڕویدابێ. وتی: مردنی یوسف بەگ بەرامبەر هێنانی دوو فیرقە سەربازە بۆ ڕەواندوز.

کاتێك دڵنیام کردەوە کە مردنی ئەو بەبێ ویستی من بوە، بەقسەکەم خەندەیەکی کرد، وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ: (ئێمە هەمو ئەوشتانە دەزانین) دواتر وەڵامی دایەوە: (ئەوە شتێکی ئاساییە) ، ئەو شاندەی کە دوێنێ شەو تکایان لێکردم، سەردانیان کردم، شتێکیان نەدەزانی هێندە نەبێ کە ئەو دورخراوەتەوە سوپاسیان کردم بۆ(ڕزگارکردنی ئیسلام لەو کافرە). پیاوەکانم پێیان ڕاگەیاندم کە خەڵکی شار زۆر دڵخۆشن لە ڕەواندوز وەك جەژنێك ئەو ڕۆژە ئاهەنگ گێڕاوە.

ڕۆژێك دوان، لە حاڵەتی وریاییەکی زۆردا مامەوە، بەلاّم هۆزەکەی یوسف بەگ لە گوندەکانی خۆیاندا مانەوە. براکانی هێزیان کۆکردەوە، بەلاّم کە نامەیەکیان لە حاجی نەورۆزەوە پێگەیشت ئیدی وازیان لەوە هێنا، چونکە وتبوی کە یوسف بەگ سەلامەتە و ڕەنگە بەرەڵلاّ بکرێ و لە کاتێکدا هەر جوڵانەوەیەك لە لایەن ئەوانەوە ڕەنگە کارەکە خراپتر بکا. ئەوانەی کە زۆر گرینگ بون سێ کەس بون: ڕەشید بەگ و بەکر بەگ و بەگۆك، ڕەشید بەگ زڕبرای یوسف بەگ بوو زۆری بەدەست یوسف بەگەوە چەشتبو، ئەو پیاوێکە لاواز بو، بەلاّم دڵسۆزبوو، بەلاّم دوانەکەی دیکە برای لەدایك و باوکی بون. یەکەمیان لاواز و کەسایەتیەکی ئەو تۆی نەبوو، بەگۆکیشم هەر نەدیتبو. کە گەنجێکی بەڕە ڵلاّبوو بۆ ئەوە دەژیا کە تۆڵەی براکەی بکاتەوە. بەیانیەکەی سێزدەی مانگ جەمیلاغا بەخۆو

بەنزیکەی(١٥) کەسەوە گەیشتنەجیّ. یەکسەر پرسی بۆچی داوات نەکرد (٢٠٠) کەس لەگەڵ خۆمدا بهێنم، دواتر شانازی بەوە کرد کە چۆن گەیشتنی ئەو من و بارودۆخەکەی ڕزگار کرد. ئەو برادەرێکی کۆنی باویلاغا بوو، هەر خێرا داوای بەزەیی لێکردم کە دەخاڵەتی نوری قبوڵ بکەم. لەژێر قورسایی ئەو بارو دۆخەی ئێستادا باشتر وایە کە بیمەیەکی پارەی کاشم لانەبیّ. چواردەی مانگ بیّ چەك هاتەلام و، گفتوگۆمان درێژەی کێشا، تکای لێکردم کە وەك ئەفسەری ژاندارم لە هەولێر دایمەزرێنمەوە، چونکە دوای ئەوەی ڕویدا نەمدەتوانی لە ڕەواندوز دایمەزرێنمەوە.

لەوسیّ ڕۆژەی دوایی کە لە ڕەواندوز مامەوە هەوڵێکی زۆرمدا تا ماڵ و موڵکی بەدبەختەکە بگێڕمەوە، ئەوانەی لە تشرینی دووەمدا کاروانەکەیان تالآن کرابوو. تاوانبارە سەرەکیەکان خەڵکی (مەرگە)بون، ناوچەی دزان، کە زۆر جار تورکەکان ویستبویان وێرانی کەن. ئەم گوندە دەکەوێتە خوار ماڵی شێخ محەمەد ئاغاوە، لەناوچەی باڵەك، خەڵکەکەشی کە(٥٠) خانەوادە دەبن خزمی ئەون. لەبەر ئەوەی لەڕەچەڵەکێکی ئاغان ڕاهاتبون ئەوان کاری کشتوکاڵیان بەشەرم دەزانی و بەکارێکیان دادەنا کە لەگەڵ کەڕامەتی ئەوان نەدەگونجا، بۆیە دوو ڕێگەیان بۆ بژێوی لەبەردەمدابو: یەکەمیان پشتبەستن بە بەخششی شێخ محەمەد ئاغا، کە ڕاهاتبو تاکو بەهێمنی بیانهێڵێتەوە زۆربەی مانگانەکەی خۆیان پێبدا، دوەمیش تالآنکردنی ئەو کاروانانەی کە بەڕێگای فارسدا دەڕۆیشتن و سەرانە لێوەرگرتنیان. لەبەر ئەوەی هیچ هۆکارێکم نەبو بۆ سزادانیان و لەسەر پێشنیاری شێخ محەمەد خۆی، خەلیفە ڕەشیدم ناردە لایان، کە بەگشتی پیاوێکی بیّ وەی و گفتوگۆکەر بوو،

بەلآم کە هەواڵی گرتنی یوسف بەگ تۆقاندبونی، بەڵێنیاندا کە هەموو ئەو شتومەکە تالآنکراوانە بگێڕنەوە کە دەتوانن کۆیکەنەوە، بەو مەرجەی کە لێخۆشبون بۆ هەموان دەربچیّ. لەگەڵ ئەوەشدا کەمێکیان لەو شتومەکانە گەڕاندەوە، چونکە زۆربەیان بەکارهێنابوو. لە ئێوارەی سێزدەی مانگدا سەرۆکانی شێروان و برادۆست گەیشتن و نزیکەی پەنجا دەست و پێوەندیان لەو کوردە ڕەوەندە خۆڕسك توندو تیژانە لەگەڵدابو کە کەش و هەوا قاڵی کرد بون. ئاغاکانی

شێروان سێیان بون و لەبەراییاندا پیاوێکی باشی ریش سپی و شەلەبو کە ناوی(ئەحمەد ئاغا) بوو. ئەو خەندەیەکی شیرین و دەنگێکی گڕی هەبو کە بەهاسانی لە وشەکانی نەدەگەیشتی، لەشێوازدا سوك و سانابو، پیاوێکی دڵسۆزبو، قسەکانی ئیمانداری پێوەدیاربو، کردارەکانی دوایشی سەلماندی کە ئەو لەخواترسێکی دڵسۆزە. موحەممەد سەعید بەگ، سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست، پیاوێکی چکۆلەو پیربوو دەنگێکی ناخۆشی هەبوو. یەکسەر نازناوی(پیرێژن)م لێناو لەبەد بەختیان ئەو نازناوەی بەرگوێ کەوتەوە و، سوێندی خوارد کە دەبێ تۆڵەی ئەو نازناوە بکاتەوە و بیسەلمێنێ کە ئەو پیاوە، نەك ژن، بەلام بەهەر حاڵ ئەو سوێندەی خۆی بەجێنەهێنا. ئەو کاریگەری لە عەشیرەتەکەی کەمبوو خەریکبو یەکبەیەکیان لەسەر دەستی روسەکان لەناوبچن، وەکچۆن لە ئازایەتی شەڕدا ناوبانگێکیان نەبو.

ئەو شەوەی ئەو سەرۆکانە گەیشتن، نانی ئێوارەیان لەگەڵ مندا خوارد و، ئیسماعیل بەگ خوانێکی گەورەی ڕازاندبۆوە. [٤] ئەحمەدی پیری ساویلکە کەبە گۆچانەکەی دەڕۆیی شوێنێکی لەلای خوارەوە گرت، زۆر بەگرانی وایانلێکرد بێتە شوێنێکی سەرەوەتر، دوای نانخواردن لەسەر بارودۆخەکە دواین، دیتم کە ئەوان، بەدو ڕای سەرەکیەوە هاتون، یەکەمیان: ئەوان لایەنی دروستبگرن ئەگەر حکومەت کارێکی دیکەی تەمێ کردن پیادەبکاو، دوەمیشیان موچەکانیان بگەڕێتەوە کە لەکاتی چۆڵکردنی ڕەواندوز برا بوو.

لەئابدا، ئەحمەد ئاغا بەڵێنی دا، پێم وایە کە لەبەڵێنەکەشی دڵسۆزبو، کە بکوژان بگرێ، چی پێبکرێ لەوبارەیەوە درێخی نەکا. بەلام دەرکەوت کە بێ یارمەتی هێزەکانی حکومەت ئەو لەوە بێتواناترە کە کارێکی ئاوا ئەنجامدا، (محەمەد سەعید بەگ) بە بەردەوامی و بە دەنگێکی لاواز پشتگیری ئەو قسەیەی دەکرد، چونکە ئەو دەترسا و خەمباریش بوو بەرامبەر زیندانی کردنی یوسف بەگی خزمی. لەماوەی(١٤) و (١٥)ی مانگ مێشکم زۆر ماندوبو، چونکە ڕێکخستنەکانی حکومەتی داهاتوی ناوچەکەم ئامادە دەکرد. یوسف بەگ بەرێ ی خۆیدا ڕۆیشت، حاجی نەورۆزیش بەبێ ئەو حاڵی لەوە خراپتر بوو کە چاوەڕوانی سودێکی لێبکرێ، گفتوگۆم لە گەڵ شێخ محمەد ئاغا لەو بارەیەوە درێژەی کێشا،

پێشنیاری پۆستی (حاکم)م بۆ کرد، وەکچۆن پێشبینیم کرد بوو، ڕەتی کردەوە. لەبەر ئەوەی عەشایەری بوو، ڕقی لە شارۆچەکەکەو شێوازەکانی بوو، سروشتی وابو کە حەزی لەژیانی ناو خەڵکەکەی نە دەکرد، حەزی نەدەکرد هەوڵ بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاغاکانی ڕەواندوز بدا، کە پیلانچی و خوێنخۆربون. لەگەڵما لە بارودۆخەکەی کۆڵیەوە و ئەگەر هەوڵدرێ کە ناوچەکە کۆنترۆڵ بکرێ سوربو لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەفسەرێکی بەریتانی و سوپایەکی چەکداری گەورەی لێبێ. ئەو ڕقی لە دامەزراندنی میر کورەکان بو وەك شێخ مەحمود، هەمیشە ڕەخنەی لەمللەتێك دەگرت کە خۆی یەکێك بو لەوان، هەموو جار دووبارەی دەکردەوە: (کورد بەزگماك سەرەتایین و شتێکی نەبیبنن باوەڕیان پێینیە) .

لە کۆتاییدا، پێشنیاری کرد، وەك ڕێوشوێنێکی کاتی، داوا لە(سمایل بەگ) بکەم پۆستی(نوێنەری حکومەت) قبوڵ بکا. لەبەرامبەر نارازیبونەکانی من. بەوەی کە تەمەنی بچووکە و شارەزایی تاقیکردنەوەیی کەمەو ناتوانێ کە کۆنترۆڵی ناوچەیەکی ئاوا شڵەژاو بکا، وتی: دەبێ هیوا خوازبین کە ئەو پۆستە بیکاتە پیاو. بەرەچاوکردنی یادەوەریە باشەکانی باوکی، ئەوا هەمو هۆزەکانی ناوچەکە چاکە خوازی ئەو بون و ئەویش هێشتا لە ناو پیلانگێڕی و ڕکابەریەکانی ئاغاکانی ڕەواندوزدا نقوم نەببو، لەبەر دەوڵەمەندی و لێبوردەییەکەی شایانی ئەو پۆستەیە. لەبەیانیەکەی ڕۆژی (١٥)ی مانگ پرسیارم لێکرد کە ئایا بەو کارە ڕازیە، ئەویش بە بەڵێ وەڵامی دامەوە.

دوای نیوەڕۆی(١٥)ی مانگ هەمو پیاو ماقوڵانم بانگێشتی کۆنگرەیەك کرد و، سەرۆکانی هەردوو عەشیرەتی شێروان و برادۆستیش ئامادەی بون. هەر هێندەی هەواڵی کۆچی دوایی یوسف بەگم ڕاگەیاند، ئیدی ورووژانێك بەرزبۆوە، دواتر پەژارەی خۆم بۆ دەستلەکارکێشانەوەی حاجی نەورۆز دەربڕی و، دەرم خست کە سمایل بەگم بۆ جێگاکەی ئەو هەڵبژاردوە، ئیسماعیل بەگیش کەسێك بوو کە هیچ خراپەیەکی بەرامبەر بەکەس نەکردبوو، هەموان بە هۆی یادگاری باوکیەوە خۆشیاندەویست و ڕێزیان دەگرت. هەموان بەکۆی دەنگ بە هەڵبژاردنەکەم ڕازیبون و هەر یەك لە مەحەمەد ئاغا و ئەحمەد ئاغا وتارێکیانداو داوایان کرد کە هەموان لەتەك سمایل بەگ بوەستن و بەشداری لە چاککردنی بارودۆخی تێکچوی

ڕەواندوز بکەن، لە جیاتی ئەوەی بە ئێرەیی و تۆڵە بارەکە بەرەو خراپتر ببەن. ئەودەم قورئانێکیان هێنا و هەموان سوێندیان لەسەر خوارد، بێ هیچ دودڵیەك، سوێندی گوێڕایەڵی و لایەنگیری بۆ سمایل بەگ. دواتر باویلاغا مەرجێکی دیکەی بۆ زیادکرد کە(من لە پەیوەندیم بە سمایل بەگەوە ڕاست و دروست دەبم ئەگەر ئەو لەگەڵ مندا بەهەمان شێوەبێ).

بەیانی(١٦)ی مانگ ، دوای ئەوەی ڕێنوێنیەکانی پەیوەست بە باجی داهات و مەسەلەکانی دیکەم دایە(حاکمی نوێ)و کاتبێکی شارەزام بۆ دامەزراند، کە شارەزایی لە حکومەتی ڕابوردو پەیداکردبوو، تاکو پشتیوانی سمایلاغا بێ، ئیدی بەرەو هەولێر بەڕێکەوتم و تالوتکەی چیاش هەمو پیاو ماقوڵان و ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی کە لەوێ بون لەگەڵماندا هاتن، دوای ئەوەی سمایل بەگ و ئاشتی ناوچەکەم دایە دەستی ئەوان و بەڵێنم پێدان کە دوای دوو مانگی دیکە دێمەوە سەردانیان ئەوسا ماڵئاوایم لێکردن و هەر خێرا دیتم بە شوێن هەنگاوەکانی پێشتری خۆم لە دۆڵەکەدا دەچمە خوارێ. کە لەهەمان کاتدا ئەو ڕوداوانەم دەژمارد کە لەو چەند ڕۆژەکەمەدا ڕویاندا بو، کە لەدەرەنجامەکانیان تۆزێك هەستم بە ئارامی و دڵنیایی دەکرد.

لەباتاس عەبدوڵلا پاشای پیرەمێردم بینی لە دەرگای ماڵەکەی چاوەڕێی دەکردم، لە خۆشیان دەلەرزی و پێدەکەنی. خەندەیەکی کرد و وتی: (بێگومان یوسف بەگ خزمی من بوو، بەلام هیچ سۆزداریەك لە نێوان ئەو دولقەدا نەبوو). لەهەژدەی کانونی یەکەمدا گەیشتمە هەولێر، خۆشیەك لەدەرونما بریسکەی دەداوە کە سەرچاوەکەی گەڕانەوە بوو بۆ ناو برادەرانی شوێنێکی شارستانی.

◆

## بەشی چوارەم
## سێ مانگی خۆشگوزەرانی.

کە گەرامەوە هەولێر بینیم نەقیب برادشۆ گواستویەتیەوە ماڵە نوێیەکەمان کە بنیاتنرابوو، دوای ئەوەی رائید مۆری نەخشەی بۆ دانابوو دەستی پێکردبوو، خانوەکە نیو میل لە شارۆچکەکە دوربو لەسەر زەویەکی بەرز و نرم بنیاتنرابو کەبە زەویەکی سەوز دەورەدرابو. پەنجەرەکانی لای باکوری رۆژهەلآت دیمەنێکی جوانی چیای سەفینی پێشاندەدا. هەر وەها هەموو پەنجەرەکانی بەسەر دەرەوەیاندا دەڕوانی لەجیاتی ئەوەی بەسەر حەوشدا بڕوانن. وەك ئەو شێوازەی کە لەماڵەکانی رۆژهەلآتدا هەیە، بۆیە ناچار بوین لەشەودا دەستەیەك پاسەوان بسوڕێنەوە.

ڕۆژی(جەژنی لە دایك بون) مان بەخۆشترین شێوە بەسەر برد، هەموو شار ڕازاوە و ئاهەنگێکی تەواو گێڕدرا. لە سەعات نۆی بەیانی هاتنی شاندێك لە عەنکاوەوە ڕاگەیەنرا. لە(١٢) قەشەو پیرەمێرد پێکهاتبون، هێنرانە ژورەوە و نزیکەی نیو سەعاتێك بە سلآو وقسە گوڕینەوە بەسەر چون. دوای نانی بەیانی سەرۆکی شارەوانی سەردانی کردین و نزیکەی(٢٠ تا ٣٠) کەسی لە فەرمانبەرە ناوخۆییەکان لەگەڵدابوو. خوانێکی نیوەڕۆمان بۆ فەرمانبەرە فەرمیە تۆمارنەکراوەکان (لە ڕۆژنامەی فەرمی) [٢] سازکرد. دواتر چوینە فرۆکەخانە بۆ ئامادەبون لە ئاهەنگی یاریەکانی کە عەقید(ب.م. کارۆل)و ئەفسەرانی یەکەی(٨٧)ی پەنجا ڕێکیانخستبوو، هەندێك لەو پۆلیس و ژاندرمانەی کە لەژێر فەرماندەیی مندابون بەشداریان تێدا کرد بوو، لەکاتێکدا کە هەموو پیاو ماقولآن و زۆربەی خەڵکەکە بۆ بینینی هاتبون. هەر هێندەی یاریەکان تەواو بون؛ ئیدی پیاو ماقوڵ و سەرۆکەکانی شارهاتن بۆ سەردانی ماڵە نوێیەکەمان، بەشداریان لە

خواردنەوەی چاو قاوەدا کرد و دواتر ڕێگەیان پێدرا سەیری خانوەکەمان بکەن.[٣] چێشتخانەی یەکەی(٨٧)ی پەنجابی بانگێشتێکی من و نەقیب برادشۆیان کرد بۆ ئێوارە خوانێکی بەخشندە، چێژمان لە ئاهەنگێکی سەری ساڵی ئاسایی وەرگرت لەیەکەم ڕۆژی ئەو هەفتەیەی کە بەدوای جەژنی لە دایکبوونـدادێ[٤] یاری(قاشوانی) (چەوگان ) (Polo) [٥] کرا، دواتر چەوگانەکە درایە دەست مشیراغای کوڕی برایماغا و ئەوانی دیکەش، توانیان لە تۆپەکە بدەن و باش یاری بکەن. من دڵنیام کە کوردەکان ئەگەر فێری یاریەکە بکرێن ئەوا زۆر باش یاری تێدا دەکەن. لەو دواهەفتەیەدا هەموو پیاو ماقوڵەکانم بانگێشتی نیوەڕۆخوانێک کرد، ئەوانیش وەك ڕێز لێنانەوە یەك لەدوای یەك بانگێشتیان کردمەوە بۆ ماڵەکانیان.

لەسەرەتاکانی کانونی دووەمدا یەکەمجار بو سەردانی شێخ مستەفا ئەفەندیم کرد، کە لە خانەقاکەیدایە،[٦] و بریتیە لە مزگەوت و خەڵوەتگایەك و دەکەوێتە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی شار، ئەو پیاوە دەموچاوێکی ڕەنگبواردوی هەیە، لەگەڵ ڕیشێکی چوار گۆشەی ڕەش و، دوچاوی بەقوڵداچوو، ئەو پیاوە لە هەرە لەخوا ترسەکان بوو کە من بینیومن و لەهەموان دەرون فراوانتربوو. ڕواڵەتی ئەو دەربڕی تەسەوفەکەیەتی نیشانەیە بۆ ئەو سەعاتە درێژانەی کە بەبێداری و نوێژکردنەوە بەسەری بردون، ئەو یەك لەو دوانەیە کە دەتوانم بە(پاکیز) (قدیس) ناویان ببەم کە لەژیاندان. هەرچەندە کە لەپلەو پایەدا لەدوای مەلا فەندی دێ بە هۆی ئەو دورە پەرێزیە گشتیەی کە بەرامبەر کاروباری دنیا هەیەتی، بەڵام ناوبانگێکی پیرۆزیی ئەو تۆی هەیە کە لەسەروی ئەو شتەوەیە. ئەو بوە برادەرێکی مەزنم، لەبەر ئەوەی بەئاسانی خۆی لە ئامادەبونی کۆبونەوەکانی پیاو ماقولان دور دەگرت، ئیدی لەماڵەوە و بە شێوەیەکی تایبەتی سەردانی دەکردم. ڕۆژی حەوتی مانگی کانونی دووەم(نەقیب لێتل دیل) گەڕایەوە هەولێر، دوای ئەوە لەو ڕۆژەدا سواری فڕۆکە بوو، بجێلی لە ناوچەی ئاکرێ بۆمبا بارانکرد، کە گوندی شێخ عوبەیدوڵڵای سورچی بوو، لەو کاتەوە بەدواوە سورچیەکان هەمیشە شۆڕشیان لەدژی حکومەت دەکرد.

ئەمە وەك برینێکی کێم کردوی بۆ گەنە و چاکبونەوەی نیە، میکرۆبەکەی لە کۆتاییدا ناوچەی هەولێریشی گرتەوە. یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە ئاکرێ شێخ عوبەیدوڵڵای بانگ کردبوو تاکو لەبەردەم(بنکەی گشتی) لە ناوچەکەدا ئامادەبێ، چونکە ڕەفتاری ئەمدواییانەی مایەی دڵنیایی و رازیبون نەبوو، هەر وەك چۆن زانابو کە سەرۆکی عەشیرەتی زێباری، فارساغا، کە یەکێك بوو لە بکوژانی مستەربیل و نەقیب سکوت، بەم زوانە سەردانی کردوە. ئەو داوایەی ڕەتکردەوە، کاتێك هەموو هەوڵەکان بۆ هێنانی ئەو شکستیان خوارد، داوای کردەیەکی ئاسمانی کرا. بۆیە لە(٦)ی کانونی دوەمدا فڕۆکەیەکم نارد، کە(نەقیب لێتلدیل)ی وەك چاودێر تێدابوو، بۆردومانی بجێلی کرد و ئاگری ڕەشاشەکەی بەسەردا کردەوە.

خودی شێخ عوبەیدوڵلا بریندار بوو، لە کاتێکدا یەکێك لە میوانەکانی کوژرا کە سەرۆکێکی هۆزی خەیلانی بوو ناوی (عەزیزی هۆدی) بوو، دوو لە خزمانی شێخ عوبەیدوڵڵاش کوژران. سورچیەکان جەنگاوەرەکانیان کۆکردەوەو هەڵوێستێکیان وەرگرت کە هەڕەشەی کارەسات و وێرانکاری دەکرد. لە کاتێکدا کە زێباریەکان لەچیاکانەوە هاتنە خوارەوە تاکو یارمەتیان بدەن. زۆر مەترسیم لە پەڕینەوەی ئەو پشێویە هەبو بۆ باشوری زێ. چونکە باسی هێرشێك دەکرا کە بەنیازە بکرێتە سەر باتاس، ڕۆژی(١٢)ی کانونی دووەم ئەو دەنگوباسانەی کە لەناوچەی ئاکرێوە دەهاتن بە شێوەیەك ترسناك بون، کەبیرم لە کۆکردنەوەی هێزێك کردەوە لە هەر دوو عەشیرەتی دزەیی و خۆشناو ، بۆ هێرش کردنە سەر شێخەکانی سورچی، بەلام بارەکە دوای چەند ڕۆژێك بەرەوهێمنی چوو بیرۆکەی کارێکی یەکسەریم لەمێشکم دەرکرد. خۆشبەختانە، کاتێك کاری پشێوی سورچیەکان لە چلە پۆپەدا بوو، سەرۆکەکانی هەرکی و زراری لە هەولێربون، ڕێگەم نەدان کە بڕۆنەوە تاکو بارودۆخەکە کەمتر هەڕەشەی پێوەدیار بوو. هەرکیەکان هەموو لە نزیك دێرە هەڵیاندا بوو.(تاهیر ئاغا)ی سەرۆکیان پیاوێك بو کە ناوبانگێکی مەزنی هەبو، بەڵێنی پێدابوم کە عەشیرتەکەی لە کاتی پێویستیم یارمەتیم بدەن، لەکاتێکدا کە ئەحمەد خان سوێندی بەئیمان خوارد کە هەردەم دڵسۆز و وەفادار دەبێ، ئەو پیاوێکی دەرون پیس و ڕواڵەت جوان بوو برادەرێکی کۆنی یوسف بەگ بوو

ئامرازی دەستی بو بۆ شکاندنی شکۆی نەقیب بیل و نەقیب کێرک لە بەهاری ڕابردودا. ئەو گەمژەیەکی دڵخۆشە، من هەرگیز باوەڕم پێی نەبوو،خۆشبەختانەش دەسەڵاتی لە ناو هۆزەکەیدا سنوردار بوو، بۆیە هەرشتێکی بیکردایە ترسم لێی نەبوو. ئەو هەمیشە بۆ هەر شوێنێك بچوبایە، کەسێکی سینگ پانی کەتەی لەپشت دەڕۆیی ناوی(شەریف ژن)بوو، ئەو بونەوەرێکی درێژو لاواز بوو هەمیشە جلی پیاولنی لەبەر دەکرد و تفەنگ و فیشەکدانی هەڵدەگرت، لەروی هێزی جەستەوە ئەو بە ڕکابەری هەر کەسێکی ڕەگەزەکەی دیکە دادەنرا، دەیانگوت لەو جۆرە (ئەمەزۆنیانە) (٧) لەشوێنی دیکەی کوردستانیشدا هەن، بەلاّم من تەنیا هەر ئەوەم دیت. رەفتاری هەرکیەکان بەدرێژایی مانەوەیان لەناوچەکەی مندا نمونەیی بوو. خەڵکەکەی باجی تەواویان دا، قازانجێکی زۆریان لە ئامادەکردنی هۆیەکانی گواستنەوە کرد بۆ دەسەلاّتی سەربازی.

ئەحمەد بەگی زراری، خاوەن دەم و چاوێکی درێژوو ناشیرین و دووچاوی لەرزۆك، بە دڵنیاییەوە کەسێك بوو کە گرنگی پێنەدەدرا، ئەو فێڵی شەیتانیی هەبوون، لەبەر ئەوەی سەرۆکی عەشیرەتێکی بچووك بوو کە بەهاسانی لە هەولێرەوە دەگەیشتینێ، بۆیە پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ مندا ڕاگرتبوو، لە حاڵەتێك یان دوان دانوستانی لەگەڵ سورچیەکانی زاوای ئەنجامدا.

لە (١١)ی کانونی دووەمدا هەریەك لە ئیسماعیل بەگ و شێخ موحەممەد ئاغا لە ڕواندوزەوە گەیشتنە هەولێر، زانیم کە لەوەتەی بەجێم هێشتوە هێمنی باڵی بەسەر ئەوێدا کێشاوە لەگەڵ ئەوەی کە حاجی نەوڕۆز و برایەکانی یوسف بەگ، وەك دەڵێن، لەگەڵ سورچیەکان نامە دەگۆڕنەوە.

لەو کاتەدا توانیم کە هەموو ئەو سەرۆکانەی دەسەلاّتیان هەیە لە پارێزگاکەدا لە هەولێر کۆیان کەمەوە و، هەموو کاتم لە بینین و ڕێزلێنانیان بەسەر دەچوو، بڕیارم دابوو کە هێزێك دروستکەم بۆ سزادانی سورچیەکان و بکوژانی مستەر بیل و نەقیب سکۆت، ئەم ئامانجە چەند هەفتەیەك بیری داگیرکردبووم، هەموو سەرۆکەکان بەڵێنی ئەوەیان پێدام کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکەن، بەلاّم کە کاتی کارکردن دەهات پێیەکیان دەکەوتە پاش و پێیەکیان دەکەوتە پێش، دواتر

زانیم کە ناکرێ پشت بە عەشیرەتەکان ببەسترێ ئەگەر هێزێکی نیزامی لەگەڵدا نەبێ.

لە (١٨)ی کانوونی دووەمدا سەردانی موسڵم کرد بۆ ئەوەی تەگبیر و ڕا لەگەڵ حاکمی سیاسی عەقید نولدەر، لەبارەی بارودۆخی عەشایەریەوە بکەم. پلانەکانم دانابوو بۆ چەند هێزێکی ژاندرمە و عەشیرەتەکان لە ئاکرێ و هەولێر، بۆ داگیرکردنی ناوچەی سورچیان، دوای چەند ڕۆژێکی کەم هێزێکی ناوچەی ئاکرێ توانیبووی گوندی شێخ رەقیب بسووتێنێ، چونکە ئەو لەکاتی ئەو پشێویانەی کە لە تشرینی دووەمدا ڕویاندا چەند کەسێکی لە ژاندرمە کوشتبوو، باران بارین و هەستانی ئاوی زێ نەیانهێشت لە هەولێرەوە جوڵەیەك بکرێ.

لەم ماوەیەدا پێشنیارم بۆ ئەوانەی بەغدا کرد، کە پەیوەندی بە دروستکردنی هێزێکی نیزامی گورز وەشێن بوو لە هەولێر. بۆ ئەوەی بۆ ئەو هێزی ژاندرمەیە زیاد بکرێ کە تەنیا بە مەبەستی کاروباری پۆلیس دروستکرابوو. نیازم وابوو هێزێك دروستکەم لانی کەم لە (٢٠٠) کەس کەمتر نەبێ، ئەمەش بۆ پاراستنی ڕەواندوز و ڕابون بە هەر جوڵەیەك، بەرووی عەشیرەتەکان، ئەگەر پێویست بوو. لەکاتی پێویستدا ڕەزامەندی لەسەر ئەو پێشنیارە هاتەوە، ئەرکی دروستکردنی ئەو هێزە نوێیە (لیڤی: سەربازانی هەولێر) بە نەقیب لیتلدیل سپێردرا. ئەویش هەوڵێکی باشیدا و ئارەزومەندانیش یەکسەر هاتنە پێشەوە، بەڵام ڕاهێنەران زۆر کەم بوون و، شتومەك و دابینکردنی چەکیش زۆر دواکەوت.

شوبات مانگێکی زۆر سارد بوو، سەرماکەی کەڵبەی گیردەکرد. لەڕۆژی پێنجی مانگ تەرزەباری و، لە ڕۆژی هەشتی مانگ زیادی کردوو، لەشەوی دەی مانگیش زۆر بە توندی باری و بۆیە بەیانیەکەی بەرزیەکەی گەیشتبووە سێ گرێ و ڕووی زەوی هەموو داپۆشتبوو. تاکو (١٣)ی مانگ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پتر دەباری تا دوای نیوەڕۆی ڕۆژی (١٣)ی مانگ کە بایەکی سارد هەڵیکرد و دەستی بە توانەوە کرد. ئەم کەش و هەوایە لە کاتێکدا دەستی پێکرد کە دەمویست جوڵەیەکی عەشایەری بکەم، ئیدی بووە شتێکی ئەستەم و مەحاڵ. ئەو شتەی کە هیوام دەکرد هەڵمەتێکی سێ چوار ڕۆژی بوو، بێ چادرو کەرەستەی دیکە، کەدەبێ لەو حاڵەتەدا کەش و هەوا خۆشبێ، لە ئاداردا کە بەفر دەست بەتوانەوە دەکا و ئاوی

ڕوبارەکـان بـەرز دەبێتـەوە و پەڕینـەوە لێیـان مەحاڵـە، بۆیـە دەبوایـە هـەموو بیرکردنەوەیـەك لـە هێـرش کردنـە سـەر سورچـیەکانی ئـاکریێ دوا بخـەم، تـا کۆتاییەکانی هاوین، ئەمـەش وایکرد کـە سورچیەکانیش تـا کۆتاییـەکانی هـاوین نەتوانن بەشێوەیەکی مەترسیدار دەسبخەنە ناو کاروبارەکانی من.

لە سەرەتاکانی شوبات سـەردانی گونـدی (لهێبـان)م کـرد کـە لـە کەنـدێناوە و بۆیەکەم جار چاوم بە (خورشیداغا)ی برای برایماغای گەورە کـەوت. لـە ڕواڵەتیـدا بە برایماغا دەچوو تا ڕادەیـەك، هـەمان بـاڵای ئـەوی هـەبوو، لەگـەڵ خەندەیـەکی لەهی ئەو سیحراویتر. بەڵام ڕوکاری بەگشتی لاوازترو باریکتر بـوو. ڕیـشێکی سـپی هـەبوو درێژیەکـەی مامناوەنـدی، ڕەتـی دەکـردەوە بۆیـاخی بکاتـەوە، ئـەو لـە برایەکەی تورەو توندتر بـوو. سیاسـیەکەیان برایماغـا بـوو، بـەڵام جەنگاوەرەکـە خورشیداغابوو، هەمیشە لە مەیداندا سەرکردایەتی لقی بایزی دەکـرد وەکـچۆن بـە ئازایەتی و لاملی ناسرابوو، بەرامبەر دوژمنەکانی نەرم نەبوو. ئەو پیاوێکی بەهێزە و بەلای توندو تیژیدایە، لە کاتێکدا برایماغا بەلای دیپلۆماسیەتی دا دەشکاندەوە. ئـەو دڵـسۆزو وەفـاداربوو بـۆ برایەکـەی ئـەوان پێکـەوە باشـترین کـەس بـون بـۆ سەرکردایەتی عەشیرەتەکە.

خورشیداغا ئەقڵی و بیرکردنەوەی لاوازبو، چونکە هەر بیرۆکەیـەکی بـۆ بهاتبـا ئیدی پەیوەست دەبو پێیـەوە، جا ئەگـەر ڕاسـت بوایـە یـان هەڵـە. ڕقـی ئـەویش بەرامبەر هەردوو دوژمنەکەی خانەوادەکەی، ئەحمەد پاشاو حاجی پـیرداود ڕقێـك بوو کـە لاچـونی نـەبوو. ئـەو قـسە کـەم دەکـاو لەسـەر قـسەی خـۆی سـورە، کـە یەکەمجار بینیم وامبەخەیاڵداهات کە ناکریێ لەگەڵ برایەکەی بەراورد بکریێ، چونکە برایماغا لەو ڕێکو پێکترە.

ئەودەم تـەندروستی باش نەبوو هۆیەکەشی دەگەڕایـەوە بـۆ جگـەرە کێشان، نەشیدەتوانی وازی لێبێنیێ، دواتر هەستم کرد کە دڵێکی هەیە لە زێڕداڕێژراوە. لەو پێنج کوڕەی کە هەیبو یەکێکیان ناوی عـەلیاغا بـوو، بـە عـەلۆ ناسـرابوو تەمـەنی نزیکەی(٣٠) ساڵ دەبـو، لەسـەردەمی عوسمانیەکانـدا ئەشـقیایەکی ناسـراو بـوو، بەڵام ئێستا لەسـەر ژیـانێکی ئاقڵانـە گیرسـاوەتەوە، ئەگـەر چـی ئێـستاش خێـرا

هەڵدەچیٚ و روی لە ڕەوەندو وەحشیگەریە. بەڵام لەپێکهاتەی ئەقڵی و جەستەیی بەباشترین گەنجەکانی ئاغا دزییەکانم دانا.

لە لهێبانەوە چوم بۆ مەخمور و شەوەکەم لای برایماغا بەسەر برد، ئەودەم کوڕی حەڤدەمی ببوو، تاقە کوڕەکەی کە لەژیاندا بوو، مەبەستم (مشیرئاغا) یە، لەوێبو. لەبەردەمما وەك سوارچاکێك کە پڕ لە تەروبری ژیان بیٚ وەستا و، پێڵاو و شەرواڵی سوارچاکیەکی فشوفۆڵی لەبەردابو، لەگەڵ چاکەتێکی بریقە دارو، ریشوی جەمەدانیەکەی بەسەر نێوچەوانیدا هاتۆتە خواریٚ. ئەوبیست ساڵ دەبیٚ و درێژی شەش پیٚ دەبیٚ، ئەو ریشوێکی کورت و زوری هەبوو دەنگێکی بەرزیش. ئەو گەنجێك بوو کە بەخۆڕسك بەدەستبلاو بەناو بانگ بوو،ئێستا هاتبو لەیەك لەسەردانە زۆرەکانی، لەبەر پێویستیەکی توندو منجرانە بۆ پارە. تازە ئەو لە شوێنێکی جودای نزیك مەخمور نیشتەجێبوە.

شەوی(٢٣/٢٤)ی شوبات روداوێکی ترسناك رویدا. ئێمە تا نیوەشەو نەخەوتین. نزیك سەعات (١٢/٣٠) بەیانی دەنگی تەقەیەکی لەناکاو واگای هێنام منیش سروشتم وابو ئەگەر وەنەوز بمباتەوە و شتێك بێزارم کا، ئەوا هاوارم لیٚ هەڵدەستیٚ، هەر هێندەی واگاهاتم، وایبۆچوم کە ڕەنگە پاسەوانێك بە هەڵە تفەنگەکەی لە دەست دەرچوبیٚ و دواتر خەوتبێتەوە، گوێم لە هاواری نەقیب لیتلدیل بوو، لەگەڵ چەند تەقەیەکی دیکە. دەستم دا دەمانچەکەم و چومە دەرەوە، یەکەم کەسی کە بینیم دیدەبانەکە بوو لە وەڵامی پرسیارە خێراکەمدا وتی کە ئەوەندەی ئەو ئاگاداربیٚ شتێك روینەداوە و ڕەنگە(ئاغای قۆمەندان) مەبەستی فەرماندەی ژاندارمە — شتێکی دیبیٚ و لەو تاریکیەدا بەدوایدا چوبیٚ، هێشتا قسەکەی تەواو نەکرد بو نەقیب لێتلدیل خێراهات، بیجامەی لەبەر بوو دەمانچەیەکی گەورەی بەدەستەوەبوو، پێدەچو کە بەبیٚ روناکی لە ئاودەست بوبیٚ، کە لە هەمان بەشی لای ژورەکەی من بوو. هەر هێندەی گوێی لە هاواری منبوە ئیدی لەپەنجەرەوە تەماشای کردوە ودوو کوردی لە نزیك پەنجەرەکەی من دیوە، کەیەکێکیان دەمانچەی پێبوە، ئیدی لە پەنجەرەکەوە خۆی بەپیاوەکە داداوە و بەڵام پیاوەکە ڕایکردوە یەکێکیان دەگریٚ بەڵام ناتوانیٚ پەلبەستی بکاو ئەویش ڕادەکا، ئیدی هاواردەکاتە پاسەوانەکە و بەدوایاندا دەچیٚ، بەڵام

شەوەکەی تاریکبوو نەیتوانی شتێك لەو لایەی بۆی هەڵاتن بەدیکا. پاسەوانەکەش یان نوستبو، یان سەیری لایەکەی دیکەی خانوەکەی دەکرد و دواتر ڕادەکاو چەند تەقەیەك دەکا و دواتر توشی من بوو. هەر هێندەی نامەیەکم بۆ سەید عەلی نارد کە ناوچەکە بپشکنێ، ئیدی لەگەڵ لێتلدیل گەڕاینەوە ژورەکەم تا بزانم چ زیانێکی بەر کەوتوە. خزمەتکارەکان بەخەبەر هاتبون و هەمو کۆببونەوە. پەنجەرەکانم داخرابون و شوشەکەی نەشکابو، ئیدی زۆر سەرسام بوین تاکو(برادشۆ) ئاماژەی بۆ وێنەیەك کرد کە لە نزیکی من لەسەر مێزێك دانرابو، لەلای بەرامبەر لە ژورەکەدا، کونێکی تێ ببو، لەپێشتیەوەش چاڵێك لە دیوارەکە ببو، لەسەر زەویەکەش فیشەکێکی بچوکمان دۆزیەوە کە تەنیا دەکرا لە دەمانچەیەکی کۆنی خراپەوە تەقێنرابێ. کە پەنجەرەکەشمان پشکنی لە چوارچێوە دارەکەی نێوان تەختەکان کونێکمان بینی کە دەورەکەی ڕەشببوو، وادیاربو کە هێرشبەرە نادیارەکەم دەمانچەکەی رولە قاچم کردبوو(چونکە نەیزانیبو سەرم لە کاملاکردوە) بەڵام شێوەی ئەو کونەی کە لەدارەکەدابو نەیهێشتبو تەقەکە بە ئاراستەیەکی ڕاست بکا، بۆیە فیشەکەکە لە ژورەکەدا بە شێوەیەکی ئاسۆیی سوڕابو لە وێنەکەیدا بوو لەگەڵ دیواری بەرامبەر.

بەیانی زو ئەحمەدەفەندیم لە ڕوداوەکە ئاگادار کردەوە، زۆر پێ تورەبو و هەڵچو. یەکێکی نارد تا شونهەڵگرێك بهێنی، هەوڵێکی زۆریدا تابزانێ تاوانباران کێن، لەبەر ئەو بارانە زۆرەی کە بەیانیەکەی باریبو شونهەڵگر نەیتوانی زۆر سەرکەوتو بێ، تەنیا ئەوەندەی زانی کە هێرشبەران سێ کەس بون و یەکێکیان سواری ئەسپ و ئەویدی سواری هێستر و سێیەمیان پیادەبوە، ئەوان لەلای باکوری ڕۆژهەڵاتی ناوچەکەوە هاتن، گومانم لە زۆر کەس بوو بەڵام سروشتی چەکە کۆنەکەو شێوازەکەی گەیاندمیە ئەوەی کە(حەما دەشین) — کە ڕۆژی پێشتر لەبەندی بەڕەڵڵاکرابوو — بەر پرسی ئەم کارەیە. بەر لە شەش هەفتە لە باتاس هێنایانە بەردەمم، بەوە تاوانبار بوو کە خەنجەرێکی لە پیرێژنێك دابو، ئەو باڵابەرزێکی لاوازبوو، ڕواڵەتێکی دڕندانەی هەبوو، موی ڕدێنی خۆڵەمێشی بوو بەسەر شیندا دەیڕوانی. لەسەردەمی تورکان چەتەیەکی بەناوبانگ بوە، هەر هێندەی زانی کە شکاتی لێکراوە ئیدی دەستی بە هاوارو گریان کرد و تۆمەتەکانی

ڕەتکردەوە، دواتر مشکیەکەی سەری فڕێدایە زەوی و، بەگشتی زۆر تورەو تۆسن بوو، ناچار بوم بۆ هەولێری ڕەوانەکەم، تاکو لە بەندیخانەی نێن. دوای چەند رۆژێك لە هەولێ کوشتنم، بە ئاشکرا ڕکابەری دەسەلاتی(بەریوەبەری دێرە)ی کرد کە دستگیر بکریَ، بەلأم رایکرد و چوە پالّ سورچیەکان.

لە(٢٦)ی شوبات بۆ جاری دووەم سەردانی ڕەواندوزم کرد، هەریەك لە نەقیب(لیتلدیل)و نەقیب(یەکینین)م لەگەڵدابوو، کە تازە، لەگەڵ ئەفسەرێکی دیکە گەیشتبونە هەولێر تا یارمەتی من بدا. تۆزێك توشی تەنگژەبوین، لەبەر ئەو بەفرەی لە(گەلی) باریبو، ئەگەر وا نەبوا گەشتەکەمان بێ کێشە دەبوو، ئەستوری بەفر لە ڕواندوز لە لەئینجێك تا دوو ئینج تێنەدە پەڕی کە لە هەندێ شوێندا توابوەوە. بەلأم چیاکانی دەوروبەری بەرگێکی ئەستوریان لەبەردابوو، بەڕاستی دیمەنێکی جوان بوو، لەسەر چیاکە گەیشتینە سمایل بەگ، بەشێوازە بەخشندەکەی خۆی میوانداری کردین، دیتم کە ناوچەکە زۆر ئارامەو، لە هەندێ کار بترازێ هیچ ئاستەنگێکی دیکەم نەبوو.

دوای نیوەڕۆی(٢٩)ی مانگ بەسواری رۆیشتین و هەر یەك لە سمایل بەگ و محەممەد عەلی ئاغا دەستو پێوەندەکانیان لەگەڵ دابوو، بە دەشتی دیانەدا تێپەڕین بۆ گوندی باڵەکیان.

ئەو دەشتە کە ڕوبەرکەی(٦×٤) میل دەبێ کۆمەڵە چیایەکی گەورە دەوریاندراوە، شوێنی فڕۆکەخانە لەوێیەو پارچەیەکی مەکینەی ئەو فڕۆکەیان دۆزیەوە کە لەوێ لە ئەیلولی ڕابردودا تێکشکا، باڵەکیان کە(٦٠) تا (٧٠) خێزانی تێدایە و هەمان ناو هەولدەگرن و نیمچە ڕەوەندن، دەکەوێتە داوێنی زنجیرەگردێکی بەرەوخوار سەر جۆگە ئاوێکی گەورە، کە کۆڵەگەی پردێکی لێیە(محەمەد پاشا) بنیاتی ناوە و چەندین ساڵە بۆتە کەلاوە و داروبەردو. دوای چەند میلێکی کەم بەرەو خوار، جۆگە ئاوەکە لە چیاکان دەرباز دەبێ و لەگەڵ جۆگەی ڕواندوز لە گەلی یەکدەگرنەوە. هەردوو موختاری گوندەکە، کە هەردوکیان ناویان سلێمان ئاغایە، یەکەم کەسبون کە دوای مردنی یوسف بەگ هاتنە رەواندوز، تا یارمەتی پێشکەش بکەن. ئەوان سادەو ساویلکەبون و پیاوەکانیان لەکوردە سەرەتایی و وەحشیەکانن. هەردوك بالآیان کورتەو تێکسمڕاون، مشکی

لەسەر دەکەن کە ریشوەکانی هاتۆتەخوارەوە. دەرەلنگی شەڕواڵەکانیان شێوەی زەنگی هەیە و پالتۆی فشو فۆڵی ئەستوریان لەبەردایە. دوای ئەوەی بەشداری چا خواردنــەوەو نــانخواردن و دۆ خواردنــەوەیان کــرد، بەرێگایــەکی تۆزێـك جیـاوازدا گەڕانەوە و بە(باپشتیان)دا ڕۆیشتن، خورشید بەگ لەوێیە کە لە سەردانی پێشترم بۆ یەسف بەگ ئەو غەنیمێکی دژبو. لەدەرەوەی گونددا دارستانێکی بەڕو هەبو کە لقی سەیری هەبو، لقە تــەڕەکانی ئــەو دارە دەبــڕدرێ و وەك ئالیـك بـۆ مــەڕو بـزن هەڵدەگیرێن بۆ ئەو کاتانەی کە بەفر ناوچەکە دادەپۆشێ. لەسەر گردێکـی نزیکـدا دیمەنێکی سەیرو جوانمان بینی دیمەنی ڕەواندوزو ئەو دۆڵانەی کە دەوریان داوە.

سمایل بەگ ئەو ئێوارەیە میوانداری هەموو پیاوماقولآنی کـردوو وەکـو بـاویش وتــاری تیــا خوێندرایــەوە. دوای نــانخواردن (فاتمــە خــان) (١١) گەیــشت و داوای بینینی منی کرد، مێردەکەی بەر لە داگیرکردنی بەریتانیا مردبوو سامانێکی زۆری لە هەردوو گوندی ئاکۆیان و فەقیان بۆ بەجێهێشتبوو کە دوو میل تا سـێ میـل لـە ڕەواندوزەوە دوور بوون. ڕائید نوێل کردبووی بە سەرۆکی ئەو دۆڵەی کـە ئـەو دوو گوندەی تێدابوو، بەڵام هەندێك لەدەست و پێوەندە پیاوەکانی بەهەر حاڵ، پێیان وابوو کە لە شـکۆمەندیان کەمدەبێتــەوە ئەگــەر لەبــەر دەسـتی ژنێـك دابـن، بۆیــە پشێویەکی زۆری بەدوادا هات و حاکمی سیاسی دواتر ناچار بوو کـە لایبـدا، فاتمـە خــانم بەرامبــەر بــەژنان بیروبــاوەڕی پێــشکەوتوانەی هــەبوو، لــە پــایزی ڕابــردوو کچەکەی داوەتە (شێخ مازۆی سورچی) و ئەمەش بەپێچەوانەی (تەقیەدین بەگ)ی برای کە خۆی بە تاکە پیاوی خانەوادەکە دادەناو لـەو مەسـەلەیەدا مـافی هـەبوو. ئەو کابرایە پەنای بۆ توندو تیژی برد بۆیە پێویست بوو ماوەیـەك بەنـد بکـرێ. لـە کاتێکا شێخ مازۆ خەریك بوو بوکەکەی ببا کە حکومەت بـۆی دەسـتەبەر کردبـوو، شێخ عوبەیدوڵڵای مامی بۆردومان کراو خانەوادەکەیان بەڕوی حکومەتدا ڕاپەڕین. بۆیە ئەودەم پێویست بوو کە فاتمە خانم ڕابگەیەنێ کە کارەکە بـۆ هـەلێکی دیکـە دوا دەخاو، من ئاگادارم کردەوە کە گوێم لێبوە کە دیاریی چەك و تفاقی بۆ شـێخ مازۆی زاوای ناردوە.

بۆ بینینم هات و جلێکی شینی ئاسایی لەبـەردابوو کـە ژنـانی کـورد لەبـەری دەکەن پەچەیەکی فراوانی بەسەردا هێنابوە خواری کـە دەم و چـاوی داپۆشـیبوو

بەسەر ڕوکاریدا هاتبووه خواری، که تەنیا جار جارێك و به نکاو دەمێکی گەورەی ناشیرینم دەدیت، پشێوی زۆر پێوه دیاربوو. قسەی لەگەڵدا کردم و سمایل بەگ وەرگێڕمان بوو. ڕۆژی دواتر بەرەو هەولێر گەڕاینەوە.

ئادار بێ ڕوداو له پارێزگای هەولێردا تێپەڕی تاکه هەوری ئاسمانی بارودۆخەکه پشێویەکانی سورچیان بوو له قەزای ئاکرێ، کاتی دەسەڵاتی حکومەت هەمووی بەکاری ڕۆتینیەوه بەسەرچوون که ڕەنگه باسکردنی وردەکاریەکانی خوێنەر بێزار بکا. چیرۆکەکەی من بەپلەی یەکەم، ئەو ڕوداوانەن که نووسەرەکەی دوچاریان بووه. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ڕووداو لەو ماوانەدا ڕویانداوه، بەلأم باسیان نەکراوه، بەلأم ئەوه مانای ئەوه نیه که ڕوداوی گەوره و گرنگ، له وڵاتی میزۆپۆتامیا بەگشتی، لەو کاتەدا لەشوێنی دیکەدا ڕوینەداوه.

◆

# بەشی پازدە

## سەردانەکان: ڕەواندوز و سنووری فارس (ئێران)

لە کۆتاییەکانی مانگی ئادار بنکەی سەربازی لە باتاسەوە گوازرایەوە بۆ کانی وەتمان کە دەکەوێتە کۆتایی خوارەوەی گەلی. لەڕۆژی کۆتایی مانگ (فەرماندە) بە تەلەفۆن پێ ی ڕاگەیاندم کە هەواڵێکی لە عەبدوڵلا پاشاوە پێگەیشتووە کەوا (٤٠٠) کەس لە زێ پەڕیونەتەوە و خۆیان ئامادەکردووە هێرش بکەنە سەر بنکەکەی.

هەرگیز باوەڕم بەو هەواڵە نەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی ناوچەی ئاکرێ جارێکی دیکە جۆشی پشێوی سەندبوو و دەهەژا، دواتر، ڕونبۆوە کە حەمادە شین بەخۆ و بە (٤٠) کەسەوە ناوچەی سورچی جێهێشتوە و، لە سەرەوەی زێدا خەریکە دەپەڕێتەوە و دەیەوێ هەندێ دوژمنایەتی کۆن لەگەڵ گوندەکانی نزیك کانی وەتمان یەکلا بکاتەوە. هەر هێندەی کە ئەوە بەرگوێ ی شێخ عوبەیدوڵلا کەوت، لەبەر ئەوەی هەندێ کاری دیکەی لە شوێنی دیکەدا هەبوو، بۆیە بانگێشتی کردەوە.

دوای سێ ڕۆژ، هەواڵ هات، کە سورچی هێرشیان کردۆتە سەر کاروانێکی سەربازی و ڕێیان پێ گرتوون لە نزیك ئاکرێ و هێزێکی تەمێ کردن لە موسڵەوە بەڕێکەوت، بەلأم شۆڕشگێڕەکان لە هەمانکاتدا و بەڕێککەوتن لەگەڵ زێباریەکان (٢) هاتنە خوارەوە و جارێکی دیکە هێرشیان کردە سەر ئاکرێ. ژاندرمەکان لەشوێنی خۆیان خۆیان ڕاگرت و عەشایەرەکان، بەشێکی کەم نەبێ، نەیانتوانی هەموو شارۆچکەکە داگیر بکەن، هەرکە سەربازیش گەیشت، ئیدی کشانەوە. وادانرا کە ئەو پشێویانە کاریگەریەکی شڵەژانی لەسەر ناوچەی ڕەواندوزەوە دەبێ. بۆیە لەگەڵ نەقیب لێتلدیل و (٧٠) ژاندرمە بەڕێکەوتین کە نیاز وابوو لە

هەردوو شوێنی پەڕینەوەی زێ، لە قەندیل و (باردین) دابنرێن، تاکو سورچیەکان نەتوانن ئەو ڕێگایە بۆ هێرشبردنە سەر ناوچەکەم بەکار بهێنن چ بۆ دوژمنکاری یان بۆ ڕاکردن لەدەست ئەو هێزەی کە خەریك بوو سەردانی ناوچەکەیان بکا. (نەقیب هاملتۆن) کە سەر بەیەکەی (راسل) ی پیادەی (٩٤) بوو لەگەڵما هات تا زانیاری لەسەر ئەو ناوچەیە کۆکەینەوە.

لە (دێرە) چاوم بە سەرۆکەکانی هەرکی کەوت، کە هێزێکی دوژمنیان لەو ناوچەیە شکاندبوو کە لە ڕوبار پەڕیبونەوە. دواتر ئەو ڕێگا سەرەکیەمان گرتەبەر کە دەچۆوە بۆ (بابە جیجك) لەوێ سەربازانی (لیڤی) مان دیت کە ئەوان پێشتر ڕەوانە کرابوون. (زەوی ڕەنگین بوو جوانیەکی نایابی وەرگرتبوو دیمەنێکی هەرە جوانی هەبوو). هەرچی لەسەر زەوی بوو سەوز بوو گەلای ڕوەك ئاودار بوو (خوناو لقەکانی لار کردبۆوە) لێژاییەکەی دوینیش زۆر جوان بوو بە گولاڵەو گوڵی دیکە ڕازابۆوە، شکۆفەیەکم دیت کە زۆر لە (Bee orchic) دەچوو.

شەوەکەمان لە بابەجیجك بەسەر برد، لەوێ مستەفاغا بەخۆو بە پاسەوانێکی کەمی عەشایەریەوە هاتە لام، هەوڵمدا باری قورسی ڕۆژ فڕێدەم و خەو بمباتەوە، بەلام باران و باو تۆز ناچاریان کردم کە بچمە ژورەوە و خۆم بدەمە دەست ئەسپێیان.

بۆ سبەینێ بەیانیەکەی ڕۆیشتین و بە کۆتایی لای خوارەوەی دەشتی هەریردا چوین، زەویەکی بەرزو نزمی پڕ لە گیاو گوڵمان بڕی، بە گوڵە جوانەکانیەوە کە جۆگە ئاوی کەنار بلندی پێدا دەڕۆیی، ناتوانی ڕادەی جوانی گیای سەوزی ئاودار دیاری بکەی، تەنیا ئەو کەسە نەبێ کە دە مانگی ساڵ لە دنیایەکی تۆزاوی و تینودا ژیابێ. بینیمان کە سەرۆکی سورچی عەلی بەگ هۆبە و ڕەشماڵی لە شوێنێکی کراوەی پڕ لە گیاو گوڵی نزیك گوندەکەی هەڵداوە، ئەو بە سفرەیەکی پڕ لە خواردنی باش ڕێزی گرتین و دواتر بەرۆخ ڕوبارەکەدا، ملی ڕێمان گرت. ناوچەی سورچی ی دوژمن لەبەرامبەرمان بوو، کە هەندێ گردۆڵکەی نزنمی پێکداچووی سەوز بوو، کە لەلای ڕۆژهەلاتی، چیای ئاکرێ بەسەریدا دەنوڕێ. یەك یان دوو گوند لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان بەشدار نەبوون، بۆیە ئالای سپیان بەرزکردبۆوە وەك ئاماژەیەك بۆ فڕۆکەکان، کە ئەوان لەبەری دۆستانن. دیتمان کە

قەندیل چۆڵ و هۆڵە، چونکە لەم کاتەی ساڵدا هەموو دانیشتوانەکان لە هۆبەو ڕەشماڵدان. جگە لە (کەڵەك) کە لەژێریەوە چەند هەنبانەی فودراو ڕایاندەگرت هیچ ئامرازێکی دیکەی پەڕینەوە لە زێ نەبوو، هەر کەڵەلێك نزیکەی شەش کەسی هەڵدەگرت. بینیمان کە (باردین) باشترین شوێنە کە ژاندرمەی لێدابنرێ.

ئەو گوندە موڵکی شەوکەت بەگ بوو کە خەڵکی موسڵە و، ماوەیەکی زۆرە لە ڕەواندوز دادەنیشێ، ئەو پیاوێکە لە ناوەڕاستی تەمەن و پشتی کوڕە و، (تەبیات). سروشتێکی تاڵی هەیە. دەڵێن لەسەرەتای تەمەنیدا عەریفی ژاندرمە بووە، وایکردوە کە خەڵکی ڕەواندوز بەڕادەیەك ڕقیان لێ ی بێ کە جارێکیان گرتویانە و وەك ئاژەڵێك بکوتی ئاوایان لێداوە و ئیدی ئەو نارێکیانەی لەشی کە ئێستاش ماوە لەو ساوە دروست بووە. لەو کەسانە بوو کە پارە زۆر کۆدەکەنەوە لە کۆتاییدا بووە سەرۆکی شارەوانی ڕەواندوز، کە نەقیب کێرك شارۆچکەکەی بەجێهێشت، ئەویش گەڕایەوە گوندەکەی و تا ئێستاش هەر لەوێیە، ئەو هەمیشە وایدەردەخا کە پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە و زۆر زانیاری بەسوودی دەربارەی سورچیان دامێ.

ڕەنگە زانیاری بەنرختریشی دابێتە دوژمنەکانمان، بەو جۆرە بۆ ئەو سیاسەتەی کە بۆخۆی ڕەنگڕێژی کردبوو بەدرێژایی ژیانی پێیەوە پابەند بوو، بەرامبەر هەردوولا ڕاستگۆ بووبێ.

(باردین) دەکەوێتە خوارەوەی گەلی کە لەوێ زێ ی گەورە لە زنجیرە چیایەکی بەرز بەرەو خواردێ کە لە باشوور بەچیای هەریر دەناسرێ و لای باکووریش بە چیای ئاکرێ. کە لە ناوڕاستیدا قوڵیەکەی دەگاتە (٣٠٠) پێ و درێژیەکەشی (٥) میل دەبێ، لە هەولێر لە ماڵەکەی خۆمڕادەبینم. هەردوو لای لە بەردێکی ڕەشی لێژ پێکهاتوە، ڕێگایەکی زۆر سەخت لەلای باشوور لە گەلیەوە دەردەچێ، من وای بۆ دەچم کە لای باکووری ڕێگایەکی نیە و نابڕدرێ، لەبەری بەرامبەری(باردین) لەبەرزی نزیکەی میلێك گوندی بێخمەیە و دەکەوێتە دەرکی گەلی، تۆزێك سەرەوەی ئەویش کەنارێکە کە کەڵەکەکانی لێوە دەڕوا، ئێرە ئەو شوێنەیە کە پێویستە چاودێری بکرێ، چونکە چەند ڕۆژێکی کەم بەر لە ئێستا حەمادەشین لێیپەڕیەوە.

نیوەڕۆشمـان لای شـەوکەتەفەندی کـرد، حـاجی شـێخ محەمـەدی موختـاری قەندیلیش لەوێبوو. ئـەو پیـاوێکی زۆر پـیرە، ڕیشێکی وەك بـەفر سـپی هەیـە لـە هەنگامەی ئەو پشێویانەی کـە ڕویانـدا ئـەو لـەهیچ دەسـتەیەك نـەبوو. بۆیـە وازی لێهێنرا کە بە دەوڵەمەندیەکەی بەخۆشـی بـژی. دوای نـانی نیـوەڕۆ ماڵئـاواییم لـە نەقیب لیتلدیل کردوو بەرەو کانی وەتمان، لەگـەڵ هەریـەك لـە نـەقیب هـاملتۆن و سەید عەلی ڕێگام گرتەبەر، مستەفاغاو پیاوەکانیم ڕەوانەی باتاس کرد چونکە پێم وابوو کە لە چونە ڕەواندوز پێویستیم پێیان نابێ.

لە چیایەکی نزم پەڕینەوە، بە گوندی (ئامۆکا)دا تێپەڕین کە دەکەوێتە دۆڵێکی لاپەڕی تایبەت بەخۆی، لەوێوە بەسەر زنجیرە گردە سـەرەکیەکاندا سـەرکەوتین، دواتر چوینە زەویەکی سەوزی پڕ لە دار و دەوەن.

دوای سەعاتێك دوان، لە کاتێك دا شەیدای ئـەوە بـوین کـە بـزانین گەیـشتوینە کوێ، گەیشتینە گوندێکی بچووك کە لە چـەند کـوختێکی خراپـی بـە بـەردوو قـوڕ بنیاتنرا و پێکهاتبوو دەکەوتە لای کانیاوێکی گۆگردی کـە ئاوەکـەی لـە حـەزێکی بەردین هەڵدەقولاو بێستانێکی میوەی بچووکی ئاو دەداو. چـەند کـەپرێکی مێـوی کەمیشی لێبوو. ئێستا ئەوێ بەرگێکی سەوزی لەبەردابوو، چەند پارچـە زەویـەکی لێبـوو کـە ڕەنگیـان ڕەش بـوو کـە بـاخی سـەروو بـوو زەویەکـەی چـاککرابوو بـۆ داچاندنی گەنم و جۆ و توتن.

ئەو گوندە سێبەرەو چنارو سەروی هەڵچو دەیشاردنەوە ئالێرەدا ئەو پێرێژنـە پێشوازی کردین کـە هێنایـان بـۆ باتـاس و خـەریك بـوو گیـان بـدا و دەیگـوت کـە حەمادە شێن لە حەوت جێگا بریندار کردوە. ناوی گوندەکەی پێگوتین کە کـانی کولێکە، ئاماژەشی بۆ ئەو ڕێگایە کرد کە دەچێتەوە کانی وەتمـان. دواتـر بەسـەر گردێك کەوتین کە درەختی چڕ داپۆشیبوو لـە شـوێنێکی زەنـەکی فراوانـدا چـەند ڕوبەرێکی بە نەرگز چێنراومان دیـت کـە بۆنەکـەی شـنەی ئـەو ئێوارەیـەی خـۆش دەکرد (مەرجی گوڵیش بۆنەکەیەتی)

زەردە ڕونـــاکی لەســـەر زەوی و ئاسمـــان کەمـــدەبۆوە و تیـــشکە زەرد و خەمبارەکـەی وردەوردە نـــەدەما. ئـــەودەم گەیـــشتینە شـــوێنی مەبەســـت، زۆربەدڵفراوانیـەوە مشولازم هەنتـەر کمە سـەربە(یەکـەی پیـادەی رسـل(٩٤) بـو

میوانداری کردین. بەدرێژی باسی ئەو مەترسیانەی بۆ کردم کە لەم دواییانە سەرییان هەڵداوە.

بەیانیەکەی ڕۆژی دواتر لەگەڵ مولازم هەنتەر بۆ نۆڕینی ئەو زەویە چوین کە لە باکوری کانی وەتمان بوو. بەتایبەتیش بۆ گەڕان بەدوای ئەو دەروەی کە ئەگەری پەڕینەوەی هێزێکی دوژمنی لێدەکرا، لەسەر زێی گەورە یان جۆگەی ڕەواندوز، یان نزیکی ئەوان. ئەو شوێنەی کە پێیدا ڕۆیشتین زۆر چۆڵ و هۆڵ بوو، وەلەبەر ئەوەی کە ڕەنگە ئەوروپیەك بەر لە ئێستا سەردانی نەکردبێ شایەنی ئەوەیە کە بە قوڵی باسی بکەین. بەهەمان ڕێگادا، مەبەستم ئەو ڕێگایەیە کە دوێنێ پێییداهاتین تاکو گوندی(کانی کولێك) بەلێواری جۆگەی ڕەواندوزدا ڕۆیشتین. کە چەند پێیەك لە ئاوەڕۆی جۆگەکە بەرز تربوین. ڕێگاکەمان بەسەر زەویەکی لێژدابوو، کە ڕوکاری(چیای سیروانی) بەردین و تیژ بوو کە بەرزاییەکەی(٦٠٠٠) پێ دەبوو لەلای چەیەوە بەسەرماندا دەنۆڕێ. لە لای خوارەوەمان زنجیرەیەك لوتکەی تیژ هەبون کە دەتگوت شانەیە.

لاپاڵی نێوان ئەو چیایەی سەرەوە و ئەو لوتکانە درەختێکی زۆری هەبو، بەتایبەتیش درەختی بەڕو. لە جۆگەی ڕەواندوزەوە ڕوبەڕوی ئەو لاپاڵە ڕەشانە بوینەوە کەهی چیاێ(بیاو) بون، بۆ ئێواران بەسێبەری درێژەیەوە ناسرابوو. تائێستاش ناوە ناوە بەفر لەسەر لوتکەکەی مابو. دەتوانرێ لێرەو لەوێ چەند گوندێکی پەرشوبڵاوی سەرلوتکەکە ببینرێن، ناوچەکەش پێی دەڵێن(مەحاڵی بیاو). لقێکی سورچیان لەوێ نیشتەجێن کە پیاوێك بەناوی (هەریس ئاغا) وە سەرۆکیانە. ئەو ناوچەیەش کە تیایدا دەسوڕانیەوە بە ناوچەی(سورچیا) ناسراوە و سورچی تێدا نیشتە جێن، ئەوان بەناو لە ژێر فەرماندەیی حەمادەشینن، بەڵام خەڵکەکەی بەهار حاڵ لە گەڵیدا ڕێك نین.

دوای ئەوەی سەعاتێك بەسواری لە کانی کولیکەوە ڕۆیشتین، گەیشتینە (گۆڕەز) کە کەوتۆتە ناو ڕەزی ترێ و داری هەرمێ، کە ئەوەی دواییان بە هەمو خشڵەوە خۆی لەبەر ڕوناکیە جوانەکە ڕازاندبۆوە.

لە خوارەوەی گوندەکە چەند کێڵگەیەکی سەوز و پاراو هەبون کە لە دارستان دابڕابون و چاککرابون، ئەگەر وانەبوایە ئەوا دارستان گوندەکەی دادەپۆست، لەو

گوندەدا سێ خانەوادە هەن کە (دوپن)و ڕۆڵەکانی لە کوردە هەرە ڕەوەند و وەحشیگەرەکانن و زیاتر لە ورچ دەچن نەك لە بنیادەم (ئۆباڵ بەملی نوسەر: وەرگێڕ) ئێستا ڕێگاکە دەچێتەوە ناو دارستانێکی چڕی درەختی بەڕوی گەورە، کە چێوەی هەر یەکیان دوو پێ دەبێ، کە دار هەرمێ ی تازە گوڵ کردوو و گێوژ لەگەڵیدا پێکدادەچن. دەوەنێکی دیکەی پڕ لە دڕك و گیاو گوڵیش لەوێ هەن. ڕۆژەکەی زۆر گەرم و شێداربو، کە لەوێ هەڵمژینی بۆنی دار و درەخت خۆشە لە هاویندا. لە نزیك ڕێگاکەدا کانیاو و گۆماو هەن کە پارچە زەوی سەوز و گەش و ڕازاوە بە گوڵی زۆر دەوریان داون لەوانەش نێرگز و پیازەخوگانەو squills و فریتیلاری fritillaries و ئۆرکید orchids.

بە دارستانەکەدا سوڕاینەوە لە خوار هێڵی لوتکەکەوە و گەیشتینە گوندی(ساوێر) کە دەکەوێتە نزیك تێکەڵبونی هەردوو زێ. لە دوڕیانەکەدا، لە و بەری جۆگەی ڕەواندوز پارچە زەویەکی فراوان هەیە کە کێڵگەیەکی سەوزە، نەدار چێنراوە و نەکەس لێینیشتەجێیە. لەگەڵ مولازم هەنتەرو چەند ژاندارمەیەك بەسەر چیاکە کەوتین کە لەسەرەوەی گوندەکەیە. دواتر دو یان سێ میل بەتەنیشتی دا ڕۆیشتین، بە ناو دارستانێکی چڕدا تاکو گەیشتینە خاکێك کە یەکسەر بەسەر زێی گەورەیدا دەڕوانی. ئەو شوێنە لە نزیك پێکگەیشتنی زێی گەورەو جۆگەی ڕەواندوز بوو. ئالێرەدا زێی گەورە بەلای ڕاستدا پێچدەکاتەوە، لەلای ڕاستمانەوە ئەو دیوارە مەزنەبوو کە پێی دەڵێن چیایی (بیاو) و بەرەو باکوری ڕۆژهەلات درێژدەبێتەوە تا دەگاتە ئەو چیایانەی کە لە ناوچەی بارزان و شێرواندان.

لە پێشمانەوە کۆتایی پچڕاوی زنجیرەیەك بەرزایی هەیە کە بە چیای (پێرێز) (پێرس) ناسراوە، ئێمە لەسەر درێژبونەوەکەی وەستا بوین، لە کاتێکدا لە نێوان پێرس و چیایی بیاوێ دولاییەکی مەزن دەبینرا کە زێی بە ناودا دەڕۆیی تاکو پێچێکی گەورەی دەکردەوە.

زێی گەورە، بەو ئاوەوە کە لە جۆگەی ڕەواندوزەوە دەهاتەوە ناوی لە خوار ئێمەوە دەڕۆیی و دەچوە ناو گەلی کەدوایی دەیگەیاندیە(باردین) لە باکوری پێرس و لە نێوان ئەو و چیای ئاکرێ دۆڵێکی درێژو تەنگەبەر هەیە کە بۆ لێواری

روبارەكە شۆڕ دەبێتەوە، ئا لەوێدا گوندی زێباریی چوڵكراو بە ناوی(مالأموس) هەیە، لە بەرامبەر ئەوێ و رێك لە ژێرئێمەوە و بەلای باكوردا گوندێكی جوان و بچوك، هەیە كە ناوی(دۆلاتیسۆ)یەو دەمانتوانی كە خەڵكەكەی ببینین چالاكانە كاری رۆژانەی خۆیان دەكرد.

لە بەرامبەرمان چیایەك بەری بینینی دەگرتن كە(باردمن)و دەشتی هەریر، تەواو دەكەوتنە پشتیەوە، بینیمان كە هێزێكی عەشایەری ئەگەر بیەوێ لە روبارەكە بپەڕێتەوە لە (مالأموسەوە)بۆ(دۆلاتیسۆ) ئەوا هیچ ئاستەنگێكی نایەتە پێش بە مەرجێك كە لەكی بۆ ئامادە بكرێ.

لە كاتێكدا كە بەلێكۆڵینەوەی دەوروبەرمانەوە خەریك بوین، یەك لە ژاندرمەكان، بە شڵەژانەوە هاواری كرد كە مارێكی دیتوە. لە گەڵیدا چوین و دیتمان لە چاڵێكدا كەپكەی كردوە، ژاندرماكە چەند تەقەی لێكرد و كوشتی. درێژی مارەكە(٤/٥) پێ دەبو ئەستوریشی سێ ئینج دەبوو سەرێكی گەورەو پانی هەبوو پەڵەی رەش لە سەر گەردەنی هەبوو.

دەنگی تەقەكان هەراوزەنایەكی لە گوندەكەدا دروستكرد و خەڵكەكەی لەسەر بانەكان كۆبونەوە. كە زانیان تەنیا مارێكە، ئیدی گەڕانەوە سەر ئەركە زۆرەكانیان. لە گردەكە هاتینە خوار و رێگای گەڕانەوەمان بەرەو(ساوێر) گرتە بەر، رێگاكەمان رێگایەكی دیكە بوو، بەلای چنارێكی رووتدا تێپەڕین كە گەڵای پێوەنەبوو بێ سێبەربوو. ئەستوری قەدەكەی نزیكەی(١٠) پێ دەبوو، پەرك و داخوراو و بۆشبو و لەناوەوە رەشببو، كانیاوێك لە رەگەكانیەوە دەهاتە دەر.

دانیشتوانی ئەوێ دەڵێن كە چنار(١٠٠٠) ساڵ دەژی، ماوەی گەشەكردنی(٥٠٠) ساڵە، بە هۆی ئاگرێكی هەناویەوە بە(٥٠٠) ساڵەكەی دیكەی لە ناو دەچێ. گوندی(ساوێر) نزیكەی حەوت ماڵ دەبن موختارەكەشی عەلی بەگی برای هارس ئاغای بیاویە، بەلە بەرچاوگرتنی ئەو دەوروبەرەی كە تیایا دەژی، بەپێچەوانەی ئەوەی لێی چاوەڕوان دەكرێ، ئەو پیاوێكی رەوشت بەرزە. لەسەر گژو یایەك ڕاكشاین و تیشكی خۆرەكە لێیدەداین، خواردنی بۆ هێناین كە بریتی بوو لە كەرە(نقیشك) و نانێك كە لە ئاردی بەرو دروستكرابوو، لەگەڵ كۆتكە دۆیەك و هەموو بەشداریمان كرد لە خواردنی.

بەهەمان ڕێدا گەڕاینەوە، بۆ ئەو جێیەی لێیهاتبوین تەنیا یەك پێچ کردنـەوەی بچوك نەبێ بۆ گونـدێك کـە لـەدوو ئـەو شـوێنانە دەگـەڕاین بـۆ پەڕینـەوە دەشـێن لەسەر جۆگەی ڕەواندوز، ئەو جۆگەیـە لـەم کاتـەی سـاڵدا پەڕینـەوەی ئەسـتەمە، بەڵام تەنیا لە یەك شوێن لە نزیك کـانی وەتمـان هـەر دوو ڕۆخەلێژەکـە لێـك نزیـك دەبنەوە کە دەتوانرێ بەهۆی کاریتە دانانەوە پردێکی لێدروست بکرێ. هـەرکی و عەشـیرەتە ڕەوەنـدەکانی دیکـە ڕاهـاتبون کـە بـەو شـوێنەدا ڕانـە مـەڕەکانیان بپەڕێننەوە بۆ ڕاکردن لەو باجەی کە دەسەڵاتی تورکی سەپاندبوی.

شـەوەکەم لـە سـەربازگەی کـانی وەتمـان بەسـەر بـرد، دواتـر ڕۆیـشتین و دەربەندەکە خۆی بـە بەرگـە بەهاریەکـەوە ڕادەنـا، لەبەشـی سـەروی نشێوەکەدا سەرەوە و بنەوەی ڕێگاکە بە گوڵێکی زۆر ڕازابۆوە، کـە ڕەنگـی سورێکی تێربـوو گەڵاکانی دڕکیان هەبوو.

لەجێگای دیکە پاشماوەی زۆری گوڵە مێلاقەمان بینی کە لـە کەنـدێناوە زۆرە. کە دوو ڕەنگی هەیە وەنەوشەیی کاڵ و تاریك. هـەردوك جورەکـە بـە خـاڵی زەردو ڕەش نەخشاون. ئەو کاتەی ساڵ بـەفر دەسـتی بـە توانـەوە کردبـوو سەرچاوەی بێخاڵ ئاوێکی باشی هەبوو، دیتمان کە ئیسماعیل بـەگ و شـێخ محەمـەد ئاغـا لـە سەر گردێکـی سـەرەوەی شارۆچـکەکە چاوەڕێی ئێمـە دەکـەن و، مـافور لـە ژێـر سـێبەری درەختـەکان ڕاخرابـون و سـەماوەر جۆشـدرابوو. دوای وچـانێك کـە نیـو سەعاتێکی خایاند و پیاڵە چای تێدا خورایەوە، بەرەو شارۆچکەکە چوینە خوارێ، کە دوای نیوەڕۆ و ئێوارەکەیم، لەگەڵ ئیسماعیل بەگ و پیاوماقوڵانی دیکەی شـار بە گفتوگۆیەکی خۆش بردەسەر.

لەوێ زانیم کە نوری چەند ڕۆژێکە ڕەواندوزی جێهێشتوە بـۆ سـەردانی هەنـدێ گوندی دۆڵی ئاکۆیان و عەشیرەتی(هـەروتی) کەلـە بەشـی سـەرەوەی ئـەو دۆڵـەدا نیشتەجێن کە لەکانی وەتمانڕا دێتە خوارێ. ئیسماعیل بەگ سـرتەی ئـەوەی کـرد کە ڕەنگە مەبەستی خراپ بێ، بەڵام ئەو دەم باوەڕم پێنەکرد. لە باویلاغام پرسی کە کوڕەکەیلـە کوێیـە؟ وتـی چـوەلە کـوڕەك کەلـەکێوی ڕاوبکـا. ڕۆژی واتـر کـە خەریك بوم شارۆچکەکە جێ بهێڵم لەبەر دەرگای ماڵی باوکی بینیم، کە تاڕادەیەك شەرمی کرد. لەگەڕانەوەمان لە جیاتی ڕێگای ئاسایی گەلی، بـەڕێگای سـەر چیـای

کۆرەکدا، کەپێی دەڵێن ڕێگای بێجان، گەڕاینەوە. بەشی یەکەمی هەورازەکە زۆر سەختە، چونکە بە دەربەندێکدا دەڕواو دەکەوێتە نێوان دوو لوتکە، کە بەسەر زنجیرە سەرەکیەکەدا دەڕوانن و دەکەونە لای ڕۆژهەلات. ڕێگاکە بەسەر تاوێری گەورەدا دەڕوا کە ئەو ئاوەی پێیدا دەڕوا ، ئاو بۆ بەشی سەرەوەی ڕەواندوز دابین دەکا. ئەو شوێنە بۆ ئاژەڵەکان زۆر ئەستەمە. هەر هێندەی ڕێگا کە لەو تەنگەبەرە ڕەتبێ ئیدی ڕێگاکە خۆشتر دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا زۆر لێژە. لە نزیك لوتکەکەدا بەفر دەتوێتەوە و گوڵی وردی ناوازە ڕواون. لێرەدا دەتوانی ئەو خەندەقانە ببینی کە قوڵ نین و تورکەکانی لێبو کاتێك ڕوسەکان لە ڕەواندوز بون. لەسەر لوتکەی چیاکەشدا ڕێگاکە بۆ مەودای هەزارپێ بەسەر دۆڵێکی ترسناك دا درێژ دەبێتەوە کە لوتکەی سەخت و بەرزایی لێژی تێدایە و هەوری قورس لە سەریدا مەلە دەکەن.

لێژاییەکە بەزەویەکی پڕ لە دارو درەختدا دەڕوا و بە قەلای(بێجان)ی کەلاوەدا دەڕوا، کە یەکێك لەو قەلا زۆرانەیە، (پاشای کۆرە) بنیاتی ناون، بەرەو باکور باماندایەوە و بەلێواری دۆڵی (ئاوی ئالانە)دا رۆیشتین کە جۆگە ئاوێکە بەرەو کانی وەتمان دەچێ و، لەگەڵ ڕێگا سەرەکیەکە دەچێتە دەربەندەکە، دوای ئەوەی بە دوو یان سێ گوند دا تێپەڕین لە جۆگەکە پەڕینەوە و، بەرەو سەر بۆ سەربازگەکە ڕێمان گرتە بەر.

کە بەو ناوچە چیاییە پڕ لە دارو درەختەدا دەسوڕاینەوە، هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر هێرشمان کرایە سەر چی بکەین؟ مەترسیەکی گەورە بەدوامانەوە بوو، کە تەنیا دوای چەند هەفتەك پێمزانی، چونکە عەشیرەتی هەروتی کە ژمارەیان(١٠٠) کەس دەبو، بە دوانـدا دەهاتن بەر لەوەی بگەینە شوێنێکی بێ ترس، خەریك بو بمانگەنێ. ڕەنگە نوری شونی ئێمەی هەلگرتبێ و خەبەری پێدابن.

لە(١٣)ی مانگ بەسواری بۆ باتاس بەرەو خواربومەوە، کە نەقیب لیتلدیل و سالح بەگم بینی، لەگەڵیدا چومە گوندی(بشور) کەهی (عوبێد بەگی) کوڕەمامی بوو پیاوێکی نازوکی بوو، چەپخون بوو، زۆربەی براکانی کوشتبو تا دەست بەسەر ماڵەکەیاندا بگرێ(ئۆباڵ بە ئەستۆی نوسەر: وەرگێر). لەوێوە بە سواری و بۆ

چەند میلێکی کەم، چومە گوندێکی دیکەی ئەو دەشتە کە ناوی(سیساوە)یە و لەوێ، قادر بەگم بینی کە پێڵاوی سواری لەبەر کردبوو و کەرەستەی جەنگی لە خۆدابوو. ئەو پیاوەکانیشی ئامادەکرد بوو، بۆ ئەوەی ئەگەر پێویست بوو یارمەتی من بدا. بەهەر حاڵ، لەوکاتەدا، هەواڵێك هات کە سوپای تەمێ کردن چەند گوندێکی دوژمنانی سوتاندوە و شێخەکانی سورچیان توانیویانە بەرەو چیاکان ڕابکەن. ئیدی مەترسی هێرشێك لە ئارادا نەمابوو، بۆیە توانیم ڕێگا بە قادر بەگ و سەرۆکەکانی دیکە بدەم کە بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. ئەو شەوە لە(بشور) نوستم و بەیانی گەڕامەوە هەولێر.

لە ڕۆژی دواتر، دەستم بە درێژترین گەشتم کرد لە گەشتەکانی کوردستان و خۆشترین گەشت بوو. بەر لەوەی دەست بە باسکردنی بکەم پێویستە باسی هەندێ ڕوداو بکەم کە لە دەوروبەری ڕەواندوز و لە کاتی ئەو سەردانەی دواییمان ڕویاندا. نامەیەکی تەلەفۆنی، دوای گەڕانەوەم، هاتە ڕەواندوز سەرچاوەکەی کانی وەتمان بوو، کە باسی ئەوەی دەکرد عەشیرەتی هەروتی خەریکن هێرش بکەنە سەر سەربازگەکە. وا دیاربوو کە ئەو عەشیرەتە، کە عەشیرەتێکی ئەوەندە گرنگ نیە، دوسێ ژاندارمەیان گرتوە و چەکەکانیان لێسەندون، ئەو ژاندارمانە بۆ وەرگرتنی باج ڕەوانەکرابون، ئیدی هەمو هێزی خۆیان ئامادەکردوە، کە نزیکەی(١٠٠) کەس دەبون. دواتر لە هەندێ ئەشکەوتی نزیك ڕێگای بێجان سەنگەر دەگرن و وەك پێشتر باسم بۆ کردی، بریاردەدەن کە بەدوامدا بێن.

دانانی بنکەی ژاندارمە لەسەر ڕێگای ڕەواندوز زۆر پێویست بوو، لە (دێرە) و(بابەجیجك) و کانی وەتمان، ناوچەکە نێچیری شڵەژان بوو، هیچ سەرۆکێکی عەشایەری بەهێزی ئەو تۆش نەبوو کە بتوانێ پارێزگاری لەو کاروانانە بکا کە بەو ڕێگایەدا تێدەپەڕین، ئەو ژاندارمانە، وەك باسم کرد سەرانەی سوکی زۆریان بەسەر گوندەکەیانەوە دەسەپاند کە سنوری نەبوو. خەڵکەکەش خۆیان لەوە نەزانتربون کە بەئاشکرا گلەیی لە وەبکەن، بۆیە ئازاریان بەو هۆیەوە درێژەی دەکێشا تاکو حەسەڵەیان نەدەما.

ڕەنگــە ئەنجامەکــەی ڕودانــی تەقینــەوەبێ. ئــەو کێــشەیەی لــە ڕیزەکــانی هەروتیەکان ڕویدا، بەزۆری دەگەڕایەوە بۆ زوڵم و زۆری ژاندارمە، بەڵام جەسارەتی ئەوەیان نەدەکرد ڕوبەڕوی حکومەت ببنەوە ئەگەر لایەنی دیکە هانیان نەدابان.

شــەوی دوای ڕۆژی گەڕانــەوەم، فاتیمــەخان کــە یارمــەتی حکومــەتی دەدا لەکۆکردنــەوەی(مەڕانــە) هێرشــی کرایــە ســەر، بارەکــە لــە ڕۆژەکــانی دوای ئــەوە، نوقلانەی خراپی پێوەبوو. دەســتەیەك لــە دۆڵــی ئاکۆیــان لــە نزیــك (بێجــان) و لــە سەروشیانەوە نوری، دایانە پاڵ هەروتیــەکان و،چــاوەڕێی هــەلێکی گونجــاوبون تــا هێرش بکەنە سەری سەربازگەی کانی وەتمان. ئەگەر نەمزانیبا کە سەربازگەکە لە شوێنێکی مەترسیدارە، ئەوا ئەو کارە هیچ دڵە ڕاوکێیــەکی لادروســت نــەدەکردم و نەمدەزانی کە هەرسەرکەوتنێکی سادە، بۆی هەیە کە هەموو ناوچــەکە هەڵــسێنێ. براکانی یوسف بەگ و هەندێ لە ناڕازیانی باڵــەك، لــە هــەمان کاتــدا، هێزێکیــان لــە گوندێکی لێواری دەشتە دیانە کۆکردەوە، خۆیان ئامادەدەکرد تا بەرەو ڕەوانــدوز بێنە خوار، خۆشبەختانە هیچ شتێك لەمانە ڕوياننەدا.

ئەحمەد ئاغــای شــێروانی نامەیــەکی بــۆ برایــەکانی یوســف بــەگ نــاردوو تێیــدا ئاگاداری کردنەوە کە ئەگەر بەرەو ڕەواندوز بچن، ئەوا ئــەویش لــە دواوە ڕا لێیــان دەدا. لە هەمانکاتدا کە حــەوێز ئاغــای هــەروتی زانــی سورچــیەکان پــەرش و بــلاو بونەتەوە و گوندەکانیان وێرانبوە ئیدی ئەویش هێزەکەی خۆی هەڵوەشــاندەوە و ژاندارمــە گیراوەکــانی ئــازاد کــرد و چــەکەکانی دانەوە،نامەیــەکی دانــێ کــەتیایا هەولێدابو ئەم ڕەفتارەی خۆی ڕونکاتەوە.

هــەر هێنــدەی بارەکــە ئــارامبۆوە، جــارێکی دیکــە بڕیــاردرا کــە ســەربازەکان بەیــەکجاری لـــە ناوچــەی ڕەوانــدوز بکێــشرێنەوە و هێــزی لیڤــی کــە ئێــستا ژمارەیان(٢٠٠)کەس دەبوو شوێنیان بگرنەوە، بە مــەرجێك لــە شارۆچــکەکەدابن و نەقیب لیتلدیل فەرماندەیان بــێ. بڕیــارم دابــوو تالــە توانــادابێ ناوچــەکە لەســەر بنچینەیەکی دروست بەڕێوە ببرێ و مۆڵەتم لە حاکمی پاشایەتی گشتی وەرگرتبــو کە(مستەر تێرنەر) لە ڕەواندوز بێ تاکو سەرپــەرشــتی کارەکــانی گــومرگ بکــاو لــە کاروباری داهاتەکانیش یارمەتی ئیسماعیل بەگ بدا.

مستەر تێرنەر پۆستی سەرۆکی نوسەرانی هەبو لە باتاس ، زانیاریەکی زۆری دەربارەی ناوچەکە و خەڵکەکەی هەبوو، زیاد لە وەش کەمێك کوردی دەزانی. ئێستا من لە ڕەواندوزم تاکو سیستەمە تازەکە دامەزرێنم و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پشێویانەی ئەم دواییە بکەم، هیواداریش بوم کە هەموو ئەوانەی بەرپرسیارن تیایا تەماعگیر بکەم کە دەخالەت پێشکەش بکەن و بەشێوەیەکی نەرم و لێوەشاوە بیانکەمە لایەنگیری یاساو ڕێکو پێکی. ئەمە باشترین شێوازە کە گونجاو بێ ئەگەر بارودۆخی ئێستا لەبەر چاو بگرین. چونکە سەربازە گیراوەکان هێشتا ڕاهێنانێکی ئەو تۆیان نەبو، بۆیە هەر ڕێوشوێنێکی هێرش بردن بابەتیانە نیە. وەکچۆن نیازی سەردانی سنوری فارسیم هەبو تابتوانم بڕیار لەسەر باشترین شێوازی گومرگ وەرگرتن بدەم، کە هیوام وابو داهاتێکی زۆر باشی هەبێ. هەروەها نیازی ئەوەم هەبو کە لە ناوچەی هەروتی و دۆڵی بالیسانەوە بچمەوە بیتوێن و دەربەند تا چاوم بە نەقیب کۆڵ، یاریدەدەری حاکمی سیاسی ئێستای ڕانیە بکەوێ و، لە کۆیە بگیرسێمەوە کە ئێستا نەقیب برادشۆجێگەی نەقیب(ڕاندل) ی گرتۆتەوە.

ئەو ڕێگا سەرەکیەم گرتەبەر کە دەچێتەوە شەقڵاوە، چونکە دەمویست ڕای قادربەگ دەربارەی بارودۆخی ڕەواندوز بزانم، سروشت جوان و ڕەنگین بوو(باڵندەکان گۆرانیان دەگوت و درەختەکان سەمایان دەکردوگوڵەکان پێدەکەنین).

ئەو گوندە بچوکەی کە لە دامێنی ئەو گردانە بوو کە چەوی تێدا بلاو ببۆوە پێش ئەوەی بگەیە چۆمی بەستۆرە، کە گەیشتینە ئەوێ گوڵەگەنم بەسەوزی گەشاوەییەکەی دەوریدابوو گوڵەخەشخاشی سور نەخشاندبوی. کە لەبنیدا گوڵێکی شینی ناسك کە پێی دەڵێن(گوڵەزەنگوڵە) ڕوا بوو، لێرە و لەوێش گوڵە توڵەگە (HOLLY) (HOCKS)ی هەڵچوو بەهەردو ڕەنگی سوروسپی بلاوبونەتەوەو، روناکیەکی زۆری وەك(وەنەوشە) (HYACINTH).

تۆزێك لە کۆڕێ ڕاوەستاین و چایەکمان خواردەوە، لەو شوێنە ئاساییەی ژێر سێبەری دار تو، پێشتر باسی(کانەبی) قاوەچی مستەفا ئاغام نەکرد بوو کە هەمیشە خزمەتی دەکردین، ئەو پیاوێکی سەیرو سەمەرەیەو دەمو چاوێکی خڕی هەیە، ئەو لە هەموو شوێنێك باسی دەکرێ و ناوبانگی هەیە، دەیانگوت کە ئەو

ئازایەتی شێرێکی تێکشکێنەری هەیە. لە شەقلاوە گفتوگۆیەکی درێژم لەگەڵ قادر بەگدا کرد. ئەو ئەو گومانەی پشتڕاست کردەوە کە لای من دروستبوە و ئۆبالّی هەموو ئەو پشێویانەی ئەم دواییەی خستە ملی نوری. دیار بوو کە ئەو مامۆستا کۆنەکەی، کە پیرە پیاوێکەو ناوی(کاکەمین)ە، هاندابوو تاکو سەردانی عەشیرەتەکانی دەوروبەر بکا تاکو هانیاندا لە دژی ئەو حکومەتە کافرە شۆڕش بکەن. کوردە نەزانەکان بە وەلیان دەزانی، بۆیە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بون، هەر ئەو شێخە خۆی، کە دیتی هەموو هەوڵەکانی لە کاتی خۆیدا نیە، لەم دواییە هەوڵیدا بارەکە ئارامکاتەوە.

ڕۆژی دواتر چومە سیساوە برازایەکی قادر بەگ کە ناوی (عەبدولرەحمان) بەگ بوو پیاوێکی لاوازی باریکەڵە بوو و ڕقم لێیبوو لەگەڵمانهات. لەوێوە بە کۆمەڵە گوندێکدا تێپەڕین کە دەکەوتنە سەر لێواری ڕۆژهەلاتی دەشتی باتاس. زەویەکانی ئەو ناوە پڕن لە گولاڵە سورە، کە دەڵێی پشکۆن، لە دوا سەردانمەوە بۆ باتاس(پاشا) ئەوێی جێهێشتبوو، لە ڕەواندوز لەگەڵ نەوەکەی نیشتەجێببو، ئەمەش نەوەکەی بێزاردەکرد، ئەو ڕقی لە تەگبیری(پیاوە پیرەکە)بوو. دواتر بەرەو کانی وەتمان ڕێم گرتەبەر کە شەوەکەم لەوێ بەسەر بردو ڕۆژی دواتر بەرێگای گەلیەوە بەرەو ڕەواندوز چوم کە(سمڵ) جیّ ی بۆ گوڵەکانی دیکەی هاوینە کە گەورەتربون، چۆڵ کردبوو.

کارێکی زۆرم لە شارۆچکەکە هەبوو دەبوایە جێبەجێیان بکەم. ژمارەیەکی زۆری سەردانیکەرانم پێشوازی کرد. بە دوای براکانی یوسف بەگ و سەرۆکانی هەروتیمدا. نارد و بەڵێنی ئەوەم پێدان کە دەنگیان لەگەڵ ناکریّ. لە کاتی گەیشتنم نوری لە ڕەواندوز بوو، بەلاّم کەداوام لە باویلاغاکرد بیهێنیّ وتیان کە بۆ ڕاوکردن دەرچوە. باوکیم ئاگادارکردەوە کەبەر لەوەی بچمەوە هەولێر هەر دەبیّ ببینم، پێم وت: ئەگەر بێتەلام شتێك نیە سڵی لیّ بکاتەوە و ئەوە بۆ ئەویش باشترە. دیتم کە(پاشا) لە هاتنەوەی بۆ ڕەواندوز زۆر دڵخۆشە، بەلاّم گلەیی لەوە دەکرد کە کوڕەکەی ناڕادەیەك دەستبلاّوە.

هەر هێندەی شەو دوڕاو ڕۆیشت و خۆربە سەرکەوتویی دەرکەوت. ڕێی ناوچەی باڵەکم گرتەبەر، ئیسماعیل بەگ و محەمەد عەلی ئاغا و هەر دوو ئاغای ناو سلێمانم

لەگەڵدابوو، هەرکە بەرەو خـوارووی شارۆچـکەکە شـۆڕبوینەوە، بەسـەر پردێکـی بچوکدا تێپەڕین کە لـە نزیـك قولاییەکـەی بـوو، ئیـدی چـوینە ئـەو بـەری جۆگـەی ڕەواندوز، ئـالێرەدا جۆگەیـەکی کـراوە دەبینـرێ کـە هـاژە دەکـا و لـەلای ڕاسـتی ڕێگاکە لێژایی بەردینی خۆڵەمێشی بەسەر ڕێگاکەیاندا دەڕوانی، لە کاتێکدا کـەلای چـەپی و بـەلێواری ئاوەکـەدا، پارچـە زەویـەکی دێـراو هـەبو کـە بـەهۆی هەنـدێ بەربەستەوە دابەشببوو کانیاوی تێدا بلاوبون لە دەوروبەریاندا گیاو گوڵی چڕوپڕو گوڵە کێوی بە کۆمەڵ ڕوابون. هەوا پڕ لە بۆن و بەرامەبو یادگاریـەکان بـەدەورەی کێڵگە ئینگلیزیەکانی حوزەیران دا دەسوڕانەوە و، دەهاتنەوە یاد. لە تاوێرەکـەی لای ڕاستی ڕیگاکە سـێ یـان چـوار کـانی فـراوان هەڵدەقوڵان کـە قـەوزە و لاو لاو خەملاندبویان. دوای شـەش یـان حـەوت سـەعات لـە جۆگەکـە دور کەوتینـەوە و بەسـەر هـەورازێکی زۆر سـەخت کـەوتین تاگەیـشتینە(زیـن) چـیای دەرگەڵـە کەبەرزاییەکەی نزیکەی(٤٨٠٠)پێ دەبێ لە ئاستی دەریـاوە، ڕێگاکـەش تـەنیا لای سەرەوەی نەبێ، بەگشتی پڕدار و درخت و پێچاو پێچە، ڕەنگی سـورە و لەبـەردە نیشتەنیەکانە و شڵە، تەنیا هەندێ شوێنی نەبێ کە هەندێ گوڵی جوانی لێڕواوە.

نشێوەکە بەرەو دەرگەڵەی بردین کە شوێنێکی زۆر قایمە، لە نێوان ئەو دەروە و دۆڵێکی تەنگەبەری خوارەوەیە تەنیا ئەو ڕێیە هەیە کە دەگاتەوە سـەر جۆگـەی ڕەوانـدوز. بـەلای باشـوردا ڕێگایـەکی سـەخت هەیـە کـە دەچـێتەوە(وەرتـێ)و ناوچەکەشـی سـەختە، چ ناوچـەیەکی سـەخت کـە لـە چـیای هندرێنـەوە بـەرەو ڕۆژهەلات دێ، لە کاتێکدا لە باکورەوە دیمەنی نشیویەکی لوسی هەڵدێرە و پڕە لە ڕەزی ترێ. دەرگەڵە کە سەر دەمانێك گونـدێکی فـراوان بـوو، بـە تـەواوی لەسـەر دەستی ڕوسەکان وێران کرا و تەنیا نزیکەی بیست خـانو نـەبێ هیـچی دی دوبـارە بنیاتنەنراوەتەوە، لێرە(میر محەمەد ئەمین بەگ) و برازاکەی(مـیرۆ) کـە گـەنجێکی زۆر قۆزە، میوانداریان کردین و خـواردنێکی زۆر نایابیـان پێـشکەشکردین. لـە نـاو خێوەتـدا دایاننـاین کـە لەسـەر زەویـەکی سـەوز هەڵدرابون و بەمـەش لەدەسـت ئەسپێ ڕزگارمان بوو، کە ئەو گوندە زۆر پێی بەناو بانگە. ئالێرەدا(شێخ محەمـەد ئاغا)مان دیت کە چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد لەگەڵ براگەورەکەی کـە نـاو بـانگێکی خراپـی هـەبوو، چـەپخون و ڕوکـارێکی زۆر سـەرەتاییانەی هـەبوو(ئۆبـاڵ بـەملی

نوسەر: وەرگێڕ) وەك شێخی هەروتیەکان ناوی کاکەمین بوو، (کاکە)ش نازناویکە بۆ ڕێزلێنانی برای گەورە.

ئەو دەستەیە هەموی بەیانیەکەی بەرەو گوندی وەلاشێ ی شێخ محەمەد ئاغا چون. ڕیگا سەرەکیەکەمان نەگرت چونکە بەکەڵك نە دەهات و ئەو پردەی لەسەر جۆگەی ڕەواندوز دروستکرابوو، روخابوو، لە تەنکاوێکیﻨﻪرم کە لە ڕۆژهەڵاتی دەرگەڵەبوو، پەڕینەوەو، بەرەو دۆڵی یەکێك لە لقەکانی روباری سەرەکی شۆڕبوینەوە. ڕێگاکەمان بە ناوچەیەکی جوان و ڕازاوەدا بوو، لە نێوان پەرژین و لەوەڕگای ڕەنگین بەبەرگی بە هارێ، لە خوارەوە هەندێ دار گوێز هەبون، لە تەنیشتی جۆگە ئاوێك خوڕەی دەکرد لە نێوان دارچنار و داربی ی هەڵچودا پێچاوپێچ دەڕۆیی. لەسەر تەپۆلکەی گردەکانی لای راستیشمان هەندێ گوندی پەرش و بڵاوت دەبینی کە بە ڕەزی ترێ دەورە درابون، لە شوێنێکی کە دارو درەختی چڕی هەبوو لە جۆگەکە پەڕینەوە و چوینە ئەو بەر. دوای سەعاتێك یان دوان لە ڕۆیشتن بە ناوچەیەکی پڕ لە دارو درەخت گەیشتینە گەروێکی نزم، کە لەوێڕا لە بەرامبەرمان گوندی(وەلاشێ)مان لێ دیاربوو.

ئەو شوێنێکی دلگیرو جوانی هەیە و لەسەر لوتکە چیایەکە، لە کۆتایی سەرەوەی دەشتێکی بچوکی سەوزە، بەگەنمێك کە تازە خەریکە پێبگا. خانوی شێخ محەمەد ئاغا لە هەر خانوێکی کوردی جیاوازە، کە سەردانم کردبێ، بنیاتێکی پتەوی هەیە و لەسەر شێوازی ماڵێکی کێڵگەی ئینگلیزی بنیات نراوە. هەندێ ڕاڕەوی تەسکی پێچاو پێچی هەیە کە دەگاتە ژوری بچوکی خۆشەوە، کە گەرم و خۆشن، جا چ بە ئاگردان گەرم بوبێ یان بەئاگری کراوەی سۆپا....... هتد.

ژورێکی تایبەت بۆ من ڕێکخرا، کە هەردەم یەکێك یان دوان لە سێ کوڕەکەی سەرۆك خزمەتیان دەکردم. ئەوان کەسانێکی ئاسایین، گەورەکەیان تا ڕادەیەك شەرمنە، بەڵام دوانەکەی دیکەی ڕاستەوخۆ بەشداری گفتوگۆیان دەکرد. بچوکی هەرسێکیان(سەعید)بوو کە منداڵێکی یازدە ساڵانە و لە خێرایی قسەزانیداو لە هاوڕێیەتی لەسەرەوەی هەر دو برایەکەیەتی.

دوای نیوەڕۆ پیاسەیەکی کورتم کرد، کە دەمویست دیمەنی سروشت ببینم، بە ناو بێستانی میوەدا بەسەر چیایەك کەوتم، لە پشت گوندەکە، لەلای ڕاستم بەربەستێکی گەورەی سەربە بەفر هەبوو، کە سنوری(فارسی) ئێرانە و لەناوەڕاستیدا هەڵگوردی مەزنە، کە قوبیەیەکی بەردینی ڕەشە و بەفر دەینە خشێنیّ. ئەو لەزنجیرەکە جودایە و بەرزترە. و لە پێشیشم دۆڵی قوڵ و تەنگی جۆگەی ڕەواندوزبوو، کە بە بەینی گردەکاندا پێچی دەخواردەوە. زەویە پڕ لە دارو درەختەکە وردە وردە بەرەو جۆگە ئاوەکە شۆڕ دەبۆوە، لە کاتێکدا لە لای دورەکەیزنجیرەیەك گرد و لوتکە هەبون کەلەیەك جودابون و دۆڵی درێژیان لەنێواندابوو، لە خوارەوەم، میلێك یان دوو میل لە پشت وەلاشیّ، (میرەکە)ی لانەی دزە بەناوبانگەکان دیارە، ئەودەم بیرم لەوە کردەوە کە زانیاری دەربارەکۆکەمەوە و وێرانی کەم، بەلام ئەوکارە بەندە بە توانای بەسەربازگیراوان و توانای جوڵەیان. دیمەنی لای چەپم بە چیای هندرێن داخراو بوو، زیاتر لەشێوەی بەرازێکی گەورە دەچوو. ئەو بەدڵێکی قوڵەوە لە ئێمە دابڕاوە کە ئەمرۆبەیانی پێیدا هاتین،ئەمە و لە دوامەوە کۆمەڵی چیای پڕ لە گژو گیا هەبون کە سەریان بەفر گرتبوی و، بەرزیان دەگاتە پتر لە(١٠٠٠٠)پیّ. لێرەوە دەتوانی گوندە بلاوەکانی باڵەك ببینی، کە بە ڕەزەتریّ و ناوچە داچێنراوە کانیەوە بە هەمولایەکدا پەرش و بلاون. وشەنیە کە پەنای بۆ ببەی بۆ وەسفکردنی ئەم دیمەنە مەزنە. ناوچەکە زۆر سەختە، جگە لە ڕێگەی ئاو نەبیّ، ئیدی چیاکان سەر بۆ هیچ حوکمێك دانانەوێنن، چونکە بەشێوەیەکی پڕ لە باخ بەسەر یەکدا کۆبونەتەوە و خەرەندی زۆر گەورە لەیەکیان جیا دەکاتەوە، بە شێوەیەك کە دەبنە هەڵدێری بێوێنە.

لەو شێو (نانی ئێوارە) کە شێخ محەمەد ئاغا پێشکەشی کردین تۆزێك بیّ هیوایی دایگرتم و ئێستا درکم بەوە کرد کە بۆچی هەندیّ لە ئاغاکانی دزەیی دەیانگوت میر محەمەد ئەمین بەگ لەو پیاوترە. تاکە شتێکی کە ئیشتیای دەکردەوە ئەو لەگەنی دومەلانە بوو، کە هەمیشە لە بەهاراندا لە ناوچەکە دەر دەکەویّ. ئێوارەکە بەقسەی خۆش و کەیفەوە بەڕێوە چوو، سەعید دوو بێچوە ورچی هێنان کە بەم دواییانە لە گردەکاندا دۆزیبونیەوە، زۆر دڵڕەقانە ویستی

بەشەڕیانێنیٚ، شێخ محەمەد بەڵێنیدا کە بۆمیان بنێرێتە هەولێر وەك دیاریەك، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك مردن. قسەکانمان دەربارەی چیاکانی دەوروبەرمان بوو، بەتایبەتی چیای هەڵگورد، خانەخوێکەم گوتی کەوا ڕۆژانی بەر لەشەڕ هیندیە گەڕۆکەکان دەهاتن تاکو لە تروێپکەکەی ئەو گیایە سەیرانە کۆکەنەوە کە ڕوابون. وتیشی لەژێر ئەو بەفرەی چەندین ساڵە بەسەریەکدا کەڵەکە بوە گیانلە بەرێکی سەمەرە هەیە کەپێی دەڵێن کرمی بەفر، درێژیەکەی نیوپێ دەبێ و قەڵەو وسپیە و دەمی نیە چاو و لوت و هیچ ئادگارێکی سروشتی نیە، تەنیا کلکە براوەکەی نەبێ، ئەگە ئەو گیانلەبەرە بهێنیە خوارەوە دەمرێ، لاشە وشککراوەکەی لە ڕۆژانی هەرە گەرمی هاوینیشدا گەرمترین ئاو سارد دەکا خەڵکێکی زۆریش دوپاتیان کردەوە کە ئەو گیانەوەرەیان دیوە، ئەوسامنیش وابیۆ چوم کە ئەو چیرۆکە بنچینەیەکی هەیە.

لە وەلاشێ، هەریەك لە بەکر بەگ، برای یوسف بەگ، و مەلا یوسف ئاغا لە عەشیرەتی باڵەکیانم دیت، کە پیاوێکی وردیلە بوو پێیەوە دیار بوو کە چەند سەرەتاییەو ریشێکی پڕو ڕەشی هەبوو، جەمەدانیەکەشی ریشوی هەبوو. ئەو بەراستی پێشرەوی بیرۆکەی برایەتیە.

ئەوان گوێڕایەڵی خۆیان پێشکەش کرد و سوێندیان خوارد کە ڕۆڵەکانی عەشیرەتەکەیان بە مەبەستی دوژمنکارانە هاننادەن و ئەوەی کراش تەنیا بۆ بەرگری لە خۆکردن بوو، چونکە لە هێرشی ئیسماعیل بەگ دەترسان ئەنجەتەکانی ئەوانم قبوڵ کرد و، بەرلە ڕۆیشتنم ڕەشید بەگیش گەیشت، هەموان لەگەڕانەوە بۆ ڕەواندوز لەگەڵمدا هاتن، تاکو ئاشتبونەوە لە نێوان ئەوان و ئیسماعیل بەگ ببەسترێ، هەر چۆنێك بێ، ئەوان نەیانتوانی وا لە بەگۆك بکەن لەگەڵیان بێ.

لە ڕۆژی حەوتی ئایار لەگەڵ شێخ محەمەد ئاغا و ئیسماعیل بەگ و ئەوانیتر سەردانی ڕایات (٧) و سنوری ئێرانمان کرد. لێرە بە ناوچەیەکدا ڕۆیشتین کە تاکو جۆگەی ڕەواندوز دار و درەختێکی باشی هەبوو، هەموو هەورازەکان پلە پلەبون تەنیا یەکێکیان نەبێ کە زۆر لێژ بوو، لەناو خەڵکەکە بە هەوراوی (ئێستر بەزین)ناسرابوو.

لە ڕێگەی(ناوپردان)ەوە گەیشتینە قولایی دۆڵەکەو، بە هۆی پردێکی شەق و شڕەوە لە لقەکانی ڕوبارەکە پەڕینەوە، کە دار گوێز سێبەری بەسەردا کردبوو، پردێکی دیکەش لەوێ هەبوو کە بەهۆیەوە لە جۆگەی ڕەواندوز دەپەڕیەوە، بەلام ڕۆژگارتێکیدابوو تەنیا بەکەڵکی پەڕینەوەی پیادە دەهات. لە ڕۆیشتن، بۆ ماوەی سێ چوار میل بەردەوامبوین تاگەیشتینە دەروی دۆڵە درێژە کە و لەوێ عەلی بەگی ڕایات پێشوازی کردین، کە پیاوێکی هێمن و لەسەر خۆ بوو، ریشی ماش و برنج بوو.

ئەو لە هەموو سەرۆك لقەکانی(گوندی باڵەك )گرنگتر بوو، لە سەرەتای دۆڵەکەدا بە گوندی ڕایەتدا تێپەڕین، کە وێرانەیی سیمای هەرە دیاری بوو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوین تاگە یشتینە هۆبەی عەلی ئاغا کە تەنیا میلێك لە گوندەکە دوربو.

ئەو دیمەنەی کە لە نیگامان هەڵەنگوت نەك هەر زۆر جوان بوو، بەڵکو لە دیمەنە هەرە جوانەکان بوو. ڕەشماڵەکان لە زەویەکی بچوك هەڵدرابون، کۆمەڵە کوردێکی سەرەتاییش کە جلی سەیرو سەمەرەیان لەبەردابوو لەبەر دەمی ڕەشماڵەکان وەستابون و لە ناو گیاو گوڵە زۆرەکەدا، دیمەنەکە بەچیای بەرزو لێژ کە لوتکەی سەر بە بەفریان هەبوو، دەورەدرابوو، هەر هێندەی چوینە دیوەخانەکەوە دوگەنجم بینی کە عابای فراوانیان لەبەردابوو کەشیدەی سەوزیان لەسەر بوو، کەنیشانەی ئەوەیە ئەوان لەنەوەی پێغەمبەرن(د.خ) ڕێگاکەیان بۆ کردمەوە و سەرەتا لەگەڵیاندا دەم و دو شیرین نەبوم(ئاوا: وەرگێڕ) بەلام هەر خێرا بینیم کە دوکەسی بەرێزن قسەکردنە بە ئەدەبەکەیان و ڕەفتارە دلگیرەکانیان تەواو لەو کوردانە جودا بوو کە لە ناویاندا دەژیان، کوردەکان، سروشتێکی درو ناخۆشیان هەبوو. ئەوان لە گوندێکی تەنیشتیانەوە هاتبون کە ناوی(دار و سەلام)بوو.

بەر لە نانی نیوەڕۆ خانە خوێکەم ئەو ڕوەکە بەناوبانگەی بۆ هێنام کە پێیدەڵێن(ڕێواس) کە تەنیا لەبەرزاییەکاندا دەڕوێ، کوردەکان بە گیایەکی باشی هەرسکەری دادەنێن، قەدێکی درێژ و ڕوکارێکی کوڵکنی سەیری هەیە، گەلایەك لە سەرەوەی هەیە کە خەریکە بکرێتەوە، پاکمان کرد و بەشەکرەوە خواردمان، تامەکەی ناخۆش نەبو، تەنیا دوای چەند ڕۆژێك و دوای کولاندنی زانیم کە ڕێواسە.

دوای نانی نیوەڕۆ لەگەڵ ئیسماعیل بەگ و ئەوانیدی سوار بوین بە نیەتی بڕینی ئەو شەش میلەی کە مابو بۆ سنور. بەرێگایەکی پلە پلە دا کە بەسەر زەویەکی بەرزی پلە پلەدایە و پڕ لەگژو گیایە، ڕێگاکە لەو دەروە گەورەیەی نزیك دوبڕبونی ئاوەکە نزیکدەبوەوە کە پێ ی دەڵێن (گەروی شێخ). زەویەکە لێرەدا ڕوتەنە تەنیا هەندێ شوێن نەبێ کە گیایەکی سەوزو پڕیان هەبوو، بەتایبەت ئەو لاپاڵانەی کە خۆر بەفرەکەی تواندبۆوەو بڕێکی زۆر لە گوڵەباینجان و مێلاقەو پیازە خوگەی لێبو، هەندێ پارچە بەفر تا ئێستاش لە لێواری ڕێگاکەدا مابون. لە دوری دومیل لە سنور تاوەرێکی قوبەیی هەبو کە زۆر کۆن بوو بە(شێخی باڵەکان) دەناسراو ناوەکەی لە گەروەکەش نرابو. ئالێرەدا پیاو چاکێکی کوردی ڕاکشاوە. کە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە و، ئەو بەرلە دوو تاسێ سەدە بەر لە ئێستا ژیاوە. لە دەوروبەری مەزارەکەی گۆڕستانێکی نارێکی موسلمانان هەیە و لە نێوان کێلەکاندا گوڵە سەوسەن ڕواون. ئەو مەزارە لەو ناوچەیەدایە کە گیانی خواوەندی مەزن لە خۆی گرتوە و بێدەنگیەکی شکۆداری هەیە.(٨)

لەبەر ئەو بەری گۆڕستانەکە سێ چوار داربی باریك هەن کە بەرزایان(٥٠)پێ دەبێ و بێ لق و گەڵان و بۆ ماوەی چەند میلێك هەر ئەو درەختانەی لێیە. ئەو دارانە بەلق و پۆپ و گەڵابون، بەڵام، لق و پۆپەکەی لەلایەن ئەو دوو سوپایەی بەرامبەر بەیەك، بۆ سوتەمەنی بڕاون. شوێنەواری پێکدادانیان لێرە و لەوێ دیارە، هێڵی سەنگەر لێدان و کوختی بچوك و قوبەی لە پلێت دروستکراو و تەل دڕو شتی دیکەش. بەڵام شوێنەواری هەرە دیار ئەو ڕێگایەکە کە بە دەروەکەدا درێ دەبێتەوەو ڕوسەکان لەسەرخۆ کردویانە بەڕێگایەکی پان و بەسود بۆ تێپەڕینی هەر هۆکارێکی گواستنەوە.

لەسەر سنور، مەبەستم لە شوێنی دوبڕبونی ئاوەکەیە، پانی دەروەکە دەگاتە میلێك و هەورازی زۆر لەولاو لە ملای ڕێگاکە هەیە، لێژاییەکی کورت و هاسانیش هەیە کە دەگاتە دەشتی(لاجان).

بەسەر گردێکی بە گوڵ داپۆشراو کەوتم کە دەکەوتە لای باکورم، سەرنجم بە دەشتە پان و ڕێکەکە داو بە گردەڕوتەنەکاندا، کە نیشتمانی هەردوو عەشیرەتی(مامەش) و (پیران) بوو، بۆ سابلاخ و، شنۆ، نارد، ئەو دەمای کە لە

دەشتی لاجان ورد دەبومەوە هەستم بە خۆشیەکی زۆر کرد، کەئەمە بۆمن شتێکی تازەو نەدۆزراوە بوو. ئەویّ بە بەراورد لەگەڵ ئەو زەویە سەختانەی کە لە پشتمەوە بون، شوێنێکی زۆر ڕێکوپێك و جوان بوو. شەیدای ئەوە بوم کە بچمە خواریّ و بە ناو عەشیرەتە سەیرو سەمەرەکانیدا بگەڕێم، لە خوارەوەی من و لەلای ڕاست دەشتێکی باشی دێراو هەبوو، دەمتوانی گوندەکانی حەسەناغای پیرانی ببینم، کە چەند ساڵێکی کەم بەر لە ئێستا قایمقامی ڕانیەی کوشتبوو پەنای بۆ هاوینە هەواری عەشیرەتەکەی برد بوو. لە بەرامبەرمدا گردێکی ڕەش هەیە کە لەدەوروبەریدا گوندی(پەسویّ)ی قەرەنیاغای سەرۆکی عەشیرەتی مامەشە، ئەو ئێستا سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەو شتەیە کە پێیدەڵیّ(گومرگ) لەو کاروانانەی وەردەگرت کە بەوڕێیەدا ڕەتدەبون. شنۆ دەکەوێتە لای چەپ، لە پشت زنجیرە چیایەکی بەردین شاردراوەتەوە لە پشتەویش ورمێیە(١٠). دەڵێن (سمکۆ) (١١) ی سەرۆك عەشیرەتی شکاك ئێستاش سەرقاڵی شەڕە لەگەڵ سەربازانی فارسی. وامهەست دەکرد کە یەکێك لە دۆزەرەوەکانم کە کیشوەرێکی نەناسراو بۆیەکەمجار دەبینیّ. بە جەخارێکی زۆرەوە ئەو دیمەنەم بەجێهێشت و گەڕامەوە.

پێویستە کە بڵێین ڕوسەکان ئەم ناوچانەیان داگیر کرد و، ئەو گوندانەی کە دەمتوانی بیانبینم و لەدەشتەکەدا بلاّو ببونەوە، ئێستا لە خەڵکەکانیان چۆڵن. هۆزی مامەش کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەهێز بوە و شانازی بە دوو هەزار سوارەوە کردوە، ئێستا ناتوانیّ لە دوسەد پیادە زیاتر ئامادە بکا. ئەوان و عەشیرەتە کوردەکانی دیکە هەر بە ناو لەژێر دەسەلاّتی حکومەتی فارسیدان، بەلاّم، بەهەر حاڵ ئەگەر لەژێر دەسەلاّتێکیشدابن کەمێك باج دەدەن، یان ڕەنگە هەر نەیدەن.

لەڕێگەی گەڕانەوەماندا، کەمێك لاماندا و لەمەشدا مەبەستێکمان هەبوو، بەرەو گوندی(دار و سەلام) ڕۆیشتین کە دەکەوتە سەر تەپۆلکەی ئەو گردەی بەسەر دەربەندەکەدا دەیڕوانی، کە لە گەڕانەوەماندا دەکەوتەلای ڕاستمان.

ئەو دو سەیدە لێرە نیشتەجێن، مەبەستم شێخ عوبەیدڵلاّ و شێخ عەلائەدینە ئەوان کوڕەمام بون، باوکیان، کە چەندساڵێکی کەم بەر لە ئێستا مردبون، بەر لە(٥٠) ساڵ لەو شوێنەدا نیشتەجێبون، ئەوان لە دەشتی لاجانەوە هاتبون، ئەوان

لای مامەش و عەشیرەتە کوردەکانی دیکە ڕێزێکی زۆریان هەبو(١٢)، لە(دار و سەلام) پەناگەیەکیان بۆ بەهاناوەچونی ڕێبواران و هەژاران دروستکردبو، بۆ ئەوانەی کە لەو دەربەندەدا سەرمایان دەبوو، چونکە ناوچەکە لە مانگی کانونی دووەم و ئادار دا هەموی بەفر دایدەپۆشی. بەو جۆرە ناوبانگێکی باشیان پەیدا کرد، مەبەستم بەکاری لە خوا ترسی و پیاو چاکان. لە ساڵی(١٩١٦)و بە هاتنی ڕوسەکان ناچار بون ڕابکەن و هەموو کەل و پەلەکانیان و شوێنەکەیان وێرانکرا، ئێستا منداڵەکانیان گەڕاونەتەوە و دەیانەوێ بە شێوەیەکی سوکتر دەست بەو کارانە بکەنەوە کە باوانیان سەرەتایان بۆ دانابو.

شێخ محەمەد ئاغا تکای لێکردم لەگەڵ ئیسماعیل بەگ و محەمەد عەلی ئاغا سەردانیان بکەین بەمەبەستی خوازبێنی خوشکی شێخ عوبەیدوڵلا، چونکە خوازبێنیکەر جوان نەبو خۆی ئەم کارە بکا.

هەستم کرد شانازیەکی گەورەم لەو کارەدا پێبڕاوە، کە پەیوەندی بەژیانی خێزانێکی کوردەوە هەیە. هەرچەندە کە ئەرکێکی زۆر دوور بوو لە ئەرکە فەرمیەکانم. ژنی یەك لە سەرۆکەکانی باڵەك، لە کاتێکدا کە خۆی جارێکیان سەردانی منی کرد بوو لە ڕەواندوز، مرد بوو. ئێستاش پێی وابوکە بەشداری کردنی من لەو کارەدا، کە بەنیازە بیکا، خێرئاوەرە.

بەپلیکانە دابەزین بۆ ژورێکی بنمیچ نزم کە لەبەر ئەیوانی کوختێك دەچوو دو پەنجەرەی تێدابوو بەسەر ڕاڕەوەکەیدا دەڕوانی، گەرم کردنەوەی ژورەکە بە هۆی ئاگرێکی گەورەوەبوو، چونکە بایەکە لێرەش زۆر سارد بوو. لەبەر ئەوەی حەزم نەدەکرد کە قسەیەکی وا بکەم خوازبێنیەکە تێکدا، بۆیە داوام لە محەمەد عەلی ئاغا کرد کە لە جیاتی هەموان قسە بکا. تەواو لەبیرم نیە چی گوت، بەڵام ئەوەی لەبیرم مابێ شتی ئاوای گوت: (شێخ محەمەد ئاغا، کە سەرۆکی عەشیرەتێکی گەورەو شوێن جێو ڕێیەکی بەرزە، هێزو توانایەکی زۆری هەیە، ئێمەی بۆ ئەرکێك ڕاسپاردوە، کە ئێوە ناوەرۆکەکەی دەزانن لە کاتێکدا کە حاکمی سیاسیش خۆی هاتوە بەشداری لەو داوایە بکا، هیواداره ڕازیبونی ئێوە دەستەبەرکا، ئەم خزمایەتیەش هیوادارین بەختەوەری بە دواوە بێ). شێخ عوبەیدوڵلا کە دەم و چاوێکی خڕو قژێکی وەك سمێڵەکانی زەردی هەبوو، وەڵامیدایەوە:(من بەڕاستی

هەستم جولاّوە، ئەو شکۆیەی کە شێخ محەمەد ئاغا لە ڕێگای ئەم داواکاریەوە، بە خانەوادەکەی منی دەبەخشیّ، چونکە من دەزانم ئەو پیاوێکی خراپ نیە، ئەو ڕێزێکی گەورەی هەیە لای عەشیرەتەکان، خزمایەتیکردنیش لەگەڵ ئەودا سەربەرزیە، بەڵام مەرجێك هەیە کە ئێوەش دەیزانن، ئەگەر قبولّی کا. منیش قبوڵمە. (مەرجەکە ئاماژەی بۆ ئەو مارەییە دەکرد کە دەبوایە لە داوای دەستی کچەکەدا بیدا، بڕەکەش لەقسەکردنێکی ئاساییدا دیاری کرا. فاتیحە خوێنرایەوە، (کە بە شێوەیەك لە شێوەکان، لە جێگەی: نوێژی خواوەندە: Lord Praye) لە ئاینی موحەممەدیدا (باشترە بڵیّ ئیسلام، (وأن الدين عندالله الاسلام: وەرگێڕ) ئەم فاتیحەیەش وەك ڕەمزێکی مارەکردن پیرۆزکردنیەتی دوای تەواوبونی ڕێو ڕەسمەکە هەریەك لەوان بە نەرمی دەیانگوت(موبارەك بیّ) دوای خواردنەوەی چاو قاوە و، دوای گفتوگۆیەکی درێژ کە نیو سەعاتی خایاند، ئیزنمان خواست و گەیشتینەوە لای شێخ محەمەد ئاغا لە ڕایات.

ئەو ئێوارەیە، باران دەباری و بایەکی ساردی دەهات، گەڕاینەوە وەلاشیّ، گفتوکۆیەکی درێژم لەگەڵ برا شێتۆکەکەی خانە خوێکەم کرد(واتە لەگەڵ کاکە مین) (ئۆباڵ بە ملی نوسەر : وەرگێڕ) ئەو دەموچاوێکی هەیە کەلە دەم و چاوی یوسف بەگ دەچیّ، بەڵام سەرنجێکی دڕندانە تری لە برایەکەی هەیە و وەك سمێڵەکانی موی قژی سپیە، دوچاوی هەن کە هەمیشە سەیری خەڵك دەکا. بۆ ماوەی دوو سەعات زیاتر بە دەنگی بەرز هات و هاواری بوو، پاساوی دەهێناوە کە بۆچی فلاّنە کاروانی تالاّن کردوە، هۆکارەکەشی دەگێڕایەوە بۆ ئەو زیانەی کە پێشتر خاوەنی کاروانەکە لەوی داوە.

لە هەشتی مانگ گەڕامەوە ڕەواندوز، کە گەشتەکەم بەیەك ڕۆژ تەواو کرد. لە دوری دومیل لە شارۆچکەکە لەلای کانیاوی جوندیان لاماندا، بۆ چا خواردنەوە لەگەڵ محەمەد عەلی ئاغا، لێرە لە ژێر ڕێگاکە ئەشکەوتێکی گۆشە وەستاو هەیە کە لە دوو گابەردی تیژی گەورە دروست بوە و ئاوێکی لیّ هەڵدەقولّیّ، کە وەك بەفر ساردە و بە درێژایی ساڵ، ئاوەکە بەردەوامبوو، تەنیا پایزان(١٣) نەبیّ کە ڕۆژێك کەمی دەکرد و ڕۆژێك سەری دەکردەوە. لە دەرکی ئەشکەوتەکە و لە ئەو بەرەوبەری جۆگە ئاوەکە شوێنی دانیشتن هەبوو کە بۆ زەویەکی کەمی پڕ لە

گژوگیا دەچوە خوارێ تا دەگەیشتە باخەکانی هەرمێ و هەنار، ئەم زەویە موڵکی محەمەد عەلی ئاغایە، ئەو لێرە لەگەڵ خانەوادەکەیدا لە رەشماڵ دەژین، بە درێژایی هاوین لەوێ دەمێننەوە.

کە گەیشتمە رەواندوز دیتم نەقیب لیتلدیل گەیشتوتە ئەوێ و سەربازە لیڤیەکانی لەگەڵدایە و خەریکن لەسەر گردێکی کە بەسەر شارۆچکەکەیدا دەڕوانی چادر هەڵدەدەن.

سەربازەکان تورکمانی هەولێر و کەرکوك و، کوردەکانی دەشتی هەولێر و کۆیە و برێکی کەمیان گاورەکانی عەنکاوە بون و هەمویان دڵخۆشبون و لە باشترین حاڵدا بون. بەمجۆرە هێزێکی سەرەنج ڕاکێشم دیت، ئەگەرچی باش ڕانەهێنرابون، هێزی ژاندارمی کۆن هەرمایەوە و ئێستا پێیان دەڵێن پۆلیسی ناوخۆو، جودان و، لەژێر فەرماندەیی(مولازم بارلۆ)دان.

میستەر تێرنەریش گەیشت، دوسێ ڕۆژم لە ڕێکخستنی کاروباری باج وەرگرتن دا بەسەر برد، لەگەڵ داهاتەکانی گومرگ و ئەو بەرو بومانەی کە خەریکن پێدەگەن. گەلێ سەردانیکەریشم پێشوازیکردن، لە وانە فاتمە خانم وحەوێزاغای هەروتی، کە یەکێك لە خزمانی(محەمەد سەعید بەگ)ە، ئەمە وتی کە سەرۆکەکەی ئەوەندە نەخۆشە ناتوانێ سواری ئەسپ بێ، ئەگەر بمەوێ ئامادەش بێ ئەوا دەبێ لەسەر قەرەوێڵە بیهێنن، ئەمە جگە لە شێروانیەکانی کۆنە برادەرم، کە(ڕۆبی تەشریفم) پێشکەشکردن چونکە زۆریان یارمەتیدام بۆ دەربازکردنی ڕەواندوز لەو بارە، ئەمەش دو سێ مانگ لەمەوبەر.

نوری لە ڕەواندوز نەبوو، کە پرسیاری ئەوم لە باویلاغا کرد، گوتی هێشتا لە ڕاو نەگەڕاوەتەوە. لەبەر ئەو نەگەڕانەوەشی هەواڵم بۆ نەقیب لێتلدیل نارد کە لە یەکەم هەڵدا دەسگیری بکا.

بە دۆڵەکەدا ڕۆیشتم، کە تاکە ڕێگایە لە باشورەوە دێتەوە ناو شارۆچکە، گەیشتمە ئاکۆیان کە گوندێکی گەورەیە و نزیکەی سەد ماڵ دەبێت و چین لەسەر چین لەسەر لوتکەی گردەکەو لە نزیك دەروی دەربەندە کە، لە نێوان دوو لوتکە کە بەسەر چیای کۆڕەکدا دەڕوانن، بنیاتنراوە. دەوروبەرەکەی پڕە لە باخچەی فراوان، کە میوەی هەنجیر و هەناری تێدایە، لە کاتێکدا گوندی(فەقێیان)ی دڵگیر

دەکەوێتە سەر ئەو دەربەندەی بەسەر ئاکۆیاندا دەڕوانیێ. بە ناو بێستانی تەڕو پاراودا ڕێگای فەقێیانمان گرتە بەر و بەسەر دەربەندەکەو بەتەنیشت ئاوێکدا کە دەهاتە خوارەوە، سەرکەوتین. درەختی بەرزی گوێزو گابەردی قەوزە گرتو ڕێگای دەگرتین و تاریکی دەکرد. فەقیان دەکەوێتە سەر گردێکی بەرز دەوری پڕ لە بێستان و چنار بوو، ڕەنگە جوانترین گوندی ناوچەکە بێ و هاوینە هەوار بێ.

فاتمەخانم لێرە نیشتە جێیە، لە دیوەخانە نوێیەکەیدا — میوانداری کردین، خزم و کەسە چاو چنۆکەکانی یارمەتیان دەدا، کە هەرچیان لە دەست بێ درێخی ناکەن بۆ کێشانەوەی سەروەت و سامانەکەی. سەعاتێك لەوێ مامەوە، کاتێك خەریك بوو بڕۆم باویلاغای پیر بەپەلە هات، تێبینیم کرد کە لەگەڵ ئەو دەستەیە نەبوو کە بۆ ماڵئاواییکردن لە من هاتبون، ئێستا ئەو پاساوی دواکەوتنەکەی بە ئامادەنەکردنی ئەسپەکەی دەهێنایەوە، سەری سوڕما کە بیستی خەریکم بڕۆم، لەوێ بە وەستاوی هێشتمەوە، دەموچاوی رقێکی زۆری پێوەبوو(وەك کەسێکی دڵی لەسەر ئاگر بێ). بەهەر حاڵ پیلانەکانی ئەو شکستیان خوارد و خۆشبەختانەش ئێمە کۆتایی داڕوخانی پیلانەکانیمان نەدیت. چونکە من تەواو لەو باوەڕەدابوم کە دەیەوێ نوری بێنێتە فەقیان و داوای لێبوردنی بۆ دەکا، ڕەنگە وای دانابێ کە من دەترسم لەو ناوچە دورە دەستە دەسگیری بکەم، ئەگەر ئەوەش نەبێ، ئەوا ڕەنگە ئەو زو ڕۆیشتنەی من، ڕێگر بێ لەبەردەم پیلانێك کە بۆ ڕۆژی دواتر بۆسەیەك لە سەرڕێگاکەم دابنرێ.

لەگەڵ عەبدەڵلا پاشا، کە خەڵکی(بلێ)بوو، بەسەر چیای کۆڕەك دا لەگەشتەکەم بەردەوامبوم، دە ژاندارم و دوانزە پیاوی ئیسماعیل بەگم لەگەڵدابوو، کە(یونس ئاغا)ی کوڕەمامی سەروکاری دەکردن. دیدەبانم بە هەمو لایەکدا نارد، چونکە دەمزانی نوری لەو دەوروبەرانەیە و ڕەنگە چاوەڕێی دەرکەوتنم بکا. لە ڕێگادا مەلایەکی مەندیل سپیم توشبو کە نامەیەکی پێبوو، شێخ کاکەمین، کە لە گوندێکی نزیك دادەنیشت داوای کرد بوو بمبینێ، بۆیە تکام لێکرد کە لە(بلێ) بمبینێ سەرکەوتنی گردەکە کارێکی گران و ئەستەم نەبوو، کە لەسەر لوتکەکەشیدا نزماییەکم دیت دەریاچەیەکی بچوکی لێبو سەرم سوڕما، لێرەوە لێژاییەکی درێژ بەرەو بلێ شۆڕیدەکردینەوە کە دەکەوێتە قولایی دۆڵێکی تەسك و

بچوک کە لە نێوان(چیای کۆڕەك) و چیایەکی رەشی بڵند دروستبوە کە پێیدەڵێن(ئیرون)و تا ئیستاش بەفری پێوە ماوە. گوندەکە لە هەمولایەکەوە چیای بەردین دەوریداوە تەنیا باشوری نەبێ کەدەکەوێتە بەرهەتاو. بۆیە گەرماکەی زۆر توند بوو. عەبدوڵلاغا بەرەو دیوەخانەکەی بردین کە لە سەر ماڵێکی سێ نهومیدا بوو، کە ئەمەش شتێك بوو لەهیچ شوێنێکی دیکەی کوردستان نەمدیبوو.

ئەودەم(کاکەمین) گەیشتەجێ، لەسەرەخۆو هێواش دەڕۆیی و دو مەلاو گەنجێکی قۆزی لەگەڵدابوو کە جلوبەرگێکی لەبەردابوو بینەری دڵخۆش دەکرد پێموابێ کوڕیبوو. هەموان کە لێی نزیك دەبونەوە سەریان دادەنواند و خەڵکێکی زۆر بەڕاکردن هاتن و هەردوو دەست و جلەکانیان ماچ کرد. ئەو بەڕاستی شێخێکی بەویقاربوو، دەموچاوێکی جوان و ریشێکی درێژی هەبوو کە یەك پێ دەبوو دەتگوت درکە. بە گەرمی پێشوازیم لێکرد، لەبەر ئەو بەخێرهێنانە گەورەیەی لە منی کرد بەو سەردانەی، لە کاتێکدا دەیویست بزانێ کە من تا چەند ئاگام لەو کارانەی هەیە کە لە رابردودا کردبونی. بۆی رونکردمەوە کە چۆن ئەو شڵەژانانەی دامراندۆتەوە کەلەم دواییانە روویانداوە و چۆن(هەروتیەکانی) گەڕاندۆتەوە ماڵەکانیان، بەلأم باسی ئەوەی نەکرد کە هەر خۆشی بانگێشتی کردبون. سوپاسم کرد و، پێم وت: بۆ ئەوانەی کە هاتن و خۆیان دەخالەت کردم ئەوەی ڕۆیی ڕۆیی. دواتر پرسیاری لێکردم: (نوریش هات؟) وتم(نەخێر) وتی: (بەداخەوە، وا باشتربو ئەوەی بکردایە) .

دوای نان خواردن بە کوێرە ڕێیەکی پێچاو پێچدا رۆیشتم و، ڕوم بەرەو باکور بوو بە دۆڵێکی چیایی تەسك و درێژدا کە ڕێك لە پشت گوندەکەوە بوو. لەسەر ئەو جۆگە ئاوەی کە لە تەنیشتمان بوو دارچناری جوان بە تەریبی ڕیز ببون. لە کۆتایی خەرەندەکە دەروێك هەبو کە ئاشێکی لەسەر بوو، لەوێ برایەکەی فاتمەخانم پێشوازی لێکردم کە ناوی خورشید بەگ بوو لە شڵەژان و هەراوزەناکەی ئەم دواییەدا بەشداریکرد بوو. ئالێرەدا لە کۆتایی گردەکە سوڕاینەوە وبەرەو باشور چوین کە دۆڵی هەروتی بوو، کە شوێنێکی نزمی تەسکەو دەکەوێتە نێوان چەند لێژێکی بەداربەڕو داپۆشراو.

ڕێگاکە بەرەو سەرچو بەلای ڕۆژهەلأتدا و بەو گوندانەدا تێدەپەڕی کە هەریەك بەرۆکی ئەویدی گرتبوو، هەر گوندێکیش لانەیان لە پانایيەکی سەری گردەکە کردبوو. دانیشتوانەکانیشی، کەلەم دواییە هەڕەشەیان لە کانی وەتمان کردبوو، هەژارو جلەکانیان فشو فۆڵی دڕاو بون. لەوێ وەستام تا بزانم هیچ گلەییەکیان هەیە. تەنیا گلەییان لە چەوساندنەوە و کوشتن هەبوو کە لەسەر دەستی موختارەکانیان دوچاری دەبون. تۆزێك لە گوندەکەی(حەوێزاغا) وەستام و قسەم لەگەڵ کرد، ئەو پیاوێکی ترسنۆکەو هیچ مەترسیەکی لێ بەدی ناکرێ (ئۆباڵ بە ملی نوسەر : و. ع ).

لەکۆتایی دۆڵەکەدا کە نزیکەی بەسێ کاتژمێر بڕیمان، لە چیایەکی بچوك پەڕینەوە و خۆمان لە لێواری دەشتێکی پانی بەپیتدا دۆزیەوە. ئێمە ئێستا لە ناوچەی خۆشناوەتین، کە ناوچەیەکە هەمیشە بە شوێنی ئارامی و ئاسایش دێتە بەرچاوم، دەکەوێتە پشت گردەسەختەکانی ڕەواندوز کە کوردی ڕەوەندی نەزان تێیدا نیشتەجێن. ڕێگاکەمان بە داوێنی چەند گردێکدا درێژدەبوەوە کە بە گوندی ئاوەدان و فراواندا تێدەپەڕی کە دەوروبەری پڕ لە بێستان و کێلگەو لەوەڕگا بوو، شنەی ئێوارانیش بارەی مێگەلە زۆرەکانی دەدایەوە. سەرکەوتنی چیایەکی بەردین لەژێر باڵی تاریکیدا ئێمەی گەیاندە گوندی(بالیسان)ی گەورە کە تۆزێ بە ئەستەم توانیمان ڕێگە ببینین، کە لە ڕێچکەی تەسکدابوو لە نێوان باخی میوە تێدەپەڕی و ئێمەی گەیاندە ماڵی(عەزیز بەگ )ی مامی میرانی قادر بەگ یەکە پیاوی شەقلاوە. ئەو پیرەمێردێکی ساویلکەی ڕوخۆش بوو، زۆرترین هەوڵیدا بۆ ئەوەی ئاشتی لە نێوان برازاکانی بپارێزێ کە ئیرەییان بەیەکتر دەبرد.

لە بەیانی دواتردا بە ناوەڕاستی دۆڵە بەرینەکەدا ڕۆیشتین کە بۆ بیتوێن بەرەوخوار دەبوەوە. کە دەکەوێتە سەر هەردو بەری ڕوباری (کیشان) کە بای ئەوەندەی ئاو تێدایە، دار بەرەو خوار بۆ زێی بچوك ببا. ئەو دۆڵە پڕە لە گوندی سەر بەلقی (باجکاڵی) لە عەشیرەتی خۆشناو، دارستانی زۆری سورە چناری لێیە. ڕێگاکەمان بەسەر لەوەڕگای پڕ لەگەلۆگولزاردا درێژ دەبۆوە. بەتایبەتیش قانە گولی ئۆرکیدی ئەرخەوانی سەربەرزم تیا بەدیکرد. لای نیوەڕۆ چوینە ناو سنوری باکوری(بیتوێن)، نزیك کانی سەرچنار کە ئاوەکەی لەبەردێکی دامێنی چۆمەکە

هەڵدە قولاو بە ئاوەڕۆیەکی بەرینی نێو قامیشەلان و جەنگەڵستاندا شۆڕدەبوەوە. دەشتەکە بەگژو گیایەکی پڕ داپۆشرابو کە دەگەیشتە گوێی ولاخ. جۆرەها گوڵی زۆری لێبو کە بە تایبەتی ناوی گوڵە تۆڵەکە دەبەم هەواش پڕ لە بۆنی خۆش جەگەن و وێنجەبوو. مێش بەلایەك بوو بۆخۆی و مێشکەرانە ئازاری ولاخەکانی دەدایەن.

نانی نیوەڕۆم لەگەڵ(کاکەمزە) ی ئامۆزای سواراغا خوارد، کە هۆبەو ڕەشماڵی لە لەنزیك (گردی تلێ)هەڵدابو. مێزەرێکی بەرینی لەسەر بوو، پشتێنێکی ئەستوری توند پێچراوی لە پشت کردبوو، شەرواڵێکی بەرینی لە پێدابوو، کە ئەمەش تایبەتمەندی دیاری عەشیرەتەکەی بوو، چونکە پیرانەکان جل و بەرگی نایابیان لەبەر دەکرد و زیدەڕۆییشیان تێدا دەکرد، پتر لە هەمو عەشیرەتێکی دیکەی من دیتبم. کاك هەمزە لە گەشتە سواریە پڕ ماندوبونەکەمدا بەپشتی دەربەند، هاواڵی کردم کە شەوەکەیم لای(نەقیب کوکی یاریدەدەری حاکمی سیاسی) بە سەربردو پێنج مانگ دەبوو، من یەکەم ئەفسەر بوم میوانداری بکا. نەقیب بارکەر بەر لەوەی بڕوا خانوێکی ڕێکی لە دۆڵەکەدا دروستکردبوو کە بەسەر روبارەکە یدا دەڕوانی. بنکەکەی خۆی لە ناو کێڵگە مەرەزەکانی ڕانیەوە، کە پڕبون لە نەخۆشی، گواستبوەوە ئەوێ. بەسەرباز گیراوەکانیش لە قەلاکە دابون، کە چاککرابۆوە، هەولێکی زۆریش درا تاگوندە وێرانەکە بنیات بنرێتەوە. حەزم دەکرد جارێکی دیکەش بابەکراغا ببینمەوە، بەلام دیتم ڕۆیشتبو، بۆیە بەیانی ڕۆژی دواتر بەرە کۆیە چومەوە و، کاکە هەمزەم لەگەڵدابوو. کاتێ بە دەشتی بیتوێندا تێدەپەڕیم توشی(مام قەرەنی) هاتم، کە ئەگەر سواراغا لەوێ نەبوایە ئەو سەرۆك عەشیرەت بوو، کۆمەڵێ ئاغەو دەستوپێوەندی پیرانی لەگەڵ دابوو لەگەڵ پیاوێك کە زوڕنای لێدەدا.

هەمویان بێ چەك بون، چونکە سوێندیان خواردبو کە بە ئاشکرا چەك هەڵنەگرن هەتا سەرۆکە خۆشەویستەکەیان نەگەڕێتەوە. بەوەشم زانی کە دیوەخانەکەی سەرخمەی، لەوەتی سواراغا گیراوە، داخراوە. بۆ نانی شێوان برای سواراغا میوانداری کردم، کە خۆی و خەڵکی سەرخمەی لە پێدەشتێکی خۆشی نزیك تێکەڵبونی هەردوو ڕوبارەکە هەڵیاندابوو. لەوێ لەسێبەری ڕەشماڵەکان

دانیشتین و سەیری منداڵەکانمان دەکرد کە مەلەیان دەکرد و ئەو کوردە پێخواسانەش کە داری براویان بە ڕوباریدا بەرەو خوار دەنارد.

دوای نان خواردن دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە بەرەو کۆیە. بەخانەی مەتراندا ڕۆیشتین لە چنارۆك کە لە بارێکی باشدابوو دەوروبەری هەموی گوڵی کێوی و دەوەنی سەوز و جۆرەها گوڵ بوو، شەوم لای نەقیب برادشۆ لە کۆیە بردەسەر، بۆ بەیانیەکەی زوو بەرەو هەولێر کەوتمە ڕێ. ئەو دۆڵە بچوکەی کە لە ناوچەکە هەبوو بەردی لمینی (تەمۆخ) سوری هەبوو، هێشتا پڕ لە گوڵ بوو، بەتایبەتیش گوڵاڵە سورە و گوڵێکی دیکە کە بەگلێنەی چاو دەچوو کە گوڵێکی سەوزی کاڵی هەبوو چەند تولەیەکی ئەرخەوانی وەك پەڕی لەسەرەوە هەبوو.

کاتێ لە هەولێر نزیکبومەوە شتێکی سەیرم بینی، خەڵکەکەی هەمویان لە لێواری شاردا هەڵیاندابوو، خانەوادە دەوڵەمەندەکان لەناو چادر و پێخەف و پەردەی بە ڕیشودابون. هۆکاری دەرچونی ئەو خەڵکەش بومەلەرزەیەك بوو کە ئەو دەمای لەوێ نەبوم ڕویدابوو تەنیا بەتەلەفۆن شتێکی کەمم لێدەزانی.

خەڵکەکە لە کاتژمێر دەی ئێوارەی (٨) ی مانگ هەستیان بە یەکەم لەرزە کرد بوو کە زۆر سوك بوو، لەمەودای چارەکە کاتژمێرێك دوو هەژانی دیکە دروستببون و کە لەهی یەکەم توندترو بەهێزتربون. زیانێکی کەمی گەیاند بوو بەڵام خەڵکەکە زۆر ترسابون گەمژەیەك لەناویاندا هەڵدەستێتەوە و ڕایدەگەیەنێ، کە وەك خەونی دیبێ، دوو لەرزەی دیکە ڕو دەدەن و کۆتایی دنیاش لەگەڵ هی دووەمیان دروستدەبێ.

دوو سێ ڕۆژی دیکە هیچ شتێك ڕوینەداو ترسی خەڵکەکەش ڕەویەوە لە ناکاو ولە شەوی ١٢/١٣ ی مانگ و، دوای نیوەشەو لەرزینێکی بەهێز تر لەوانەی پێشو ڕویدا. دەماڵی ڕوخاند و ژمارەیەك زیانیان بەر کەوت، دوپیاو مردن و زۆریش بریندار بون، خەڵکەکە بەترسەوە لە شارەکە ڕایانکرد و چەند شەوڕۆژیان بەنوێژو پاڕانەوە بەسەر برد. دوای ئەوە کە هیچ ڕوینەدا، تەنیا دویان سێ لەرزەی دیکە کە ڕەنگە کەس هەستیشی پێنەکردبێ، ئیدی خەڵکەکە گەڕانەوە ماڵە کانیان و خەریکی چاککردنەوەی زیانەکان بون.

ئەوەی سەیر بوو ئەوەبو کە ئەو لەرزینە شتێکی ناوخۆیی بوو لە هەشتی مانگدا تێبینی لەرزینێکی سوکم کرد لە ڕەواندوز، بەڵام ئەو لەرزینەی لە شەوی ١٢/ ١٣ی مانگ ڕویدا کەس لە دەربەند یان کۆیە هەستی پێنەکرد تەنیا خەڵکێکی کەم نەبێ کە ئەودەم بەخەبەربون. کاریگەریشی لەسەر شاری کەرکوك و موسڵ نەبوو، لە کاتێکدا ئەو گوندانەی نزیکی هەولێربون هەستیان بە جوڵەیەکی سوك کردبوو. بەگەوێرەی قسەی دانیشتوانیش پێشتر لەرزینی وا توند لە هەولێر ڕوینەداوە.

◆

# بەشی شازدەهەم

# نوری: دومەزن کە کاتیان هات.

هەر یەکسەر دوای ڕۆیشتنی من، نوری بەرەو ڕەواندوز گەڕابووەوە، نەقیب لیتلدیل بۆ ئەوەی گومانەکانی لاببا چەند ڕۆژێکی کەم خۆی لێ بوارد، تەنانەت برادەرایەتیشی لەگەڵ بەست و جارێك(چا)شی لەگەڵدا خواردەوە، نوری داوەتکرا تا سەربازگەکە ببینێ، گەنجەکەش داوەتەکەی قبوڵ کرد بێ ئەوەی هیچ گومانێکی هەبێ، هەر هێندەی گەیشتە ترۆپکی گردەکە ئیدی خۆی بەگیراوی و کەلەمچەکراوی دیتەوە.

دەنگی تەقەیەك هات، ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ دوو دەستە کە لە ئامادەباشی هاتنە پێشەوە بون. ئەو دوو دەستەیە دەستیان بەسەر هەمو چەکەکاندا گرت، لەگەڵ فیشەك و ئەو نامانەی کە توانرا دەستیان بەسەردا بگیرێ. ژمارەی چەکەکان(١٦) چەك بوو لەگەڵ(٢٠٠٠) فیشەك و لەناو نامە کانیشدا نامەیەك بۆ ئەوە دەشیا کە بەهۆیەوە تۆمەتێك ئاراستەی خاوەنەکەی بگرێ کە شێخ عوبەیدوڵڵای سورچی نوسیبوی و بۆ شێخی پیرەمێرد، (کاکە مین)ی نوسیبو.

نوری لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی پاسەوان ڕەوانەی هەولێر کرا، هەر چەندە لەو کەسانەبون کە متمانەیان پێدەکراو، خرایە زیندانەوە، لە کاتێکدا کە فەرمان بە باویلاغادرا لەدوی بڕوا هەرچەندە کە دەسگیریش نەکرابوو. (دادوەری گشتی پاشایەتی) بروسکەیەکی پیرۆزبایی بە بۆنەی ئەو دەسگیرکردنەی هەنارد، ئیدی هەستم دەکرد کە بارەکە لە ڕەواندوز ئێستا ئارامە. لە شەشی حوزەیران زانیاریم

دەربارەی ئەو تەقینەوەیە پێكەیشت كە لەتەلەعفەر (١) رویدابو، كە شارۆچكەیەكی نزیكەی (٥٠) میل لە رۆژئاوای موسلّ دوربوو.

كۆمەڵێك لە رۆڵەكانی عەشیرەتەكان لە ژێر فەرماندەیی ئەفسەرە شەریفیەكان هێرشیان كردە سەر شارۆچكەكەو دانیشتوانیش یارمەتیان دان و فەرمانگە حكومیەكانیان گەمارۆداو رائید بارلوای یاریدەدەری حاكمی سیاسی و ستیوارتی ئەفسەری دەرەك و هەندێ فەرمانبەری بچوكی بەریتانیان كوشت. لە ئەنجامی ئەوەدا پشێوی لە ناوچە عەرەبیەكانی موسلّ دروستبوو هێرشبەرەكان تا سەر رێگای گوێر — موسلّ هاتن. كارێكی سەربازی لەو دەمە پیادەكرا و پشێویەكان سەركوتكران.

ئەو هەواڵە هەڵچونێكی گەورەی لە هەولێر بەرپاكرد و لێرە بەدواوە، پروپاگەندەی دژبە بەریتانیا رۆژانە زیادیكرد و، لە پێشان توند تربوو. گێرەشێوێنان(ئاوا: و. ع ) ئەوانەی كە ناوبانگێكی خراپیان هەبوو بەئاشكرا دەستیان بە مژدەی دەستپێكردنی شۆرش كرد و، گۆرمپانی كارەكەشیان قاوەخانەكان بوو، هەندێ نامە بلاّوبونەوە كە گوایە كە گوایە لە(شەریفی مەككەوە) هاتبون و هەندێكیش لە پیاو ماقولاّن و سەرۆك عەشیرەتە نیاز خراپەكانەوە هاتبون وەك ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود. سورچیەكانیش چالاك بونو، وەك چۆمی لافاو كردو بەسەر كۆیە و شەقلاّوە و دەوروبەری رەواندوز یانداداو، هەندێ نامەیان پێبوو كە گوایە لە والی وان و كەسایەتی وەك ئەوەوە هاتبون. ئەمە پروپاگەندەبوو سەر چاوەكەشی ئەنە دۆلّ و سوریە بوو، بە درێژایی چەندین مانگ بە نهێنی كاریاندە كرد، لەبەر ئەوەی هەندێ یەكەی سەربازی لەوكاتەدا كێشرابونەوە، بۆیە دەسەلاّتی حكومەت دارماو ئەوەش بە ئاشكرا دیاربوو، لەزووەوە دەمزانی لە هەولێر هاندەرەكان كێن و هەستیشم دەكرد كە گرتنەبەری هەر رێوشوێنێك لە دژیان، لە تێروانینی خەلّك، مەترسی ئەوانی زیاتر دەكرد. لەبەر ئەوەی درۆی چیرۆكەكانیان زۆر جار دەردەكەوتن، بۆیە روبەروی گاڵتە جاری دەبونەوە، چونكە خەڵكی ئەو ناوچانە راهاتبون نیازێكی پاكیان بەرامبەر حكومەت هەبێ.

بەشــی هــەرە زۆری هــەردو مــانگی حــوزەیران و تــەموز بەتــەنگ قەبلاّنــدنی بــەروبومی ناوچــەی هــەولێرەوە بــوم. ئــەو داهاتانــەی لەگــەنم و جــۆوە دەهــاتن بەهایەکی زۆریان هەبوو، وەك چۆن بە هۆی فەرمانبەری دەستە پاچە و خــەڵکانی ناپاك ساڵی ڕابردو زیانێکی زۆرمان هەبوو. بۆیە بڕیارمدا، چــەندی لــە توانامــدابێ، گەشتێکی فــراوان بکــەم، بــۆ ئــەوەی بــە خــۆم لــە ئەنجامــەکان دڵنیــابم. لەمەشــدا دوکەس یارمەتیان دەدام و کاری قەبلاّندنیان دەکرد و دەکرا پشتیان پێ ببەستم. سەردانی حەفتاگوند زیــاترم کــرد، لــە کــاتی دروێنــەی جــۆ و دروێنــەی گــەنمیش. کارەکە تاقەت پروکێن بوو گەرماش لەو پەڕی بوو.

گەڕانی یەکەمم لــە مــانگی ڕەمەزانــدا بــوو، کــە کوردەکــان تیایــدا، بــەجیاوازی پایــەیان، هــەمو بــە ڕۆژون. جوتیــار هــەر جوتیــارە، جــا ئەگــەر بــەڕۆژوبێ یــان نــا ئەوەیان گرنگ نیە، بەهەر حاڵ ئــەو نــاتوانێ بــەڕۆژوبێ مــادام بــە درێــژایی ڕۆژ لــە کێڵگە کاردەکا. لەلایەکی دیکەشەوە سەرۆکەکان تا بتوانن زۆربەی ڕۆژەکەیان بــە خەوتن بەسەر دەبەن و لای ئێوارە ڕێگەی دیوەخــان دەگرنەبــەر کــە جامــە ئاوێك یــان دۆیــەکیان لــە پــێش دانــراوە و، بــە پەرۆشــەوە چــاوەڕوانی(بــەربانگن) کــە ڕایگەیەنێ خۆر ئاوابوە و ڕۆژوەکەیان تەواو بوو.

لەگەڵ یەکەم وشەی بانگیش دەبینی کە تۆزێك ئاو یان دۆ دەخۆنەوە و دەست بەنوێژ دەکەن و، دواتر بۆ نان خواردن خۆیان ئامادە دەکەن. دیتم هەندێکیان بــە جگەرە ڕۆژو دەشکێنن، ئەمەش کارێکی نائاساییە دوای شازدە کاتــژمێر خــۆگرتن لە ئاو و نان خواردن. سەرەڕای بونی هەندێ لە کەمتەرخەمان کە بە دزی تێنوێتی خۆیان دەشکێنن، زۆربەی ئەو کوردانەی دەتوانن ڕۆژەکەیان بێ کار بەسەر ببــەن تــەواو پابەنــدی ڕۆژو گــرتنن. ئــەوەی خۆشــبو ئــەوەبو کــە ڕەمــەزان ڕێگــری لەومیوانداریە نەگرت کەلە هەمو شوێن و بە شەو ڕۆژ بۆم دەکرا.

گەڕانەکانم تەنیا لە ناوچەی(دزەیی) بوو،ناسـیاریەکی چاکم لەگــەڵ ئاغاکانــدا، پــیر بــوان یــان گــەنج، گەورەبونایــە یــان بــچوك، پەیــداکرد. هــەر چــەندە زیــاتر بمناسیبونایە بۆم ڕوندە بۆوە کە لە سەرۆکەکانی ناوچە شاخاویەکان، بە جەرگ و تەبیات وشکەکان، باشترن. ئێستا واملێهاتبو هەموو خزمــەکانیان و تێــك ئەنگژانــە

بـچوکەکانیان و ئارەزوەکانیـانم دەزانـی و، وامليهـاتبو کـە هەسـتم دەکـرد منـیش یەکێکم لەو عەشیرەتە.

کەسی کورد هێندە ڕێزی هیچ میوانێك ناگرێ بەقەدەر ئەوەی ڕێزی ئەو میوانە دەگرێ کە خۆی پێیدەڵێ(شارەزا)، بەمانای ئەوەی کە زانیاری نێوشـاری تـەواوی هەیە و، دەتوانێ دەربارەی کارە سوکە تایبەتیەکانی و پرۆژەکانی قسەی لەگەڵدا بکاو، ئەمەش لەشتە سەیرەکانی دنیای دەرەوە زیاتر خۆشی پێدەبەخشێ.

زۆر جار پرسیاریان دەوکـرد : (ئینگلتـەرا چـۆنە؟ مـن مـاڵم لـە کوێیـە لـەوێ؟ خزمەکانم کێن و ئایا ئێستاش زیندون؟) گوێگرتن لە قسەکانم دەربارەی بەروبومی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری وڵاتەکەم و نەریتەکانی ژنهێنـان زۆر سـەرنجی ڕادەکێـشان. بەڵام ئەگەر دەربـارەی گـەورەیی لەنـدەن و خەڵکەکـەی و، سـەیرو سـەمەرەکانی دنیای نوێ قسەم بۆ بکردنایە، ئەوا هەر خێرا دەتدیت باوێـشك دەدەن و دەچـونە سەر بابەتێکی دیکە. بەزۆریش بابەتی سـەرەکی گفتوگۆ، سیاسـەتی عەشـایەری بوو، چونکە کورد هیچ شتێکی لەوەپێ خۆشتر نیە.

لە هەمو گوندێك پیرەمێردەکان ڕاهاتبون لە دەورمـان کۆدەبونـەوە، کـاتێ بـۆ قەبلاَندنی جۆخین(خەرمان) دەچوین، باسـی لاوازی دانەوێڵـەو درێـژی قـەد و ئـەو هــەموو نەخۆشـیانەی کـە لەبەروبومــە کەمەکـەی داون، دەکـرا. هــەر چـەندی قەبلاَندنەکانمان کەم بوایـە ئـەوان داوایـان لێدەکردین کـە لەگـەڵیان بـچینە سـەر جەنجەڕو شـەنەباو دەیـانگوت ئەگـەر دەرکـەوت بەروبومەکـە نیـوەی ئەوەیـە کـە دەڵێن، هەموی ببەن، هەرچەندە ئەوان فێڵیـان دەکـرد بـەڵام سروشـتیان باشـبو، چونکە هەر هێندەی کارەکان تەواو دەبون بە شیرین گوفتاری مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەکردین و نەرم ونیانیەکی زۆریـان لـە ڕو دەنوانـدین، ئـەو قسەیەش بـۆ هـەموان ڕاسـت بـوو تـەنیا ئەوانـە نـەبن کـە دەسـتیان لـە ملـی خۆیـان بەنـد دەکـرد و بـە بەردەوامی منگە منگی زوڵمی قەبلاَندنەکەیان دەکرد تا لە گوندە کە دەردەچوین.

لەو دومانگەدا، نزیکەی هەمو ڕۆژێك برایماغام لە مـەخمور دەدیـت. لەسـەردانە کانمـدا بـە زۆری نـەقیب ویلمیـسۆنم لەگـەڵ خـۆم دەبـرد کـە بەرپرسـی(پزیـشکی مەدەنی بوو لە هەولێر. ئەو سەرۆکە پیرە لە سەرەتاکانی نیساندا نەخۆشـکەوت، دوای گەڕانەوە لە گەشتێك کە پێکەوە چوینە بەغدا.

هەوکردنێکم لە سیەکانیدا دیتەوە، لەگەڵ ئەوەی چی لە توانا دابو کرا بۆ پاراستنی ژیانی و، هەندێ کات چاکدەبوەوە وهەندێ کاتی دیکەش نەخۆشیەکەی سەریهەڵدەداوە. ڕۆژی پازدەی حوزەیران کە باری تەندروستی زۆر خراپ بوو چومە سەردانی. ئەو دەمای لە دیوەخان نەبو بەڵکو لە بەشی تایبەتی خۆی بوو: بەشەو لە چادرێکی ناو حەوش و ماڵەکەی و بە ڕۆژیش لە ژورێکی بچوکی پڕ لە خشڵی گرانبەهاو نەخش و نیگاری جوان. هەر چەند جاری بچوباما سەردانی، دەستە لاوازەکانی درێژ دەکرد و دەستەکانمی توند دەگرت و چاوە گەرمەکانی لە ڕوە لاوازەکەیدا بە قوڵدا چوبون. ئەگەر بیتوانیایە دانیشێ دادەنیشت و پێشوازی لێدەکردم، لەوەشدا خورشید ئاغا یان یەکێ لەخزمەکانی یارمەتیان دەدا. هەرچی من بوم لە تەك ئەوەوە لەسەر سەرینێك دادەنیشتم ئەگەر بێزار بومایە یان لە دانیشتنەکەم نا ئارامیەك دەرکەوتایە، قسەی دەبڕیم و بەخەندەیەکی شیرینی سەر ڕوخساری دەیگوت: (ئیسراحەت، ئیسراحەت ). ئەگەر هەمو شتێ لەبیریش بکەم ئەوا هەرگیز بینینەکانی ئەو پیرەمێردە خۆشەویستە لە بیرناکەم کە خۆشەویستیەکی قوڵم بۆی هەیە. واپێدەچوو کە حەزبکا دەستم بگوشێ و قسەم لەگەڵدا بکا. من وادەزانم کە پێیوابوو ئەگەر کەسێك هەبێ ڕزگاری بکا، ئەوەمنم. سوربوو لەسەر ئەوەی بەگوێرەی توانا سەردانی بکەم، ئەگەر هەفتەیەکیش زیاتر تێپەڕیبا ئەوا گلەیی لە دیار نەبونم دەکرد.

ئەمجارەیان، مەبەستم ڕۆژی پازدەی حوزەیرانە، ئەو پیاوە زۆر بێ هێزببو، زۆربە گران دەیتوانی قسە بکا. کاتێ گەیشتمە لای فەرمانی ئامادەکردنی چاو قاوەی کرد بۆ من و — دواتر فەرمانی بە وانەی ژورەوەدا بچنە دەرەوە. دوای ئەوەی ماوەیەك دەستی گرتم وتی: (ڕەنگە چەند ڕۆژێکی کەمی دیکە بژیم، بەلاَم دەزانم ئەم دنیایە جێدێڵم. خورشید ئاغای برام لە جێی من دادەنیشێ، یەك تکاشم لە تۆ هەیە: لەگەڵیدا نەرم ونیان بی وەك چۆن لەگەڵ مندا وابوی و ئەو گرنگیەی بەمنت دەدا بەویش بدەی، چاکەی گەورەی لەگەڵدا بکەی، زیاتر لەوەی لەگەڵ مندا کردت. من زۆر شەیدای ژیانم، ئەگەر نەمرم شتێکی مەزن دەکەم و پێشکەشی تۆی دەکەم کە هەمودنیا پێی سەر سوڕماوبێ. وا دیاربوو بەرلەوەی وەلاَمی بدەمەوە خەریکبو لە هۆش خۆی دەچو، بەلاَم خەم بەسەرمدا زاڵ بوو لە

ژورەکە چومەدەرەوە. ئەو شەوە زۆر پەرێشان بوو دەنگی گریان زۆر لە ماڵەکەدا بەرز دەبوەوە. بەیانیەکەی نەیدەتوانی قسە بکا بەلاّم کە چوم بۆ بینینی ناسیمیەوە.

کارەکە هەرچۆنێك بیّ، هێشتا(کۆتایی) نەهاتبوو. ئەو بەردەوام لەگەڵ ژیاندا لە ململانیّ بوو، زۆر جار سەردانیم کرد، هەندیّ جار ئەوەندە بە هێز بوو، کە دەیتوانی لە کێشەی عەشایەری یەکان و باری سیاسی بکۆڵێتەوە. بەلاّم هەمیشە دەستی دەگرتم و، بۆ ماوەیەکی درێژ بە دوو چاوی پڕ پرسیار کە بۆ ژیان دەبریسکانەوە سەیری دەکردم. لە یەك لە سەردانەکانم باسی نامەیەکی بۆ کردم، کە لە جیاتی(نوری) نوسیبوی، با باسی ئەوەش بکەم کە ئەو نامەیەم نەدیتبو، ئەو لەو قسەیەدا چاوەڕوانی هیچ نەبو، بەلاّم پێشنیاری ئەوەی کرد کە لەبەرامبەر کە فالەتێك(دەستەبەر) ئەگەر بکریّ، ڕێگە بەو لاوە بدەم بە ئازادی لە هەولێر بمێنێتەوە. ئەگەر بەقسەی ئەویشم بکردایە کارەکە باشدەبوو.

برایماغا زۆر لە خەمی بەرژەوەندی برادەرەکانی و جوتیارەکانی بوو. ئەو تکای لێدەکردم کە قەبلاّندنی بەروبومی فلاّن یان فلاّنە کەس کەم بکەمەوە کە زێدە ڕۆیی تێدا کراوە، یان لە پۆستێکی کە بەتاڵ بوایە، یەکێك لەناسیاوانی دامەزرێنم چونکە دڵسۆز و دەست پاکە، ئەگەر چی زۆر هەژاریش بیّ. نەمدەتوانی ئەو تکایانەی ڕەتکەمەوە چونکە پیاوێکی تێگەیشتو بوو شتێکی داوا نەدەکرد ئەگەر لە توانامدا نەبوایە.

خورشید ئاغا بە درێژایی ماوەی نەخۆشیەکەی براکەی لە مەخمور مایەوە، کە لەویّ بومایە بە ئەرکی میوانداری هەڵدەستا، پیرەپیاوە داماوەکەش لە جاران خەمبار و ڕەشبینتر بوو، لەگەڵ ئەوەی کە دەگەیشتمە ئەویّ بەخەندەوە پێشوازی دەکردم. ئەو دڵنیابوو کە سەردانەکەی بەغدامان هۆی نەخۆشی برایەکەی بوو. ئەو برایماغای زۆر خۆشدەویست و زۆربەی کاتی چاودێری دەکرد و نوێژی دەکرد تاخوا شیفای بدا. دواتر تایەکی گەرمی گرت و لە تەنیشت براکەی لەناو جێدا کەوت و وا دەردەکەوت نەخۆشیەکەی ئەو توندتربیّ.

بەگشتی سیّ چوارێك لە خزمەکانی ئامادەبون، کاتیّ حاڵی ئەو سەرۆکە، کە لە مردن نزیك بوو، مەترسیدار بوایە(تەمەن هەر چەند درێژ بیّ کۆتایی دیّ) ئەوا

بیست سی ئاغا کۆبونەوە، لەوانە خورەکەی و براکانی و برازاکانی و ئامۆزاکـانی و، رەحماناغاش بە زۆری لەگەڵ برایەکی بچوکی کە ناوی موحەممەد ئەمین ئاغا بـوو تەمـەنی سـی سـاڵ دەبـوو قـۆزو روخـۆش بـوو، ئامـادەبون. دیـارترین خزمـە دورەکانیش دوان بون: (حوسێنی مەلای) و (جوکول ئاغا). یەکەمیان بە جەرگێکی لادێییـە، تەمـەنی شەسـت سـاڵ دەبـێ، سـورەیە و هەڵـسوکەوتی خۆشـە، لـە سەردەمی عوسمانیەکان هەڵسوکەوتی خراپ بوو، ئەو فەوزای پـێ خۆشـترە، ئـەو لێرە بە دواوە بەهێزترین لایەنگیری من بوو. هەرچی جوکل ئاغایە پیاوێکی باشە و کەسایەتیەکی ئەو تۆی نیە رۆڵێکی گرنگ لـە کێـشەکانی عەشـیرەتەکاندا بگێـرێ. کورێکی بچوکی گاڵتەچی هەیە کە تەمـەنی دە سـاڵەو نـاوی(ئاغـا)یـە. ئـەو هـەرە خۆشەویستی برایماغایە. رۆژێکیان کە گەیشتمە مەخمور، چەندم پـێ سـەیر بـوو، بە قەسیدەیەکی بەخێرهێنان پێشوازی لێکردم کە خۆی بە فارسی نوسـیبوی. لـە ٢٩ی حـوزەیران بـۆ خـۆم نـوریم دادگـایی کـرد، تۆمەتەکەشـی پـشێوی نانـەوە و پیلانگێـری بـوو دژی دەوڵـەت. ئیـسماعیل بـەگ دوو شـایەدی رەوانـە کـردن، یەکێکیان خورشید بەگی برای فاتمـەخان بـوو، کـە خۆشـی بەشـداری لـە شـۆرش کردبوو. نوری بە توندی بەرگری لـە خـۆی کـرد و باسـی هـەمو هەڵـسوکەوتەکانی خـۆی کـرد لەوەتـەی دەسـەڵاتی بـەریتانی هـاتوە و، لێهاتوانـە ئـەو تۆمەتانـەی رەتکـردەوە کـە ئاراسـتەی کرابـون. بەشـکۆوە راوەسـتابوو چـاوەکانی بریقیـان دەداوە، ئەگـەر بـەو رۆڵـەم نـەزانیبا کـە گێڕابـوی بـاوەڕم بەقـسەکانی دەکـرد. سەریشی دانـە دەنوانـدو نەیدەسـەلماند تـا ئـەو نوسـینەم دەرهێنـا کـە لـە شـێخ عوبەیدوڵڵاوە هاتبوو لە ماڵەکەی دۆزرابۆوە. پـازدە سـاڵ بەنـدیم بەسـەردا دا، لـە ساتێکی شەیتانیدا بڕیارم دا لەجیاتی موسڵ بینێرمە کـەرکوك، کـە بەندیـەکان بـە ئاسایی بۆ موسـڵ رەوانـە دەکـران، ئـەوەی کـە واشـی لێکـردم ئـەو بڕیـارە بـدەم ئەوەبوو کە سلێمان بەگ و هاورێکـانی لـەو شـارەبون و هۆکارێکیـان بـۆ راکردنـی دەدۆزیەوە. سەرەرای ئەوەش موسڵ بنکـەی ئـەو پروپاگەنـدەیـە بـوو کـە لـە نـاو کوردەکان لە نێوان هەردوو ناوچەی ئاگرێ و رەوانـدوز هـەبوو. بەهـەمان شـێوازی رەوانەکردنی لە رەواندوز، پێمباش بوو کە بەخێرایی و بە بەنهێنی رەوانەی بکەم،

چەند پاسەوانێکی کەمی لەگەڵدابێ کە جێگەی متمانە بون ، لە جیاتی هەناردنی لەگەڵ کەژاوەیەکی گەورە.

عەریفێکی(دەرەك)ی عارەبم هەڵبژارد کە ناوی یونس بوو، باشم دەناسی، (پیاوێك بوو قسەکانی بەکردار دەسەلماند)، دەستپاك و وەك شێر ئازابوو، بە (سەید عەلی)یشم وت کە خۆی شەش سەربازی دیکە هەڵبژێرێ تالە گەڵیدابن. لە ئێوارەی(٣٠)ی مانگ هەواڵی بەسەلامەتی گەیشتنیم بۆ کەرکوك پێگەیی، ئیدی کارم پێی نەبو، من کە سەرکەوتوبوم، هەواڵێکم بۆ ئیسماعیل بەگ لەڕەواندوز هەنارد و داوام لێکرد کە ڕایگەیاندن لە دیوار بدا تا ئەو سزایە ڕونکاتەوە بۆ خەڵك کە بە سەریدا دراوە و ئەو تاوانانەی کە سزای خۆی لەسەر وەرگرتوە. لە شەوی(٧)ی تەمموز لە سەردانی برایماغا لە مەخمور گەڕامەوە، دیتم هەواڵێك چاوەڕێمە(تاڵ وەك زەرەند) کە خەریکبو باوەڕ نەکەم، مەبەستم ئەوەیە کە نوری لە نێوان کەرکوك و سەری سکەی شەمەندەفەر لە کەنگربان ڕایکردوە. ئەگەر ڕۆژێك بە ڕاستی پەشۆکابم، کە نەپەشۆکاوم، ئەوا هەرگیز وەك ئەمڕۆ نەبوە. لە ژورەکەم دەهاتم و دەچوم، زۆر توڕەو بەداخ، ڕۆژی دواتر سەردانی کەرکوکم کرد تا بزانم چی ڕویداوە و، ڕێو شوێنی پێویست دانێم بۆ دەسگیر کردنەوەی ئەو(بەندیە)، ئەگەر بتوانم بیگرمەوە نوری بەسەلامەتی گەیشتە کەرکوك، دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لەوێ بوو بە هاواڵی هەمان ئەو پاسەوانەی ڕەوانەی سەری هێڵی ئاسن کرا لە کەنگربان، تالە وێوە بە هێڵی شەمەندەفەر بەرەو بەغدا بچێ. عەریف یونس و سەربازەکانی بە درێژایی گەشتەکە وریاو بە ئاگابون، لە هەولێرەوە تا کەرکوك، ڕەنگە لە دوا شوێن و لە ڕۆژەکانی دواییدا لەو ڕێگەیەی بەرەو کەنگربان دەچوو (٧٠) میل دەبوو، تۆزی خۆیان شل کردبێ، لە ئەنجامدا نوری یان کەسێکی دیکە توانیویەتی بەرتیل بداتە(ژاندارمەکان) ، یان بەشتێك فریوی دابن و هەردوکیان یارمەتی ڕاکردنیان دابێ. کاتژمێرێك دوای خۆرئاوابونی ڕۆژی شەشی تەمموز و، لە کاتێکدا ئەو دەستەیە لە دوری چەند میلێکی کەم بون لە سەری هێڵی شەمەندەفەر لە ناکاو، لە دواوەڕا تەقە لە عەریف کرا، کە لە پێشی کاروانەکە بوو، تەقەکەش ئەو دوو ژاندارمە کردیان کە لە تەك بەندیەکەوە دەڕۆیشتن. ئەسپەکەی عەریف کوژراو خۆیشی گەدەی برینداربوو. دوای ئەوە

ئەو دوو پیلانگێڕە بەندیەکەیان گرتو بەرەو گردەنزمەکانی لای ڕۆژهەڵاتی ڕێگاکە ڕفاندیان، یونس تاکو بەربۆوە ڕاوەدوی نان و برینەکەی پرزەی برِی. لە کاتێکدا ژاندارمەکانی دیکە ڕاوەستان، کە ئەوان ڕەنگە لە فێڵەکە بەشدار بوبن و لەوانەشە بەشدار نەبوبن،تۆزی ڕوانیان و ئیدی ڕەمەکیانە دەستیان کرد بە تەقەکردن لە ڕاکردوەکان و هەرگیز هەوڵیان نەدا ڕاوەدویان بنێن. یونس گواسترایەوە نەخۆشخانە لەکفری و لەوێ ڕوداوەکەی بە دەسەڵاتەکان گەیاند و ژاندارمەکان دەسگیرکران. بەو جۆرە نوری و هاوڕێکانی توانیان ڕابکەن، لەگەڵ ئەوەی پروپاگەندەیەکی زۆریان دەربارەکرا کەچی بە درێژایی چەند هەفتەیەك شتێکی دیاریان دەربارە نەبیسترا.

ئەوکاتەی لە مەخموربوم بروسکەیەك گەیشت کە ڕاکردنی ئەوانی ڕاگەیاند، ئیدی نەقیب دیکنسن یەکسەر(باویل ئاغا)ی خستە زیندانەوە. کە گەڕامەوە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ ئیسماعیل بەگ کرد و پێم وت کە چاودێری براکانی نوری بکاو ئەگەر بۆی بکرێ بە کەفالەت لە ڕەواندوز دەست بەسەریان بکا. ئەو کارەش بوە پاساوی تاوانێکی کوشتن. چونکە لە نۆی تەمموز هەواڵدرا کە هەر چوار براکەی هەوڵیانداوە لە شارۆچکە بچنە دەرەوە، کاتێ پیاوەکانی ئیسماعیل بەگ بەدوایاندا چون ئەو چوار برایە تەقەیان لێکردن. ئەوانیش بەتەقە بەر پەرچیان دانەوە، دوانیان لێ کوشتن لە کاتێکا دوانەکەی دیکە ڕایانکرد. لە ژێر قورسایی بارودۆخەکەدا ناچار بوم باوەڕ بەو چیرۆکە بکەم، لە کاتێکدا گێڕانەوەی خەڵکەکە بۆ ئەوە دەچوو کە پیاوانی ئیسماعیل بەگ، جا چ بە فەرمانی ئەو بوبێ، یان بە فەرمانی خزمەکانی، کە ئەمەش ڕێی تێ دەچێ، هەڵمەتیان بردۆتە سەر ئەو برایە بێ چەکانە و لە کاتێکدا دەیانویست لەو ڕوبارە بپەڕنەوە کە ناوی بۆ شارۆچکەکە دەهێناو، هەوڵیاندا هەمویان بکوژن. بەر لەو ڕوداوە، هەر چەندە لە ڕاکردنی نوری زۆر دڵتەنگ بوم، بەلام چاوەڕێی هیچ دەرەنجامێکی خراپم نە دەکرد. چونکە ئەو پیاوە خەڵکێکی زۆری لەگەڵدا نەبوو، جا چ لە ناو خەڵکەکەی شار و چ لە ناو عەشیرەتەکان، وامدانابوو کە ئەو بۆ خاکی تورکیا یان فارس ڕا دەکا تا هەلی گەڕانەوەی بۆ هەڵدەکەوێ.

هەر چۆنێك بێ، بارەکە ئەو ڕۆژە تەواو گۆڕا. من دەمزانی کە نوری تا تۆڵەی خوێنی ڕژاوی دوو براکەی نەکاتەوە هەرگیز ئارام ناگرێ. هەستم کرد کە کارێکی ترسناك تورەیی(نەمسیس) Nemisis (٢) بەسەر سەبەبکارانی دا دەبارێنێ. جگە لەوەش ئەو ڕوداوە سۆزی جەماوەری زۆر لە ئیسماعیل بەگ دورخستەوە، کە پێشتر پشتگیریەکی گەورەی هەبو کە لەلایەن خەڵکی شارو عەشیرەتەکانی دەوروبەر پێشکەشی دەکرا. ئەوەی کە تورەیی خەڵکەکەی پتر کرد ئەوە بوو کە گوایە پیاوەکانی لە کاتی پشکنینی ماڵەکەی ساوایەکی نوریان کوشتبوو. لە ڕاستیدا ئەو منداڵە بە (تا) مردبوو لەو کاتە بەدواوە هەورێکی ڕەش باڵی بەسەر گردەکانی کوردستاندا کێشاو ئەمەشم بەڕاستیە نەك مەجاز.

بەر لە تێپەڕبونی مانگێکیش نەمتوانی سەردانی ڕەواندوز بکەم، مەبەستیشم ئەوە بوو ڕاستی ئەو ڕوداوانە بزانم کە درابوە پاڵ بکوژان، ئەو دەماش بارودۆخی(ولاتی نێوان دوڕوبار) (میزۆپۆتامیا) وەها شلۆق بوو کە نەدەکرا هیچ ڕێوشوێنێك بەرامبەر هەر دوو برادەرە دڵسۆزەکەی ڕەواندزمان پیادە بکەم مەبەستیشم: ئیسماعیل بەگ و باپیریەتی.

ڕۆژی دوای هەواڵی ئەو کوشتنانەی باسکراوە، باویلاغام لە بەندی بەردا، هەواڵی مردنی هەردوو کوڕەکە شیم دایە، ئەو پیاوە پیرە شێتگیر بوو، خەم باڵی بەسەر داکێشاو زۆر هەڵچوو وتی: کە ئەو لە شەوی پێش ئەو ڕوداوە هەموی لەخەودا بینیوە. دەستی بە جنێودان کرد بەئیسماعیل بەگ و تکای لێکردم تۆڵەی بۆ بکەمەوە. چەند ڕۆژێکی زۆر وەك بێ سەر لەشارۆچکەکە دەسوڕایەوە و خەڵکی ڕادەگرت و باسی بەختەڕەشەکەی خۆی بۆ دەکردن، لە یازدەی تەمموز چومە سەردانێکی دیکەی کۆیە. لە ئێوارەی پێش ڕۆیشتنم(حەماغا) ئێوارە خوانێکی گەورەی سازکرد کە نەقیب برادشۆو من و پیاو ماقوڵان وفەرمانبەرە گەورەکان هەمو ئامادەی بوین. هەشت جێ برنجی گەورە دانرابوو پەنجا تا شەست لەگەنی بچوکیش لە پێشەوەی دانیشتنەکە لە ژێر سێبەری دار توێکی گەورە لە نزیك تانکی ئاوەکە دانرابون، ئەمە دوا جار بوو کە بەر بەخشندەیی زۆری ئەو پیرە پیاوە بکەوم. ماوەیەك بوو توشی نەخۆشی ببو، بەلام ئێستا پێدەچو حاڵی باشتر بێ. دوای نان خواردن بە خۆشەویستیەوە خەندەیەکی بۆ کردم و وەك زمانحاڵی

بڵێ: بە نەرمی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بکە و ڕوت بەرامبەریان خۆشبێ. هەر وەها پڕ لە چالاکی بوو هەمیشە بەشداری گفتوگۆکانی دەکرد.

بەیانیەکەی بەر لەوەی بەڕێکەوم، چومە لای بۆ ماڵئاوایی، وەك نەریتی خۆی، بەو گەرمایە، لەسەر سەکۆیەکی بەرزی ناو ڕێگایەکی پێچاو پێچ دانیشتبو کە بۆ دیوەخانەکەی دەچوو.

پرسیارم لێی کرد: (هەموو شتێك لە کۆیە ڕیکوپێکە، هیچ هەیە کە گێرمەو کێشە دروسکا؟).

وەڵامیدایەوە: (هەندێ شت هەیە.......) بە خەندەیەکی وەك خەندەی منداڵێ قسەکەی خواردەوە، پرسیم(چی هەیە؟) بەڵام ڕەتیکردەوە ئاشکرای بکا و خەندەکەشی هەر لەسەر لێو بوو. دواتر وتی: (جارێکی دیکە... جارێکی دیکە). ناچار بوم وازلە قسەکردنەکانم بێنم و ماڵئاوایی لێبکەم. بەڵام دوای ئەو جارە جارێکی دیکە نەبوو.

ڕۆژی یەکی ئاب، لەکۆیەوە بروسکەیەکی تایبەتم لە جەمیل ئاغاوە پێگەیشت تکای هەناردنی پزیشکێکی دەکرد، کە لەبەغداوە بۆ چارەسەرکردنی حەماغا بچێ، بەڵام هەر ڕۆژی دوایی هەواڵی مردنی ئەو پیرە پیاوە بڵاو بۆوە، بەڕاستی زیانێکی گەورەبوو، ئەگەر دوو مانگی دیکە ژیابا گەلێ کێشەو گێرمەو دوو دڵی لە کۆڵ دەکردینەوە. چونکە ئەو شوێنگرێکی نەبوو دوای مردنی، وەك ڕەواندوز کۆیەم دایە دەست ئاغای پیلان گێڕ، کەسێ لەناویاندا باڵادەست و زاڵ نەبوو. ئەمەش حاڵەتێك بوو کە نیشانەی مەترسی بوو بۆ(یاریدەدەری حاکمی سیاسی) چونکە هێزێکی ئەو تۆی لەبەر دەست دانەبوو بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو کۆبونەوانەی کە ڕەنگبوو بکرێن. حەماغا بەدرێژایی ژیانی پیاوی (مەسڵەتی) بوو ئەوەی لەسەر زارانیش بوو ئەوەبو کە هەر هێندەی دنیا جێبێڵێ خەڵکێکی زۆر لە ناو دەچن. مەبەستیش ئەوە بوو کە مردنی ئەو بێ کێشە نابێ. لەوەتەی بەریتانیەکان هاتبون ئەو بەردەوام لەگەڵ ڕژێم و یاسا دابوو، پشتیوانێکی بە هێزی حکومەت بوو لە ورێیە لاینەدەداو کۆڵێ نەدەدا. ئەو یەکەمین کەس بو کە لە کاتی ڕۆژە ڕەشەکاندا کە لە کاتی شۆڕشی شێخ مەحمود دا پێیدا تێپەڕی، بارودۆخی کۆیەی ڕزگارکرد. پیرێکی خۆشەویست و لە دڵا شیرین و، بە

خێوکەرێکی ڕوخۆش و خۆش ڕەفتار بوو، کاتێ دەمدیت، بەدوو چاوە کزە خەندە ئامێزەکانییەوە هەمیشە بیرم لای(پاشای) ئەو گۆرانییە بوو کە ناوی(پاپا پاسیس)ە. شینە تۆخەکەی سپی هەڵگەڕابو. (٢) ئەودەم هەواڵی ئەوەش هات کە برایماغاش لەسەر پێخەفی مردنە، ئەودەم وام پێ باش بوو کە واباشترە بۆ کەسوکارو ژنەکانی وازی لێ بهێندرێ، لە چواری ئابدا گیانی سپارد. نەخۆشیەکەی درێژەی کێشاو چەندینجار هاتە گیانەلآ، بۆیە مردنی ئەو ئارامیەك بوو بۆی و، بە مردنیشی کە سایەتیەکی مێژوویی ڕۆیشت. چونکە ئەو بە درێژایی (٣٧) ساڵ دروستکەری مەخمور و، سەرۆکی ڕاستەقینەی هۆزی گەورەی (دزەیی) بوو ئەو دیپلۆماتێکی لێهاتوو بوو بە ڕاستی خەڵکەکەی خۆی خۆشدەویست، بۆیە ئەوانیش خۆشیان دەویست ئەو ڕۆژەی کە بۆ یەکەمجار لە هەولێر بە پلیکانەی سەربانەکەمدا سەر کەوت، کە لەسەر بان دانیشتبوم، هەستم بە ڕێزێکی زۆر کرد بەرامبەری و، هەر خێرا ئەو ڕێزگرتنەش بۆ لایەنگیریەکی تایبەتی گۆڕا. پێموایە ئەویش لەبەرامبەر دا هەمان سۆزی بەرامبەر بەمن هەبوو. ڕەنگە ئەو پەیوەندیەش لە تێڕوانینی ئەو، یان خانەوادەکەی، لە هەزاران ئەنجەت بە هێزتر بوبێ کە لەبەرژەوەندی یان دژی حکومەت دەردەبڕدرا.

لە شەشی ئابدا، بەیانیەکەی لەگەڵ ئەحمەد ئەفەندی ڕۆیشتین تالە پرسەکەیدا ئامادەبم. چونکە کە لە کوردستان سەرۆکێك یان کەسێکی گرنگ کۆچ دەکا، نەوەکانی، یان کەسوکارەکەی پێشوازی لە سەرەخۆشیکەران دەکەن و ئەوەش چەندین هەفتە دەخایەنێ و، هاوڕێ و دراوسێکانی کۆچکردو سەرە خۆشی دەکەن و سورەتی فاتیحە بۆ گیانی دەخوێنن. کە گەیشتینە مەخمور بەیداغێکی ڕەشم بینی لەسەر ماڵی ئەو سەرۆکە کۆچکردوە هەڵدرابوو، لە بەر دەرگا لەلایەن خورشید ئاغاوە و کۆمەڵێ لە خزمەکانی پێشوازیم لێکرا. بەرەو دیوەخان دەستی گرتم و لەوێ هەموان دانیشتین و بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوین، فاتیحە خوێندرا و دواتر لەگەڵ ئەحمەدە فەندی خەم و پەژارەی خۆمان دەربڕی و خورشید ئاغاش هەر دەیگوت (ئەوەی خوابیکا گەڕانەوەی نیە).

کوردەکان کاتێ باس لە مردنی کەسێك دەکەن، دەر بڕینێکی جوانیان هەیە، مەبەستم ئەوەیە کە دەڵێ: (ئەو فەرمانی خوای بەجێهێناو فەرمانی ئەویش

گەڕانەوەی نیە). ئیدی بەدرێژی باسی کارەباشەکانی کۆچکردومان کرد، لە کۆتاییشدا، وەك باوە، سوپاسی خوای گەورەمان کرد چونکە نەوەیەکی باشی لە دوای خۆی جێهێشتووە، تکا خوازی ئەوەش بوین، کە ئەو نەوەیەی تا بۆی بکرێ جێگەی شانازی و شکۆی ئەو سەرۆکە کۆچکردوەبێ. دواتر خواردنێکی ئاسایی پێشکەش کرا و هەرکە ڕێز و حورمەتی خۆم بۆ خستنە ڕو ئیدی یەك ئەرکی فەرمیم مابوو بیکەم، ئەویش ئەوەبو کە دەبوایە جێگرەوەیەك بۆ برایماغا دانێم. ئاماژەم بە خزمەکانیدا کە ئەوان بڕیار لەسەر کێ بدەن ئەو دادەنێم. لە وەتەی کۆچیشی کرد بوو ئەوان ماوەیەکی زۆریان لەو مەسەلەیە بەسەر بردبوو بە هۆی ئەحمەدە فەندیەوە بڕیاری خۆیان پێگوتم بەوەی بڕیاریانداوە خورشیدئاغا سەرۆکی فەرمی ئەو عەشیرەتە بێ و لە مەخمور نیشتەجێ بێ لە کاتێکدا (مشیر ئاغا) کە تەمەنی ئەوەندە نەبوو بۆ ئەو ئەرکە گرنگانە بگونجێ، خەریکی کاروبارەکانی ماڵی باوکی بێ و، لە کاتی شەڕیشدا سەرۆکایەتی عەشیرەتەکە بکا. تێبینی ئەوەم کرد کە لەتەنیشت خورشید ئاغاوە دانیشتوە وپلەی ئەو یەکسەر دوای ئەو دێت، لە کاتێکدا خزمەکانی دیکەی هەمویان لە خوارتر دانیشتبون، یان بە پێوە ڕاوەستابون، لەمەوە گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە وەك میراتگری خورشید ئاغا هەلبژێردراوە. وەك چۆن(حوسێنی مەلا) ش وتی کە ئەو هێشتا تەواو نەبوەتە پیاو، تا بتوانێ بە ئەرکەکانی سەرۆك عەشیرەت هەڵسێ. بە درێژیی کاتیش تا لە دیوەخان بوم هەر سەیری منی دەکرد چاوەکانیشی پڕ لە خەم و پرسیار بون پێم وابو هیوای ئەوەی هەبوو لە جێگەی باوکی دانێم، پێشتر وەك گەنجێکی سەرەڕۆی هەڵەشە سەیرم دەکرد، بەڵام لێرە بە دواوە، لە بەرچاوم بوبە پیاو.

وتارێکمدا و بە فەرمی بڕیاری ئەوەمدا کە خورشید ئاغا ببێتە جێنشینی براکەی، لە کاتێکدا کە ئەحمەد ئەفەندی ئەو عابایەی دەخستە سەرشانی کە بەو بۆنەیەوە هێنابومان.

سەرۆکی نوێم دڵنیا کردەوە، کە تا ئەو لایەنگیرو دڵسۆزی من بێ، منیش بەهەمان چاوی دڵسۆزیەوە سەیری دەکەم و بەهەمان ئەو مامەڵە پڕ لە خۆشەویستیەی کە براکەی هەیبوو مامەڵەی لە گەڵدا دەکەم.

دوای ئـەوەی هیـوای سـەرکەوتنم بـۆ خواسـت لـە ڕۆژانـی داهـاتودا، ئـاوەڕم لە(مشیر) دایەوە سۆزی خۆم بۆ نواند و لە خەمی باوکیدا دڵمدایـەوەو داوام لێکرد کە شوێن پێـی بـاوکی بگـرێ وببێتـە پیـاوێکی وەك ئـەو. لەبـەر ئـەوەی خورشـید ئاغاش پیاوێکی بە تەمەن بوو تەندروستی باش نەبوو، هەمیشە دژی پرو پاگەنـدە بوو، پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد کە بـە هـەر شـێوەیەك بـێ پـشتیوانی بـێ و ئەگـەر بارودۆخەکەش پێویستی کرد وەك نوێنەری خورشید ئاغا هاتو چۆی هـەولێر بکـا. لە کۆتاییدا هیوام خواست کە بنەماڵەی (بایز) هەمویان هەر لە پێـشکەوتن دابـن و هەر پشتیوانی حکومەت بن.

هەر هێندەی وتارەکەم تەواو کرد هەمو خزمەکانی بە یـەکجار هـاتن و بـە یـەك ڕیـز لەپێـشم وەسـتان و، حوسـێنی مـەلای، کـە لێـرە بـەدواوە ببـوە سـەرکردەی هەرەچالاك و ئەرکی ئەوەی گرتبوە سەر شان کە بە ناوی خەڵکەکەیەوە قسە بکا، بە ناوی خانەوادە سوپاسی کردم، چونکە بە ئارەزووی ئەوان ڕازیبـوم و خورشـید ئاغام بۆ ئەو ئەرکانە دانا کە برا کۆچکردوەکەی پێیهەڵدەستا. دواتـر ئامـاژەی بـۆ ئەو چاودێری و دڵسۆزیەکرد کـە هەمیـشە بەرامبـەربرایماغا هـەمبوە، بـە تایبـەتی لەکاتی نەخۆشیەکەیدا و، بەڵێنی ئەوەشی پێدام کە هەمو خانەوادەکەی لە جیاتی ئەوە هەمیشە وتا هەتا سوپاسی خوا دەکەن و، ئەگەر پێویستیـشی کـرد، ئەگـەر هـەر مەترسـیەك یـان کێـشەیەك هاتـە پـێش ئـەوا پـشتیوانی پێویـست پێـشکەش دەکەن.

دوای ئەوە دیار بوو کە هەموو خەڵکەکە بۆ ماوەیەك ڕابردوی پڕخـەمیان لـەبیر کرد و قسەیان لەسـەر داهـاتوێکی بەختـەوەر دەکـرد، وەکـچۆن خورشـید ئاغـاش بەخەندەوە و، ڕوخۆشیەوە سوپاسی ئەو چاکەیەی کردم کە لەگەڵ ئەو دا کردم.

ئەوەم پێشتر نەدەزانی، بەڵکو لە زاری خورشید ئاغا خۆیەوە زانیم کە برایماغا بەر لە مردنی برایەکەی بە من سپاردبوو، داوای لە هەموو خانەوادەکـەی کـرد بـوو کە دەبێ لە خزمەتی منداین و بمپارێزن، وەك ئەوەی من سەرۆك عەشـیرەتیان بم، ئەمەش بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە هەولێر نیشتەجێم.

◆

## بەشی حەڤدەهەم
## سەرەتای پشێویەکان

لە چواری ئابدا (ئەحمەد بەگی زراری) هاتە لام و، چەند نامەیەکی لە (سورچیەکانی ئاکریێ)وە پێبو کە تکای ئەوەیان دەکرد ڕێگەیان پێبدەم گوێڕایەڵی خۆیان پێشکەش بکەن. ئەوان لە لیوای(پارێزگای) من نەبون و، بەبێ مۆڵەتی حاکمی سیاسی موسڵ، (عەقید ناڵدر) نەمدەتوانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم. بە شێوەیەکی تایبەت، حەزم دەکرد، ڕێگەی هاتنیان پێبدەم، لەگەڵ ئەوەی پێموانەبوو بە ڕاستی هێرشێکی چەکدار بکەن. مادام ڕاشپەڕیون ئەوا پەناگەیەکی ئارام بون بۆ پەنابەرانی ناوچەی ڕەواندوز، وەك نوری و حەمادەشین و بنکەیەك بون بۆ پیلانگێڕی و بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە، ڕەنگە ئەمەش سورچیەکانی دەشتی هەریر بورووژێنێ، لەگەڵ هەڵگەڕاوە ناڕازیەکانی وەك براکانی(یوسف بەگ) . سەرەڕای ئەوەش ئەمڕۆ ئاوی ڕوبار نزمەو، لەو چەند هەفتەیەی دواییش چەند کۆمەڵێ لە سورچیە غەوارەکانی ئاکریێ چەندین جار، هێرشیان کردبوە سەر کاروانەکان لە نزیك(دوین) و(باباجیجك) ، بۆیە مەگەر بە دەگمەن نەگەرنا ڕێگای سەرەکی، ئەمڕۆ کەسی پێدانایە. هەڵویستی ئەو عەشیرەتە(نەقیب لیتلدیل) و منیان خستبوە حاڵەتی ترس و پەشۆکانێکی بەردەوام بە تایبەتیش کەولآت شەپۆلێکی پشێوی و شڵەژان دایگرتبوو. بۆیە ئامادەی بەخشینی زۆرشت بوم تابە ئاشتی بیانبینم.

لەو کاتەدا هەوڵی ئەوە دەدرا ژمارەیەکی زۆری پەنابەرانی گاور(مەسیحی) لە ورمێ و (١) ناوچەی تەیاری(٢)، لەرێگای ئاکرێوە بگوێزرێنەوە. ئەوانەش خەڵکانێك بون کە هێرشبەربون و دابین بونیان نەدەزانی و چەکداربون و لە نزیك ناوچەی سورچی هەڵیاندابوو. وادەزانرا کە ئەو عەشیرەتەش لە ژێر دەسەلاتی ئێمەدان و، بە هەرحاڵ ئەگەر مەرجەکانمان پێدابان، نەماندەتوانی لە هێرشی ئەو پەنا هەندانە بیان پارێزین. بیرۆکەیەك لە ئارادابوو بۆ ڕاگواستنی یەکجارەکی سورچیەکان لە ناوچەکانیان و نیشتەجێکردنی گاورەکان لە شوێنیاندا، بۆیە مۆڵەتی دانوستانەکە ڕەتکرایەوە لە هەشتی ئابدا گەشتێکم بۆ ڕەواندوز کرد کە زۆر دواخراوبوو، ئیدی (مارشل) م لەگەڵدا بوو کە بۆماوەیەکی کورت بۆ سەردانی هەولێر هاتبو، تا هەندێ زانیاری دەربارەی شارەوانی وەرگرێ و لەگەڵ (مولازم بوا) کە سەرکردایەتی ڕەوانەی کردبوو بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئەو دەستە سەربازە بکا کە تازە دروستدەکرا. سوربوم لەسەر ئەوەی کە لەشەش پاسەوان زیاتر لەگەڵ خۆم نەبەم، بەلاَم ئەحمەدە فەندی ڕۆژی پێش بەرێکەوتنم پێی وتم: (بۆ داوا لەمستەفاغا ناکەی لەگەڵت بێ؟) وتم: (بۆ وابکەم، پێتوایە مەترسیەك لە ڕێگەدا دروستبێ) وەلاَمیداوە: (نەخێر، بەلاَم تۆ نازانی چی ڕودەدا، وا باشترە لەگەڵ خۆتی ببەی) . لەسەر ئەوە بۆم نوسی. وەك نەریتی خۆی. دوای ئەوەی خواردنێکی چاکی داینێ لەژێر دارتوەکەی کۆڕێ، لەگەڵ چوار پیاوی دیکە ڕەگەڵمان کەوت، مەبەستم: کانەبی قاوەچی و کێخوا عەبدوڵلاَ پیرە مێردی موختاری گراوێ و کورەمامێکی گەنجی خۆی کە ناوی عەبدوڵلاَ بوو و یەکێك لە پێوەندەکانی برایەکەی کە ناوی مەجید بوو. دوای لۆقە کردنێکی توند بەسەر گردەکەدا، گەیشتینە باتاس، کە یەحیابەگ دوو یان سێ مانگ دەبوو بنکەی خۆی لە(دێرە)وە گواستبۆوە ئەوێ، بە درێژایی شەویش ڕەشەبا لە چیاکانەوە هەڵیکردبوو، بۆیە ناچار بوین لە ژورەوە بخەوین.

ڕۆژی دواتر بە دەربەندیدا ڕێگەی ڕەواندوزمان گرتە بەر، لە دوری دەربەندێ دوازکەدەس لە پیاوانی ئیسماعیل بەگ بە پیرمانەوە هاتن. وەك پێشتریش لە سەروی دەربەند ئیسماعیل بەگ و شێخ محەمەداغا پێشوازیان لێکردین.

دیتمان بارودۆخەکە شلۆقە، لە کاتی تێپەڕینماندا خەڵکەکە بە ئانقەست بەسەر سوڕماوی ماوەیەکی درێژ سەیریان دەکردین، هەموانیش هەناسەیان ڕاگرتبوو چاوەڕوانیان دەکرد. وەك ئەوەی تەقینەوەیەك لەسەر ڕودان بێ. لەو چەند ڕۆژەی دواییدا و لەژێر باڵی تاریکیدا، دو کەس، دوجاران تەقەیان لە ئۆردوی سەربازەکان کرد بوو. هەمو پیاوماقوڵان ڕایانکردبوە لای نەقیب لێتلدیل تا یارمەتی پێشکەش بکەن، بەلام دەسدرێژیکەران هەرکێبن، کەم بون و، خێرا لە گردەکاندا ون ببون. تێبینی زۆرم لەسەر شوناسیان خستەڕو، هەندێ وتیان نوری و براکانی بون، هەندێکی دیکە گوتیان سورچیەکانن، بەلام لێکدانەوەی هەرە باو و بلاو بۆئەوە دەچوو کە ئیسماعیل بەگ شتەکەی بۆئەوە ڕێکخستبێ تا نەهێلێ کەرەستەکانی ئۆردوگاکە کەمکەمەوە و هانیشم بدا تا ڕێو شوێنی توند تر بگرمەبەر لەبەرامبەر هەموو خانەوادەکەی باویلاغا.

لەهەمان کاتدا پڕوپاگەندەی ئەوە هەبوو کە نوری گەڕاوەتەوە و بەر لەشەوێ یان دوو شەو سەردانی خانەوادەکەی کردوە لە شارۆچکەکە و ئێستا لە گوندێکی نزیکدا خۆی شاردۆتەوە. ئەو ڕۆژەی گەیشتمە ئەوێش، ئەو جۆگەیەی ئاوی خواردنەوەی بۆ شارۆچکەکە دابین دەکرد برابوو، ئەو دەستەیەی بۆ چاککردنەوەی چوبون گوتیان کاری بەرازی کێویە، بەلام هەمو خەڵکەکە، کە ڕاستیان دەکرد، پێیان وابوو کە نوری دەستی لەو کارەدا هەبوە.

ئەو بەندیە ڕاکردوە توشی زۆر کێشەو سەریەشەی ڕۆژگار بوو. (ئۆنباشی یونس) سوێندی خوارد کە بریندار کردوە، بەهەر حاڵ خۆی و دوو هاوالەکەی لەلایەن هەمەوەندەکانەوە ڕوتکران و چەککران، کاتێ بە ناوچەی ئەواندا تێپەڕیبون. دوای چەند هەفتەیەك توانیان بگەنە(بێتواتە) بنکەی ئەحمەد بەگی سەرۆکی(بەجگای) (میرەبەگی) لقی عەشیرەتی خۆشناو و گەیشتنە لای هەردو برایەکەی کەمابون. لە وێوە ڕێگەی گوندی(شێخ کاکە مین) ی پیرە مێردیان گرتەبەر و، ئێستا وازەن دەبرێ کە لەگەڵ براکەی ئەودا لە دۆڵی ئاکۆیان بن.

هەرچۆن بێ شتێکی دیکە دودڵی کردبوم. ئیسماعیل بەگ ئیدی لای خەڵك خۆشەویست نەبوو وایلێدەهات زیاتر و زیاترو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر شایانی ئەو پۆستی دەسەلاتداریە بێ. ئەو مۆتەکەی تیرۆرکردن دەوری دابوو، بەدەگمەن

نەبوایە نە دەكرا لە ماڵ بیهێنیتە دەرەوە، لە محەمەد عەلی ئاغاش بترازێ پێیوابوو كە هەموو خەڵك پیلانی لێدەگێڕن. دوای ئەوەی ئەوانەی گومانی چارەنوسی براكانی نوری لێدەكردن وایان دیت مافی خۆیان بوو لێی بترسن ولێی بتەكنەوە.

پێموابێ تارادەیەكی زۆر دایكی لەو هەڵسوكەوتانەی بەر پرسیار بوو، چونكە لە ڕێی گفتوگۆكانی لەگەڵ مندا، وام بۆ دەردەكەوت كە هێشتا ئەو منداڵە بێ گوناهەیە، كە درێژدادڕی نەدەزانی، وەك چۆن پێشتر ناسیبوم، پیرە پاشاش. كە پێشتر نەخۆش بوو، ئێستا تەواو چاكبۆوە و، بەزیرەكی و دیپلۆماسیەكەی هەندێ كاری بۆ ڕاستكردنەوەی هەندێ هەڵەی سیاسی نەوەكەی پیادەكرد.

سوپاس بۆ هەوڵە بەردەوامەكانی(نەقیب لێتلدیل) و(نەقیب هجیسن)، سوپاس بۆ خوا: ئەوەتا سەربازە(لیڤیەكان) بونەتە هێزێكی چوست و وریا و، ڕاهێنانەكانیان بەرەو پێشەوە دەچێ. بەیانیەكیان لە كاتی نواندنەكاندا سەیرم دەكردن دیتم جگە لە ڕاهێنانە ئاساییەكان، بەشداری لە ڕاهێنانە وەرزشیەكان و مشتەكۆڵەش دەكەن. ڕاهێنانە دروستەكەو گیانە بەرزەكەیان دڵی خۆش كردم. نزیكەی هەمو سەربازەكانیش لاو بون و خەریكبو گیانی هەرەوەزی لە ناویاندا گەشەی دەكرد.

زۆر باسی ئەوەیان كرد كە لە زستاندا سەربازەكان چۆن بحەوێنینەوە. نەخشەكان بۆ دروستكردنی بینایەك لە شوێنی كۆنە ئۆردوەكەی توركی دانرابو كە دەكەوتە لای خوارەوەی ڕۆژهەڵاتی شارۆچكەكە لە گۆڕەپانێكی تەختایی نێوان ڕێگای فارس و چیای ڕەواندوز بوو، پرۆژەكە زۆر دواكەوت، بۆیە بیرمان لە نەكردنی كردەوە، ئالێرەدا حاجی نەوڕۆز هاتە پێشەوە و خانوەكەی خۆی لەبەرامبەر برە پارەیەكی گونجاودا خستینە بەر دەست. لەگەڵ ئەوەی كە ئاوی تێدا نەبوو بەڵام جێگەیەكی نایابی حەوانەوەبوو، بۆیە كارەكەیمان هەرزو پەسەندكرد، بە هیوای ئەوەی لە ساڵی داهاتودا سەربازگەیەكی گونجاو دروست بكەین. ئەودەم دەتوانرا خانوەكە بكەینە بەڕێوەبەرایەتیە حكومیەكان. بەهەر حاڵ، لەوەسەر سام بوم كە چی پاڵی بە حاجی نەوڕۆزەوە نابوو بۆ ئەم كارە. بەدڵنیاییەوە ئەو پێویستی بە پارە نەبوو، هەندێ جار بۆ ئەوە دەچوم كە بەو

مشکەی دانێم لە کاتی نوقوم بونی کە شتیدا خۆی دەرباز دەکا. گفتوگۆکانی لەگەڵ مندا درێژەیان کێشاو گلەیی لەو گومانە دەکرد کە باڵی بەسەر ئیسماعیل بەگدا کێشاوە، کەوای لێکردوە لەسەلامەتی خۆی و خانەوادەکەی بترسێ و وتی ئەگەر بارودۆخەکە باشترنەبێ، ئەوا، دەچێتە ناوچەی باڵەکایەتی یان ولاّتی فارس و، بەدرێژایی ئەو ماوەیەش پەشۆکاو و شلەژاو بوو.

کاتێ لە دوازدەی مانگدا داوەتی نانی نیوەڕۆی کردم توشی تەنگە تاوی کردم، چونکە بڕیارمدابوو بەیانیەکەی ئەو ڕۆژە ڕەواندوز بەجێبێڵم و بەلاّم دەمویست کارەکەم بەنهێنی بهێڵمەوە نەوەك دوژمنەکانم لەسەر ڕێگە بۆم دانیشن. وەلاّمێکی دودڵم دایەوە ووتم: دوایی بەدڵنیاییەوە پێیدەڵێم دێم یان نا. ئەمەش وەلاّمێکی دروستی ئەو زانیاریانەبوو کە دەیوستن. لە شەوی یازدەی مانگ هەمو پیاو ماقوڵاّن و سەرۆك عەشیرەتەکانی کە لە ڕەواندوز بون بۆ ئێوارە خوانێك بانگکران کە لەسەر بانی ماڵی ئیسماعیل بەگ ئامادەکرا بوو.

دوای ئەوەی لەو نانخواردنە خۆشە بوینەوە لەسەر قەنەفەکان دانیشتین و ئەڵقەمان بەست و دەستمان بەقسان کرد. بەر لەوەی بانگێشتکراوان بڕۆن وتارێکم دا و، باسی ئارامی و ئاسایشم کرد کە چەند مانگێك باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە، بۆ ئامادەبوانیشم دوپاتکردەوە کە گوێ بەو پڕوپاگەندە زێدەڕۆیانە نەدەن کە لە باشورەوە دێن. دڵنیام کردنەوە کە سەرەڕای ڕاپۆرتە دژەکان، کەمترین نیەتمان بۆ چۆڵکردنی ڕەواندوز نیە، جاچ لە ئێستادا بێ یان لە کاتێکی نزیکدابێ.

بەیانیەکەی ڕۆژی داهاتو کاتێ میلی کاتژمێر ئاماژەی بۆ چوار و نیو دەکرد، ڕۆیشتین، هەریەك لە ئیسماعیل بەگ و شێخمحەمەد ئاغا لەگەڵ ئێمەدا سواربون تا لە چیایەکە ماڵئاواییمان لێبکەن، کە تەنیا ئەو دو کەسە بەنیازی ئێمەیان دەزانی. بەر لەوەی ئیسماعیل بەگ وشەی ماڵئاواییمان پێبڵێ داوای کرد دەستەیەك لە پیاوەکانی بۆ پشکنین بنێرێتە (گەلی)، بەلاّم من ڕەتم کردەوە بۆ ئەوەی توشی ماندوبونی نەکەم،وەکچۆن پێشموانەبوو توشی هیچ کێشەیەك ببین مادام زۆر زوو بە نهێنی ڕۆیشتوین.

لە پێشەوە سوار بوبوم و بەگەلیدا دەچومە خوار، مستەفا ئاغا و پیاوێکی دیکەم لەگەڵدا بوو کە چاوێکی بەستبوو ناوی عەلیە فەندی بوو، هەریەك لە کانەبی و کوێخا عەبدوڵلا و مەجید و دوسێ ژاندارمەی دیکەمان لەگەڵدابوو، لە کاتێکدا (مارشلێ ) و (ملازم بوا) و خەڵکەکەی دیکە لەسەر خۆ دەڕۆیشتن، هەر خێرا یەك میلمان لەدوای خۆمان جێهێشت. لە ڕێگادا توشی دوسێ کەس بوین کە بەرامبەرمان دەهاتن، بازرگانێکی هەولێریان لە ناو دابوو کە ناوی سەید عەبدوڵلا ئەفەندی بوو، هەموان گاکڕی تەماشایان کردین، بەلام کەسیان ورتەیان لێوەنەهات و بە ڕێگەی خۆیاندا ڕۆیشتن.

هەر هێندەی لە بەشی سەرەوەی گەلی هاتینە خوارەوە، ڕێگاکە کراوە بوو چوینە ناوچە نزیکەکەی کە لە مەودای سێ تا چوار میل دور لە دەروەکەیەوە دەست پێدەکا، دیتم مستەفا ئاغا سێ لە پیاوەکانی بە لۆقە کردن هەنارد و، بە پەرۆشیەوە چاوی بۆ چوارەمیان دەگێڕا کە ڕائید مارشلێ لەلای خۆی گلی دابوەوە. کە نەیدیتەوە ئاماژەی بۆ ژاندارمەیەك کرد کە لەگەڵ پیاوەکانی ئەودا سوار بێ. پازدە خولەکی دیکە بەقسەکردن ڕێگەمان بڕی. لەوێ منداڵێکی کوردی سورچیمان دیت کە ئاوی جۆگەی لەوێ ڕادەکێشا، لە ناکاو دوتەقەی خێرا و دوای یەکمان گوێ لێبو. دەنگی تەقەکان لە پشتمانەوە هاتن. مستەفا ئاغا وەك مردوان وەستا و گوێی قولاغ کرد، وتم (ڕەنگە ئەو پیاوانەی پێشەوە نێچیرێکیان ڕاو کردبێ) مستەفا ئاغا وتی(نەء، ئەوە بۆ سەیە) بەمنی وت کە لە دواوە بمێنمەوە خۆی بەسواری بەرەو پێشەوە چوو تا بزانێ چی بوە. بەلام من نەمدەویست بە تەنیا لەدواوە بمێنمەوە لە ناو تەڵەی مەرگدا، بۆیە سوربوم لەسەر ئەوەی لەگەڵیاندا بچم. مەودای دوسەد تا سێ سەد یاردە لەسەرخۆ ڕۆیشتین و، بێدەنگی وەك گۆڕستان ئاسۆی دا پۆشیبوو، تا گەیشتینە خاڵێك لە ڕێگەکە دا کە گابەردێکی گەورەی لێبوو بەری بینینی پێشە خۆی دەگرت. خولەکێك وەستاین و گوێمان هەڵخست، کاتێ خەریکبوین بەوریاییەوە سەیری هەموو لایەك بکەین. دیتمان ئەو ژاندارمەی کە بەسواری ڕۆیشتبو بە پیادەیی دەگەڕێتەوە و لە ترسان تۆقیوە. بەڕاکردنەوە هاواری کرد کە یەکێك لە پیاوانی مستەفا ئاغا کوژراوە و دوانەکەی دیکەش بەدیل گیراون و ئەویش تەنیا کاتێ ڕزگاری بوە کە خۆی لەسەر

پشتی ئەسپەکەی فرێداوەو بە ڕاکردن بە پەسیواندا ڕای کردوە. دواتر بەردەوامبوو وتی: دەستەیەك کە لە حەفتا کەس کەمتر نین لەسەر ڕێگاکە بۆسەیان داناوەو چاوەڕێی ئێمە دەکەن. لە کاتێکدا کە سێ چوار ژاندارمە بەسواری بەرەو پێشەوە چون، بۆیە تەنیا سێ چوار ژاندارمەی چەکدارمان لەگەڵدامابوو، لە کاتێکدا ڕائید مارشال کە لە دواوە و زۆر دور بوو لێمان، تەنیا ژمارەیەکی هاوتای ئێمەی ژاندارم هەبون. بەو ژمارەکەمەی ژاندارمەوە هەوڵی برینی ئەو دەروە تەسکە بێهودەبو کە داروبارێکی زۆر و گابەردێکی زۆری هەبوو. لەوێ چەند کەسێکی کەم دەیانتوانی بەربینی سوپایەك بگرن. بۆیە ژاندرمێکم بە خێرایی هەنارد تا هەواڵەکە بە ڕەواندوز ڕاگەیەنێ و نامەیەکی بۆ نەقیب لێتلدیل پێبو تا ئاگاداری بکاتەوە. تکام لێکردبوو کە هێزێکی سەربازی بنێرێ تا یارمەتیمان بدەن بۆ برینی ئەو دەروە. ڕەنگە جوانوە بچوکەکەم بۆنی مەترسی کردبێ، چونکە چەندی جڵەویم دەسوڕاندەوە ئەو هەر لۆقەی بۆ دواوە دەکرد، بۆیە وامکرد بە شێنەیی بەرێدا بڕوا، جیا لە کۆمەڵێکی دیکەی سەر ڕێ کە لە دواوەی ئێمە بون. هەر خێرا گەیشتینەوە ڕائید مارشل و مولازم (بوا) کە بەرێی خۆیاندا گەڕابونەوە. ئێستا گەلی وەك قوببەیەکی تاریك دەردەکەوت کە کۆتایی نەبێ، دوژمنیش لە هەمو قوژبنێکی بۆسەی ناوەتەوە، تاوێرە بەرزو مەزنەکانی دیواری بەندیخانەیەك بون کە پیا هەڵگەڕانی مەحاڵ بوو. قوڵاییە مەزنەکەشی وەك خەرەندێکی تاریك دەردەکەوت بۆ لە ناوچونی ئەوانەی چارەنوسیان دیاری کرابو. هەر هێندەی لە زەویەکی دەوروبەری تێپەڕین و بەسەر لێژییەکە سەرکەوتین ڕاوەستاین و کۆنگرەیەکی جەنگمان بەستا. بڕیارماندا بگەڕێینەوە تا شوێنی ئارامی(Out post)ی ڕوسی کە دەکەوتە شوێنی هەرەبەرزی گەلی و، چاوەڕوانی فریا گوزاری بکەین. پێم وابێ کە لەسەر ڕێگا کەسێکم دی کە لەسەر تاوێرێکی سەر خەرەندەکە بە چۆکدا هاتبوو، هەر هێندەی ئێمە تێپەڕیبوین، دەنگی دو تەقە هات ڕەنگە ئەوەش لێکدانەوەیەکی ڕاست بێ کە ئاماژەیەك بوبێ بۆ ئەوانەی لە کەمیندابون و، مەبەست ئەوە بێ کە نێچیرەکە لە دەست دەرچوو. ماوەیەك لە پێگە ئارامە ڕوسیەکەدا ماینەوە، کە خۆرەکە گەرم بوو ئاومان نەما، بۆیە بڕیارماندا بەرێی خۆماندا بگەڕێینەوە، تا سەرچاوەی ئاوی بێخاڵ. هەر هێندەی

گەیشتینە ئەو شوێنە جوانە و تۆزی هیلاکیمان دەرکرد، ئیسماعیل بەگ و پیاو ماقوڵانی ڕەواندوز و دەستو پێوەندەکانیان گەیشتنە لامان، تەنیا حاجی نەورۆزیان لەگەڵدا نەبوو. تۆزی دواتر نەقیب لیتلدیل بە پرچەکی و بە سواری ئەسپە پیرەکەی گەیشت کە لەسەر زەویە سەختەکە لینگی دەدا. دوای ئەویش دەستە سەربازەکان گەیشتن کە ڕایاندەکرد و ئارەق لە هەموجەستەیان دەچۆڕا، بەلاّم ئەوەی دەردەکەوێ، شەیدای شتێك بون کە ئاسان دەستدەکەوت. هەرکە(٧٠) ژاندارمە گەیشتن لێتلدیل(٥٠) کەسی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو گەلی شۆڕبوەوە و(٢٠) کەسیش لەگەڵ ئێمەدا مانەوە تا دوای ئەوەی لە نانخواردن دەبینەوە لەگەڵماندا بێن، کە ئیسماعیل بەگ هەندێ لە پیاوەکانی ڕەوانەکرد تا بۆ مانی بێنن.

دوسێ کاتژمێرمان لە بێخاڵ بەسەر برد و لە خۆمان دەپرسی ئەوانە کێ بون کە خەریك بوو شالاّومان بکەنەسەر. هەر هەمومان گومانمان بۆ نوری دەچو، بەلاّم من ڕەتم کردەوە کە خۆم بخەمە ژێر قورسایی ئەو زو بڕیاردانە. من کە گومانم هەبوو دەربارەی ئەو پروپاگەندانەی دەیانگوت گەڕاوەتەوە، پێم وابوکە سەرکردەی ئەو پرۆژەیە هەموی(بەگۆك)ی برای یوسف بەگ بوو، ئەوکەسەی کە هەرگیز لێبوردنم نەدایە.

ئەوەی کە ئەو بۆ چونەی بە هێزکردم ئەوەبو کە باوکی ژنەکەی نەورۆز بەگ بو، بەڕوارو ساتی ڕەواندوز بەجێهێشتنی ئێمەی پێدابون.

لە کوردێك یان دوکورد کە بەتەنیا بەگەلیدا سەرکەوتبون تەنیا ئەو تۆزە زانیاریەمان دەسکەوت کە پێشتر ژاندارمەکان پێیان وتبوین.

دوای ئەوەی خواردنێکمان خوارد خوا حافیزیمان لە ئیسماعیل بەگ و پیاو ماقوڵەکان کرد و سوپاسی ئەوەمان کردن کە بۆ یارمەتی ئێمە هاتبون، دواتر بە سواری بەگەلیدا شۆڕبوینەوە لە ڕێگا توشی شەوکەت ئەفەندی باردینی ناحەز و(ئۆبالْ بە ملی نوسەر. و. ع) حەسەن ئاغای موختاری باتاس بوین کە بەسواری بۆ پێشوازی ئێمە هاتبون. پێیان ڕاگەیاندین کە کانەبی قاوەچی کوژراوە و، دوپیاوەکەی دیکەش دوای ئەوەی ڕوتکران و لێیاندراوە، بەرەڵلاّ کران و ئێستا لەکانی وەتمانن. هەواڵێکیش بە تەلەفۆن لە ڕەواندوزەوە بۆ یەحیا بەگ ڕەوانە

کرابوو لە باتاس، ئیدی هەمو عەشیرەتەکانی سورچی و دەشتی هەریر لە دەرکی گەلی بۆ یارمەتی ئێمە کۆببونەوە، ئەگەر پێویست بکا. لە پێشەلآنەکە تێپەڕین کە پێشتر لەوێ گویمان لە دەنگی تەقەکان بوو هەر خێرا گەیشتینە ئەو گابەردەی کە چەند کاتژمێرێك لەمەوبەر تەنیا ئەو لە نێوان ئێمە و مردندا وەستابوو.

لە پشت ئەو ڕێگایەی بەرەو جۆگە ئاوەکە شۆڕدەبۆوە، بە پەنجا یاردەیەك، کە لێوارێکی بچوکی هەیە و پارچە زەویەکی باشە بۆ ئاوەدانی ئاژەڵ. لە کەناری بەرامبەردا پارچە زەویەك داربی تەڕی لێ ڕواوە، هەر هێندەی ڕێگاکە بە لێوارەکەدا دەڕوا و کورتدەبێتەوە و ڕێگاکە بەژێر بەردێکی مەزن دا تێدەپەڕێ. ئێرە جێگای بۆسەی ئەوانە بوو کە ویستیان شالآومان بکەنەسەر، کە دیوارەکە مەزنەکە هەمو هیوایەکی ڕاکردنی دەبڕی، لەسەر کەنارە سپیەکە پەڵەیەکی تاریك هەبوو کە ئاماژەی بۆ ئەو شوێنە دەکرد(کانەبی) دوا هەناسەکانی لێدابوو.

لێرە بەسەرەوە، دیتمان لەوبەر لەوبەری ڕێگاکە سەنگەری سەربازەکان هەبوو، هەر خێرا لە کۆتاییدا گەیشتینە(گەلی). ناتوانم باسی ئەو هەستەی خۆمان بۆ (خوێنەر) بکەم کاتێ، جارێکی دیش ئەو هەوا شێدارە پاکەمان هەڵمژی و، ئەو دەشتە بچوکەمان لە خەلیفان لەبەردەمی خۆماندا بینی، کە تیشکی خۆر خەملآندبوی و گردەکانیش دەوریان دابوو. دوای کاتژمێر پێنجی بەیانی چوینە ناوگەلی، ئێستاکات نزیکەی پێنجی بەیانیە. وەك مێشێکی کەوتبێتە تۆڕەوە تیایدا هاتین و چوین، ئەمەش نزیکەی(١٢) کاتژمێری خایاند و، سێ جار درێژیەکەیمان پێوا. ئەمەش دواجار بوو بەگەلیدا تێپەڕم — لانی کەم تا ماوەیەکی دیکە — چونکە لەسەردانی کردنەوەی ئەو ناوچەیە بێئومێد نەبووم.

تەواو لە دەرەوەی گەلیدا، توشی(لیتلدیل) و سەربازەکانی بوین، کە بێ ئەوەی توشی هیچ بەرەنگاریەکبین پێیدا ڕۆیشتبوین. دەستەیەکی پەنجا کەسی لە سورچیەکان پێشوازیان کردین و هەمویان هی دەشتی هەریر بون و، پیرۆزیایی ئەو ڕزگاربونەیان لێکردم و دەستی یارمەتیشیان بۆ ئێمە خستەڕو. کە بۆ کانی وەتمان سەرکەوتین کوێخا عەبدوڵلآمان بینی کە وادیار بوو زۆر مەلول بوو هەندێ جل وبەرگی لادێیانەی زبری لەبەردابوو، (مەجید)ی لاویش تەنیا کراسی بنەوە و شەڕواڵێکی سپی لەبەر دابوو، لە کاتێکدا دەستە جلە بە ئاوریشم نەخشاوەکەی

نەمابوو، (کانەبی) بەمردویی لەویَ کەوتبو. لەویَ گوێمان لە وردەکاریەکانی ڕوبەڕوبونەوەکان بوو: کانەبی کە لە پێشەوە بوو هەر هێندەی گەیشتبوە لێوارە سپیەکە — کە شوێنەواری خوێنەکەیمان تیا بینی — دێتە خوارەوە تا تۆزێ ئاو بخواتەوە، لە ناو دار بیەکان و لە بەرامبەر خۆیدا دەستەیەك پیاوی چەکدار دەبینیَ، یەکسەر هاواری لێدەکەن(بەڕێی خۆیدا بڕۆ، ئێمە نامانەویَ ئازارت بدەین. ئێمە تەنیا چاوەڕێی حاکمی سیاسی دەکەین). ئەویش وتبوی من پیاوی(حاکم)م و تەقەی لێکردبون، ئەوانیش تەقەیەکیان کرد و کوشتیان، لە هەمان کاتدا هەندێکی دیکەیان دەردەپەڕن و کوێخا عەبدوڵلا و مەجید دەگرن و چەك و جل وبەرگی سەرەوە و ئەسپەکانیان لێدە ستێنن، لە پەرە کوێخا دەپرسن ئێستا حاکم لە کوێیە؟). دەڵیَ:(لەگەڵ محەمەد ئاغا، لە ڕەواندوز دەرچون بۆ سەردانی ناوچەی باڵەك) ئەوانیش دەڵێن: (ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە، چونکە هەواڵمان دراوەتیَ کە بەرەو هەولێر ئەم ڕێگایەی گرتۆتەبەر).کوێخا دوپاتی کردەوە(پێتان دەڵێم بەرەو ئەولاچوە) . ئیدی بەلێدان بەردەبنە گیانی و ئەمەش نیو کاتژمێر دەخایەنیَ، بەڵام ئەو خۆڕادەگریَ و مل نادا دوای ئەوەی ئەو دەستەیە دەسەعات خۆیان مەڵاس دەدەن، دەکشێنەوە و هەر دوو دیلەکەیان بەردەدەن. ئەو دوپیاوەش یارمەتی دەدرێن و تەرمەکەی کانەبی دەبەنە کانی وەتمان.

لە کاتی پرسیارکردن لە کوێخا عەبدوڵلا دەربارەی ژمارەی ئەوانەی شالاویان بۆ هێنابون، وتی(لانی کەم سی کەس، تاشەست کەس دەبون). کوێخا نەیتوانی کە سیان بناسێتەوە و ئەو وەسفەی بۆ سەرکردەی ئەو دەستەیە کردی پتر خەملاندن و تەخمین بوو. منیش کە دەمزانی کوردەکان چەندیان مەیل لە زێدەڕۆییە لە ژمارە هێنانەوە، بۆیە پێم وابو کە ژمارەی ئەو دەستەیە لە نێوان (١٥) تا (٢٠) کەس دەبون و، تا ئێستا پەیوەستم بەو بیرۆکەیەی کە ئەوەی ویسبوی بمکوژیَ: بە گۆك بوو. بەدوادا چونەکانی دواتر دەریانخست کە هاوبەشی سەرەکی لەو بۆسەیە تەنیا ئەو پیاوە بوو کە گومانم لێی هەبوو و، هەر ئەویش جارێکیان هەوڵی دا لەپەنجەرەی ژوری نوستنمەوە بمکوژیَ و مەبەستیشم خدری کوڕی حەمادەشینە، کە (٣٠) کەسی لەگەڵدا بوو، لە کاتێکا نوریش لەگەڵ ژمارەیەکی هاوشێوە لەسەر گردەکانی لای سەرەوە چاوەڕێی دەکرد و ئامادەبوو

بۆ یارمەتیدانی هاوڕێکەی. دوای ئەوەی نوری شەویْ سەردانی ڕەواندوزی کرد چوە(بیاو) و(حارس ئاغا)ش چەکی دایە، دواتر لە ڕوبار پەڕیەوە و پەنای بۆ سورچیەکانی ئاکریْ برد. دوای ئەوە یەکسەر گەڕایەوە و، خدر و پیاوەکانی خۆیان لەگەڵدا بوو کە ژمارەیان نزیکەی(٢٠) سورچی بوو، لە کاتی تێپەڕینیان بە ناو سورچیەکاندا چەند کەسێکی کەمی دیکەشیان ڕەگەڵ خۆ خست و لە ڕوباری ڕەواندوز پەڕینەوە بەرەو بیاو، کە(حارس ئاغا) نانی دانیْ و هێزێکی بچوکی فریاگوزاریشی ڕەگەڵ خستن و هێزەکەیان ژمارەی زۆر بوو. بەیانی ئەو ڕۆژەی چومە ڕەواندوز، ئەوان ڕێی(سرێشمە) یان گرت و بە ڕێگایەکی تەسکدا لەلای باکوریەوە بەمەودای یەك میل چونە ناو گەلی. ڕێبوارەکان یان ئەو سیْ کەسەی لە شۆڕبونەوەی یەکەم جارماندا چاومان پێیان کەوت و ئەو منداڵەش کە لە قامیشەلأنەکەدا کاری دەکرد هەموان دەسبەسەر کرابون و داوایان لێکردبون کە بەرامبەر گیانی خۆیان سوێند بخۆن، کە بونی ئەو بۆسەیە ئاشکراناکەن. تەنیا بیر کردنەوەی پێشتری مستەفا ئاغا و ئازایەتی و دڵسۆزی پیاوەکانی منیان ڕزگار کرد، چونکە ڕوبەڕوی مردنێکیْ ڕەها دەبومەوە، لەوانەیە ئەگەر چەند هەنگاوێك لەوگابەردە تێپەڕیمایە کە دیمەنەکەی لێشاردبوینەوە ئەوا هەموو هەوڵە کانیان بێهودەو سەر نەکەوتو دەبوو.

هەر چەندە مستەفا ئاغا پێدەچیْ پیاوێکی بەدین و لە خواترس بیْ، بەلأم بەوە ناسراوە کە واز لە تۆڵە سەندنەوە ناهێنیْ.(٣) ئەو ڕوداوانە گیانە عەشایەریەکەی ئەویان وروژاندو، ڕەتیکردەوە. تەرمەکە لەو شوێنە بشاردرێتەوە ولأخێکی دەستکەوتو لێی بارکردو بردیەوە بۆ گوندەکەی خۆی و، بە ناوچەی خۆشناوەتیدا بردی تا(تیرە) کان بوروژێنیْ داوای تۆڵە سەندنەوە بکەن. چونکە کانەبی، یان(عەلی بابا) لەگەڵ ئەوەی هەژار بوو ئەو پیاوێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو ئازایەتیەك لە گیانە ئازاکەیدا هەبوو کە لەهەموو ناوچەی خۆشناو وێنەی نەبوو. بە منداڵی لەسەر دار گوێزێك دەکەوتە خوارەوە و چاوی ڕاستی کوێر دەبیْ، ئیدی پێڵوی شێوابوو. ئێستاش وێنەی ڕوەخۆشە پڕو تەڕەکەی و برینە سەیرەکەی دەهێنمەوە بەر چاوی خۆم ، وەك ڕاهاتبوو، لە ژێر دارتوە مەزنەکەی کۆڕیْ قاوەی بۆ تێدەکردین.

گەڕاینەوە باتاس و لەچایخانەکەی سەر ڕێگای خوار گوندەکەی حەمادەشین ڕاوەستاین کە ناوی(کەڵەکین)بوو. یەحیا بەگ و هەموو سەرۆکەکانی سورچی دەشتی هەریریٚ لەویٚ کۆببونەوە بۆ پیشوازی و پیرۆزبایی لێکردنم. ژمارەیەکی زۆریٚ چەکداریشیان لەگەڵدابوو کە پێموایە لەبەرە بەیانەوە بۆ ئەوە ئامادەکرابون کە ئەگەر بکوژرێم هێرشبکەنە سەر ڕەواندوز و باتاس، و ئەگەر دەربازیش بم بۆ یارمەتیدانم بون. کاتژمێرێك دوای خۆر ئاوابون گەیشتینە شوێنی مەبەست، چوینە ناو جێگا بۆ خەوتن.

ڕائید مارشڵ و مولازم بوا ڕۆژی دواتر گەڕانەوە هەولێر، لە کاتێکدا من لە باتاس مامەوە تا لێکۆڵینەوە بکەم و هەڵمەت بکەمەسەر ئەوانەی ویستیان بمکوژن. تەلەفۆنم بۆ هەولێر کرد تا داوای هاتنی سەید عەلی و دەستەیەك ژاندارم و کۆمەڵێ سەربازی سوارە بکەم و، ئێوارەکەی بە سواری چومە شەقلاوە و مستەفا ئاغام لەگەڵدا بوو، تا داوای یارمەتی لە قادر بەگ بکەم. کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر بۆ پێشوازی و پیرۆز باییم هاتن و، قادر بەگیشی بیٚ ئەوەی داوای لێبکریٚ، هەموو عەشیرەتی خۆشناوی وروژاند بوو تا تۆڵەم بکەنەوە. کارەکە هەر چۆنێك بیٚ، تکای ئەوەم لێکرد کە ژمارەیەکی کەمم پیاو بداتیٚ کە جێی متمانەبن، چونکە من دەمویست هێرش بکەمە سەر(حەمادەشین) و(نوری) و نەمدەویست هێرشێکی گشتی بکەمەسەر ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی دژی ئێمەن.

لە ڕۆژی سێزدەی هەمان مانگدا، بۆ یەکەم جار هەواڵی ڕاپەڕینەکانی عەشیرەتەکانی دەوروبەری باقوبەم پێگەیشت(٤). لە سەرەتاکانی تەممووزەوە، نزیکەی هەمو ڕۆژێك ئەو بروسکانەمان پێدەگەیشت کە هەواڵی ئەو پێشویانەی لە خۆ دەگرت کە لە ناوچەی فوراتدا هەڵگیرسابون. لەگەڵ ئەوەی کە زۆر مەترسیداربون بەڵام دەنگییان لە زۆر دورەوە دەهات و، زۆر نەیاندەشڵەژاندم، کەچی ئێستا پشێویەکان کەوتبونە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە، ئیدی دەبوایە بەڕاستی بارودۆخەکە لە هەولێر جوربکەم و، هەولێریش لەیەکی ئابەوە بیٚ سەرباز بوو.

لە چواردەی مانگ بۆ بەردەوامبونی لێکۆڵینەوەکانم گەڕامەوە باتاس. هەر هێندەی سەید عەلیش گەیشت هەناردمە ناو سورچیان تا زانیاری کۆبکاتەوە و هەر دەسگیرکردنیکیش کە بە پێویستی دەزانیٚ بیکا. ئێوارە گەڕایەوە و

موختاری(سرێشمە) و ئەو منداڵەی لە شوێنی ئاشەکە بوو و سێ یان چوار کەسی دیکەی لەگەڵدا بوو، ئەوانە شوناسی ئەوانەیان ئاشکرا کرد کەویستیان شالاّوم بکەنە سەر. نوری و خدر و پیاوەکانیان بە ناوچەی سورچیاندا گەڕانەوە و تالاّنەکانیان هەڵگرت و لە سەروی(باردین) لە زێ پەڕینەوە. وێدەچو ئێستا لەسەر گردێکدا هەڵیاندابێ کە بەسەر دەربەندی زێدا دەڕوانێ.

پیاوەکانی(حارس ئاغا) گەڕانەوە بیاو، منداڵەکەم بەرداو، ئەوانیدیم وەك دیل ڕەوانەی هەولێرکردن و، سەید عەلی و سەربازەکانم هەنارد تا دەوری حارس ئاغا بگرن. لە کاتی ڕۆژدا لیتلدیل بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا کردم و وتی حاجی نەورۆز لە ڕەواندوز ڕایکردوە و چۆتە ناوچەی باڵەك. هەولێکی زۆرم دا بیهێنمەوە بەلاّم ئەو پەنای بۆ شێخ محەمەد ئاغا برد بوو، ئەویش پەنایدابوو ڕێگەی پێدا بوو لەوێ بمێنێتەوە.

لە پازدەی مانگ بەڕێی کۆڕێدا گەڕامەوە هەولێر و مەودای چل میلم بڕی. لەگەرمای ئەو ڕۆژەدا لە کۆڕێ پشومدا و لەوێ زانیم کە کوێخا عەبدوڵلاّ بردراوەتەوە گوندەکەی و لەبەر ئەو زیانەی لێیکەوتبوو لەشەرمەزاریان خەریکە بمرێ. هەر هێندەی گەیشتمەوە هەولێر پزیشکێکی عارەبم هەنارد تا چارەسەری بکا. هەواڵێکم لە پزیشکەکەوە پێگەیشت کە گوایە باری تەندروستی مەتر سیدارنیە، بەلاّم گلەیی لەوە دەکا و دەڵێ(چون وەك دڵسۆزێکی (صالح) بمێنمەوە کە نەچەکم هەیە و نە ئەسپ؟) بۆیە هەر یەکسەر تفەنگێکم بۆ ڕەوانە کرد و، ڕێو شوێنی پێویستم گرتەبەر تا قەرەبوی ولاّخەکەی بۆ بکرێتەوە.

شتی دووەمی کە هەر دوای گەڕانەوەم کردم ئەوەبوو کە بەدوای باویلاغادا گەڕام و، زانیم کە ڕۆژی پێشتر لە شارەکە ڕایکردوە، هەر چەندە دەرباز بونی خەمی پێدام بەلاّم دڵم خۆشبو کە ئەو پیاوە پیرە بەدبەختە ئێستا دەتوانێ خەمی خۆی بەبادا، کە حەسرەت داّی دەگوشی، بەوەی کە خانەوادەکەی و نوریی خۆشەویستی ببینێ.

دیتم بارودۆخەکە لە هەولێر جێگەی دڵنیایی و ئارامی نیە و کەشەکەش پڕ لە پروپاگەندەی ئەوە بوو کە ڕەنگە پشێویەکانی کەرکوك ببنە شورشێکی توند و لەم زوانە ڕوبدەن. هاندەرە نهێنیەکانیش لە چایخانەکاندا چالاك بون و هانی

خەڵکیان دەدا بۆ شۆڕش و روبەڕوبونەوەی حکومەت. حاجی ڕەشید کۆمەڵی فەرمانبەری دامەزراند تا شوێنی فەرمانبەرەکانی من بگرنەوە و هەموو ئەوانەی داشیمەزراندن چەپخونەکان بون(ئۆبالّ بەملی نوسەر: و. ع) و جەماوەر یەك هەفتە لەگەڵیاندا هەڵینەکرد. سەید عەبدوڵڵا ئاغای بەلای خۆیدا ڕاکێشا چونکە وادەی پلەی فەرمانداری پێدابوو. ئەو بەبێ پشتیوانی عەشایەر هیچی پێنەکرا، بەلأم ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود بەبەردەوامی گوێ لەمستی ئەو بون ، ئێستا، سەردانی(بەحرکە) یان کردبو بۆلای جەمیل ئاغا، پیلانێکیان لەبەر دەستدابوو.

بە پێی بۆچونی من ئەوان بەڕاستی هیچ پلانێکیان دانە نابوو بەلأم تەنیا لەسەر بەربەرەکانی حکومەت ڕێککەوتن لە کاتی ئێستادا و بە شێوەیەکی نهێنی، ئەگەر هەلیش هاتە پێش ئەوا بە ئاشکرا دەیکەن، لە کاتێکیشدا کە شتێکی ئەو تۆ لە کەرکوك و موسڵ ڕوینەدا ئیدی هەستم بە ئارامی و دڵنیاییەکی تەواو دەکرد.

ئەو ڕۆژەش، مەبەستم پازدەی ئابە، ڕۆژی یەکشەممە بوو، یەکشەممەو هەینی لە نوسینگەی مندا ڕۆژانی پشوبون، بەیانیەکی حاجی ڕەشید هەناردیەلای پیرە قازی و داوای لێکرد: (ئایا بەدرێژایی ئەو ڕۆژە کار دەکەی؟) قازی وەلأمی دایەوە(نەخێر، یەکشەممەیەو ئێمە لای نیوەڕۆکەی دەڕۆین.) ئەویش پێی وت: (بۆ یەکشەمە نیوەڕۆکەی دەڕۆن، یەکشەمە پشویەکی موحەممەدی نیە، ئێستا من فەرماندارم، بڕۆ بە هەمو فەرمانبەران بڵێ بە درێژایی ڕۆژ لەسەر کارەکانیان بەردەوامبن و لە نیوەڕۆوە فەرمانگە بەجێ نەهێڵن). قازی وەلأمی دایەوە: (باشە، ئەگەر ئەوە ئارەزوی تۆیە، بڕۆ لەسەر پلیکانەکان بوەستەو لە کۆتایی هاتنی دەوام مەهێڵە بچنە خوارێ. منیش هیچ ناکەم.)

ئەو ڕۆژە، بە تەلەفۆن، لەسەید عەلیەوە لە باتاس هەواڵێکی خۆشم پێگەیشت کەوا (حارس ئاغا) دەستگیر کراوە و دەست بەسەر ژمارەیەك چەکدا گیراوە. تەنیا بە خۆی و بیست کەسەوە لە زێی ڕەواندوز پەڕینەوە و، دەوری ماڵی ئەو سەرۆکە بیاویەیان گرت. ئەو دەمای خەوتبو، کە دێتە دەرەوە بزانێ چ باسە لەگەڵ دوسێ دەست و پێوەندی دەگیرێ و دەستیان دەبەستنەوە و بە پەلە دەنێردرێنە ڕەواندوز. بە سەید عەلیم وت کە بەندیەکان ڕەوانەی هەولێر بکاو تێم گەیاند کە لە باتاس بمێنێتەوە و ژمارەیەك لە پیاوانی قادر بەگ و مستەفا ئاغا

کۆبکاتەوە و هێرش بکاتە سەر نوری. وەبە هۆی کۆچکردنی حەماغاوە دەبوایە سەردانی کۆیە بکەم، بۆیە دەست واڵام کرد تاکو ئەگەر بتوانێ ئەو جۆرە ڕێو شوێنانە پیادەبکا.

لە بەیانیەکی شازدەی مانگ بەیاننامەیەکی بێ مۆر لە شاردا دەرکەوت کە بانگێشتی موحەممەدیە پیاوچاکەکانی دەکرد (ڕاستتر موسڵمانە باوەڕدارەکان: و. ع) داوای لێدەکردن شۆڕش دژی حکومەتی کافران بکەن. لە هەمانکاتیشداداوەتی مەولودی پێغەمبەری دەکردن، کە جۆرێکە لە کۆبونەوەی ئاینی – سیاسی، بەمزوانە لە مزگەوتی کەرکوك و هەزاران کەس لە بڕوا دارانی چەکدار ئامادەی دەبن. ئێستا بڕیاری ئەوەمدا کە هەندێکیان دەسگیر بکەم، بەلام حەزم دەکرد ئەگەر بتوانم هەندێ پیاو ماقولانی شار هاوبەشی پێبکەم. بۆیە هەموانم بۆ کۆنگرەیەك بانگ کرد، تەنیا حاجی ڕەشید ئاغای لێدەرچێ. دوای ئەوەی سوپاسی پیرۆزبایی دەربازبونەکەی گەلیم کردن، ئاماژەم بۆ پشێویەکانی باشور کرد (مەبەستی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ عێراقە: و. ع) لەگەڵ ئەو کۆبونەوە نهێنیانەی کە لە شارەکەدا دەبەسترێن. دواتر پرسیاری ئەوەم لێکردن کە ئایا پێیانوایە لەبەرژەوەندی کۆمەڵگایە، ئەگەر گێرەشێوێنەکان لە قوڵایی بەندیخانە توند بکرێن، یان لە شار دەربکرێن. لەگەڵ ئەوەی کە وەڵامی چاوەڕوانکراوی هەمویان (بەڵێ) بوو، ئەگەر بەچرپە یان بە نهێنی ئاراستەیان بکرا بوایە، کەچی هەمویان خۆیان لە بەئاشکرا دەربرین بە دورگرت، تەنیا(عەلی پاشا) نەبێ، ئەو بە سوێوە وەڵامی ڕازیبونی دایەوە، ڕەنگە ئەوەش بۆ شاردنەوەی هەستی دژ بە حکومەت بوبێ، کە هەستێکی توندبوو، پێشنیاری ئەوەشی کرد کە تەنیا ئاگادار کردنەوەیان بەسە کۆبونەوەکە تەواو بوو یەکسەر چوار لە هەرە گێرە شێوێنەکان دەسگیرکران. دوانیان خرانە تاریکایی زیندان و دوانەکەی دیکەش ڕەوانەی دەرەوەی شار کران. ئەمەش کاریگەریەکی نایابی هەبوو. حاجی ڕەشیدئاغا بە ڕەو گوندەکەی کە لەسەر ڕێی گوێڕ بوو کشایەوە و گوایە گلەیی لەوە هەبوو کە هەولێر، لەو وەرزەی ساڵدا بۆ تەندروستی باش نەبوو، قسەو قسە لۆکی هاندەرانەی شۆڕشگێریش لە چایخانەکان بڕان. وەبە تێڕوانینی ئەو گفتوگۆیانەی کە لە پەرلەماندا کران (پەرلەمانی ئینگلیزی: و.ع) تاڕادەیەکی زۆر بیروباوەڕی

ئەوە هەبوو کە خەریکە ئەو ولاتـە چۆڵ بکـەین. هـەر ئـەو بۆچـونانەش بـون کـە عەشیرەتەکانی و کۆمەڵگە ناوخۆییەکانی، کە تا ئەودەم لایەنگیری حکومەت بون، هانـدا پەنجـە لەگـەڵ شورشـگێرەکان گرێـدەن، هەرچـەندە ئـەو پەیوەندیەشـیان بەهێزتر بوایـە ژیـانی حاکمـە سیاسـیەکان پـتر دەکەوتـە بـەر مەترسـی. تائێـستا دەستە پاسەوانێکم لەگەڵ خۆدا دەبرد کە دویان سێ ژاندارمە بـون و ئەوەنـدەش بەس بوو بەچەکداریش دەرنەدەچوم. کەچـی ئێـستا هاوڕێکـانم پێیـان وتم وریـای خۆت بە لە پیاوکوژان. خەڵکێکی زۆرم دەناسی کـە خـاوەنی بیرکردنـەوەی هـێمن بون، باشم دەناسین، بەلام ئامادەبون هیچ هەلێك لە دەست نەدەن بۆ لە ناوبردنم، بۆیە، تەنانـەت لـە کـاتێ کـە لەماڵـەوەڕا دەچـومە فەرمانگەکـەم، نزیکـەی شـەش ژاندارمەم لەگەڵدا بون هەمیشە دەمانچەیەکیشم لە گیرفاندا هەڵدەگرت. وە لەبـەر ئەوەی هۆکاری تەواویشم هەبوو بۆ ئەوەی گومانم لە ژاندارمـەکانیش هـەبێ، بۆیـە داوام لە خورشید ئاغا کرد کوڕەکەیم بۆ بنێرێ کە زۆر باسیان دەکـرد و ناوبـانگی بـەوە هـەبوو کـە چـەپخوێکی کرێگرتەیـە و نـاوی(سمـە قـولی) بـوو (ئـەوە کـوڕی خورشید ئاغا نەبووە، بەڵکو خزمەتکار یان پیاوی ئەو بووە) لەگـەڵ پێـنج پیـاوی ئـازای دیکـە تایبنـە پاسـەوانی تایبـەتی هەمیـشەییم. ئێـوارەی شـازدەی مـانگ بروسکەیەکم بە کۆد (شفرە) پێگەیشت کە لە (حاکمی گشتی پادشاییەوە) هاتبوو (Civel Commissioner) ناوەڕۆکەکەی شتێکی ئـاوابو :(ماڵەکـەی حـاکمی سیاسـی خانـەقین و نوسـینگەکەی سـوتاون و چـاوەڕوان دەکـرێ لـەوێ ڕابکـا. بارودۆخەکـە لەسـەر زێـی دیالـە زۆر مەترسـیدارە، دەسـتە سـەربازیەکان گـەمارۆ دراون و، پردەکان ڕوخێنـراون و هێڵـی شـەمەندەفەر زیـانی بەرکـەوتوەو، بەسـەر شـاری باقوبـەیان داداوە و هێـرش کراوەتـە سـەر ئۆردوگـای پەنابـەران. ئەگـەری گێڕانەوەی هۆکارەکـانی گەیانـدن تـا ماوەیـەکی دیکـە نیـە، چـونکە سـەرباز نیـە عەقیـد(لـچمان) کـوژراوە و، لیـوای دلێمـیش ئێـستا لـە وروژاندایـەو پـشێوی بـاڵی بەسەردا کێشاوە. ئەگەر توشی ئاستەنگ ببی. تا توانین تەنانەت بەیەك فرۆکـەش یامەتیت بدەین، هەر هەنجەتێکی بۆت دەکرێ دروستی کـە بـۆ ڕەوانـە کردنـەوەی ئەو فەرمانبەرانەی دەتوانی دەسبەرداریان ببی) . سەرەڕا ئەو هەواڵە تۆقێنەرەش هێشتا بێ خەمم لەوەی کە هیچ شتێکی مەتر سیدار لـە لیـوای(پارێزگـا)ی هـەولێر

ڕونەدا. (بنەماڵەی بایز) لە عەشیرەتی دزەیی دەشتەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو، لێشیان دڵنیابوم. وەك چۆن باوەڕێکی قوڵیشم بەوە هەبوو کە پەنابەرەکان دەتوانن سنورێك بۆ سەرکێشی سورچییەکان دانێن، بۆیە بە پێویستم نەزانی ڕەواندوز چۆڵ بکەم و بەرهەمی هەولێ و کارێکم وێران بکەم کە هەشت مانگی خایاند بوو، لە کاتی پیادەکردنیدا ڕوبەڕوی کۆمەڵێ مەترسی ببومەوە. بەهەر حاڵ. دەستم بە هەناردنی ئەو پارە زیادانەو فەرمانبەرە بەریتانی و هیندیانە کرد بۆ کەرکوك و موسڵ کە زۆرم پێویست بەخزمەتیان نەبوو.

ئەحمەدە فەندی سەرۆکی شارەوانیش، وەك عادەتی خۆی، لە هەمو ئەو ئاستەنگانەی کە دەهاتە پێشم ڕاوێژ کاری سەرەکیم بوو. لە حەڤدەی مانگ نانی نیوەڕۆم لەگەڵداخوارد، لە کاتێکدا خۆی و(شێخ مەعروف)ی خەزوری ڕێو شوێنی بە سەلامەتی گەیشتنە کۆیە یان بۆ دابینکردم. چونکە دەمویست ڕۆژی دواتر سەردانی ئەویێ بکەم، تا بزانم کاریگەری مردنی حەماغا چیە لەسەر بارو دۆخەکەی، ئەمەش بۆ من کارێکی زۆر پێویست بوو. بەر لەڕۆیشتنم بەتەلەفۆن بەدرێژی قسەم لەگەڵ سەید عەلی کرد، بە هۆیەوە توانیم ئەوە بزانم کە ئەو پلانانەی بۆ هێرشکردنە سەر نوری دانراون زۆرکەم چونەتەپێش، کە ئەمەش زۆری توڕەکردم، جارێکی دیکە لێم دوپات کردەوە کە من هیچ بزوتنەوەیەکی عەشایەری گەورەم ناوێ، ئاگاداریشم کردەوە کە دەبێ هەموو شتێك بەر لە جەژن، کە دەکەوتە(٢٥)ی مانگ، تەواو بکرێ، چونکە ئەودەم عەشیرەتەکان بەدڵنیاییەوە پیادەکردنی هەموو هەڵمەتێك ڕەتدەکەنەوە.

شەوی هەژدەی مانگم لە(هەڵەجە) لەگەڵ شێخ مەعروف بەسەر برد کە دیتم هاوڕێیەکی نزیك و مرۆڤێکی نیاز پاکە، پیرە مێردێکی بەقسەیە، دەم بەخەندەو گەشبینە و لە خواترسە و بەدینە. دەستەیەك لە منداڵەکانی و ئامۆزاکانی ڕۆژی دواتر لەگەشتەکەی کۆیە ڕەگەڵم کەوتن، لە ڕێگا بۆ نانی نیوەڕۆ لەلای کەریماغا لە بنکەی ناوچەکەی وەستاین کە ناوی (گۆمەشین)ە. کەریماغا سەرقاڵی وەرگرتنی باج بوو وتی کە یاساو ڕێکو پێکی لە هەمو شوێنێك بەرکەماڵن. تاکە کەسی کە کێشەی بۆ دروستدەکرد شێخ محەمەد ئاغا بوو کە لە هۆزی گەردی بوو

بە(دەبەنگ) دەناسرا — (ئۆباڵ بە ئەستۆی نوسەر: و. ع) ئەمەش بەهۆی روخسارو ئەقڵی.

دیتم(برادشۆ) دڵخۆشە، هەرچەندە تازە هەواڵی ئەوە گەیشتبو کە (کفری) ئێستا لە ژێر دەستی عەشایەریەکانە و (نەقیب سامۆن) یارمەتیدەری حاکمی سیاسی لەوێ بەندکراوە. تاکە کێشەی کە ئێستا لە ئارادابوو کێشەی خزمەکانی(حەماغا )بو و پەیوەندی بەموڵکەکانیەوە هەبوو. (ڕەسوڵ ئاغا)ی برازای، کە پیرە مێردێك بوو دو تەمەنی کرد بوو، (٨٠) ساڵ بوو، لوتێکی سورهەڵگەڕاوو، جەستەیەکی لەرزۆکی هەبوو، شەیتان لە چاوەوی فریشتە بوو، لە ناوچەی ڕانیەوە هاتبوو و سوربو لەسەر ئەوەی لە پرسەی کۆچی دوایی ئەو پیرە مێردەدا ئامادەبێ. دوای ئەوەی بەهێمنی لە گۆڕەکەیدا ڕاکشا، تەنیا داوای سەرۆکایەتی خانەوادەی غەفوری نە کرد و بەس، کە خانەوادەیەکە پەیوەندی پێیەوە هەیە، بەڵکو داوای بەشێکی زۆری سەرو سامانی حەماغای کرد و، وتی کە بە درێژایی چەندین ساڵ بە زۆرداری و دوژمنکاری لێی بێبەش کراوە. داوای چەند دوکانێکی کرد لەگەڵ دیوەخانەکەی خودی ئاغا پیرەکە و وتی(دەبوایە دوای مردنی باپیرەی بدرێتە باوکی) ئەو باپیرەش بەر لەیەك سەدە و بگرە زیاتریش دەبو، مردبوو. گوێم لە هەردو لایەنی کێشە کە ڕاگرت دیتم مەتران (مەبەستی مەلای گەورەیە) و هەمو پیاو ماقوڵان لەسەر ئەوە کۆکن کە بەپەلەترین شێوە (کۆیە) لەو پیاوە ناحەزە دەرباز بکرێ. ئەوان توانیان لە دیوەخانەکەی حەماغا دەریکەن، بەڵام شوێنێکی دیکەی دۆزیەوە و لەگەڵ دوژمنی دێرینی، واتە عەبدوڵڵا ئاغا ڕێککەوت، کە لە ئایاردا ڕێگەی پێدرابوو لە بەغدا بگەڕێتەوە و، هەر چەندیی باری سیستەمی حکومەت خراپتر بوایە، بە هۆی ئەو هەواڵانەی دەهاتن، دیوەخانی ئەو دوپیاوە سەردانیکەری پتر دەبوو.

لەگەڵ ئەوەی کە مەترسیەکی ئاشکرانەبوو، گومان لەوەدا نەبوو ئەگەر پشێوی باری ناوچەکانی دەوروبەر بگرێتەوە، ئەوا ئەو دوپیاوە لە هەموپیاوانی شارۆچکەکە بەهێزتربون. جەمیل ئاغا کە پیاوێکی باش و دڵسۆز و لایەنگیری حکومەت بو ئەو کەسایەتیە مەعنەویەی نەبوو کە بەهۆیەوە بتوانێ ڕوبەڕوی گەردەلولەکە ببێتەوە و خۆی لەبەرامبەر ڕاگرێ. هەر دوای مردنی حەماغا یەکسەر

کرایە فەرمانڕەوای شارۆچکەکە، بۆ ئەوەی عەبدوڵڵا ئاغا دەستی پێڕانەگا. لە کاتێکدا رەسول ئاغا و هەندێ لە ئاغاکانی دیکەی خانەوادەی غەفوری داوای مافی ئەوەیان دەکرد کە وەك یارمەتیدەری دامەزرێن، بۆ ئەوەی دەستەکەی ئەوانیش نوێنەریان لە حکومەتدا هەبێ، ئەوەیان لەبیر نەبوو کە حەماغا و لاوازیەکەی پێویستیان بە یارمەتیدەر هەبوو، لەکاتێکدا کە جەمیل ئاغا بەبێ یارمەتی دەیتوانی ئەرکەکانی جێبەجێبکا. بەهەر حاڵ، بە هەندێ دوپاتکردنەوە هانم دان کە، کاتێ سەرکەوتودەبن لە یەکلاکردنەوەی کێشە خانەوادەییە کانیان، سەیری داواکانیان دەکرێ.

هەر یەك لە(مەلا ئەحمەد ئاغا)ی برازای حەماغا، کە دەموچاوی دەتگوت کاوڕە (ئاوا: و.ع)، و برازا لاوازەکەی(مەلا حەوێز) لە چەسپاندنی پێگەی خۆیان سەرکەوتوبون و وەك کۆڵەگە بە هێزبون و، لە دیوەخانی پیرە پیاوەکە نیشتە جێبون. توانیان کوڕە قەڵەوە بچوکەکەی بەخۆوە بگرن، کە تەمەنی هەشت ساڵان بوو، ناوی(محەمەد زیاد)بوو لە هەمو شوێنێك وەك سەرۆکی خانەوادەکە و جێگرەوەی ئەو پیاوە مەزنە پێشانیان دەدا. بە گورزێك توانیان ڕەسوڵ ئاغا ببەزێنن. ئەگەر هەر یەکێکیان، بون، یان زیرەکیان هەبوایە، ئەوا هەلۆیستەکەیان بەدەستەوە دەگرت، چونکە لەهەموو پیاو ماقوڵانی دیکەدەوڵەمەندترو، بە دەستوپێوەند تربون. لەگەڵ ئەوەی دوو ئافەریدەی ساویلکەبون کەچی لە تەنگترین ڕۆژەکاندا لەسەر ڕێوشوێنی حەماغا ڕۆیشتن و لەسەر پێشگیری حکومەت جێگیربون. ڕۆژی دوتر لە پرسەی حەماغا ئامادەبوم. هەمو خزم و پیاو ماقوڵەکان ئامادەبون تەنیا(عەبدوڵڵا)ی لێدەرچێ. لەو بەرهەیوانە دانیشتین کە بۆ دواجار تیایدا چاوم بەو پیرە پیاوەکەوت. کوڕەکەی منداڵێکی جوان بوو، هەرچەند کەمێك قەڵەو بوو، کورسیەکی لەلای سەرەوە داگیر کردبوو وەك میرێکی چکۆڵە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا. وەك باوە، سۆزداری خۆم لەبەرامبەر عەشیرەت و خزمانی و ئەو زیانە گەورەیە دەربڕی و، باسی چاکەکانی خوالێخۆشبوم کرد. وادەر کەوت کە ئامادەبوان ئەوەندە گوێیان بەو شتانە نەدەدا، ڕەنگە لەبەر ئەوە بوبێ کە بە سەرەخۆشی و دڵدانەوە ماندوبون و، ئەگەری زیاتریش ئەوە بوو کە ئەوان بە مردنی ئەوپیاوە پیرە دڵخۆشبوبن و، هەر خێرا باس هاتە سەر باسی

کارە سیاسیەکان. دوای ئەوەی وتارێکم پێشکەش کرد کە دەربارەی باری گشتی بوو، ماڵئاواییم لە هەموان کرد و، کاتژمێر دوی دوای نیوەڕۆ لەگەڵ نەقیب برادشۆ ڕێگەی باتاسمان گرتەبەر، چونکە هەستم دەکرد بونی من لەوێ کارێکی پێویست و بەپەلەیە.

ڕێگایەکمان گرتەبەر کەپێشتر باسکراوە و، بە ناوی(جەلی)دا تێپەڕین و بە بناری ڕۆژهەڵاتی سەفیندا تێپەڕین، دوایی بە نازەنیندا بەرەو هیران تێپەڕین... من پێموایە کە ئەوە جوانترین ڕێگایە لە کوردستان پێیدا ڕۆیشتبم، چونکە دوای (جەلی) ڕێگاکە بە ناو توترك و قامیش و گوڵدا تێدەپەڕێ، پونگەکێویش لە هەمو شوێنێك هەوا پڕ لە بۆن دەکا. بەلای زەویەکی زۆردا تێپەڕین کە توتنی لێ کرابوو، ژنەکان سەرقاڵی چینی گەڵاکانی بون و لە گوندەکاندا دیتمان لەسەر تاوێرەکان داندراون و لەسەربانەکان وشك دەکرێنەوە. کە گەیشتینە هیران خۆرئاواببوو ئاسۆی خۆرئاوا سور هەڵگەڕابوو، عەلی بەگی موختار لەسەربانی ماڵەکەیدا میوانداری کردین، لەگەڵ ئەوەی کە خواردنێکی هاکەزایی داینێ و — ڕێبواران هەمیشە گلەییان لەوە هەیە کە ئەو گوندە ناندەر نین — کەچی وا دیار بوو لە هاتنی ئێمە زۆر دڵخۆشبوو، زۆری بەخێر هێناین و، هەر لەوێ زانیمان کە قادر بەگ سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێزێکی گەورەیە لە عەشایەرەکان بۆ جەنگی سورچیەکان و، ڕەنگە سبەینێ لە باتاس ببینینەوە.

کە دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە، ڕێگای سەرەکی شەقڵاوەمان نەگرت و بەڕێی دۆڵی بەرەکەیدا بەرەو دەشتی هەریر چوین. ئەو ناوچەیە ڕازاوەو جوانبوو، زۆریش چۆڵ بوو. لەگوندی(بەرەکە) ی (مام کاك) کە موختار بوو و بە تایبەت کابرایەکی قوشمە بوو، میوانداری کردین و، خواردنی بۆ ئامادەکردین و لە تەنیشت کانیەکدا خواردمان کە داربی سێبەریان بەسەردا کردبوو. موختار پێیگوتین کە هەموو ئەو پیاوانەی توانای چەك هەڵگرتنیان هەیە و لەو گوندەدان بە فەرمانی قادر بەگ دەستیان داوەتە چەك و گوندیان بەجێهێشتوە. ئەو کابرایە خۆشەویستیەکی بێ خەوشی زۆری نیشانداین و ئەوەشی ڕەتنەکردەوە کە لە جیاتی من بە هەر گوندێکی کە پێیدا تێپەڕین، ئەو چەکدار کۆکاتەوە.

هەر کە گەیشتینە باتاس سەرم سوڕما کە هەریەك لە قادر بەگ و سەید عەلی لەوێنەبون. چونکە یەکەمیان هێشتا نەگەیشتبوە ئەوێ و، لە کاتێکدا دوەمیان، وەك یەحیا بەگ وتی هەمو سورچییەکانی دەشتی هەریری کۆکردۆتەوە و بەرووباریدا پەڕاندونەتەوە بۆ شەڕی ئەو برایانەیان کە لەو بەری زێدان و هەواڵیشی بۆ قادر بەگ جێهێشتوە کە بە خێراترین شێوە، بگاتەلای.

لە باروددۆخی ئێستا زۆر دودڵ بوم(هەناوی پیاوی دادەخوریێنێ). یەکەم: ئاشکرابوو کە لە جیاتی هەر هێرشێك، خۆیان بۆ بزوتنەوەیەکی عەشیرەتی گەورە ئامادەکردوە، دووەم: ئەوەی جێگەی گومان نیە هەریەك لە نوری و سورچییەکانی ئاکریێ بەپلانەکانی ئێمە دەزانن و لە مێژە لیێ!ی ئاگادارن، بۆیە خۆیان بۆ بەرەنگار بونەوەمان ئامادەکردوە، سێیەم: (جەژن) نزیکبۆتەوە، وەك سەیریش دەکەم ناهێڵی هەرگیز بە کارێك هەڵسین و، چوارەم: ئەگەر سەید عەلی بەڕاستی سەروکاری سورچیەکانی کردبێ و لەزێی پەڕاندبنەوە، تاکو بەهێرشێك هەڵسن بۆ سەر براکانیان، ئەوا ئێستا هیچ سودێکی نیە. بۆ ئەو خاڵەشیان زۆربە پەرۆش بوم، بۆیە بڕیارمدا هەر ئەو شەوە بەرەو باردین سواربم: (باشترین کار لەنزیکەوە بەدەستدێ). پاسەوانەکانم زۆر ماندو و هیلاك بون، نەیاندەتوانی لەوەندەی ڕۆیشتبون زیاتر بڕۆن و، تەنیا هێزێکی کەمی فریاگوزاریشم هەبوو کە ئەندامەکانی لە (بەرەکە) و گوندەکانی دەوروبەریەوە هاتبون و عوبەیدوڵلا بەگی باشوری و یەکدو پیاوی ئەوم لەگەڵدابوو. ئەوەی دواییان ئامۆزای ساڵح بەگی کۆسەبوو کە سوێندی لێخواردبوو کە ئەگەر هەندێ گوندی دیاریکراو داگیرکا ئەوا دەیکوژێ، ئیدی بڕیاریدا کە ببێتە هاوڕێم. کاتێ پێشنیاری ئەوەم کرد کە پاسەوانم بۆ دەستەبەر بکرێ ئیدی پیاوانی بەرەکە دەستیان بەهاوار و نەڕاندن کرد، لە کۆتاییدا سەرکردەکەیان کە کوڕی(مامکاك) بوو ناچاری کردن دەست بە ڕۆیشتن بکەن، بەڵام ئاراستەیان بە شێوەیەك بوو کە ناچاربوم بیانگەڕێنمەوە. لە تاریکیدا بە شەو ڕۆیشتم و لە عوبەیدوڵلا و دوو ژاندارم بترازێ کەسی دیم لەگەڵدا نەبوو، کە عوبەیدوڵلاش زۆر پشتی پێ نابەسترێ. ئەمەش کارێکی خۆش نەبوو، چونکە زۆر ماندوبوم و ڕێگاکەش تاشەبەردبوو تەنیا دەمانتوانی لەسەر خۆ بڕۆین. خۆمان لە گوندەکان بواردوو؛ نیوەشەو گەیشتینە شوێنی مەبەست. لە ڕێگا تەنیا توشی

یەك پیاو بوین، کە ڕامانگرت تۆقی ولێمان پرسی: برادەر ئەوە چیتە. وتی کە لە پیاوانی شەوکەت ئەفەندیە دەچێتە ڕەواندوز شەکر بکڕێ. کاتێ گەیشتینە باردین ئەو(قەمبورە زۆڵە) گوتی من کەسم ڕەوان نەکردوە.

زۆردڵم خۆشبوو کاتێ دیتم سەید عەلی لە ڕوبار نە پەڕیبوەوە. ئەو ئۆردوی بە(٥٠) ژاندارم و سەرباز و(١٠٠) کەسی سورچییەکان، کە پێشتر کۆی کردبونەوە، دانا بوو، هەموشی بە هەڕەشە هێنابون. هەموسەرۆکە کانیشیان لەگەڵدابون، لەوانە: عەلی بەگ و تاجەدین ئاغا و عەزیز ئاغا، لە کاتێکدا شەوکەت ئەفەندی میوانداری میوانەکانی دەکرد(کە حەزی بە چارەیان نەبوو)، ئەو شەوە لە تەنیشت سەید عەلیەوە خەوتم، لە کاتێکدا هەمو سەرکردە سورچییەکان ئالقەیان بەستبوو لە دوری چەند یاردەیەك خەریکی پسەپس بون.

گومانی تێدا نیە کە سەید عەلی شەوکەتی(شکۆ)ی شکاندبون، بۆ ئەوەش گیانە جەربەزەکەی و بونی ژاندارمەی بە کارهێنابوو، گومانیشی تێدانیە کە ئەوانە لە کاتی دروستبونی هەر پشێوەیەك ڕابکەن. ڕەنگە گەیشتنی منیش بۆ ئەوان ناکاو بوبێ و بیرکردنەوە تەمەڵەکەشیان کاتی تەواوی نەبوبێ بۆ بڕیاردان بەر لەوەی ڕۆژببێتەوە: ئایا کوشتنی من ئاسانە یان نا؟.

زۆر دڵم بەوە خۆشبوکە عەلی ئەفەندیش درکی بەوە کرد بوو کە ئەو سەرۆکانە لەوە نزیکترن کە دژی ئێمە شەڕ بکەن نەك لەگەڵ ئێمە دابن و، پێیم وت کە لە باردین بمێنێتەوە و بە چاوی هەڵۆوە چاودێریان بکا. ئەو هەواڵانەی لەو بەری زێوە هاتبون دەیانگوت کە نوری و حەمادەشین چونەتە پاڵ شێخ عوبەیدوڵڵا لە بجیل، کە هێزێکی گەورەی لێیە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئێمە. بەرەبەیان چومە باردین و گەڕامەوە باتاس و هیچ شوێنەوارێکم لە ساڵح بەگ نەدیت لەوێ. هەر چۆنێك بێ نزیك کاتژمێر دەی بەیانی گەیشتە ئەوێ و مستەفا ئاغا و ساڵح بەگ و ڕەشید بەگ و ژمارەیەکی زۆری سەرۆکە پلە دووەکانی لەگەڵدا بوو چەند هێزێکی فریاگوزاری عەشایەری یان بەدواوەبوو بە درێژایی ڕۆژ بەردەوام دەهاتن.

هەمو سەرۆکەکان هاتن، ژمارەیان نزیکەی(١٧)کەس دەبوو، لە ژورەکەی یەحیابەگ لە دەورم دانیشتن. باسیئەو جوڵانەوانەمان کرد کە هیوای پیادەکردنیان دەکرا و قسەکانمان تەم و مژاویی بون، دوای چەند خولەکێکی کەم

وتی: قادر بەگ و سێ سەرکردە گەورەکەی دیکە دەیانەوێ کۆنکرەیەکی تایبەتیم لەگەڵدا ببەستن. بۆیە لەگەڵیاندا چومە ژوری نوسینگەکە و لەسەرەوە دانیشتم و مێزێکی لەبەردەمدابوو، لە کاتێکدا ئەوان لەسەر قەنەفەکانی کە لەلایەکی ژورەکە دابو لەلای ڕاستم دانیشتن. خەریکبوو چاوەکانی قادر بەگ لە سەری بێنەدەرەوە، ڕەشید بەك و سالّح بەگ شەرمێون و بێزاردیاربون، نەیاندەتوانی سەیری ڕوی من بکەن، لە کاتێکدا دودڵیەك بە مستەفائاغاوە دیاربوو بە درێژایی کات هەستی لێراگرتبوم و شڵەژانێکی دەرونی پەرێشانی کردبوو. ئیدی قادر بەگ دەستی بە قسەکردنێکی درێژی بێ سەروبەر کرد، تیایدا وتی، کە ئەوو هەر دوبرا سەرۆك عەشیرەتەکەی هەمیشە ئامادە بون بۆ گوێڕایەڵی هەر فەرمانێکی بۆم دەرکردبن هەر چەند ئاسانیش بوبێ، ئەوان هێزێکیان کۆکردۆتەوە کە (٤٠٠) کەس دەبێ، بەلاّم لەوەدا دوچاری ڕێگری مەلاکان بون کە بانگەشەی ئەوەیان کردوە کە شەڕی موحەممەدی و موحەممەدی شەرعی نیە، ئەگەر بە فەرمانی حکومەتێکی گاور دەرچوبێ، ئەوەش کارێکی پتر سەرشۆڕانەیە ئەگەر لە ڕۆژی جەژنی قوربانیدا ڕوبدا و لەجیاتی قوربانی دیاریکراویش خوێنی باوەڕداران بکرێتە قوربانی خواوەند. وتیشی کە ئەو و دوبراکەی لە زۆر مەلایان داوە و خستویاننەتە کونجی زیندان و، ئەوان ئامادەن فەرمانەکانی من جێبەجێبکەن ئەگەر پێچەوانەی شەریعەتەکەشیان بێ و(ئاوا! : و. ع) دژی فەتوای دەسەلاّتە ڕۆحانیەکانیشیان بێ(ئاوا: و.ع) و ئەوان لە پێناوی مندا ئامادەشن ببن بە کافر(ئاوا: و.ع)، بەلاّم ئەوان ناتوانن ئەوشتانە دەرخەن کەلە دڵی پیاوەکانیاندایە. ئەوان ئامادەن، ئەگەر فەرمانبدەم، کە سەرکردایەتیان لە پەرینەوەی زێ بکەم، بەلاّم ئایا ئەوان لەوبەر لەژێر قورسایی هەڕەشەی ئاگرێکدا نابن وەك کلّپە ڕوبەڕویان دەبێتەوە؟ ئەوان خۆیان لە کارەساتێك دەپاراست کە شەرمەزاری و ڕو ڕەشی دەکردن، ئەوانیش وەك ڕۆڵەکانی عەشیرەتەکانیان ئەودەم بۆ تا هەتا لەبەر چاوم دەکەون، ئەو دەم کە گوێم لەوتەکانی بوو دڵم گوشرا، ئەمەش لەنائومێدیان نەبوو — چونکەمن بەپیادە نەکردنی ئەو کارانە بەو پێوەرەی کە قادر بەگ خۆی بۆ ئامادەکرد بوو دڵ خۆشبوم و، چەندین ڕۆژیش بوو پێم وابوو کە جەژن دەبێتە کوسپێك — بەلاّم بە غەریزە هەستم بەوە دەکرد فێڵێکی چالاك لە ئارادایە. چاوە سورەکانی ئەو

وئەوسیما شەرمێونەی هاوڕێکانی وایاندە گەیاند. لێم پرسی: پێی وایە کە چ ڕێچکەیەك بگرین تا ئابڕومان بپارێزین؟ ئەودەم ئەوەی لە ئەستۆ گرت کە بۆ ئەو عەشایەریانەی کۆببونەوە رونبکاتەوە کە نایەوێ لە ڕۆژانی جەژنی گەورەدا لە ماڵەکانیان دوربن و، من فەرمانم داوە هێزە کە بڵاوەی پێبکرێ و کارەجەنگیەکانیش دوابخرێن. لە هەڵوێستی گومانـاوی سورچیەکانی دەشتی هەریر ئاگاداری کردمەوە و بەتایبەتیش باسی عەلی بەگ و شەوکەت ئەفەندی کرد و پێشنیاری ئەوەی کرد داوا لە سەرۆکەکانیان بکەم بێنە باتاس و نیەتەکانی خۆمیان بۆ ڕون بکەمەوە. بەڵێنی ئەوەشیدا کە بەبۆنەی جەژن هەمویان داوەتی شەقلاوەبکا و بەڵێنی ئەوەشیدا کە بەر پرسیاری هەڵسوکەوتە کانیشیان بێ. هێزەکەش کە(٤٠٠) کەس بوو تاسبەی بڵاوەی پێناکرێ، ئەمەش بۆ ئەوەی کاتی تەواوم هەبێ بۆ بانگێشتکردنی سەرۆکەکانی سورچیان و پیادەکردنی ڕێو شوێنی ڕێگر لە دروستبونی شۆرش لە ناویاندا. بە پێشنیارەکانی ڕازیبوم و خۆی و هاوڕێکانی جێیان هێشتم، منیش بیرم لە لاوازیەکانی بارودۆخە خراپ و شڵۆقەکە دەکردەوە. مستەفا ئاغا توانی بەتەنیا بمبینێ، بەڵام هیچ زانیاریەکی پێنەدام بەڵکو ئاگاداری کردمەوە کە پێویستە سبەینێ زۆر زو لەگەڵ ئەودا ڕێگای هەولێر بگرینەبەر. دەمویست سەردانێکی خێرای ڕەواندوز بکەم، تالە بارودۆخی ئەوێ دڵنیابم، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو گوێ لە هیچ شتێ بگرێ دەربارەی ئەو بیرۆکەیە، بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەگەر من شتێکم بەسەر بێ ئەوا هەموو لیواکە(پارێزگاکە) دەکەوێتە بارودۆخێکی شڵەژان و بێ سەروبەری. بۆیە پێم باشتر بوو کە بگەڕێمەوە بنکەکەم، هەناردمە دوای سەید عەلی کە هەرئێستا لە باتاس بگاتەلام و هەمو ئەو ئاغا سورچیانەش کە دەتوانێ کۆیانکاتەوە لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێ.

ئێستا بیرم لە چۆڵکردنی ڕەواندوز دەکردەوە، یان بەهەر حاڵ، لە کێشانەوەی بەشی هەرە زۆری (سەربازەکان )بۆ باتاس. نەقیب لیتلدیل زۆر سەرسوڕمابوو لەو پێشنیارەم کە بە تەلەفۆن پێم ڕاگەیاند، ئەو زۆر دڵنیابوو لەوەی کە سورچیەکانی ئاکرێ ناتوانن ڕوبەڕوی هێرشێك ببنەوە کە هەرهێزێك بیکا، سوریشبو لەسەر ئەوەی کە هەرچی ڕویدا یان ڕودەدا، نابێ بڵێن بەریتانیەکان ترسی نوری

وایلیکردن بە پەلەو بێ کۆشش لە ڕەواندوز بڕۆن، بۆیە بڕیاری ئەوەیدا بە پتەوی لەوێ بوەستی. لیتلدیل پرسی ئەوەی کرد کە ئایا دەتوانێ بێتە هەولێر، دەبوایە مانگانە بێتە هەولێر بۆ ئەوەی کاروباری سەربازەکان و پۆلە (٥) نوێیەکە بەسەر بکاتەوە. دوای دودڵیەکی زۆر موڵەتی هاتنم پێدا و پێشم وابوو کە لەکاتی جەژن و ئەو ڕۆژەکەمانەی دوای جەژن ئەگەری ئەوەنیە هیچ کارێکی دوژمنکارانە بکرێ و، ئەو دەتوانێ بەر لە خراپ بونی بارودۆخەکە بگەڕێتەوە. نانی نیوەڕۆم لەگەڵ(یەحیا بەگ)دا خوارد و، لە کاتێکدا دوای ئەوە چوم لە ژورەکەمدا پشوێك بدەم لە خوارەوەی ژورەکە گوێم لە هەرایەکی زۆر بوو. دەرگاکەم کردەوە دیتم خەریکە ژورەکە لە دوکەڵدا نوقوم ببێ، وا دیاربوو کە هەندێ توتن لە ژورێکی خوارەوە ئاگری گرتبوو، بەپەلە هاتمە خوارەوە، دیتم ماڵەکە بە خەڵکە عەشایەرەکە دەورە دراوە و هاواریان دەکرد. باشبو کە قادر بەگ لەناویاندا دەرکەوت و من و ئەو توانیمان خەڵکەکە کۆنترۆڵ بکەین. باشبو هەر خێرا ئاگرەکە کوژێنرایەوە و، گەڕامەوە ژورەکەم. دوایی مستەفائاغا تێیگەیاندم کە توتنەکە بە ئەنقەست سوتێنرابوو، بە هیوای ئەوەی لە ماڵەکەدا بسوتێم، ئەگەر ئەوەش ڕوینەدابا هەلێکی دیکە لە ئارادا هەبوو، مەبەستم ئەوەیە کە لەو هەراو زەنایەدا بمکوژن، کە بە دڵنیاییەوە دوای ئاگرەکە پەیدا دەبوو.

هەر دوای ئەو ڕوداوە، پاسەوانەکانم کە سەر بە ڕۆڵەکانی عەشیرەتی دزەیی بون، بە سەرۆکایەتی (سمە قولی) گەیشتن و بەهاتنی زۆر دڵخۆش بوم. ئەو سەرۆکەشیان بونەوەرێکی فزوڵی وردیلانەبوو، هەر خێرا بەچرپەو دەنگێکی خۆش دەستی بەقسەکرد و بەپەلە وتی: (عەلۆ) پێیوتم کە تۆ بەتایبەت داوای منت کردوە وشتێکی ئاساییە کە واز لە کارەکانم بێنم و بگەمەلات. ئەگەر فەرمانم بۆ دەرکەی، تەنانەت ئەگەر سەدان پاوەنیش زەرەر بکەم، دەگەمە لات. دەبوایە ببینی تێپەرینی ئێمە بە هەولێردا چ کاریگەریەکی هەبوو، هەریەك لە عەلی پاشاو حاجی ڕەشید ئاغا لە ترسان دەلەرزین، دەتوانم ئەوەت بە ڕاستگۆیی پێبڵێم دەرسێکیان دادەدەین. بەڵام تۆ لێرە چ دەکەی؟ هەرگیز متمانە بە عەشیرەتەکان مەکە، چەندی دەتوانی بە پەلە ڕێی گەڕانەوەی هەولێر بگرەبەر. متمانە بە عەشیرەتەکان مەکە، من ئەمەت پێدەڵێم، هەرگیز متمانەیان پێ مەکە). وازم

لێهێنا قسەبکا، دلنیاشم کردەوە کە، هەر هێندەی لـە توانامـدابێ بـەنیازم باتـاس جێبێڵم.

چەند کاتێکم لە بیرکردنەوە لە هەڵوێستی قادر بەگ بەسەر برد. پێم وابـوو کـە ئەو لە یەکێك لەو تێکەوتنانەی کە زۆرجا توشی دەبوو تێوەگلابوو. ڕەشید بەگ و ساڵح بەگ و(ئەحمەد مەدحەت)ی نوسەری باسی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەیان بۆ دەکرد کە بەریتانیەکان لە باشور دوچاری ببون و لە کۆتاییـدا توانیـان بیگەیەننـە ئـەو بـاوەڕەی کـە ئـەو گـرەوی لەسـەر ئەسـپی دۆڕاو کـردوە. خـستنەڕوی یارمەتیەکانی لە کاتی سـەردانی شـەقڵاوەمدا، پوخـت و بێگـەرد بـون، بـەڵام ئـەو چیرۆکانەی لەوکاتەوە بەسەر گوێچکەیدا دەبارین، وایلێکرد خـۆ ئامادەکردنـەکانی تا ڕۆژەکانی جەژن دوابخا، تابتوانێ پاساوێکی بۆ جێ بەجێ نەکردنی بەڵێنـەکانی هەبێ. کارەکە هەرچۆنێك بێ، ئەو پیاوە تا ئێستا لەژێر کاریگەری ئەو پەیوەندیـە دایە کە لە نێوانماندا هەیەو،پەیوەست بونی بەو حکومەتەی کە بۆ ئەوپایە باڵایەی ئێستای بەرزی کردبۆوە، لـە کاتێکدا کـە بـرا حەسـودەکەی و برادەرەکۆنەکـەی، پەیوەندیان بە بیرۆی ژەهـراوی ئەحمـەد مەدحـەت ئەفەندیـەوە هـەبوو(ئۆبـاڵ بـە ئەسـتۆی نوسـەر: و.ع ) ئـەوان باشـترین هەوڵیانـدا بـۆ گەنـدەڵ کردنـی و ئەنجەتیـشیان بـۆ ئـەوە ئەوەبوکـە: یـان ئـەو حکومەتـەی کـە ئـەو بەپلەکـەی قەرزاریـەتی دەڕۆخـێ، یـان، ئەگـەر مایـەوە، ئـەوان ئـەودەم دەتـوانن، بەسـەر شـۆڕکردنی ئـەو، دڵاریـی حکومـەت بەدەسـت بێـنن. چـەندین نامـە بەپێنوسـی ئەحمەد ئەفەندی بۆ ئاغاکانی سورچی لە بجیل و، بە ناوی قادر بەگەوە نوسـران، بەڵێنی ئەوەی پێدەدان تەنیا بە پەڕینەوەم لەزێ لە دواوەڕا هێرشم دەکاتە سەر، بەو جۆرە قادربەگ سیاسەتێکی دژبە حکومەتی گرتەبەر و، مستەفا ئاغـاش تاکـە کەسبو کە لەو کارە نابەجێیەی ئاگاداری دەکردەوە.

سـەید عـەلی نزیکـەی کاتـژمێر نـۆی بـەیانی گەیـشتە جـێ و، دو یـان سـێ ئاغـای سورچی لەگەڵدا بـوو، نـە عـەلی بـەگ و نـە شـەوکەت ئەفەنـدیان لەگەڵدا نـەبوو، ئەنجەتی نەهاتنیشیان هەبوو. هەر هێندەی ئەوان گەیشتن نامەیەکی تەلەفۆنیم لە نەقیب لیتلدیلەوە بە دەست گەیشت کە گوایە نوری لەسەر هەمان بەری زێیـە کـە ئێمەی لە سەرین. ئەم بەیانیە پۆستەچیەکەی لـە گـەلی ڕوت کـردەوە و دوایـی لـە

گوندێکی کە تەواو دەکەوێتە دەرەوەی شارۆچکەوە ون بوە، کە لەوێ ژنەکانی خۆی و ژنەکانی باوکیشی چونەتەلای.

دەبوایە ئێستا لەسەر ڕێگای گەڕانەوە بێ کە بەسەر چیای کوڕەکدایەو لەگەڵ کاروانێکی دورودرێژدایە. هەر هێندەی سەید عەلی گوێی لەو هەواڵە بوو خێرا گەڕایەوە باردین تا دەستەیەك ژاندارمە کۆکاتەوەو سەرقاڵی بکا. هیوام زۆر بەرز بۆوە، بەڵام هەلی سەرکەوتن زۆرکەم بوو. چونکە گوند هەموی لە پشت پیاوێکەوە دەوەستێ کە لە پێناو ژنەکانی خانەوادەکەی خۆی بخاتە مەترسیەوە.

ئەو ئێوارەیە کەمم قسە لەگەڵ ئاغا سورچیەکان کرد، لەسەربان خەوتم و، پاسەوانەکانم لە دەورم ئەڵقەیان بەستبوو، ئاغاکانی خۆشناو تۆزێك لێم دوربون. لە کاتی شەودا هەورێکی چڕ کۆبوەوە و ئەستێرەکانی شاردەوە وەك پشکۆی کوژاوە. بایەکی بەلورەلور هەڵی کرد و هەڕەشەی لە نوێنەکانمان دەکرد و لەسەر سەربانەکەی فڕێدا خوارەوە. دوای ئەوە بروسکاندی و گەواڵە پەیدابون و بارانێکی باش باری، ئەوە هەموی لەمکاتەی ساڵدا، شتێکی سەیربوو. ناچاربوین هەمومان بەپەلە بێینە خوارەوە، نوێنەکانمان لە ژورێکی خوارەوە ڕێکخست کە گەرمیەکەی وەك هاڵاوی ئاگربوو.

کە کازیوەی ڕۆژی دواتر ئەنگاوت گرژو دژبوو چیای هەریر هەوری ڕەش و زۆری بەسەرەوەبوو. هەموشتێك ئاماژەبون بۆ ڕۆژێکی شوم. بەیانیە زوەکەی بانگی ئاغا سورچیەکانم کرد پێم وتن کە بڕیارمداوە، وەك ڕێزگرتن و شکومەندیەك بۆ جەژنی ئەوان، هەموکارێکی سەربازی ڕاگرم زیاتریش جەختی ئەوەم لێ کردن کە بە ئامۆژگاری قادر بەگ بکەن کە خۆی خستۆتەبەر باری پاراستنی یاساو سیستەم لە هەمو دەشتی هەریردا. دواتر من بەدەشتەکەدا بەڕێکەوتم و پاسەوانەکانم و مستەفا ئاغام لەگەڵدابون. ئەودەم نەمدەتوانی ڕکابەری ئەو هەستە بکەم کە ئەمە دوا ماڵئاواییە لە باتاسی دەکەم و، مەترسیەکیش چاوی لێ زەقکردومەوە. یەکێك لە پیاوەکانی مستەفا ئاغا ئەرکی ڕێنیشاندەری گرتە ئەستۆ و بەڕێگایەکی پێچاوپێچی سەیری دا بردین، بەمەش خۆمان لەوەبە دورگرت. کە بە گوندەکەی عوبێد بەگدا بچین. بەرەو گوندی(پلێنگان) شۆڕبوینەوە کە چەند میلێك لە ماوەران دورە و لەلای خوارێی دۆڵی ڕوباری

شـەقڵاوەیە. مـستەفا ئاغـا بـەردەوام بـە(دەلیلەکـەی) ڕێنیـشاندەرەکەی دەوت: بۆچی بەو ڕێگایەمان دا دەبەی، ئەم ڕێیـە درێـژتر و سەختترە) . بـەڵام ئێمـە لـە ڕۆیشتن بـەردەوام بـوین و ئەمـەش بـۆ گەشـتێکی ئـاوا شـتێکی سـەیر بـوو. لـە پڵێنگان لە بانیژەی کوختێك پـشوماندا کـە سـەبەتەیەك ترێـی ئەرخـەوانیمان بـۆ هات، کە ژنێك لە دار مێوێکی چنیبوکە شۆڕببوەوە. تۆزێ لەوێ ماینـەوە و دواتـر لە پێشان خێراتر بەڕێ کەوتین و، تامی پـشومان نەچێـشت تاگـە یـشتینە کـۆڕێ. ئێستا زانیم کە ئاگادار کردنەوەکانی مستەفا ئاغا بۆ دەلیلەکەی کارێکی ئانقەست بوە چونکە ئەو، دەیویست لەسەر ڕێگایەکی کە کەسی پێدانەهاتوە پەلەم لێ بکا، بۆ ئەوەی لەومەترسـیانەم بپـارێزێ کـە ئـەودەم لـە هـەموو پـەناو سوچـێکی ئـەو گردانە دا خۆیان ماتدابوو.

چەند کاتژمێرێك لە کۆڕێ مامەوە و، لە هـەیوانێکی سـەر ترۆپکـی گردەکـەو نزیـك دیوەخان پشومدا. خواردنێکی بەپێزو نایابیان بۆ هێنـاین و دۆی لەگەڵدا بـوو کـە چـەند کلۆبـە فرێـك لەسـەری مەڵـەیان دەکـرد. کێخـوا عەبـدوڵڵا لـەوێبوو بـۆ بەخێرهێنانم هات، ئەمەش دوای ئـەوەی قـەرەبوی زیانـەکانی کرابـۆوە. هـەروەها برایەکەی کانەبی هێنرا لام و، لەبەردەممدا سـوێندی خـوارد کـە تۆڵـەی برایەکـەی دەکاتـەوە. دوای ئـەوەی سوپاسـی مـستەفا ئاغـام کـرد لەبەرامبـەر ئـەو هـەموو دڵسۆزیەی لە بەرامبەر مندا نواندی، لەگـەڵ پاسـەوانێکی زۆرەوە بـەڕێ کـەوتین و ڕێگاکەم بەسەر گردەکانەوە بۆ ئاوی بەستۆرە شۆڕدەبوەوە کە ماشێنەکەم لـەوێ چاوەڕێی دەکردم. ئەمەش دوایین گەشتەکانم بوو بۆ ئـەو گـردە کوردیانـە کـە زۆر دڵگیربون لەلام، گردە جوانە ڕازاوەکان، کە زۆر جارکوشـتن و مردنـی ناکـاو لـەوێ خۆیان لە بۆسەناوە.

◆

# بەشی هەژدەهەم
# گەردەلولەکە تەقیەوە

هەموشتێك لە هەولێر هێمن و ئارام بوو(جەژن) هات و خۆشترین جەژن بوو کە خەڵك دیتبی؛ لە هەموو جەژنێکیش ئالۆ والآتر و خۆشتربوو. ئەو شارە پێشتر لە بارو دۆخێکی ئاوا پڕ ئاشتی و گەشاوە و ڕازاوە دەرنەکەوتبوو، شەقامەکانی پڕ لە منداڵ بون و پێکەنین و هەرایان بەرزدەبوەوە، گومانیشی تێدا نیە کە خەڵك بەگشتی هەستیان بە دڵخۆشی و ئارامی دەکرد. ڕۆژی یەکەمی،(٢٥)ی ئاب. هەموو پیاو ماقولآن و فەرمانبەران، وەك نەریت، سەردانی نوسینگەکەیان کردم و. منیش ڕۆژی دوایی سەردانم کردنەوە و حاجی ڕەشید ئاغام بەئانقەست پشتگوێ خست. لە ئەنجامی ئەو کارەمدا، کەس خۆی لەو کابرایە نەگەیاند و چەند ڕۆژێك کەس نەچوە دیوەخانەکەی، لە ئەنجامی ئەوەدا توشی ڕیسوایی بوو تکای چاو پێکەوتنی منی کرد ئەو جەختی لەسەر گوێڕایەڵی کردەوە، پێم وت! لەوانەیە هەلێکی دیکەت بدرێتی تابیسەلمێنی و، کارەکانیشتن واملێدەکەن کە لەگەڵتابم یان دژت بم.

لە کاتی عەسری ڕۆژی دووەمی جەژن سەردانێکی درێژی شێخی ڕۆحانی مستەفا ئەفەندیم کرد و زۆر پرسیاری دەربارەی ئاینی گاوران(المسیحی) لێکردم. تکاشی لێکردم کە دانەیەك لە کتێبی پیرۆزی بۆ بێنم (الکتاب المقدس) کە بە زمانێك بیّ بتوانیّ بیخوێنێتەوە، ڕۆژی دواتر، دانەیەکی عەرەبیم هەبو، بۆم نارد.

لە هەمانکاتدا هەندیّ هەواڵم لە سەید عەلیەوە پێگەیشت کە گوایە گەیشتۆتە خەلیفان و زانیویەتی کە نوری بەوێدا تێپەڕیوە. ئەویش بە ناوچەی سورچیاندا بە دوایداچوە، بەڵام نەیدۆزیوەتەوە. واپێدەچیّ کە کاروانە کە لە نزیك ساوێر، ولە

نزیك پێکگەیشتنی زێی و گەورەو ئاوی ڕەواندوز پەڕیوەنەتەوە، لە کاتێکدا کە دەستەیەکی زۆری سورچیەکان هەڕەشەی ئەوەیان دەکرد کە هێرش دەکەنە سەر بنکەی(باردین) بۆ ئەوەی ڕێگا لە هەناردنی دەوریە بگرن بۆ ئەو ناوچانە. فەرمانم بەسەید عەلی دا بگەڕێتەوە هەولێر و هێزێکی ژاندارم و شەبانە: (لیڤی) بەجێبێڵێ تا چاودێری جێگەی پەڕینەوەی لای باردین بکەن. نەقیب (لیتلدیل) یش لە(٢٥)ی مانگدا گەیشت. بەچیای (کوریك داغ) دا بەشوێن نوری کەوتبوو، بەلاّی نەیگەیشتبوێ، تەنیا چەند کاتژمێریکیش پێشتر چوبا دەیگرت.

فەرمانداری بروسکە لە ڕۆژی بیست و حەوتی مانگ پێیڕا گەیاندم کە پەیوەندی لەگەلّ باتاس پچڕاوە. پێم وابوو کە دەستەیەك لە هێرشبەران ئەو کارەیان کردوە، بۆیە برێکی کەمیژاندارم و پیاوێکم هەنارد ناچاکی بکەنەوە. ئێوارەی ڕۆژی(٢٨)ی مانگ لە مەخمور گەڕامەوە و زانیم کە سورچیەکان و(نوری) و (حەمادەشین) لە زێ پەڕیونەتەوە و بەهەموویان ژمارەیان سەد کەس دەبێ و هەموو عەشایەریەکانی دەشتی هەریریش(١) داویانەتە پالّیان و ئەمەش بەیانی ڕۆژی ڕابردوو رویداوە.

پێشویەکان بەو کارەی عەلی بەگ دەستیان پێکرد، بەیانیەکەی ڕۆژی(٢٧)ی مانگ دەوری بنکەی ژاندارمی لە بابەجیچکدا و ئەوەی لەوێ بون چەکی کردن و تارادەیەکی زۆریش هێلّی بروسکەی تێکدا. دواتر هەوالّی بۆ سورچیەکان هەنارد — کە ئامادەبون و، لەو بەری زێ چاوەڕێیان دەکرد — هەر هێندەی پەڕینەوەش دەوری بنکەی باردینیان گرت. ژمارەیەك ژاندارمە کوژران و زۆربەشیان بەدیل گیران، دو یان سێ کەسیان دەربازبون تاکو هەوالّەکە بە یەحیا بەگ ڕاگەیەنن لە باتاس. ئەویش توانی هەوالّەکە بە نەقیب هاگنسن بگەیەنێ لە ڕەواندوز، ئەمەش بەرلەوەی کە هێلّی نێوان ئەو دوشوێنە بپچڕێ. دواتر هەمو پارەی حکومەتی هەلّگرت و لەگەلّ ژمارەیەکی کەمی ژاندارمان ڕایکردە سیساوە، کە یەکێکە لە گوندەکانی خۆشناوەتیە و بە سەلامەتی گەیشتە ئەوێ. شۆڕشگێڕەکان باتاسیان داگیر کرد و فەرمانگەکانی حکومەت و مالّی(پاشا)یان تالاّن کرد، بێ ئەوەی قادربەگ ڕێوشوێنێك بگرێتە بەر.

لە نێوان من و نەقیب لیتلدیل گفتوگۆیەکی دوورودرێـژ کـرا، ڕێککـەوتین لەسـەر ئەوەی هەموو ئەو کەسە دەستڕۆیشتوانە کۆکاتەوە کە دەتـوانێ کۆیانکاتـەوە و، بە پەلەترین شێوە لەگەڵ سەید عەلیدا بچێتە شەقڵاوە، کە لـەوێ دەبـێ پارمـەتی قادربەگیش بەدەست بێنێ. کە وەك پێویستیش بەهێز بوو، پێویستە هێرش بکاتە سەر باتاس و بەشەر ڕێگەی خۆی بکاتەوە، تا دەگاتە ڕەواندوز، لـە(٢٩) ی مـانگ بەرلەکازیوە دەرچوو (کینارد)ی (ڕەئـیس عورەفـای سـریە) (گروبـانی دەسـتە) و سەید عەلی و دوئەفسەری بچوکی دیکەی لەگەڵدابوو کە ئەوانیش(حەمید ئەفەنـدی ) و(دەورێش ئەفەندی)بون لەگـەڵ نزیکـەی(١٠٠) سـەرباز، کەچـلیان سـوارەبون و نزیکەی هەموشیان تازەبە سەرباز گیرابون. هیوایەکی بـێ هومێـد بـوو، بـەلآم مـن دەمزانی نەقیب لیتلدیل چ ئازایەتیەك و ڕەوشـتێکی هـەبوو، بۆیـە هەسـتی ئـەوەم لادروستنەبوو کە سەرکەوتنی پێویست بەدەست نەهێنێ.

ئەو سێ ڕۆژەی (٢٩) تا(٣١)ی مـانگم بەدوودڵیـەکی زۆرەوە بەسـەردا تێپـەڕی، هەمو شتێك لە هەولێر ئارام بوو، وەکچۆن حـاجی ڕەشـید ئاغـا و ئاغـا دزەیـی یـە نەیارەکان و جمیل ئاغا لە کۆنگرەبەسـتنیان زۆر چـالاك بـون نەخـشە و پیلانیـان دادەڕێشت. لە ترسی کودەتایەکی کەڕودەدا، نامەیەکم بۆ خورشید ئاغـا هـەناردو تکام لێکرد، وەك پشتیوانیەك بۆ من، خۆی و دەست و پێوەندەکانی بێتە هەولێر.

دیانەکانی (عەنکاوەش) بە درێژایی ئەو کاتە لە ژیانێکی پڕ مەترسـی دەژیـان، تکایان لێدەکردم چەکیان بدەمێ، ڕەنگە ئەگـەر چەکیـشیان بـدرا بوایـە، ئـەوا لـە یەکەم هەڵدا دەیانفرۆشتەوە خەڵکە عەشایەرەکان. مـەتران (کـەرکۆن ئەسـتیفان) لە عەنکاوە جێگیر بوو، لـە (٢٩)ی مـانگ داوەتـی ئێـوارە خـوانێکی کـردم لـەوێ. لەگەڵ مولازم بوا چوینە ئـەوێ و پاسـەوانە (دزەییـە) کانیـشم لەگەڵـدا بـوو. ئـەو پیـاوە پـیرە بـە جلـە ئەرخەوانیەکانـەوە هاتـە دەرەوە تـا پێـشوازیم لێ بکـا، لەسەرەبانی ژوورەکەی کە لە تەنیشت کلێسابوو شێومان کرد. ئەو خەڵکـە بەڕاسـتی شایانی بەزەیین، ئەحمەد ئەفەندی بۆ ئەوان بەردەوام دەتگوت دڵی گڕی گرتووە، وەك ئەوەی لەسەر ئاگر بێ و ئەگەر شۆڕشێکی عەشایەریش سەرکەوتوو بـێ ئـەوا بێ گومان هێرشێکی دڕندانە دەکرێتە سەر گوندەکەیان کاتێ دەنگوباسی شـالآو و هێرشی سورچیەکان گەیشتە هەولێر، بەردەوام بروسـکەم دەنـاردوو تکـای ئـەوەم

دەكرد فڕۆكە ڕەوانە بكەن و ڕێوشوێنی پێویست بگرنەبەر، جا چ لەسەر دەستی سەربازەكان بێ یان پەنابەرەكانی ناوچەی سورچی، لە باكووری زێ ی گەورە بۆ ئەوەی ئەوانەی لە زێ پەڕیونەتەوە ناچار بن بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە. فڕۆكە لەبەر دەستدا نەبوو بارەكەش لە موسڵ بەجۆرێك بوو كە نەدەتوانرا دەستبەرداری یەك سەربازبین. هەرچی هێرشی پەنابەرەكانیشە ئەوا كۆمەڵێك ئاستەنگی لەبەردەمدا بوو، بۆیە هیچ شتێكی ئەوتۆ نەكرا. ئاغا سورچیەكان لە ناوچەی ئاكرێ و لەماوەدای دوو هەفتەدا توانیان هێزەكانیان كۆكەنەوە و هەوڵەكانیان كە وەلانانی نەبوو بەگەڕ بخەن بۆ شكاندنی دەسەڵاتی حكومەت لە لیوای (پارێزگای) هەولێر.

لە (٣١)ی مانگ، لە كاتێكدا لەسەربان شێومان دەكرد گوێمان لە دەنگی ناڵی سوار ئەسپێك بوو كە بە توندی بۆ لای ئێمە دەهات، لەماوەدای یەك خولەكدا نەقیب (لیتلدیل)م دیت كە جلەكانی تۆزاوی و قژی تێكهاڵاو و تۆزاوی بوو بە پەلە بەسەر پیلكانەكان دەكەوت. یەكەم قسەی ئەوەبوو كە خۆشناوەكان هەموو لەدژی ئێمە ڕاپەڕیون و، خۆی و برێكی كەم لە پیاوەكانی، زۆر بە ئەستەم توانیویانە ڕاكەن و دەرباز بن. وردەكاریەكانی كارەساتەكەش بەو جۆرە بووە:

نەقیب لیتلدیل لە (٢٩)ی مانگ گەیشتە شەقڵاوە، دیتی قادر بەگ لە حاڵەتی هەڵچونێكی گەورەدایە، چاوەكانی لەهەر كاتێك پتر سوور هەڵگەڕاون. ئەو بەڵێنی بە لیتلدیل دابوو كە لە دەركردنی سورچیەكان لە باتاس پشتیوانی بێ، بەڵام بۆ كۆكردنەوەی پیاوەكانی داوای كاتی كردوو، وتی كە سبەی بەیانیەكەی ئامادە دەبێ. بۆ بەیانیەكەی قادر بەگ هات و داوای دواخستنی كارە سەربازیەكانی تا ئێوارە كرد. ئەو دەمای هەموو ئەوانەی كۆببونەوە چونە (سیساوە) كە دەكەوێتە كۆتایی باشووری (دەشتی هەریر) و نزیكەی هەشت میل لە باتاس دوورە. لێرەدا هەموو ئاغا خۆشناوەكان كۆببونەوەو، لە ناویاندا مستەفائاغای كۆڕێ و نزیكەی بەدرێژایی ڕۆژەكەش كۆنگرەیان بەستاو، گفتوگۆكان زۆر گەرم بوون.... هەر هێندەی تاریكی ئێوارە داهات قادر بەگ تكای دواخستنێكی دیكەی كردوو، ئەودەم نەقیب لیتلدیل بۆی روون بوەوە كە هەڵوێستی قادر بەگ و ئاغاكانی برای فیلێكی تێدایە، بۆیە بڕیاری تاكە شتێكی دا كە دەیتوانی بڕیاری لەسەر بدا كە

یەکسەر هێرش کردن بوو، بە تایبەتیش، کە گوایە لە باویلاغاو چل کەس زیاتر، کەس لەوێ نەبوو، هەرچی شۆڕشگێڕەکانی دیکەش بوون بەرەو ڕەواندوز هەڵکشابوون.

بەو جۆرە فەرمانی بە پیاوەکانیدا کە ئامادەی بەرەو پێش چوون بن. لێرەدا قادر بەگ داوێنی گرت و تکای لێکرد کە تا ڕۆژی داهاتوو هێرش نەکاو، ئامادەیە بە (٤٠٠) کەس یارمەتی بدا. لە کاتێکدا کە خەریکی ڕۆیشتن بوو ساڵح بەگ هاتە پێش و هەردو ڕومەتی ماچ کردو تکای لێکرد کە واز لەو نیازانەی بهێنێ. نەمتوانی ئەو هەڵسوکەوتە یەکلایی بکەمەوە کە ئایا جۆرێکە لە پەشیمانی یان جۆرێکە لە فریودان. بەهەرحاڵ، نەقیب لیتلدیل بڕیاری داو لەسەر بڕیارەکەشی سوربوو. ڕێگای گرتەبەر و برازاکەی ڕەشید بەگ و بڕێکی کەمی دەستوپێوەندی لەگەڵ دابوو، هەرکە گەیشتنە نیوەی ڕێی باتاس تووشی موختاری ماوەران بوون کە لە گوندی (ئازۆ) دەهاتەوە. لەبەر ئەوەی نەیتوانی پاساو بۆ نهێنی ئەو کارەی بهێنێتەوە بۆیە سەید عەلی هەڕەشەی لێکردو ناچاری کرد بەگەڵ ئەو دەستەیە بکەوێ. تێکڕای ئەو هێزەش (٤٠) سوارە و شەست پیادە بوون. لەدوری یەك میلی دور لە مەبەست داوا لە سوارەکان کرا پیادەبن و ئەسپەکان لەلای چەند سەربازێك بە فەرماندەیی سەرۆکی گروبانی دەستە، کینارد بەجێهێلران. تێبینی ئەوە کرا کە ئەو کاتە ئاگرێك لەسەر چیای هەریر کرایەوە، ئەمەش لە ئاماژەیەك زیاتر نەبوو بۆ شێخ ئازۆ و نوری و شۆڕشگێڕەکان، ئەوانەی کە دەبوایە ئەودەم لەنزیك کانی وەتمان بونایە. دوو دەستە ڕێکخران، یەکیان بۆ هێرش کردنە سەر باتاس لەسەرەوە و ئەویدی لە خوارەوەڕا. نەقیب لیتلدیل ڕەگەڵ دەستەی یەکەم کەوت، و لەناکاو لە مەودایەکی نزیکی گوندەکەوە، ئاگر بارانێکی گەرم کران. چونکە شێخ عوبەیدوڵلا خۆی و (١٠٠)کەسی گەیشتبوونە ئەوێ، بۆ پشتیوانی باویلاغا. سەربازە نوێیەکان بەر لەوەی چاو بترووکێنن ڕایان کردوو دڵیان داخوڕپا، تەنیا سەید عەلی ئەفەندی و سێ چوار سەربازی ڕاهاتوو لەگەڵ نەقیب لیتلدیل مانەوە. هەرچەندە هێزێکی زۆر لە ژمارەی خۆیان زیاتر هێرشی کردبوە سەریان کەچی توانیان خۆیان لە شوێنەکانی خۆیاندا بگرن و کشانەوەی پیاوەکانیشیان تا ئەو خاڵەی کە ئەسپەکانی تێدا بەسترابۆوە، بپارێزن. تا ئێرە و هێزەکانی دیکەش

پاشەکشەی کردو هێزەکە هەمووی کۆبوەوە سەریەك و سەربازەکان هاتنەوە سەرخۆ. نەقیب لیتلدیل خەریکبوو بەهەموو هێزیەوە هێرشێکی دیکە بکاتەوە ئەگەر لە دواوەڕا هێرشی نەکرابا سەرو، وەك من پێموایە لەلایەن خۆشناوەکانەوە هێرشیان کرابوە سەر. هیچ شتێك نەمایەوە تەنیا گەڕانەوە نەبێ بۆ هەولێر لەڕێی گردەکانەوە. بەو جۆرە ڕیزی سەربازەکانی ڕێکخست و لەکاتێکدا کە ناوچەکە پڕ بوو لە ویزەی گوللە و تەقەی تفەنگ و ئاگری ئاماژەکان کە هەموو گردەکانی دەوروبەری ڕوناك کردبۆوە (شەوێك بوو وەك بەیانی ڕوناك)، کشایەوەو، ڕیزی تەقە لە هەموو گوندێکی کە دەکەوتە سەر ڕێیان بەسەر ئەو هێزە ڕاکردوەدا دەباری و کاتێك گەیشتنە ناوچەی گردەکان، وەها دەهاتە بەرچاو کە هەموو سوچێکی پڕ لە پیاوی چەکدارە. یان چاودێری خوداوەند ئەوانی پاراست، یان تاریکیە نوتەکەکەو، هەرکە بەیان ئەنگوت ئەوان لە کۆڕێ نزیك دەبونەوە. مەجید ئاغای برای مستەفا ئاغا لەسەر ڕێگا ئەوانی دیت و تکای پشودانی لێکردن تا شتێکی سارد بخۆنەوە، بەلآم ئەوان ئەویان بەدوژمن دادەنا، بۆیە لە پێشتر خێراتر بەڕێکەوتن و، تا لە ئاوی بەستۆرە نەپەڕینەوە پشویان نەداو، دواتر بەرەو دەشتەکان هاتنە خوارێ.

لەنێوان ئەو سەد کەسەی کە پێشتر بەرەو پێشچون تەنیا شەست یان حەفتایان گەڕانەوە و لەنێوانیان (٣٦) سوارە. تەنیا چوار ئەسپیش ون بوون. ئەوانەی مابون قادر بەگ هەندێکیانی دەسبەسەر کردبوون و شۆڕشگێڕەکانیش هەندێکیان تالآن کردن و بەرەڵلآیان کردن. ژمارەیەکی کەمیشیان کوژران. چوار سەربازیش پەنایان بۆ (ئارۆ)ی ماوەرانی برد. چای بۆ هێنان و دواتر شالآوی کردنە سەرو سێ ی لێ کوشتن و چواریەمیان بە برینداری توانی ڕابکا تاکو دواتر چیرۆکەکە بگێڕێتەوە. یەکێك لە ئەفسەرەکانیش، مەبەستم حەمید ئەفەندیە، لەکاتی ئەو هێرشەی کرایە سەر باتاس، بریندار بوو کەوتە دەست شێخ عوبەیدوڵلآ و لەوێ کوژرا. وتیان کوشتنەکەش وابوو کە لەسەر سەربانێکەوە بۆ دۆڵێکی هەزار بەهەزار فڕێدرایە خوارەوە. خزمەکانی ژنێك، کە لە کاتێکدا فەرماندەی ژاندارم بووە لەو گوندە خراپەی لەگەڵدا کردبوو، داوای ئەو تۆڵە سەندنەوەیان کردبوو.

لە پاداشتی ئەو ئازایەتییەی لەو شەوەدا نواندیان و بۆ ئەو ئازایەتی و ئارامییەیان کە لەژێر باری قورسی ئەو کاتەدا نیشانیاندا و بەشێکی گەورەی ئەو هێزە توانیان بە سەلامەتی بگەڕێنەوە، هەریەك لە نەقیب لیتلدیل بە میدالی (ئیم. سی: M.C) و سەید عەلی ئەفەندی بە میدالی سەربازی خەلاتکران. خۆڕاگری سەرۆکی گروبان، کینارد سودێکی زۆری بۆ نەقیب لیتلدیل هەبوو، لەکاتێکدا، دەروێش ئەفەندی، کە یەکێك لەو دوو ئەفسەرانە بوو لەکاتی کوژرانی (گروبان میسوین) خۆیان لەژێر کورسی شاردبۆوە، ئێستا هێمنییەکی چاوەڕوان نەکراوی نیشاندا، لەگەڵ ئامادەیی زەینێکی باش و، زۆریش لە هاندانی سەربازەکان بۆ خۆڕاگری و ورە بەرنەدان چالاك بوو.

هەر هێندەی کە ئەو کارەساتەم بەر گوێ کەوتەوە درکم بەوە کرد کە قەیرانێکی مەترسیدار خەریکە ڕوودەدا.

قادر بەگ بێ ویستی خۆی، خزم و کەسەکەی ناچاریانکرد سیاسەتێکی دژ بە حکومەت پیادە بکاو، لە ئەنجامی ئەوەشدا خۆشناو هەمووی ڕاپەڕین. ئەو دەمای ڕەواندزیش دوچاری چارەنوسی حەتمی خۆی بوو بەڕاستی کەوتە دەست ڕاپەریوان. هەموو هیوایەکم ئەوە بوو کە بەهەر شێوەیەك بێ ئاژەڵەکانی نەقیب هەگنسن و دوو ئەفسەرەکەی دیکە پارێزراو بن. هەرچی کۆیەشە ئەوا بەبێ حەماغا هیچ ڕێگایەك بۆ پاراستنی لە ئارادا نەبوو، وەك چۆن پڕوپاگەندەی ئەوە هەبوو کە سورچییەکان و شۆڕشگێڕانی ڕەواندوز دەیانەوێ شالآو بۆسەر هەولێر بێنن.

ڕۆژی دواتر، لەیەکی ئەیلول و، بەهۆی تکا کاریە بەردەوامەکانم، بەلێنێکم پێگەیشت کە بەیانی زوەکەی فرۆکەکان سەردانی ڕەواندوز دەکەن، بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ نەقیب برادشۆ کرد لە کۆیە و ئاگادارم کردەوە کە ئامادەی چۆڵکردنێکی یەکسەر بێ، لەگەڵ ئەوەی کە حاکمی سیاسی لە سلێمانی بەوە نارازی بوو دەیگوت سەلامەتی لیواکەی ڕووبەڕوی مەترسی دەبێتەوە کەچی (حاکمی پاشایەتی گشتی) فەرمانی ئەو کارەی پێدام، کاتێ بارەکە بەرەو خراپی دەچێ، چونکە خستنە مەترسی گیانی بەریتانییەك، لەو شوێنە دورەو لەکاتێکدا بارودۆخی ولآت بەگشتی بەو شێوە بێ، لەو کاتەدا، هیچ سودێکی نیە. لەو دەمەدا

لە پێشتر جیدی تر دەستمان بە گواستنەوەی فەرمانبەر و سەر و سامانەکانی حکومەت و شتومەکی کەسەکان کرد بۆ موسڵ چونکە جارێکی دیکەش پێیان ڕاگەیاندین کە ناتوانن بۆ ئێمە دەسبەرداری یەك سەربازیش بن و، ئەگەر بکرێ پێویستە هەولێر چۆڵ بکەین، منیش بڕیارمدا درێژترین ماوەی گونجاو تیایدا بمێنمەوە، چونکە دەمزانی دوای ڕۆیشتنی من توشی چ هەراو زەناو بەدبەختیەك دەبێ. عەشیرەتەکان شارەکە تالان دەکەن و بەلاو بەدبەختیەکی زۆر ڕوبەڕوی هەژارەکانی دەبێتەوە. هەروەها برادەرەکانم و، ئەحمەدەفەندیش، دەبێ ڕاکەن و موڵك و ماڵیان جێبێڵن، بۆ ئەوەی بەهەموو شێوەیەك بە تەواوی ویران بکرێ.

بێ گومان، عەنکاوەش دەکەوێتە ژێر کارەساتێکەوە کە ئاگرەکەی ئاورینگی دەدا، ئەگەری ئەوەش هەیە کە دیانەکان لەوێ وەك کاوڕ سەربڕدرێن. ئەو دەمای هەموو پەیوەندیەك لەگەڵ بەغدا پچڕابوو، تەنیا پەیوەندی بێ تەل لەگەڵ موسڵدا مابوو، هەولێریش تاکە هۆکاری پەیوەندی نێوان موسڵ و کەرکوك بوو. بەر لە شێوکردن دەنگوباسی ئەوە هات کە خۆشناوەکان پیاوەکانیان کۆدەکەنەوە تا بەیەکجاری هێرش بکەنە سەر هەولێر و کۆیە. پێم وابوو کە ئەگەر یەکە سەربازیەکان نەگەنە جێ ئەو پەڕەکەی یەك هەفتە دەتوانم بەرگری بکەم.

لە دووی ئەیلول بە دوورودرێژی قسەم لەگەڵ نەقیب برادشۆ کرد کە لە کۆیە بوو. چونکە ئاراستەی کارەکان لەوێ گۆڕابوون و زۆر بەخێرایی بەرەو خراپی دەچوون. ئەگەر جەمیل ئاغا پیاو بوایە دەیتوانی هەڵوێستەکە بەدەستەوە بگرێ، بەڵام گرمۆڵە بوەوە و لە لاوازیان هاوپەیمانیەکی بەستا کە پێشتر هەریەك لە عەبدوڵلا ئاغاو ڕەسوڵ ئاغاو مەلا حەمە ئاغای مام سلێمانی تێدابون و، ئەوانەش سەر بە لقێکی بچوکتری خانەوادەی غەفوری بوون. ئەو چوار کەسە خۆیان کردە دەستەیەك کە بارودۆخەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو تەنیا دوو غەنیمەکەشیان مەلا ئەحمەد ئاغاو مەلا حەوێز بوون، تەنیا ئەو دووە وەك لایەنگیری حکومەت مابوون و، وایان کردبوو کە نەقیب برادشۆ ئاگاداری هەموو گۆڕانکاریەکان بێ، دواتر زیاتر لەوەشیان کردو، دەستیان بە کۆکردنەوەی پیاوەکانیان کرد بۆ بەرگری کردنی هێرشی خۆشناوەکان کە پڕوپاگەندەی بۆ دەکرا.

نـەقیب برادشـۆ لـەو ئۆردوگایـە نیـشتەجێبوو کەلەسـەر گردێـك بـوو بەسـەر شارەکەیدا دەڕوانی و، لەسەر دەروێك بـوو کـە بـۆ دەشـتاییەکی فـراوان دەچـوو. لەشەوی دووی ئەیلول، بەهەر شێوەیەك بوبێ دەستەیەك توانیان خۆیان بخزێننـە ئەو پاناییەو بنکەی(یاریدەدەری حاکمی سیاسـی) درایـە بـەر گوللـە. باشـبوکەس توشی ئازار نەبوو، بەڵام لە ئەنجامی تەقەکردنی ژاندارمەکان ئەسپێك کوژرا. دوای ئـەو ڕوداوە هـەموو پیاوماقوڵانی کۆیـە بەپەلـە پـەل هـاتن تـا یەکسەر یارمـەتی پێشکەش بکەن و هەموو دەستوپێوەندەکانیان لەگەڵ دابوو، خۆ دەرخستنێك کرا بۆ پشکنینی ناوچەکە. دڵنیاشم کە ئەو کارە هـەموی لەلایـەن دەسـتەی عەبـدوڵڵا ئاغـاوە کرابـو. — بەڕاسـتیش ڕۆژی دواتـر برازایـەکی بـە چـاوێکی بەسـتراوەوە دەرکـەوت، وەك ئـەوەی گوللـەی بەرکـەوتبێ — مەبەسـت لـەو کـارەدا ئـازاردانی نەقیب برادشۆ نەبوو، بەڵکو ناچارکردنی بوو تا هەرچی زوە شارۆچکەکە جێبێڵێ. کارەکە هەر چۆن بێ، بەیانیەکەی ڕۆژی دواتر، جـەمیل ئاغـا ئامۆژگـاری کـرد کـە لەوێ بـڕواو سـپاردنی مـاڵ و مـوڵکی حکومەتیـشی ڕێکخستبو کـە بـە لیژنەیـەکی بسپێرێ کە خۆیان خۆیان دانابوو چوارکەس بون و، پێیوت کە ئەو شـەوە لەگـەڵ حـەوێز ئاغـاو پاسـەوانێکی زۆر خـۆی دەربـاز بکـا. وتیـشی کـە خۆشـناوەکان نامەیـەکیان نـاردوە، ئەگـەر (یاریـدەدەری حـاکمی سیاسـی) دەرنـەکرێ، ئـەوا، بەدڵنیاییـەوە هێـرش دەکەنـە سـەر شـارەکە، ئـەو چوارکەسـە بەڵێنیانـدا کـە بەرژەوەندیەکانی حکومەت بە بەڕێوە دەبەن تا بارودۆخەکە ڕێگـە بـە گەڕانـەوەی دەدا. نەدەتوانرا هیچ شتێك بکرێ تەنیا ڕازیبون بە واقیعەکـەی ئێـستا نـەبێ. بـێ هیچ گومانێك، پیلانەکە لەلایەن عەبدوڵڵا ئاغاوە چنرابوو. ئەمەش جۆرێکی بـاڵای فریودانی کوردی بوو کە بەگشتی لەو کاتانـەدا پیـادەدەکرێ کـە پـشێویەکی ئـاوا دروستدەبێ، بیرۆکەکەش لە دەسبەسەرداگرتنی بەشی هەرەزۆری سـەرو سـامانی حکومەتـدا چـڕدەبێتەوە بەنیـەتی پارێزگـاری کردنـی کـاتێ بـاری لێـژە، ئەگـەر حکومـەت مایـەوە ئـەوا بـە هیـوای دەسـکەوتنی پاداشـتی زۆری ئـەو پاراسـتنە دەدرێتەوە حکومەت.

لە ئێوارەی ڕۆژی سێ ی ئەیلول، نەقیب برادشـۆ نزیکـەی سـێ هـەزار ڕوپیـەی دایە جەمیل ئاغا تا بەیەکسانی وەك سپاردەیەك بیداتـە هـەر چـوار کەسـەکە بـە

مەبەستی پاراستنی. دوای ئـەوەی شێوی لای محەمـەد زیادی نـەورەس کـرد و ماڵئاوایی لە هەموو پیاو ماقوڵەکان کرد، لە مـاڵی حـەماغادا، لەگـەڵ مەلاحـەوێزدا کۆیەی بەجێهێشت. مـەلا حـەوێز ئاگاداری کـردەوە کـە ڕەنگـە هـەوڵی کێـشە بـۆ دروستکردنی بدرێ، بۆیە بە ڕێگایەکی تاریکی نێوان گـردە لمیەکانیـدا بـرد، تالـە بەیانی ڕۆژی داهاتو گەیشتنە ماڵی شێخ مەعروف لە هەڵەجە.

بەیانیەکەی ڕۆژی چواریْ مانگ هەواڵێکم بە تەلەفۆن لە کۆیـەوە پێگەیـشت و، سەرم لەوە سوڕماکە یەکێك لـە ژمێریارەکـان(موحەممـەد سـادق بـات) هێـشتا لـە کۆیەیە. ئەو پیاوە باسی ئەو ڕوداوانەی بۆ کردم کە دوای ڕۆیشتنی نەقیب برادشۆ ڕویانداوە. هەر هێندەی ئەو دەڕوا، سالح بەگ – کە گەنجێکی سەر سەریە و سـەر بەدەستەی حەماغایە – بە چوار ناڵە لەگەڵ دەستو پێوەندێکی زۆر هاتنە کۆیـە و بەزەبری هێز نیوەی ئەو پـارەو پولـەی لای ئـەو چـوار کەسـەبوو دەسـتی بەسـەر داگرت و زەقەی چاویان دەهات. دواتر پـشێوی بـاڵی بەسـەر شـاردا کێـشاو مـاڵی یاریدەدەری حاکمی سیاسی تالآن کراو ئەویش ناچار کرا بگەڕێتەوە کۆیە و ئێستا پەنای بۆ ماڵی حەماغا بردوە.

تەقـە بەدرێـژایی شــەو بــەردەوامبوو، چـەندین ڕوداوی تونـد و تیـژی ڕویـدا، ئارامیش هەتا خۆرهەڵاتن باڵی بەسەر ناوچەکەدا نەکێشا. دەستە چوار کەسـیەکە لـە شـەیتانە نەگریـسەکانی ئـەو پـشێویە تۆقیبـون و لـەو پـشێویەدا کارەکانیـان سودێکی نەبوو. جەمیل ئاغا بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵداکردم و پەژارەی خـۆی بـۆ ڕۆیشتنی(یاریدەدەری حاکمی سیاسی) دەربڕی و پێشنیاری ئەوەی کرد کە ڕێگـە بە(مستەر بات) بدرێ لە شارۆچکەکە بمێنێتـەوە تادەریخـا کـە لەگـەڵ هاوڕێکـانی بەپشتیوانی حکومەت کاردەکـەن. بـەوە ڕازیبـوم و(مـستەر بـات)م وەك نوێنـەری حکومەت دانا لە کۆیە تـا گەڕانـەوەی یاریـدەدەری حـاکمی سیاسـی و لـە بنکـەی خۆی جێگیربوو، جەمیل ئاغاش پاسەوانی بۆ دانـا و ئیـدی خـەریکی پیـادەکردنی کارە قورسەکانی بوو.

هەرچـی مەترانـە، یـان مـەلا محەمـەد ئەفەنـدی، کـە لـەو دوو سـاڵەی دوایـیدا بەشـێوەیەکی مـەزن دەرکـەوت، بـەلآم لوتبـەرزی و ڕێـو شـوێنە ڕەقەکارەکـەی وایـانکرد لای خـەڵك خۆشەویـست نـەبێ. دوای ڕۆیـشتنی یاریـدەدەری حـاکمی

سیاسی، بڕیاریدا بکشێتەوە گوندەکەی و تا ماوەیەك واز لە سیاسەت بهێنێ. بالە کۆیە بگەڕێین کە لە بارودۆخێکی تۆزێ ڕێکوپێك دابوو(لیژنەی چوار کەسەکە) خەریکی بەرکەماڵکردنی بون و، بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕوداوانەی لە ڕەواندوز رویاندا.

بە درێژیی ئەو دو ڕۆژەی دوای گەڕانەوەی نەقیب لیتلدیل لە باتاس زۆر پەرۆشی چارەنوسی نەقیب هاگسن و هاوڕێکانی بوم. لە کۆتاییدا زۆر دڵخۆش بوم کە نامەیەکی تەلەفۆنیم لە(نەقیب کوك)ەوە لە دەربەند پێگەیشت و ناوەڕۆکەکەی ئەوەبوو کە نامەیەکی لە شێخ محەمەد ئاغاوە پێگەیشتوە و دەڵێ: نەقیب هاگسن و مستەر ترترو، شیبەردی سەرۆکی گروبانان و ئیسماعیل بەگ هەر هەمویان بەسەلامەتی لە (والاش) لای ئەون و بەنیازە بەرێگەی چیادا ڕەوانەی ڕانیەیان بکا.

دوای سێ ڕۆژ توانیم بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ نەقیب هاگسن بکەم و لەوردەکاری ڕوداوەکان دڵنیابم. کاتێ لە یەحیابەگەوە هەواڵی هێرشی سورچیەکانم بۆ سەر باتاس پێگەیشت لە ڕۆژی(٢٧)ی مانگ و بەر لەپچڕانی هێڵەکە، ئیسماعیل بەگ بەبێ ئەوەی ڕاوێژ بە نەقیب هاگسن بکا ناردیە لای هەریەك لە ئەو دوپیاوەی ناویان(سلێمان ئاغابوو) و خەڵکی باڵەکیان بون و میر محەمەد ئەمین بەگ کە خەڵکی(دەرگەڵە) یەو خزمەکانی کە خەڵکی دۆڵی ئاکۆیانن، پیاوەکانیان بۆ بەرگری کردن لە ڕەواندوز کۆکەنەوە. ئیدی ئەو ئێوارەیە و ڕۆژی دواتر داڕژانە شارو ئیدی شار پڕ لە هەراوزەنای کوڕانی عەشیرەتەکان بوو کە داوای چەك و فیشەکیان دەکرد. (٣)

نەقیب هاسگن ئەو دەمای خراپ تێوەگلابوو، چونکە تا ئەو کاتی، شتێکی ئەو تۆی دەربارەی شارەکە و کەسایەتیەکانی نەدەزانی و. چاوەڕوانی ئەوە بوو کە ڕێنماییەکانی لە هەولێرەوە بۆبچێ، بەلاَم سودی نەبوو.

لە کۆتاییدا نامەیەکی هەنارد کە گەیشتە نەقیب لیتلدیل لە سیساوە، ئەویش وەلاَمێکی بۆ هەناردەوە بەلاَم هەرگیز بە دەستی نەگەیشت. لە(٢٩)ی مانگ هەولێك هات کە نوری و سورچیەکان لە کانی وەتمانن و خۆیان بۆ ئەوە ئامادەکەن بەرەو ڕەواندوز بچن. بۆ ئەمەش سیستەمێکی بەرگری دانراو سەنگەری سەربازان لە شوێنە بالآدەستەکانی دەورەی شارەکە دانران. داوا لە

عەشیرەتەکانیش کرا پیاوانی جەنگاوەر بنێرن بۆ ئەوەی بەو ئەرکە هەڵسن، بەڵام ئەوانەی بە دەنگەوە هاتن زۆرکەم بون. زۆربەشیان لە ناو شارو لە دەوری پێگەی سەربازەکان مانەوە، چونکە ئەوان لە سەربازگەکەی سەرگردەکەوە گواستبویانەوە ماڵە چۆڵەکەی حاجی نەورۆز و ئێستا داوای فیشەکیان دەکرد. بارەکە شلۆقتر بوو، پێشبینی ڕۆژێکی شومی لێدەکرا کە ئاگرەکەی ئاورینگی دەدا. هەر خێراش دەرکەوت کە بیرۆکەکەیان ئەوەبوو، بەر لەوەی سورچییەکان بگەنە شار، ئەوان چەندی پێیان دەکرێ دەست بەسەر شتەکاندا بگرن. عەشیرەتە کوردەکان ئەگەر هیچ هۆکارێك بۆ کۆنترۆڵ کردنیان لە ئارادا نەبێ، مەترسیدار ترین هاوڕێن کاتێ پێویستت پێیان دەبێ.

ڕۆژی(٣٠)ی مانگ جڵەوی کۆنترۆڵکردنی هەموو عەشیرەتەکان لە دەست دەرچوو، کارەکان زێدەڕۆیی تێدا کرا: بەڵام بەختی باش شێخ محەمەدیٔ هێناو، کەوتە بەردەست دەستەی حکومەت کاتێك دۆزیانەوە و تەنیا(٥٠) کەسی لەگەڵدابوو ئامادەی هیچ بەرگری کردنێك نەبوو هەرکە هاتە ناوشار هەموو پیاوماقوڵان بانگێشتی بەستنی ئەنجومەنی شەڕ کران و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بە نەقیب هاگنسن ڕابگەیەنێ هیچ چارەیەکی دیکە جگە لە چۆڵکردنی شار نیەو، ئەویش دەبێ هەر ئێستا بەرەو والآش بچێ، پلانەکانیش بەو پێیە دانران.

ئەو دەمای ژمارەی سەربازەکان(١٥٠) کەس بوو تەنیا حەوتیان ڕایانکرد و هەرلە ڕودانی پشێویەکانەوە شایەنی ئەوە بون ڕابکەن. ئەوانەش کە مایونەوە، ئەوانەی خانەوادەیان لە شارەکە بوو وەك خۆئامادەکردنێك بۆ گواستنەوەیان یان پارێزگاری کردنیان، ڕێگایان پێدرا لە شارەکەدا بمێننەوە.

ئەو دەستەی لەگەڵ نەقیب هاگنسن ڕۆیشتن نزیکەی سەد کەس دەبون و هەر یەك لە شێخ محەمەد ئاغا و عەبدوڵڵا پاشاو ئیسماعیل بەگیش بەخۆو بە دەستوپێوەندە عەشایەریەکانیان لەگەڵیدا ڕۆیشتن. هەر هێندەی یەکێك لە سەربازەکان لەسەر ڕێگا بەجێ بمایە ئەوا خێرا لەلایەن عەشایەریەکانەوە چەك و فیشەکەکانی لێدەستێنرا.

نەقیب هاگنسن سەربازەکانی لە ژێر فەرماندەیی نەقیبەکەیان (یۆزباشیەکەیان) سەبری ئەفەندی لە دەرگەڵە بەجێهێشت، کە خەڵکی کۆیە بوو،

بۆ ئـەوەی دواتـر بـە تـەنیا ڕێگـای ڕانیـە بگرنەبـەرو، خۆیـشی لەگـەڵ هـاوڕێ بەریتانیەکانی و ئیسماعیل بەگ و لە دواشیانەوە شێخ محەمەد ئاغا بەرەو(والاش) کەوتنـەڕێ. لـەوێ مامەڵەیـەکی باشـیان لەتەکداکراو هـەر هێنـدەی هـەواڵیان لـە نەقیب(کوک)ەوە پێگەیشت، کـە دەتـوانن بـە سـەلامەتی بگەنـە دەربەنـد، بـەرەو ئەوێ چون و پاسەوانی عەشایەریان لەگەڵدابوو، دو ڕۆژ لـەوێ مانـەوە، دواتـر بـە بەسلێمانیدا ڕێگای کەرکوکیان گرتەبەر، تەنیا ئیسماعیل بەگ نەبێ کە لە دەربەند مایەوە.

ژاندارمەکان لە دەرگەڵە لەلایەن(میر محەمەد ئەمین بەگ)ەوە میوانداری کران، لـە کاتێکدا کـە دانیـشتبون و خـەریکی گۆشـت خـواردن بـون، زۆربـەیان لـەناکاو چەککران. ئەوەی گومانیشی تێدانیـە ئەگـەر حکومـەت لـەو ناوچـانەدا دەسـەڵاتی بەدەست بهێنابایەوە، ئەوا(مـیر محەمـەد ئـەمین بـەگ) ئەوچـەکانەی دەردەهێنـاو دەیگوت(ئەوانە برێکن لەو چەکانەی کە لە دەست خەڵکی عەشایەر ڕزگارم کـردون و، تکا دەکەم کە بفەرمون و بکرێم بە سەرۆکی ئەو ناوچەیە و لە جیاتی دوربینیم، موچەیەکم بۆ ببڕێتەوە). پەنجا چەك دەستی بەسەر داگیراو، تەنیا نزیکەی بیست سەرباز بەچەکەوە مابونەوە. دواتر ئەو دەستەیە بێ ئـەوەی توشـی ئاسـتەنگێکی ئەو تـۆبن ڕێگـای هـەولێریان گرتەبـەر. ئەوانـەی لـە ڕەوانـدوزیش مابونـەوە، وەك ئەوانیدی بۆ هەولێر گەڕانەوە. هیچ سەربازێك گیانی لە دەستنەدا و، تەنانەت هیچ مەسیحیەکیش، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە.

هەرچـی(پـیرە پاشـا) شـە، ئـەو دەمـای لـە دەرگەڵـە و لـەلای(مـیر محەمـەد ئەمینبەگ) نیشتە جێ بوو.

کاتژمێرێك دوان پاش دەرچـونی ژانـدارم لـە ڕەوانـدوز(شـێخ مـارزۆ) لـە بـەرایی سورچیەکان هاتە شارو، وەکچون نوری و دەستوپێوەندەکانی بێ بـەرگری هاتنـە ناو شارۆچکەکە. گوتیان کە نوری زۆر بەداخ و حەسرەتەوەبوو ئـاگری ئـەوەی لـە هەناودابوو کە ئیسماعیل بەگ لە چنگی دەرچوو بوو ڕزگاری ببو. شارەکە ڕۆژێکی پڕ کارەسات و بێ سەروبەری بەخۆوە دیت و تالان و بڕۆیەکی زۆری تێداکرا، تەنیا موڵك و ماڵی حاجی نەوڕۆزنـەبێ و پیـاو ماقوڵـەکانیش وەك محەمـەد عـەلی ئاغـا و کەریم بەگ و مەلا سەعید ئەفەندی لەوێ ڕایانکرد. وە شـایەنی باسـە کـە ئـەوەی

دواییان لە کاتی قەیرانەکەدا تاکەکەس بوو کە یارمەتی(نەقیب هاگنسن)ی داو هەر ئـەویش ژمارەیـەکی زۆری لـە ژاندارمـەکان شـاردەوە و پاراسـتنی و، لـە گـەڵ خانەوادەکانیان مانەوە و دواتر بۆی ڕەخساندن کە لەگەڵ خانـەوادەکانیان بـەرەو هەولێر ڕابکەن. ئەحمەد ئاغـای شـێروانی بـەرەو شارۆچـکەکە هاتـە خـوارەوە تـا پشتیوانی حکومـەت بـێ، بـەڵام کـە گەیـشتە دەشـتی هـەریر و بیـستیکە نـەقیب هاگنسن ڕۆیشتوە، ئیدی بایدایەوە و ڕێگەی گەڕانەوەی بەرەو(دێرتە) گرتەبەر.

شێخ مازۆو سورچیەکان چەند ڕۆژێك دەستیان بەسەر چارەنوسی ڕەواندوز دا گـرت و، دەنـگ وابـو کـە بـە دوای خانەوادەکانیانـدا هـەنارد و، بڕیاریانـدا لـەوێ نیـشتەجێبن. بەهـەر حـاڵ، بـونی دەسـتەیەکی بیـانی لـە نێـوان عەشـیرەتەکانی دەوروبـەری بـوە هـۆی ناڕەزاییـەکی گـەورە و دوبـەرەکی دروسـتکرد، ئیـدی سورچیەکان کشانەوە بۆ باتاس و شارۆچکەکە لە باویلاغـاو نـوری بـترازێ کەسـی تێدا نەماو ئەوانیش بە دوای شـێخ کاکـە مینیانـدا هـەنارد تـا ببێتـە فـەرمانڕەوای شارەکە. هەر وەها سەرانەیان لەو کاروانانـە وەردەگـرت کـە بەوێـدا تێدەپـەڕین و هەولێکی زۆریان بۆ وەرگرتنی باجی زەوی خەرج کرد و، پڕوپاگەندەی ئەوەشـیان بڵاوکردەوە کە هێزێکی گەورەی تورکی بەڕێوەیە و لە(وان)ڕا بۆ پـشتیوانی ئـەوان دێتە شارۆچکەکە و، ئـەوان فـەرمانی کۆکردنـەوەی گـەنمیان پێـدراوە تالـە کـاتی هاتنیان ئامادەبێ.

با بەو جۆرە واز لە ڕەواندوز بهێنین، بـە پێـی ئـەو دوایـین زانیاریانـەی کـە لـە کۆتایی ساڵدا بە دەستم گەیشتن و باسی ئەوەیان دەکرد کە نوری و باویلاغا تەنیا سی دەسـتو پێوەنـدیان لەگـەڵ مـابوو، هـەر دوکیـان خـەریکی فرۆشـتنی چـەك و فیشەك بون بۆ کڕینی خواردەمەنی، هەموو ئەو دانیـشتوانەی مابونـەوە ڕایـانکرد، بۆیە ئەو پاشماوەکەمەی شارەکە کە لەدەسـت ڕوسـەکان و تورکـەکان ڕزگـاربیو، ئێستا وێرانە و کەلاوەبوو، کەواتە بەرهەمی هەموو هەوڵ و هیواکانم ئەوەندەبوو.

◆

## بەشی نۆزدەهەم
## خورشید ئاغا... بەڵێنی خۆی دەباتە سەر

خورشید ئاغا ڕۆژی دووەمی ئەیلول گەیشتە هەولێر و(٨٠) کەس لە دەستوپێوەندەکانی لەگەڵ دابوو، لەو دوازدە ڕۆژەی دواتر بە ڕاستی ببو بە فەرمانڕەوای شارەکە.

ئەو دەمای، هەندێ نامە گەیشتە دەست مستەفا ئاغا کەڕوداوەکانیان ڕوندەکردەوە و، بەگشتی دوای ئەو شکستە کە دوچاری هێرشەکەی سەر باتاس هات، قادر ئاغا دەستە پاچە بوو لە کۆنترۆڵکردنی خزمەکانی و ناچاربوو بداتە پاڵ شۆڕشگێڕەکان. ئێستا ئەو شەیدای ڕێککەوتنەوەیە لەگەڵ حکومەتدا، بەڵام لەو سزایە دەترسێ کە لە ئەنجامی خیانەتەکەیان ، ڕوبەڕوی خۆی و عەشیرەتەکەی دەبێتەوە. هێزەکانی سورچی، ئەو دەمای، لە دەوروبەری باتاس کۆببونەوە، لە کاتێکدا کۆبونەوەی بچوکی خۆشناوەکان، کە لە زۆر شوێنەوە هاتبون لە ناوچەی خۆیاندا بون.

لە ڕۆژی چواری مانگدا هەندێ دەنگوباس هاتن، کە دواتر دەرکەوت ڕاستنەبون، کە گوایە قادر بەگ خەریکە گوێڕایەڵی خۆی پێشکەش بکاو شێخ عوبەیدوڵڵاو سورچیەکان گەڕاونەتەوە بەری زێی لای خۆیان. ئەو دەنگو باسە ورەی(١) ڕوخاوی ئێمەی بوژاندەوە چونکە تروسکایی هیوایەك بون لە ئاسۆیەکی تاریکدا. دوای نیوەڕۆ ڕائید لۆنکریك بە هەمرایی مولازم بیکنۆڵ(ئەفسەری کڕینی کالآی ناوخۆبو) لە کەرکوکەوە گەیشتن و کاروانێکی گەورەیان لە ماشێنی باری(فۆرد) هێنابوو تابە پێ!ی توانا(لەکی: Lakhs) یەکان واتە ئەوڕوپیانەی هێشتا لە(خەزێنەکەمدا)مابون، بگوازنەوە، ئەو پارانە، کە هەمویان زیو بون سەر

چاوەی دودڵیەکی گەورە بون بۆمن، هەر وەك چۆن هۆی چاوتێبڕینی پیاو ماقوڵ و ئاغا ناو خۆییەکان بون. گواستنەوەشیان بوە هۆی داڕوخانێکی دیکەی شکۆی حکومەت لە شارۆچکەکەدا، خەڵك بۆ ئەوە دەچون کە خەریکم لە شارەکە ڕابکەم و، لە ئێستاش بە دواوە، دەسەلاتم وەك حاکمی سیاسی، وەك نەبو وابوو، تەنیا بەهۆی نێوانکاریە چاکەکانی هەریەك لە خورشید ئاغا و ئەحمەدەفەندی توانیم دەسەلاتۆکەیەکم هەبێ. بەهەر حاڵ، نیعمەتێکی گەورە و فەرێکی گەورە بوو کە لە ڕۆژانی داهاتودا ئەو پارەیە بگوازرێتەوە. چونکە بونی ئەو پارەیە گومانی تێدانەبوو کە لیکاوی پیاوانی وەك سەید عەبدوڵلا پاشاو ئەحمەد پاشای بۆ دەهاتە خوارەوە و لەڕژدیان ملچەی لێ خۆشبکەن (ئاوا! : و. ع). ئەو دوپیاوە تا پارەکە ڕوندەبێتەوە و خۆی ئاشکرا دەکا بەبێلایەنی دەمێننەوە. نەقیب برادشۆ بە سەلامەتی گەیشتە جێ و ڕۆژ لە ئاوابوندابوو. ئێوارە خوانێکمان بە پیاڵەی شەمپانیاوە ساز کرد کە هەموانی بە خۆشی کۆکردەوە و، بە دەگمەن نەبێ هیچ ئێوارەیەکی دیکەی ئاوا خۆشمان بەسەر نەبردبوو. تاڕادەیەك هەستمان دەکرد کە ئەو هەورە ڕەشەی ئاسۆی گرتبوو، بەر لەوەی چەند کاتژمێرێك بڕوا، بەسەر ئێمەش دادێ و هەموان لولدەدا ، بۆیە خوانەکەمان گیانی ئەو وتە باوەی تێدا بوو کە دەڵێ: مادام بەیانی دەمرین ئیدی بابخۆین و بخۆینەوە و دڵخۆشبین.

زیاد لە هەموو شتێکیش بەشێکی زۆری دودڵیەکەم بە هاتنەوەی نەقیب برادشۆ بە سەلامەتی، نەما، چونکە ئەو ئەفسەرو سەربازە بەریتانیانەی لەو دوبنکە دورەبون، ڕەواندوز و کۆیە، کە نەمدەتوانی هیچ هەنگاوێك بۆ پاراستنیان بهاوێم، ئەمڕۆ پارێزراو و سەلامەتن. لە پێنجی مانگدا ئاسمان بە هەوری ڕەش تەڵخبوو. هەواڵی ئەوە هەبوو کە سورچی و خۆشناو و گەردی لە ناوچەی کۆیە، هێزەکانیان کۆکردۆتەوە و خەریکن بۆ هێرشکردنەسەر شارۆچکەکە دەکشێن. پیاوماقوڵ و ئاغاکان کۆنگرەیەکی بەپەلەیان بەستا، عەلی پاشا، بەهیوای دروستکردنی بارێك بۆ تۆقاندنم و ڕاکردنم، داوای لە خورشید ئاغاکرد هەمو پیاوانی عەشیرەتەکەی بێنێتە شار. ڕائید لونکریك و مولازم بینکۆل ڕۆیشتن و بەشی هەرە زۆری پارەکەیان لەگەڵ خۆدابرد. کەچی بڕی(٢٠٠٠٠) ڕۆپیە هێشتا مابوو، بۆیە هەندێ ڕێو شوێنی پێویستم گرتەبەر بۆ هەناردنی ماشێنی دیکە تا

بیگوازمەوە کەرکوك، ئەگەر بارودۆخ بۆ ئەوە گونجاوبێ. نەقیب برادشۆ و مولازم بوا بەرەو موسڵ بەجێیان هێشتین، لە کاتێکا هەندێ لە فەرمانبەران و هیندییەکان، کە تۆمارە نهێنییەکانیان لەگەڵ خۆدا بردبوو بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری نزیك شەرگات چون.

لەو کاتە بەدواوە نەقیب دیکینسن بەردەوام خەریکی لێخوڕینی ماشینەکەمان بوو لە هاتن و چون لەو ڕێگایەی بەرەو(گوێڕ) (٢) دەچو — چونکە شوفێرەکەمان مۆڵەتی وەرگرتبوو لە بەغدابوو، هەندێ جار لە ڕۆژێکدا سێ کەڕەت دەچوو دەهاتەوە، تا فەرمانبەرو شتومەکەکان لە گوێڕ دانێ و لەوێڕا بە ماشێن ڕێی موسڵ بگرنەبەر.

ئەودەم مەترسیەکی زۆری لەسەر بوو چونکە لە ژاندارمێك زیاتر کەسی دیکەی لەگەڵ نەبوو. زۆرجاران توشی ئەو دەستە چەکدارانە دەبوو کە ڕێگریان دەکرد، بەلاّم خۆشبەختانە، هیچ کام لەودەستانە هەرگیز خۆیان لەو نە دەگەیاند.

هەندێ جار شەوی لەگوێڕ بەسەر دەبرد، کە لەلایەن دەستەیەکی ژاندارمی سەر موسڵ پاسەوانی لێدەکرا، ئەو ماشێنەکۆنانە کاری سەمەرەیان دەکرد، لە ژێر بارە قورسەکاندا دادەچەمین، قرەقرِی مەکینەیان دەهات، بەلاّم کۆڵیان نەدەدا.

ئەو دەمای، سەرنجی شتومەکەکانی خۆم و کەلوپەلی ناو ماڵم دا، ئەمە کارێکی پڕ لەحەسرەت بوو، مەبەستم چۆڵکردنی ئەو ماڵە کۆنەیەو گەڕان بە ناو ژورە چۆڵ وبێ فەرشەکانی. ئەوەی حەسرەتی بەسەر حەسرەتەوە دێنا ئەوەبوو کە ئەو هەموو هەوڵەی دابوم لەو چەند مانگەکەمەدا بە هاسانی و لە خۆبردویی و مەبەستیشم سەقامگیری ئاشتی و بەربلاّوی خۆشگوزەرانی بوو لەو شارۆچکەیە؛ هەروا بڕواو، ئەگەری ئەوەش هەیە کە وێرانبونی کۆشکەکانی و لە ناوچونی خەڵکەکەی بەدوادابێ: چونکە لە خۆشیەوە ناخۆشی بەدوادادێ.

لای ئێوارە دزەییەکان کۆبونەوە و، شارەکەش پڕ لە پیاوی چەکدار بوو؛ پاسەوانەکانیشم لەگەڵمدا هەڵدەستان و دادەنیشتن و خەملابەرم بون و لە هەموو هاتوچۆیەکدا لەگەڵمدابون، لەو شوێنە ئاساییانەی کە بۆمن ئاشنابون و پێشتر بە سەربەستی تێیدا دەهاتم و دەچوم و بێ پاسەوان، ئێستا وەك دەبینرێ مردن

خۆی تێدا مەڵاسداوە. سەرنجم بۆ گردە جوانەکان هەنارد کە پێشتر حەزم دەکرد بەخۆشیەوە تیایاندا سواری ئەسپ بم و، پڕلە سۆز و غوربەت و دەردی دوریەکی زۆربوم، ئەویێ کەتیایدا میوانداری و داوەت دەکرام تیایدا، چەند سەیرە، ئێستا بۆتە مۆڵگەی دوژمنان (ڕق و کینە لە زاریان دەردەچوو دڵیشیان پتری دەشاردەوە) ئەگەر ئێستا چوباما ئەویێ بێگومان بەسەلامەتی نەدەگەڕامەوە. ئەو شەوە دواشەو بوو، کە تۆزێ لەو ماڵەماندا، بەسەرمانبرد، ئەو ماڵەش لە ناو کۆمەڵێ کێڵگەی بەریندا بوو نیومیل لە شارۆچکەکەوە دوربوو ئارام نەبوو چونکە بەڕوی هێرشی ناکاودا کراوە بوو، بۆیە بۆ ڕۆژی دوایی بڕیارمدا بچینە ئۆردوی ژاندارمەکان.

ئەوجارەیان یەك لەو دوجارەبوو کە بە درێژایی ڕۆژانی تەنگانە لە ژێر هێرشی دەرونیدابوم. ماڵەکە ببوە مۆڵگەی ترس و تۆقین، مەترسیە نادیارەکانیش وا دەردەکەوت لە تاریکیەکەیدا دەسوڕانەوە. ساتەکان بەبێداری تێدەپەڕین، گەێم بۆ دەنگی ئەو تەقانە هەڵدەخست کە ڕەنگە ئامازەی هێرش کردنە سەرمان بێ. پاسەوانیەکەمان زۆر پتەوبوو لە چوار خاڵی بەهێزدابون کە لەهەر چوار سوچی سەربانەکاندابون و تفەنگێکی ڕەشاشی جۆری(لویس) مان هەبوو، کە نەقیب لیتلدیل لە فڕۆکەیەکی کردەوە کە بۆ سەردانمان هاتبوو.

لە بەیانی ڕۆژی دواتر چوینە ئۆردوگاکە، کە بینایەکی شێوە چوارگۆشەبوو حەوشێکی پان و فراوانی هەبوو، دەکەوتە لێواری ڕۆژئاوای شارۆچکەکە و، ڕاستەوخۆ لە ژێر قەڵاکەبوو. هەرچەندە دەمویست لە جیاتی سەریەشەی گەمارۆ، بەرەو موسڵ بکێشێینەوە، کەچی لێرەخۆمان وائامادەکرد کە درێژترین ماوە خۆڕابگرین، ئەگەر عەشیرەتەکان هێرشمان بکەنە سەر. ئەوانەی لەگەڵمان مابونەوە بریتیبون لە: نەقیب لیتلدیل و سەرۆکی گروبان، کینارد و (مستەر ڕۆبنز)ی بەڕێوەبەری کاروباری پۆلیسی شارۆچکەکە. وەك پێشتر باسکرا، نەقیب دیکنسن لە ڕێگەی گوێڕ هاتوچۆی دەکرد و سەرقاڵی ئەوەبوو. هەموو فەرمانبەرە بەریتانیەکانی دیکە لە شار گوازرابونەوە. فەرمانبەرە هیندیەکانیش لە هەولێر مستەر(دلی جاند)ی خەزنەدار و مستەر بلوچ کە بەرپرسی کاروبارەکانی فەرمانگەی پۆستەو بروسکەبوو لەگەڵماندا مابونەوە و ئەمەش تەنیالەو دو ڕۆژە

ڕەشەدا و دواتر ڕەوانەی گوێرم کردن. کرێکارە ناوخۆییەکانی بروسکە لە شوێنی خۆیان مانەوە و لە هەموو ڕۆژەکانی تەنگانەدا پارێزگاری لە پەیوەندیەکانی کەرکوك و موسڵ کرا.

ئەوەی ویستی واز لە ژاندارمی یان سەربازی بهێنێ ڕێگەی پێدرا. ئەگەر بارەکە خراپتر بوو بەرەو زۆر خراپی چوو ناچاری ڕاکردن بوین یان شەڕی خۆدەرباز کردن، وامان پێباشتربو کە ژمارەیەکی کەمی ئەو کەسانەمان لەگەڵدابێ کەمتمانەمان پێیان هەیە، نەك خەڵکێکی زۆر کەگومان لەلایەنگیریان بکەن. نزیکەی(٥٠) سەرباز و(٢٠) ژاندارمەمان لەگەڵدامایەوە، جگە لە پۆلیسەکانی شارۆچکەکە کە ژمارەیان(٣٥) کەس بوو ئەوانەی دوایی هەرگیز لێمان جیانەبونەوە. ئەوان لایەنگیری مستەر ڕۆبێنز بون و ڕاهێنانیان لەوانیدی باشتربوو، ڕەنگە لە کاتی تەنگانەش لە ناوبانگی خۆیان ترسابن لەناو خەڵکی شارۆچکەکەدا. هەر چەندە ئەو کەسانەی لەگەڵ ئێمەدا مابونەوە کاتێ دەچونە شەقامەکان لەلایەن خەڵکی عەشایەرەوە سوکایەتیان پێدەکراو، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی کات پێدەچو کێشەکەی ئێمە دۆڕاو بێ، بەڵام ئەوان ڕێگەیەکی جوامێرانەی چەسپاویان گرت(سپڵەی پێنەزان نەبون)، هەمیشە وشیاربون و وەئاگابون، هیچ بزاوتێکی وایان نەبوو کە ئاماژەی خیانەت بێ، کە من لە دڕندەیی خەڵکە عەشایەرەکە پتر لەوە دەترسام.

ئەو دەمای شارۆچکەکە بەچەکداران سیخناخ ببوو، خورشیدئاغا هاواری بۆ هەموو لایەنگرانی لە ناوچەکەدا هەنارد بوو، لەوانەش عەشیرەتی (تەی) و هەموان ڕژانە شارۆچکەکەو ژمارەیان(٣٠٠٠) کەس دەبوو، پێم خۆشبوو لەشتی وەهادووربین، چونکە لە دڕندەیی کوردی و پەرۆشی بۆ تاڵانکردن دەترسام و، پریشکێکیش بەس بوو بۆ ئەوەی گڕ لە بارودۆخەکە بەردا، بە جۆرێك چەندین ئاغەی وەك خورشید ئاغا لە دنیا، ئەگەر نیازیشیان پاك بێ ناتوانن ئاگرەکە بکوژێننەوە. هیوای دەسکەوتی تاڵان ئەو پیاوانەی بەپەلە هێنابوو تەنانەت کاریگەری بەسەر هەموو ئاغاکانیشەوە هەبوو. ئەوان ئارەزوی خزمەتکردنی دڵسۆزانەی خورشیدئاغا و منیان دەکرد، کەچی ئارەزوی تۆقاندنی منیشیان بە

دڵدادەهات بۆ ئەوەی بازاڕی پڕ لە کاڵاو شتومەك و ئازوقەی خـەڵکی شارۆچـکەکە بکەوێتە ژێر بەزەیی ئەوان.

لە نیوەڕۆی هەمان ئەو ڕۆژە، کاتێ تازە لە بەڕێوەبەرایـەتی بروسـکە هاتبومـە دەرەوە، کە دەکەوتە کوتایی لای ڕۆژهەڵاتی بازاڕ، گوێم لـە (هێـرش) بـوو کـە لـە ڕەواندوز ڕایچڵەکاندم و، وایلێکردم پەردەکان دادەمەوە و، دەرگا دابخەم و، گـوێم لە دەنگی پێ بووکە خاوەنەکانی بەپەلە دەڕۆیشتن. ئیدی پیاو و ژن و منداڵ وەك چـۆمی سـەرکرد و لـە بـازاڕ دەهاتنـە دەرەوە و بەلامـدا تێدەپـەڕین و هاواریـان دەکرد(عەشیرەتەکان هاتن، ئەوان بەڕێوەن)وە پاسەوانەکانم هەوڵیانـدا بـەخێرایی بمگەیەننەوە ئۆردوەکە، بەڵام من بڕیارمدا نەهێڵم ئەو ترسە گەورەیە لەمندا ببینن و، بەهێواشی دەگەڕامەوە، لەڕێ توشی (حوسێنی مەلا) ی بوم کەبـە پەشـۆکاوی دەڕۆیشت و دەموچاوی لـە هـەر کـاتێکی دیکـە پـتر سـورهەڵگەڕابوو بەرچـیغێکی گەورەی بە دەستەوەبوو. لە ئۆردوش دیتم نەقیب لیتلدیل فەرمانیـداوە شـەیپوری ئاگادارکردنەوە لێبدرێ و خۆشی ئامادەی تەقـەکردن بـوو بـەو ڕەشاشـەی جـۆری لویس کە هەیبو. هەرچۆنێك بێ بارودۆخەکە دوای چەند خولـەکێك ئـارام بـوەوە و ئەحمەدە فەندی هاتەلام و وردەکاریـەکانی ڕوداوەکـەی بـۆ باسـکردم. وا دیـاربوو یەکێك لە عەشایەرەکان لە مامەڵەی دوکاندارێکی بازاڕ، کە جولەکە بوو، بێزار بـوو پارەکەی فڕیدەداتە سەر زەوی و دەست بەسەر ئەو شتە دا دەگرێ کـە دەیـەوێ. ئەودەم جولەکەکە دەسـت بـەهاوارکردن دەکـاو دەڵـێ عەشـایەرەکان بـازاڕ تـاڵان دەکەن. دوای ئەوە ترس و تۆقین بڵاودەبێتەوە و، بـێ گومـان شـتێکی ئاسـاییش نیە کە عەشایەرەکان ئەو هەلە لەدەستبدەن و دەست بەسەر هەر شـتێکی خـۆش و بەتامدا نەگرن: ئەو دەمای حوسـێنی مـەلای بـەخۆو بەرچـیغە ئەسـتورەکەیەوە بەدەر دەکەوێ، لەڕێی، جوێندان و زللـەو بـۆکس و تێوەژەنـدن و بـەدار لێدانـەوە توانی ئارامی بگێڕێتەوە. ئـەو جولەکـەی کـە دەنگی بـەرزکردبۆوە و ئـەو تـرس و لەرزەی دروستکردبوو،خرایە کونجی زیندان و، شـتومەکە بردراوەکـانیش درانـەوە خاوەنیان. ئەو ڕوداوە نمونەی ئەو ترسە بوو کەبـەدڵی خەڵکدا ختـورەی دەکـرد، لەگەڵ ئەو ئامادەباشیەی عەشایەرەکان بۆ هـەموو هـەلێکی گونجـاو هـەیانبوو بـۆ تاڵان و بڕۆکردن تیایدا.

لەو هەشت ڕۆژەی دواتردا، حوسێنی مەلای ئەرکی پۆلیسی شارۆچکەکەی بەجێهێنا. سوپاس بۆ ئازایەتی و دەسەڵاتەکەی کە توانی بەهۆیانەوە دەست بەسەر هەزاران کەسی چاوچنۆکی عەشایەرەکاندا بگرێ کەبە باشی چەکدار کرابون. کۆنترۆڵ کردنەکەی بە تەواوی بوو، بە شێوەیەك هیچ تاوانێك ڕوینەدا، لەیەك ڕوداوی کوشتن بترازێ کە لە دوژمنایەتیەکی کۆنی دوکەسی شارۆچکەکەوە ڕویداو، هەر خێرا بکوژەکە دەسگیرکراو خرایە زیندان. سەرەڕای هەموو ئەوانەش بەیارمەتی کوڕە گەورەکەی خورشیدئاغا کە ناوی ڕەحمان ئاغابوو، ئەرکی دابەشکردنی یارمەتی بەسەر ئەو پیاوانەدا لەئەستۆگرت کە بۆ یارمەتی حکومەت بانگکرابون و ئەرکی سەرشانی بوو خواردنیان بۆ دابینکا لەسەر کیسەی خۆی، لەگەڵ ئەوەی ئێمە خۆشبەختانە بڕێکی باش گەنمی داکراومان هەبوو، توانای کڕینی پێداویستیەکانی دیکەشمان هەبوو، بەڵام خەڵکە عەشایەرەکە دابەشکارەکانیان هەناسە بڕکردبوو بە درێژایی ڕۆژ گەمارۆیان دەدان و گلەییان لە چۆنایەتی و چەندایەتی خواردنەکان دەکرد، ئەمرۆش کۆنە دوژمنەکەم(سواراغای پیرانی) بێ هیچ چەند و چونێك ببوە سەرچاوەی مەترسیەکی گەورە بۆمن. وەك پێشتر باسمان کرد، نەقیب بارکەر لە پایزی(١٩١٩)دا دەسگیری کرد و بە بەندی لەبەغدا مایەوە و دواتر کاری ئەو لە هەولێر بەمن سپێردرا کە بەئازادی لە هەولێر نشتەجێبێ، ئەمەش بەدەستەبەری حاجی پیرداود ئاغای دزەیی. لەترسی ئەوەی کەلەگەڵ هەڵگیرسانی هەر پشێویەك لە شارۆچکەکە، ڕابکا و ڕێی ڕانیە بگرێتەبەر و لەوێ وەك تاعون بچێتە گیانی نەقیب کوك (یاریدەدەری حاکمی سیاسی)، بۆیە بە پاسەوانی هەناردمە موسڵ، ئەمەش دوای دوسێ ڕۆژ لە دەسگیرکردنی. ژنەکەی هاتە لای خورشید ئاغا و خۆی بەسەر پێڵاوەکانی دادا، تکای ئەوەی کرد بۆ مێردەکەی بپارێتەوە. دەرکبەوتنی ژنی ئاغایەك، کە بە زۆری بەندی ماڵەکەیەتی، لەبەردەم ئاغایەکی دیکەی بێگانە بە خانەوادەکەی، لە ناو کوردانیدا بە ئەو پەڕی نزمی و سەرشۆڕکردن دادەنرێ. بۆیە خورشید ئاغا، بێ ویستی خۆی و، وەك سەردانەواندنێك بۆ نەریتە عەشایەریەکان و جێبەجێکردنی داواکەی، هاتە لام و کارەکەی خستمە بەر دەست، منیش لە وەڵامێکی توند زیاترم نەبوو، واتە لە ژێر قورسایی بارودۆخی ئێستادا هیچ شتێك ناچارم ناکا ڕێگە بە

گەڕانەوەی(سواراغا) بدەم، خورشید ئاغا سەرکێشە، ئەگەر بیرۆکەیەکی بۆ هات و، تۆزێك کەللە ڕەقیەکەی بیگرێ ئیدی پێوەی دەنوسێ و هەرگیز وازی لێناهێنێ. لەبەر ئەوە سێ ڕۆژ لە سەریەك سەری بەو مەسەلەیەوە ئێشاندم، بەڵام من ملم نەدا.

لەگردەکانەوە، ئەوکاتە، پڕوپاگەندەی تۆقێنەر دەهاتن و، گومانی تێدانەبوو کە هێزە یەکگرتوەکانی لە سورچی و خۆشناو پێکهاتبون بۆ هێرشکردنە سەر شارۆچکەکە دەکشان. ڕەنگە ژمارەیان لەهەزار چەکدار پتر نەبێ و، گومانیشی تێدا نیە کە ئەگەر بێنە ناوچەکەوە ئەوا هەریەك لە عەبدوڵلا پاشاو حاجی پیرداود لە دزەییەکان و جەمیلاغا لە عەشیرەتی گەردی، دەدەنە پاڵ ئەوان، هەموشیان لەو کەسانەبون کە بانگێشتم نە کردبون تا دەستی یارمەتی درێژ بکەن، بەڵکو خۆیان خۆبەخشانە بەفێڵ و تەڵەکە هاتبون. دەستوپێوەندی نەیاری حاجی ڕەشید ئاغاو عەلی پاشاش لە شارەکەدابون. دڵنیاشبوم کە ئەو کۆمەڵی عەشایەریانەی بە فەرمانی خورشید ئاغا هاتبون، ڕەتیدەکەنەوە کە لەدژی کوردە هاو خوێنەکانیان بجەنگن، بەتایبەتیش کە شکۆی حکومەت ئەودەم لە تەپانی بنەوەدابوو. هەر هێندەی هێزەنە یارەکە لە شارەکە نزیك ببوایەوە دەتدیت کە بەرەو پەڕگەی شار ڕادەکەن و دواتر لێی دەکشێنەوە. ئەوەندەی کارەکەش پەیوەندی بە جەنگین لەبەرژەوەندی منەوە هەبێ، ئەوا بە تەنیا دەتوانرا پشت بە دەستو پێوەندە تایبەتیەکانی خورشید ئاغا و مشیرو ئەحمەدەفەندی ببەسترێ. هەموو هەوڵێکم خستەگەڕ تا قادر بەگ لە دوژمن دابڕم، چونکە ئەو پیاوە لە سەردانی فڕۆکەکان بۆشەقڵاوە و سیساوە زۆر ترسابوو، دەیانوت کە ئامادەیە خۆیم دەخیل بکا ئەگەر بتوانێ مەرجی ئاسان و بە بەزەیی بەدەست بهێنێ. دوای نیوەڕۆی شەشی مانگ لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە گفتوگۆی دورو درێژم لەگەڵ هەندێ لە پیاوماقوڵانی کۆیە کرد. کەریم ئاغا ئەو دەمای لە شارەکەبوو، تاکە پیاویش بوو کە لەکاتی قەیرانەکەدا بەگشتی، بەلایەنگیریەکی هەڵقوڵاو لە زەینێکی ڕونەوە هەڵسوکەوتی کرد. کەریم ئاغا پێی ڕاگەیاندم کە عەبدولرەحمان بەگ، کە هێزێکی دوسەد کەسی لە پیاوانی خۆشناو لەگەڵدایە، ئێستا لە نازەنینە کە چوار کاتژمێر ڕێ لە شارۆچکەکە دورە و، نامەیەکی بۆ هەمو پیاو ماقوڵانی شار ناردوە و

تکادەکا کە خۆی و پیاوەکانی وەك میوانی ماڵەکانیان داوەت بکرێن. بە کەریم ئاغام ڕاگەیاند کە داوای پشتیوانیم لە فڕۆکەکان کردوە و ئێستا لەوەزیاتر ناتوانم یارمەتی بدەم و ئامۆژگاریم کرد دان بە خۆیدا بگرێ. دوای چەند خولەکێکی کەم هێڵی بروسکەی کۆیە بڕا.

لە ئێوارەکەیدا بروسکەیەك لە بەغداوە هات کە(کە حاکمی گشتیی پاشایەتی: سێر ئەرنۆڵد ولسن) لە هەشتی مانگ لەگەڵ سێ فڕۆکە سەردانم دەکا و هەرچەندە لە سەلامەتی ئەو دەترسام بەلاّم ئەو هەواڵەم لە شارۆچکەکە ڕاگەیاند و کاریگەریەکی دڵنیاکەرەوەی هەبوو. وەلاّمی بروسکەکەم بەبروسکەیەك دایەوە و تێیدا ڕونم کردەوە کە ڕەنگە لەهەر چرکەیەکدا ناچاربم شارەکە بەجێبێڵم ئەگەر — لەکاتی گەیشتنی فڕۆکەکان — هیچ ئالاّیەك لەسەر سەرادا نەبوو ئەوە مانای وایەکە من لە شوێنی خۆمدا نەماوم و دابەزینیش لەوێ مەترسیدارە.

ئەو شەوە لەشەوە هەرە پەرۆش و پڕ چاوەڕوانیەکان بوو کە بە سەرمدا تێپەڕین، ئەحمەدە فەندی بۆ هەندێ قسەکردن هاتبوو جلی ئەو روپی وەك جاران لەبەر نەبوو، بەڵکو جلێکی شینی شۆڕی لەبەر دابوو کە نەقیب لیتلدیل ناوینابو(وەستای دیوار)، وتی کە بارودۆخەکە مەترسیدارە بەلاّم ئەو بێهیوانیە. چەك و فیشەکی پێویستم دایە بۆ ئەو لایەنگرانەی کە لە شارۆچکەکەو دیانە بەدبەختەکانی عەنکاوەبون و کە بەدرێژایی چەندین ڕۆژ بەردەوام بە دوامەوەبون لە بەدبەختیان ((١٠٠٠٠) فیشەکی پێوستی چەکە تورکیەکان هەبوو لەگەڵ بڕێکی زۆری ئەوچەکانەی کە لەو سەربازانە کۆکرابونە کە بەڕێمان کرد بون دەستەیەك لە ئاغا دزەییەکان سەردانیان کردم و خورشید ئاغایان لەگەڵدانەبوو بە پێداگرتنی زۆرەوە داوای فیشەکیان دەکرد و زۆرلە پیاوەکانیشیان خۆیان کوتایە ناو ئۆردوەکە و بارودۆخەکە پڕیشکی کێشەیەکی گەورەی لێدەبۆوە تاڕادەی ئەوەی لەسەر داواکاریەکانیان ڕازیبوم. ڕەحمان ئاغا کە بەشێوەیەکی تایبەت شایەنی ڕێزگرتن بوو، فەرمانم دا کە(١٥٠٠٠) هەزار فیشەکی بدەنێ و وتم کەناتوانم لەوە زیاتری بدەمێ، بەلاّم بەو مەرجەی هەموو عەشایەریەکان لە ئۆردوەکە دەرکاتە دەرەوە کە هاتبونە ژورەوە. ئەویش دەریکردن، بەلاّم زۆربەیان توانیان دوبارە بگەڕێنەوە و بەلای سەربازەکاندا ڕەتبن لەبەر ئەوەی سەربازەکانیش لەڕوی

دەرونیەوە ماندوببون نەیانتوانی بیانکەنە دەرەوەیئۆردوەکە، بەر لەوەی ئاگاداری ئەوەبم کەچی ڕودەدا خودی خۆی چوە جبەخانەکە و نزیکەی(٥٠٠٠٠)فیشەکی گواستەوە. تاکە دلخۆشیشم لەو بارەدا ئەوەبوکە تەقەمەنیەکان کەوتبونە دەست دەستەی خورشید ئاغا، نەك ئەوانەی دوژمنی من بون، ئەوان بە ڕەزایی و دلّنیاییەوە، بۆ ئەو دەسکەوتە مفتەی دەستیان کەوت، چونە دەرەوە و، جارێکی دیکە توشی کێشەی ئاوا نەبومەوە.

شەوێکی تەنگ و نوتەکمان بەڕێکرد و هەموو جلوبەرگمان لەبەر کرد بوو وەك ئامادەباشیش ئەسپەکانمان زین کرد بوو. ئەحمەدە فەندی و دوسێ ئاغەی دزەیی لەگەڵمدابون. ئامادەبوین لەهەر چرکەیەکدا بڕۆین، بەڵام دەنگی چەند تەقەیەکی کەممان بیست کە لە شارۆچکەکەدا ویزەی دەهات و، وای لە نەقیب لیتلدیل و پیاوەکانی کرد یەکپێ بچنە سەنگەرەکانیان، لە ڕاستیشدا کارێکی ئەو تۆ ڕوینەدا شایانی باسبێ. هەر هێندەی بەیانی ڕۆژی دوایی داهات، وەك زۆربەی بەیانیەکانی دواتر، خەڵکێکی زۆری شار لەدەوری ئۆردوەکان کۆبونەوە تا دلّنیابن کەمن هێشتا لەوێم. هەڵسوکەوتیشیان تا ئەو پەڕی ڕادە دۆستانەبوو، زەخیرەیان بۆ سەربازەکان هێنابوو، چونکە چونە بازاڕ بۆ ئەوان کارێکی دورلە مەترسی نەبوو.

ئەودەمای کێشەی (سواراغا) گەیشتبوە لوتکە و لەچڵەپۆپەدا بوو، بەڕاستیش گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی: یان دەبێ بیهێنمەوە یان دەبێ من هەولێر بەجێبهێڵم. بەردانی ببوەنرخی هاریکاریکردنی خورشید ئاغا. ئەوپیاوە پیرە بە درێژدادرپیەوە باسی ئەو مەسەلەی نەکردو، ئەو پابەندی وەسیەتەکەی براکوژچکردوەکەی بو بە دەستەبەرکردنی سەلامەتی من، بەڵام دەمزانی ئەگەر مل بۆ داواکەی نەدەم ئەوا شارۆچکەکە جێدەهێڵێ و منیش لەگەڵ خۆیدا دەبا. بۆیە زۆربەناچاری ڕازیبوم و، کاری نیشتەجێبونی(سواراغا) لەمەخمور ڕێکخرا و، خورشید ئاغاش بەڵێنی دا کە مەگەر لە کوردستان نەمێنم ئەگەرنا، لەوێ نەڕوا. بەیانیەکەی ڕۆژی دواتر سواراغا بە ماشێنێك لە موسڵەوە هێنرایەوە و، لە نزیك گوێر، دەستەیەکی زۆری دزەییەکان پێشوازیان کرد و، بەسەرکەوتویی بەرەو شوێنی نیشتەجێی سەرۆکەکەی خۆیان برد، تاتەمومژەکەش ڕەویەوە هەرلەوێمایەوە. هەر هێندەی ڕازیبوم ئیدی بارودۆخەکە ئارامتربوەوە و ئاغاکان لە(خەڵوەتێك) کۆبونەوە و

سوێندیان بە(تەلاَق) خوارد کە دەرۆژ هەولێر لەبەرامبەر هەر کەسێك بپارێزن کە هێرشی بکاتەسەر و ئەگەر دوای ئەو دەرۆژەش بارودۆخەکە باشترنەبوو یەکە سەربازیەکانیش نەگەیشتن، ئەوا یارمەتیمان دەدەن بۆ ئەوەی بە سەلامەتی لە شارۆچکەکە بکشێینەوە. خورشید ئاغا و حوسینی مەلای و هەمو ئاغاکانی لقی(باین) لەو سوێند خواردنە بەشداربون و، ئەوانیش وەك رەسوڵ ئاغا و سلێمان ئاغا، کە ئامۆزای حاجی پیرداود بوو، شێخ محەمەد ئاغای عەشیرەتی گەردی لە کۆیە. لەو بارودۆخەدا زۆرسەرم لە هەڵسوکەوتی(سلێمان ئاغا) سورمابوو، چونکە ئەودەم چەند رۆژێك بوو لە شارۆچکەکە بوو لایەنگیری و سەر راستی دەردەخست، خەریکبو لێی دڵنیابم، بەلاَم دوایی بۆم دەرکەوت کە هەموکاتی خۆی لە گۆرینی گوێڕایەڵی ئاغا گەنجە دزەییەکانی لقی بایز بەسەر دەبا، لەگەڵ نامە نوسین بۆ خۆشناوەکان و هاندانیان بۆ هێرش کردنەسەر شارۆچکەکە. شێخ محەمەد ئاغا بۆ ناوبژیوانی کێشەی سواراغا هات. لەلایەك لەبەر ئەوەی لەرێگەی ژن و ژنخوازیەوە خزمی بوو لەلایەکی دیکەش لە ترسی(عارەب ئاغا)ی ئامۆزای کە لەدژی حکومەت دابویە پاڵ خۆشناوەکان.

هەموو رۆژەکانی دیکە سەردانی(سەرا)م دەکرد تەنیا یەکشەموان نەبێ کە لە ئۆردوەکە دەمامەوە، بە شێوەیەکی ئاساییش کارەکان ئەوەندە زۆرنەبون. بەزۆریش نزیکەی کاتژمێرێك لە نوسینگەکەم دادەنیشتم و دواتر دەچومەوە جێی حەوانەوەم و کاتێکی هێمنم بە خوێندنەوەی چیرۆك بەسەردەبرد. لە زۆرلەیەنەوە چێژم لە ژیان وەرگرت. چونکە لەگەڵ ئەوەی دڵە راوکێیەکی دیارم هەبوو، ئەوەیان جاری یەکەم بوو، بە درێژایی چەندین مانگ، بتوانم پشوێکی خۆشبدەم و، کارەکان بە هاسانی و سادەییەوە وەربگرم. لەحەوتی مانگ کاروانێك لە کەرکوکەوەهاتن و هەرچی پارەی هەمبوو گواستمەوە تەنیا ئەو برە پارەکەمەنەبێ کە بۆ ناچاری هێشتبومەوە. لە پشتی پەرژینەکەوە و، چەند میلێکی کەم لە دەرەوەی شارۆچکەکە، تەقە لە کاروانەکە کرا.

رۆژی دواتر، فرۆکەخانەکەمان بۆ هاتنی(حاکمی گشتی پاشایەتی) ئامادەکرد، لە کاتی ئامادەکردنی رێو شوێنەکان، لەرزم لێهاتبوو، لەبەر ئەو پروپاگەندەیەی کە دوایی درۆ دەرچوو، کە گوایە: دەستەیەك هاتونەتە(سەرا) و ئالاَکەیان

داگرتـوە. فرۆکـەکان کاتـژمێر(٧,٤٥)ی بـەیانی گەیـشتن و پاسـەوانیەکی تونـد لەفرۆکەخانـە ئامـادەبوو، سـوپاس بـۆ هەوڵـەکانی هەریـەك لـە ئەحمەدەفەنـدی و خورشید ئاغا، کەوایکرد خـەڵکی لـە نـاو شارۆچـکەکەدا بمێننـەوە. هـەر هێنـدەی دیـتم(حـاکمی گـشتی پاشـایەتی) و ئەفـسەرانی هێـزی ئاسمـانی پاشـایەتی بەسەلامەتی سواری ماشێنەکان بون، ئیدی خێرا بەسواری ئەسپەکەم بـەرەو مـاڵ چوم، تا تێشتیان (نانی بەیانی) بۆ ئامادەبکەم، بەڵام ئەوان لـەوێ دەرنەکـەوتن و بەرەو شارۆچکەکە ڕێگەیان گرتبوەبـەر. بۆیـە بەسـواری بەدوایاناچـوم و دیـتم لـە شـەقامە پـڕ ئاپۆراکـەدا ماشـێنەکانیان لێـدەخوڕن و سـوارێکی زۆری پیاوەکـانی خورشیدئاغا لەدەوریانن. دواتر هەمومان هاتینەوە ماڵەوە، دوای نانخواردن باسـی بارودۆخەکـەم کـردو سـوربوم لەسـەر هێنـانی هێزێکـی بـچوکی سـەربازی بـۆ شارۆچـکەکە چـونکە بارودۆخەکـەی دەگەڕانـدەوە ئاسـتی پێویـست. ڕەگـی پـشێویەکان ئـەو بـۆ چـونە گشتیەبو کـە حکومـەت خەریکـە وڵات چـۆڵ دەکـاو، هەنگاوێکی لەو جۆرە بـەس بـوو بـۆ ئـەوەی ترسـی هاوڕێکانمـان بڕەوێنێتـەوە و، پەتی هیوای دوژمنەکانیشمان بپسێنێ. دوای ئەوە چوینە(سەرا) و حاکمی گشتی پاشایەتی پێشوازی لە پیاوماقوڵان کرد و دواتریش هەموو ئاغا کوردەکان. سەیرم پێهات کە لە ناویاندا ئەحمەد پاشاو حاجی پیرداود و جەمیل ئاغـاببینم. وتـارێکی پێشکەش کرد کە لەگەڵ دانیشتنەکە بکونجێ و بۆ هەموان بوو، دواتر(مەلافەندی) و خورشید ئاغا دوای یەك وەڵامیان دایەوە و هەریەکـەیان تکـای ئـەوەی کـرد کـە هەرئێستا سەرباز بۆ هەولێر بنێردرێ. دواتر بەتەنیا لەگەڵ هەریـەك لـە ئەحمـەدە فەندی و خورشیدئاغا دانیشت و سوپاسی ئەو خزمەتانـەی کـردن کـە پێـشکەشی حکومەتیان کرد بوو، دواتر بۆ نانی نیوەڕۆ چوینەوە ماڵەوە و ئامادەکرابوو.

ئەو ماڵەمان بۆ میوانداری کردنی حاکمی گشتی پاشایەتی هەڵبژارد چـونکە لـە فرۆکەخانە نزیك بوو. خواردنێکی نایاب ئامادەکرابوو، لەوانەش(نەرمك) کە بریتیبو لە قەلەمونێکی بۆ جەژنی لـەدایکبونی مەسـیح هـەڵمانگرتبوو. توشـی پـشێویەکی دەرونی خراپ بوم، کە ئەمە دووەم جارم بوو. جـارێکی دیکـەش هەسـتم کـرد کـە ماڵەکە ئاوەڵایە و پێموابوو کە ڕەوەسواری عەشایەرەکان شـالاومان بـۆدێنن. دڵـە ڕاوکێکەم بەپلەی یەکەم لەبەر حاکمی گشتی مەلـەکی بـوو، چـونکە بەرپرسـیاری

سەلامەتی ئەو دەکەوتە سەرشانی من. (مستەر ڕۆبنز) و ڕەشاشەکەی و دەستەیەکی زۆری سەربازان و ژاندرمەکان لەسەربانەکەی سەر ئێمە هەشیاربون. لە ناوەڕاستی نان خواردنەکە ئاگادارییەك درایە نەقیب لیتلدیل و ڕەنگی تێکچوو بەپەلە بەرەو دەرەوەچوو. خۆم پێنەگیرا و بەدوایدا چومە دەرەوە. دەرکەوت ئاگادارییەکە لەلایەن مستەر ڕۆبێنزەوە ناردرابوو تیایدا نوسرابوو:(ئەوان لەسەر گردەکەوە بەرەو ئێرەدێن) بەپەلە بەپلیکانەکاندا سەرکەوتین و بەپەرۆشییەوە ئاسۆمان پشکنی، دیتمان، (ئەوانەی دێن) تەنیا ڕانە مەڕێکەو ئیدی دڵەڕاوکێکەمان نەما. کاتژمێر دوی پاش نیوەڕۆ، حاکمی گشتی پاشایەتی و ئەفسەرانی دیکە بەفڕۆکەکانیان ڕۆیشتن. خورشیدئاغاو مەلافەندی بۆ بەڕێکردنیان هاتن و پێیان گوتم کە حوسێنی مەلای لەسەردانێکی خۆشناوەتی گەڕاوەتەوە و، کەپێشتر بۆ دانوستان لەگەڵیاندا ڕەوانە کرابوو، نامەیەکی لە قادر بەگەوە هێنابوەوە کە ئەگەر لە هەموو کردەوەکانی ببوردرێ و هیچ سزایەکی ماددی نەدرێ ئەوا خۆی و هەموو خزمەکانی گوێڕایەڵی بۆ حکومەت دەکەن. پێشنیاریان کرد کە ئەوهەلە بقۆزمەوە و تکا لە حاکمی گشتی پاشایەتی بکەم ئەو پێشنیارە قبوڵ بکا. داوام لە ئەحمەدەفەندی کرد دەربارەی ئەوە قسە لەگەڵ(سێر ئەرنۆڵد ویلسۆن)بکا، ئەویش دوای ئەوەی لە ناو فڕۆکەدانیشت قسەی لەگەڵدا کرد، ڕەزامەندی وەرگرت و فڕۆکەکان زیکەیان هات و هەڵسان و تۆزێکی زۆری بەرپاکرد کە هەمومانی گرتە خۆ. کە توانیمان دیسان بیانبینینەوە، ئەوان لەئاسمان بون و دور کەوتبونەوە، ئەو دەم هەستم کرد کە بارێکی گرانم لەسەرشان لاچوە و، بەڕاستی بارێکی گرانیش بوو. یەکسەر چومە بەڕێوەبەرایەتی(سەرۆکی شارەوانی) تابزانم چ هۆیەك پاڵی بە ئەحمەد پاشاو هاوڕێکانیەوە ناوە لەوێ ئامادەبن. ئای لەو سەمەرەیە، ئەوان لەلایەن مەلافەندیەوە بانگێشت کرابون، کەپێیوابو ئەرکی هەموانە کەبە یەکڕیزی بەرەوڕوی هێرش بەران ببنەوە و، زۆر ئاسانتریشە کەلایەنگری ئەو ئاغایانە دابینبکرێ کە پێشتر دوژمنکارییەکی ئاشکرایان نیشان نەداوە، چونکە ئامادەبونیان لەشارەکە و لە ژێر چاودێری زۆرباشترە کە لە گوندەکانیان بمێننەوە. گفتوگۆیەکی دورو درێژم لەگەڵدا کردن، ئاساییشە کە دڵسۆزی خۆیان بۆ حکومەت دوپات بکەنەوە و پشتگیریان بۆمن، بەلاّم

بەیەقینەوە دەمزانی ئەگەر بونی خورشیدئاغا و پیاوەکانی نەبوایە، ئاشکرابونی ڕاستی ئەوان ئەوەندە درێژەی نەدەکێشا. بەهەر حاڵ، درکم بەوە کرد بوو چەند داودانێنەوە و فڕوفێڵ بکەن، بەئاشکرا هەر پشتیوانی منن، مادام ئەگەری سەرکەوتنی دەستەی حکومەت لە ئارادایە.

ئەو دەمای سورچیەکان لەدەوروبەری(دێرە) و بە درێژایی ئاوی بەستۆرە کۆببونەوە و، تەنیا دوازدەمیل لە هەولێر دوربون و شێخ عوبەیدوڵلا سەرکردایەتی دەکردن. نوریشیان لەگەڵدابوو وەك چۆن ژمارەیەك هێزی فریاگوزارییان لەگەڵدابوو کە لە عەشیەتەکانی ڕەواندوزەوە هاتبون، خۆشناوەکان لە بەری نزیکی ئاوی بەستۆرەبون و نزیکەی(٩) میل لە هەولێر دوربون و لە دەوروبەری گوندی مەلائۆمەر بون. بۆیە زۆر هاسان بوو هەموو شۆڕشگێڕەکان لە نێوان خۆرئاوابون و خۆرهەڵاتدا بەرەو هەولێر بکشێن.

خورشیدئاغاو مشیر دوای شێوان سەردانیان کردم. زانرابوو کە(عەلۆ)ی کوڕی خورشید ئاغا و محەمەد ئەمین ئاغای برایی بە نوێنەری سورچیەکانیان وتبوو، ئەگەر هێرش بکەنە سەر هەولێر، ئەوان بێ بەرگری هێزەکانیان دەکشێننەوە، خورشید ئاغا دڵنیای کردمەوە کەئەوە لەقسەی منداڵێك زیاتر نیە و، پێشیان وتم کە کەمتەرخەمانی بە توندی سەرکۆنە کردبوو. وتیشی کە دەوریەی بەدرێژایی ڕێگای ئاوی بەستۆرە هەناردوە و، هەرکاتێ هەواڵی ئەوەهات کە شۆڕشگێڕان خەریکن بەرەوپێش بێن ئەوا مشیر بەهەموو هێزی خۆیەوە بۆ ڕوبەڕوبونەوەیان دەردەچێ. ئەوانە موحەمەدی بن یان نا هەر هێندەی سورچیەکان لەئاوەکە بپەڕنەوە، خوێن دەڕژێ. ئەو بەرگەی لەشارۆچکە دەرچونمان ناگرێ، چونکە جڵەوی کاروبارەکانی بە دەستەوە گرتوە و لەسەر کارەکانیشی بەردەوام دەبێ، لەگەڵ ئەوەی هەندێ لەئاغاگەنجەکان چەنەبازیی منداڵانە دەکەن. هەڵوێستە جێگیرەکەی وەك ڕوناکیەکی توند، زۆردڵنیای کردمەوە، لەگەڵ ئەوەی دوژمنیش نزیك بوو کەچی شەوێکی ئارامان بەسەربرد. خورشید ئاغا بەیانی ڕۆژی دواتر شێخ مەعروفی، کە وەك شێخێکی ئازاو بەڕێز ناوی دەرکردبوو، بۆ بینینی شێخ عوبەیدوڵلا هەنارد، تاکو ئاگاداری بکاتەوە نەکا لە ئاوی بەستۆرە بپەڕێتەوە، چونکە ئەنجامی ئەوە خوێنڕژانی زۆری محەمەدیەکان دەبێ.

ئەو ڕۆژە، تا میلی کاتژمێر ئامـاژەی بـۆ سـێ ی دوای نیـوەڕۆکرد، بـەهێمنی و ئـارامی بەسەرچـوو، ئـەو دەمـای تێبینـی دەسـتەیەکی گـەورەکرا کـە لەشـار نزیکدەبونەوە ئەو دەستەیە لە ناوچەی خۆشناوەتیەوە هاتبون. ئەودەم ترسێکی گـەورە بلاوبـوەوە و، دڵـیش لەسـەر بـاڵی باڵنـدەبوو، سـەربازەکان ئامادەبـاش وەستابون نەقیب لیتلدیل بەرەو ڕەشاشەکەی ڕایکرد و مشیر پیاوەکانی خـۆی بـۆ شەڕ ئامادەکرد و لە دەوروبەری ئۆردوەکە دایمەزراندن، عەلۆ و هەندێکی دیکە کە لەگەڵ ئەو عەشایەرانەی کە لەبەر کەمی خۆراك شارۆچکەکەیان بەجێهێشتبوو، بە چوار ناڵە بەرەو شارۆچکەکە هاتنەوە. بەهەرحاڵ ئـەو کۆمەڵـەی نزیـك دەبونـەوە لـە(بـاداوە) ڕاوەسـتان و هـەر خێـرا زانیمـان کـە هـەموو ئاغاکـانی خۆشـناو گەیشتونەتەجێ و ئێستا لـە مـاڵی مەلافەنـدین. ئەحمـەد ئەفەنـدی بـۆ دیداریان بەسواری ڕۆیشت، هەر هێندەی هاتـەوە وتـی کـە ئـەوان زۆر هەڵچون و لەبەرئـەو ڕۆڵەی لەگـەڵ ئێمـەدا گێڕاویـەتی بـە خـائینی کـافر ناویـان بـردوە. وادیاربوو کـە مستەفا ئاغاو خدربەگی بالیسانی، کـەدوو کـەس بـون زۆرم ڕق لێیـان بـوو(ئـاوا! : و.ع) بەدرێژیی ڕۆژانی هەژان و پشویەکان ئامازەیـان بـۆ قـادر بـەگ کرد بـوو کـە لەسەر لایەنگیری خۆی چەسپاو بـێ، لـە کاتێکـا ئاغاکـانی دیکـە بەسـەرکردایەتی ساڵح بەگ و ڕەشید بەگ، کە پەرۆشی تێکشکانی ئەوبون دەیانگوت دەبێ لەگـەڵ لایەنکەی دیکە دابی. ئەو پیاوە لە بارێکی شڵۆقدابوو، نەبۆ ئەم بەرو نەبۆ ئەوبـەر و، هێشتا بیری خۆی بەکارنەهێنابوو، بەلآم کەتا ئەو ئاسـتەهاتبوو، ڕەنگـە بـەلای ئاشـتیدا بکـەوێ، بەتایبـەتیش کـە مەلافەنـدی لێـشاوی زمانپـاراوی خـۆی بـۆ هەڵدەڕشت تاکو بێگەڕێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست.

هـەمان ئـەو ئێوارەیـە کـاروانێکی گـەورەی ئێـسترو گوێردێـژمان لەشـار کـردە دەرەوە کە هەموو کەلوپەل و دەستەی ئەو فەرمانبەرانەی هەڵگرتبوو کە دەبوایـە لەشار بیانبەینە دەرەوە. شەوێکی تەنگ و تاریکمان بەسەربردو هەموو چرکەیەك ئامادەی ڕاکردن بووین. ئەگـەری زۆری ئـەوە هـەبوو کـە خۆشـناوەکان پـیلان و خیانەتێکیان لەژێر سـەردابێ و، نـەقیب لیتڵـدیل شـتێکی ئـەوتۆی لەبـەر دەسـتدا نەبوو وای لێبکا متمانە بە قـادر بـەگ بکـا. هەنـدێ تەقـە ترسـاندمی و، تـا بـەیان ئەنگوت شتێکی دی ڕوینەداو ئیدی تا ڕادەیەك دڵنیابوینەوە.

بەیانیەکەی ڕۆژی دەی مانگ بەکپی و هێمنی بەسەرچوو. نزیك کاتژمێری یازدەی بەیانی ئەحمەد(ڕەنگە ئەحمەد پاشا بێ و هەڵەی چاپ بێ) (و.ك) بۆ بینینم هات. بەفێڵ و تەڵەکە دەستی ماچ کردم و دوپاتی لایەنگیریی سەرمەدی خۆی بۆ خودی من کردەوە. ئاماژەم بۆ ئەو برادەرایەتیە کرد کە پێشتر لە نێوانماندا بوو لەسەر هەڵوێستی ئێستاشی سەرکۆنەم کرد، لە کاتێکدا ئەو سوربوو لەسەر ئەوەی کە خۆشناوەکان تەقەیان لە دەستەی نەقیب لیتڵدیل نەکردوەو، ئەوان تەنیا لەبەر گومانێکی کە باڵی بەسەردا کێشاون هێزیان کۆکردۆتەوەو، ئەوان لەکارێکی تەمێ کاری دەترسن کە حکومەت بەرامبەریان پیادەی بکا. کارێك کرا تا قادر بەگ و هەموو ئاغاکانی دیکەی خۆشناو لە (سەرا) و لەکاتی عەسری ئەو ڕۆژەدا چاویان بەمن بکەوێ. لەبەر ئەوە دوای نیوەڕۆ ڕێگەی نوسینگەکەم گرتەبەرو، لە پەنجەرەکەوە سەیری ئاغا خۆشناوەکانم دەکرد کە بەڕێوەبوون. خەڵکێکی زۆر لە لێواری شەقامەکان وەستابوون و، دزەییەکان دەستیان بە گاڵتەپێکردنی سوراچاکی ئەو پیاوانە کرد کە لە گردەکانەوە هاتبوون کە خەریکبوو گێچەڵێکی لێبکەوێتەوە و ببێتە هەرا. قادر بەگ یەکەم کەس هاتە ژورەوە و دوای ئەو خورشید ئاغا و دوای ئەویش ساڵح بەگ و ڕەشید بەگ و مستەفا ئاغا و خدر بەگ و عارەب گەردی. گرژیەك بە ڕوخساری هەریەك لە ساڵح بەگ و ڕەشید بەگەوە دیاربوو. بارودۆخێکی سەیر و سەمەرە بوو: چونکە من بەدرێژایی دوو ساڵ ڕاهاتبووم فەرمان بەسەر ئەو ئاغایانەوە بکەم، کەچی ئێستا بارودۆخەکە ئاوەژوو بۆتەوە و ئەوان مەرجەکانی خۆیان بەسەرمدا دەسەپێنن. لەگەڵ ئەوەی کە هەڵوێستی ئەوان ملکەچی و گوێڕایەڵی پێوە دیار نەبوو، کەچی بەهیچ شێوەیەك، دوژمنکارانە نەبوو. قادر بەگ لەجیاتی خەڵکەکە قسەی کردو ساڵح بەگ ناوە ناوە بەتێبینی جۆراوجۆر قسەی پێدەبڕی. ئەوان ڕازیبوون هێزەکانیان بڵاوە پێبکەن و هەر کەلوپەلێکی حکومەت کە لەلایانە بگەڕێننەوە، بەو مەرجەی وابکەم کە ئەوەی ڕۆیی بێ گەڕانەوە بڕواو بەردەوام وەك سەرۆکی فەرمی مانگانەیان بدەمێ و بەهەمان مامەڵەی ڕێزو خۆشەویستی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم کە بەر لە پشێویەکەدا هەمبووە. بەڕاستی لەگەڵ ئەوەی پێشی دڵخۆش بووم، کەچی ناچاربووم ئەو جۆرە پێشنیارانە قبوڵ بکەم. بۆ ئەوەی

ئابڕوی خۆشیان بپارێزن مەرجێکی دیکەیان زیاد کرد، چونکە ئەوان لەبەرامبەر عوبەیدوڵلا ئاغا سوێندێکی گەورەیان خواردبوو کە تا کۆتایی تاڵ لە دژی حکومەت بجەنگن. بەدڵێکی شکاوەوە داوایان لێکردم بەپێی مەرجی ماقوڵ، ئاگربەستێك لەگەڵ سورچیەکان ببەستم، بەڵام من تەنیا وادەی ئەو شتانەم پێدا کە لەبارمدا بوو.

هەر هێندەی دانوستانەکە بەشێوەیەکی باش تەواو بوو ئیدی کۆبونەوەکە بڵاوەی پێکرا. بەر لەوەی نووسینگەکەم جێبێلم شێخ مەعروف گەڕایەوە و بۆ بینینم هات. چیرۆکەکەی ئەو سەمەرە بوو: هەر هێندەی گەیشتبووە لای سورچیەکان ئیدی شێخ عوبەیدوڵلا بە ریسواکردنێکی زۆرەوە پێشوازی لێکردبوو پێی وتبوو: ﴿کە تۆ (سەید)ی و نەوەی پێغەمبەری (د.خ: و.ع) بۆ لەگەڵ ئەو کافرانە هەڵسوکەوت دەکەی؟ بدەرە پاڵ ئێمەو بۆ دەرکردنی ئەو گەلە نەفرەت لێکراوە پشتیوانمان بە﴾. دوای ئەوەی چەند خولەکێك لەسەر ئەو جۆرە قسانە بەردەوامبوو، (سەرکردەی شۆڕشگێڕەکان) قسەکانی بەوە کۆتایی پێهێنا کە وتی: (ئاساییە کە ئەگەر حکومەت بمکاتە سەرۆکی عەشیرەتەکەم و موچەیەکم بداتێ و رێوشوێنی دامەزراندنی هێزێك لە ژاندرمی عەشایەری جێبەجێ بکا، من ئامادەم باجی بۆ کۆ بکەمەوە و بیدەمێ و پشتیوانی بکەم و بە ئەوپەڕی لایەنگیری و دڵسۆزی خزمەتی بکەم:)، لەکاتی ئەو گفتوگۆیە نامەیەك لە عەلی پاشاوە دەگاو شوناسی ئەو قارەمانە ئاشکرا دەکا، کە بە ئەوپەڕی پشتگیریەوە، بە ئاشکراو نهێنی، هەڵسوکەوتی دەکرد. وترابوو کە گوایە دزەییەکان بەهۆی هێرشێکی عەرەبەکان ناچار بوون بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان و، ئێستا هەولێر بێ پاسەوانەو، دەبێ شێخ عوبەیدوڵلا یەکسەر هێرش بکا. شێخ مەعروف بەتوندی نکوڵی ئەو قسە هەڵبەستراوانە دەکاو، کە هاتەوە پێی ڕاگەیاندم کە وای دەبینێ مادام خورشید ئاغا لە هەولێر بێ، ئەگەری ئەوە نیە سورچیەکان لە ئاوی بەستۆرە بپەڕنەوە.

دوای راوێژو وتووێژێکی زۆر ئاغا خۆشناوەکان شارۆچکەکەیان جێهێشت و شەوێکیان لە (بنەسڵاوە) و لەدووری شەش میل بەسەر برد. لای ئێوارە خۆشیەکی زۆرمان کەوتە دڵەوە، چونکە بروسکەیەك لە (بنکەی گشتی)یەوە هات

کە ڕەزامەندی بوو لەسەر هەناردنی سەربازو، دوو دەستە سەرباز لە بەیانی ڕۆژی داهاتوو لە کەرکوك و موسڵەوە بەڕێدەکەون و لەچواردەی مانگ دەگەنە هەولێر. بۆیە ئەگەر چوار شەوی دیکە خۆڕاگرین کارێکی زۆر باشە.

ئەو شەوە و ڕۆژی دواییش بەهێمنی و ئارامی تێپەڕین، سەردانی (سەرا)م کرد، لای عەسرەکەی بەسواری ئەسپەکەمەوە چووم تا چادرگەیەك بۆ سەربازەکان هەڵبـژێرم. پارچە زەویەکم لای سەر (٤) کارێزێکی نێوان خۆمان و فرۆکەخانە هەڵبـژارد، شەوی دواتـر خـراپترین شـەوبوو کـە بەسـەرماندا تێپـەڕی، چـونکە ئەحمەدەفەندی لە نزیك کاتژمێر نۆی ئێوارە بە تۆقیوی هاتە ژورەوەو، جلێکی درێژو شەرواڵێکی سواری لەبەرکردبوو پێڵاوەکانی لەپێکرد— ئەو جلانەش نەقیب لیتلڎیل پێیدەگوت (جلی جوتیاری)— وتی: گومانی تێدا نیە کە ساتی تەنگانە هات. ئامۆژگاری کردین کە هەر ئێستا بەرەو گوندێك بچین لەسەر ڕێگای گوێڕ کە چەند میلێك دوربوو. وتیشی کە ئاغاکانی خۆشناو هێشتا لە بنەسلاوەن و هێزێکی گەورەشیان لەگەڵدایە و هەندێ زانیاری هاتوون کە سورچیەکانیش بەنیازن هەر ئەمشەو هێرش بکەن. پشتێنمان بەستاو دەمانچەو زین و ئەسپەکانمان ئامادەکردوو هەموو سەربازەکانیشمان بۆ ڕۆیشتن ئامادەکردو، کاتێ خورشید ئاغا هاتە ژورەوە و خۆی بەسەر ئەحمەدەفەندیدا شۆڕکردەوە و هاوارێکی توندی کرد: (ئەی من لێرەنیم؟ با هەموو کوردستان هێرش بکا، من بەریان پێدەگرم، بۆ تەنیا پروپاگەندەیەك ئاوا پەرژو بڵاوی کردوون؟ ئێوە بەهۆی منەوە لە ڕۆژە تەنگانەکاندا لێرە بمێننەوە، ئەمڕۆش ڕێگەتان پێنادەم بڕۆن). ئیدی دانیشت و منگە منگی دەکردو دەنگی بەرز کردەوەو دەیگوت: (ئای....ئای) هەناسەی درێژی هەڵدەکێشاو قێز و تورەیی دەردەبڕی. دواتر بەمنی وت کە دەوریەکانی دەرچوون، هیچ هۆکارێك لەئارادا نیە کە ترسمان تێدا بڵاو کاتەوە و، پیاوەکانیشی کۆبونەتەوە و ئامادەن بەرسینگی هەر هێرشێك بگرن و، مشیر و برێکی زۆری سواران لە خانێکی نزیك ئێرەن تا کاتی پێویست یارمەتیم بدەن، ئا لێرەدا بیرۆکەی ڕاکردنم لە مێشکم دەرکرد، وەکچۆن خورشید ئاغای پیریش سوربوو لەسەر ئەوەی ئەو شەوە لەگەڵ ئێمە لە ئۆردوەکەدا بەسەر ببا.

خەو لە چاوماندا زڕاو، دواتر هێمن بوینەوە ڕاستەوخۆشناوەکان ئەو ڕۆژەی ڕۆیی لە بنەسلاوە مابونەوە، وا دیاربوو کە تاوتوێی بارودۆخی کۆیەیان دەکردو، عەلی بەگی پیرەمێردیان، کە مامی قادر بەگ بوو ڕەوانەی ئەوێ کرد لەگەڵ هێزێکی بچووك تا بە شێوەیەك کاروبارەکان کۆنترۆڵ بکەن لەبەرژەوەندی ئەواندا بێ.

هەندێ زانیاری هاتن کە ئەوان لەگەڵ کازیوەدا بەرەو شوێنی خۆیان بەڕێکەوتون. نەقیب دیکینسن لەکاتی نان خواردن گەیشت و هەواڵێکی پێبوو کە هەمووان گرنگیمان بەوەدا کە لەناو خەڵکەکەدا بڵاو بکرێتەوە کە بریتیبوو لەوەی ئەو دەستە سەربازەی لە موسڵەوە هاتبوون ئێستا لە گوێڕ هەڵیانداوە. دوای نانخواردن یەکسەر بەجێیهێشتین و بە ئەرکی گێڕانەوەی هەندێ کارمەندو شتومەك هەڵسا کە پێشتر لەشاری دەرکردبوون و شتەکانیشی لادابوو. خەڵکی هەولێر چەند کەسیان هەنارد تا لە هەواڵی هاتنی سەرباز دڵنیابن. خەڵکەکە سەرەتا باوەڕیان نەدەکرد، گومانیان لە دروستی هەواڵەکە هەبوو، بەڵام لای ئێوەرەکەی هەڵوێستیان گۆڕا.

دوای نیوەڕۆ بەسواری ئەسپەکەم چوومە سەردانی مەلافەندی لەماڵەکەیدا کە لە باداوە بوو. دیتم کە ئەوەندە بەو ترس و لەرزە کاریگەر نەبوو کە بڵاو ببۆوە. وەك دەمناسی بە نیشانەکانی سۆز و ڕێزەوە پێشوازی لێکردم و، گفتوگۆیەکی خۆشمان کردوو چەند ئامۆژگارییەکی باشی دامێ. ئەوبوو کە ورەی خەڵکەکەی بەرز کردەوە و وای لە هەموان کرد دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکەن و سەرکردایەتی ڕای گشتی کرد. هەر ئەوبوو کە بە ئەحمەدەفەندی دەگوت چی بکاو، هەر ئەویش بوو کە غەریزە دڕەکانی خورشید ئاغای کەوی کردوو هەر ئەویش بوو کە گفتوگۆی لەگەڵ ئاغا خۆشناوەکان کرد تا هەڵوێستێکی ڕاست و دروست وەرگرن. لەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن نەبێ پیاوێکی وەك ئەو سادەو ساکارم نەدی. ئەو گوێ لە سوپاسگوزاریەکانی من ڕاناگرێ، بەڵکو دەڵی کە ئەو هەوڵ دەداو هەمیشەش هەولیداوە، بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی و میللەتەکەی.

کەچی هێشتا هەموو شتێك تەواو نەبوو، هێشتا هەندێ شت مابوو کە پێیەوە هیلاکبین و لێ ی بترسین. دوای شێوکردن خورشید ئاغا هاتە ئۆردوەکەو،

پێچەوانەی جاران، هەڵچوبوو. ئامۆژگاری کردین ئامادەی ڕاکردن بین، دڵنیاشی کردینەوە کە لەهەمان کاتدا چی لەدەست بیّ دریّغی ناکا تا ڕێگە لەو شتە ناکاوە بگریّ. ئەو حاڵەی خورشید ئاغا وایلیّکردین کە پێمان وابیّ هەڵوێستەکە بەڕاستی زۆر مەترسیدارە. بەڵام ئەمجارەیان ئەحمەدەفەندی ئارامی بەدڵ و دەرونمان دایەوە. وا دیاربوو پیلانگێڕی ترسناک، ساڵح بەگ، دوای ئەوەی شەو باڵی بەسەر دنیادا کێشابوو، سواری ئەسپەکەی ببو هاتبۆوە ناوشارو چوبوە ئەو شوێنەی کە ئاغا دزەییەکانی لیّ کۆببونەوە و هاواری کردبوو: (ڕاکەن، ڕاکەن، سورچیەکان شالاویان بۆ هێناون) دواتر دەبێتە هەراوزەناو دەوریە بە هەموو لایەکدا دەنێردرێن. ئەوانەش هەر خێرا دەگەڕێنەوە و دەڵێن کە هیچ نیشانەیەك لە ئارادا نیە کە هێزێکی دوژمن بوونی هەبیّ. ئا لێرەدا ئاغا دزەییەکان درك بەو فێڵە دەکەن کە لێیان کراوە، ئیدی ئاغا گەنجەکان دەیانەویّ ئەو خاینە بگرن و بیدەنە دەست من، بەڵام، کە خورشید ئاغا گویّ ی لەوە دەبیّ ڕێگا نادا و دەڵیّ: (ئەوە پێچەوانەی داب و نەریتی عەشایەریە و لەگەڵ ڕێسای میوانداری ناگونجیّ). ئاماژە بۆ سالح بەگ دەکا کە شارۆچکەکە بەجێبێڵیّ و ئیدی بە سەرشۆڕی و تێکشکاوی دەڕواو، کارەکەش تەواو دەبیّ. لەگەڵ ئەوەی ئێمە ئاگاشمان لەوە نەبوو، کەچی سورچیەکان وازیان لە پڕۆژەکەیان هێنابوو خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئامانجێکی دیکە لە نزیك (گرد مامك) لە زیّ بپەڕنەوە. هەر هێندەی ڕۆژی سێزدەی مانگ هات، ئەو حاڵەتی گەمارۆیەی تێیدا بوین کۆتایی هات. وا پێدەچوو کە بارودۆخەکە هەمووی گۆڕابوو، ئەو هەورە ڕەشەی ماوەیەکی درێژ بەری ئاسمانی گرتبوو ڕەویەوە و، ڕایکرد.

سواری ماشێنەکەم بوم و ڕەحمان ئاغام لەگەڵدابوو بۆ پێشوازی ئەو دەستەیە چوین کە لە کەرکوکەوە هاتبوون، ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە ئەگەر پێویستی کرد بۆی بسەلمێنم، کە سەربازەکان بەڕاستی هاتوون. ئەوەی دەرونی پڕ لە گوشادی و خۆشی دەکردم ئەوەبوو کە جارێکی دی ئەو دەشتە پان و بەرزو نزمە ببڕم و ئەو هەوا پاکەی پایز هەڵمژم. دیتمان کە دەستەکە لەلای قوشتەپە هەڵیاندابوو، بە دیتنیان زۆر دڵخۆش بووین، بەڵام ئەوان لەوە دەترسان کە هاتنەکەیان زۆر دواکەوتبیّ، بۆیە زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکردین. هێزەکەش لە سریەیەکی

پیادەی بەریتانی و دوو دەستە سوارەی هیندی پێکهاتبوو. بەدڵێکی پڕ لە گوشادیەوە گەڕاینەوە هەولێر و گروپانێکی (نائب عریف) نەخۆشیشمان لەگەڵ خۆماندا هێناو لە ئۆردوەکەمان دانا.

ئەو شەوە هەر چوار ئاغا دزەییەکان لەگەڵ ئێمەدا خەوتن، مەبەستم: خورشید ئاغاو ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود و ڕەسوڵ ئاغایە و لەگەڵ جەمیل ئاغای گەردی، ئەمەش وەك لایەنگیری یەککرتویان بێ، بێ دەست و پێوەند لەوێ مابونەوە. تا ئەو دەمیش لە (کودەتایەك) دەترساین کە حاجی ڕەشید ئاغا یان یەکێك لە دەستەکەی بیکاو، بەچاوی دیدەوانیەوە چاودێریمان دەکرد، بەڵام ئەو شەوە بەهێمنی و ئارامی تێپەڕی.

بەیانیەکەی چواردەی مناگ زوو لەخەو هەڵساین و لەگەڵ دەستەیەك لە سەربازەکان سواربوین و مشیر ئاغاشمان لەگەڵدابوو چوینە پێشوازی ئەو دەستەیەی کەرکوك کە پێشبینی دەکرا یەکەمجار بگاتە جێ. لە نۆیکی کاتژمێر نۆو نیوی بەیانی لەگەڵ ئەو دەستەیە هاتینەوە ناو شار، لەکاتێکدا هەموو خەڵکە عەشایەر و خەڵکی شارەکە، بەدڵخۆشیەوە لەسەر لێواری ڕێگەدا وەستابوون و هەندێ لە ژنەکان هەلهەلەی سەیریان لێدەداو بەخێرهاتنیان دەکردین، ئەو هەلهەلانە لە زەماوەندو پرسەکانیش لێدەدرێن. دەستەکەی موسڵیش گەیشتن کە لە سریەیەکی سوارەی هیندی و دوو دەستەی پیادەی هیندی پێکهاتبوون و دوو تۆپیشیان پێبوو. هەموو هێزەکەش لەو شوێنە هەڵیاندا کە من بۆم دەستنیشان کردبوون. خەڵك بە دەستە و تاك تاك بۆ دیتنیان دەهاتن و فرۆشیارە دەستگێڕەکان میوە و پسکوێتو جگەرەیان بۆ هێنابوون، لە کاتێکدا دەستی خورشید ئاغا و ئەحمەدەفەندیم گرت تا گەڕانێکی پشکنین بەناو سەربازگەکەدا بکەین. ئەودەم گەڕاینەوە ماڵەکەمان، بەشێوەی جاران دەستمان بە ژیانمان کردەوە، ئەگەرچی پێشتر کول و کەسەر و مۆتەکەیەکی ترسناك تا ماوەیەك باڵی بەسەردا کێشابووین.

دوو هەفتەی بەرایی ئەیلولی (١٩٢٠) هەمیشە وەك سەرچاوەیەکی سروش و ئیلهام دەمێنێتەوە، ئێستا مەترسیەکانیان نەماو بەسەرچوون، ئەوەی لە ئەقڵی منیشدا مایەوە تەنیا ئەو هەڵچونە توندە بوو کە لەگەڵ ئەو دوو هەفتەیە

دروستبوو، وەك ئەو کەڵەکێویە سەرکێشەی سەرچڵی دەکاو، دڵسۆزی و لایەنگیری هاوڕێکانیشم، لەوانەش باسی ئەوەم کرد کە جڵەوی کارەکانی گرتبوو مەبەستم مەلافەندیە، بەڵام ئەو دوەی کە لەتەنگی ڕۆژەکان و بارگرانیان ئازاریان چەشت ئەحمەدەفەندی و خورشید ئاغا بوون. ئەوەی یەکیەمیان چەندین ڕۆژ تامی خەوی نەکرد و بەردەوام لە هاتوچۆ و هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری دابوو بۆنی دوا تەڵەکە و پیلانەکانی دەکردو، ئەو هاوڕێ دوو دڵانەی هاندەدا کە نە ئەولا بگرن و نە ئەم لاو، سەرکێشی لەگەڵ ئەوانەدا دەکرد کە هەرگیز گومان لە دوژمنکاریان نەدەکرا لەو ڕۆژە تەنگانەداو لە کاتێکدا کێشەی سواراغا خەریکبوو ببێتە پاچێکی تێکدەر. ئەقڵە چالاکەکەی هەمیشە لە نەخشەکێشانی خۆدەرکردن و (میانڕەوی) دابوو، جارێك داوای لە ئاغا دزەییەکان و جارێکیش لەمن دەکرد کە لە داواکانمان نەرم بین.

سەرەڕای دڵسۆزی و لایەنگیری بۆمن دوو دڵی ڕاستەقینەی ئەو لە هەولێری خۆشەویست و ئازیزی دڵیدا چڕ ببۆوە لەگەڵ خەڵکەکەیی و ئەو دیانە هەژارانەی کە لە عەنکاوە بوون. ئەو دوو ساڵە کە لە پۆستی (سەرۆکی شارەوانی) بوو ژیان و گیانی خۆی بۆ چاودێری و پاراستنی چینە هەژارەکان تەرخان کردبوو، بۆ ئەوەی لە جەور و ستەمی ئاغاکان بیانپارێزێ. ئێستا بەچاوی خۆی دەیدیت، ئەوانەی خۆشیدەویستن، مەبەستم پیشەگەران و خاوەن دوکان و هەتیو و بێوەژنەکانە، کە مەترسی وێرانیەکی بێوێنە هەڕەشەیان لێدەکا. لەکاتێکدا کە مەلافەندی شکۆیەکەی دەیپاراست و پیاو ماقوڵەکانی دیکە بە نیشاندانی دۆستایەتی هەردوولا خۆیان دەپاراست، ئەحمەدەفەندی بە دڵسۆزیە قوڵەکەی بۆ (مەبەستەکانی)، سەرچڵی بە ماڵ و خانەوادە و ژیانی خۆیەوە دەکرد.

خورشید ئاغا جۆرێکی تەواو جیاواز بوو، تا ئێستا نەمزانیبوو کە خۆی و خانەوادەکەی، ئەوەندەی پەیوەندی بە پاراستنی منەوە هەبێ، ئەوان وەسیەتی ئیبراهیم ئاغای کۆچکردو جێبەجێ دەکەن. من لەوەش دڵنیام کە ئەگەر (ئاغا) (مەبەستی ئیبراهیم ئاغایە) خۆیشی زیندو بایە، هەرگیز بەو شێوەیە بەردەوام و یەك مەبەستیە خزمەتی نەدەکردم و، ئەقڵە باڵاکەی چارەسەرێکی میانڕەوی بۆ ڕزگارکردنم دەدۆزیەوە بێ ئەوەی هەستی ئاغا کوردەکانی درواسێی بریندار بکا.

ئیدی هەر چۆنێك بێ، هەر کە ئەو ڕایە بۆ خورشید ئاغا ڕون بوەوە کە ئەرکی ئەوە لەگەڵ منداب، ئیدی هیچ شتێك نەیتوانی ئەو مەبەستە بگۆڕێ کە هەوڵی بۆ دەداو کەیفی پێ ساز بوو. لەکاتێکدا کە خزمایەتی ئەو بەڕاست و چەپدا لەهەژان بوو پیاو ماقوڵ و ئاغاکانی دیکە هەموو کارێکیان دەکرد بۆ ئەوەی ناچاری بکەن من شەرمەزار بکا، هەرچەند گەیاندرابوە ئەو باوەڕەی کە حکومەت لەدوا هەناسەکانی دایە، بەڵام ڕەتیکردەوە بستێك لە هەڵوێستی خۆی لابدا. جارێکیان (ئەبو ئاغا) لەمزگەوت بە تەنیا دەیبینێ هەزار پاوەندی زێڕی دەداتێ تاکو تەنیا فشار بخاتە سەر من بۆ ئەوەی حاجی سەعید ئاغای برای بەربدەم کە لەبەر ئەوەی عەریف میسۆنی کوشتبوو لە بەندیخانەبوو، بەڵام ئەو بەرتیلەی بەتوندی ڕەتکردەوە. لەبەربەرەکانی کردنی خەڵکانی گێرەشێوێن و پشێوی ئەو برپرەی پشتی بەرگریمان بوو. ئەو ڕەتی کردەوە کەلەکەی قوڵ بکاو نەرمی بنوێنێ، تەنانەت لەکاتێکیشدا من و ئەحمەدەفەندی ئامادەی ئەو کارە بوین. دەسەڵات و دامەزراوی ئەو هۆکاری دەربازبوونی ئەو شارۆچەکەیە بوون لەوەی هێرشی بکرێتە سەر، چونکە ئەگەر ئەومان لەگەڵدا نەبوایە ئەوا لەگەڵ گەیشتنی یەکەم نیاز خراپیی شێخ عوبەیدوڵڵا ناچار دەبوین ڕابکەین. لەهیچ کوردێکدا ئەو دامەزراویە بەهێزە و تاك مەبەستیە بێ خەوش و بێ خۆپەرستیەم نەبینی، خورشید ئاغا لەو بوارەدا نمونەیەکی باڵایە. ئەمەش لەو ڕۆژە ڕەشانەدا دەرکەوت کە هەولێر تیایاندا کەوتبوە ژێر هەڕەشەی عەشایەرەکان.

◆

# بەشی بیستەم
# بنیاتنانەوە

بەر لەوەی بچینە کۆتایی (چیرۆکەکەمان) وا باشترە کە بەوردی لەو هۆکارانە رابمێنین کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ئەو پشێویانەی لە دوو بەشی پێشتر باسیان کرا. بە دودڵیەکی زۆر کەمەوە بڕیاری ئەوە دەدەم کە جەماوەری خەڵك لە هەولێرو کۆیە و ناوچەی خۆشناوەتی لایەنگیری حکومەت بوون. ئەوان بەردەوام خەریکی کارکردن بوون و، ئارەزوی (باج) دانیان هەبوو، بەرامبەر سەلامەتی و پاراستنیان لەشەڕی ئاغا چاوچنۆکەکانیان و کە ئەمەش دوو شت بوون کە بەڕێوەبردنێکی دڵسۆز بۆی دابین دەکردن. لەکاتی دروستبوونی پشێوی لە لیوای (پارێزگای) هەولێر، هیچ ڕوداوێکی تالآنکردن و ڕوتکردن روینەدا، کەسیش هەوڵی ئازاردانی فەرمانبەرەکانی ناحیەکانی نەدا، یان هەوڵی برینی هێڵە سەرەکیەکانی بروسکەی کەرکوك و موسڵیان نەدا، ئەگەر مەرگیش حەماغای نەبردایە ئەوا لە کۆیەش هەموو شتێك بەباشی و خۆشی بەڕێوە دەچوو. هەڵوێستی ئاغاکانی خۆشناو و بڕێکی کەمی ئاغاکانی ئەو شارۆچکەیە وایکرد کە ئەو شوێنە لە جڵەو هەڵتیزێ. سێ چوار ڕۆژ بەر لە هەڵگیرسانی پشێویەکان بە ناوچەی خۆشناوەتیدا گەڕام و، تەنانەت لە گوندە دورەکانیشدا، وەك سەروکارێکی دڵسۆز پێشوازی کرام. لێرەشدا، دەبەنگی قادر بەگ و (ئاوا: ئۆبالێ بەستۆی نووسەر: و.ع) چاوچنۆکی و ئیرەیی خزمەکانی بوونە هۆی دروستبوونی خۆپیشاندانی نەیارانە. کاتێ ئاغاکان دیتیان کە پیاوەکانیان گوێڕایەڵیان ناکەن ئەودەم لەو گەوجیەیان پەشیمان بوونەوە.

بەهەر حاڵ کارەکە لە ڕەواندوز جیاواز بوو. خەڵکەکەی ئەوێ ڕەقەکار و دەبەنگ و نەزانن و، زۆربەی گوندەکانیشیان ناتوانرێ بەهاسانی بیگەیتێ و خاکی

ناوچەکەشیان بەپێت و دەوڵەمەند نیە، بۆیە ئەگەر پشێوی هەبێ ئەوا جوتیارەکان کەمتر زیانیان لێدەکەوێ. سورچیەکانی ناوچەی ئاکرێش بۆ ماوەیەکی درێژو، بەردەوام ڕکابەری حکومەتیان کردو، ئەمەش تاڕادەیەك لە سزادان دوربوو، ئەمەش سروشتی ئەوەی دایە براکانیان لە دەشتی هەریر کە لەسەر پێودانگی ئەوان بڕۆن و ئەو پشێویانەی کە لە باکوری (زێ)دا ڕویاندا ژمارەیەکی زۆری لە هێزی ژاندارمە پێویست بوو لەناویان بێ. بۆیە زوڵمی ئەو ژاندارمانە و داگیرکاریان وایان کرد کە ئیدی حەوسەڵەیان نەمێنێ و، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆرکەم گلەییان لە دەستتێوەردانی حکومەت هەبوو، لە کاروبارەکانیاندا. چونکە لە برێکی کەمی باج زیاتر داوای هیچیان لێنەکرابوو، وەکچۆن یەك تۆز ورورژانیان پێویست بوو هەلی تالآن و بڕۆبقۆزنەوە. گیانی ڕاڕایی لە ڕەگە قوڵەکەیدا خۆی مەڵاس داوە و، ئەو گیانەش لەباشورەوە بەرەوسەر تەشەنەی کرد و، هانی ئەوانەیدا کەگلەو گازاندەیان هەبوو پشێوی دروستبکەن، لە کاتێکدا کە حکومەت لە شوێنی دیکەدا زۆرسەرقاڵ بوو و هیچ سەربازێك لە هەولێردا نەبوو. ئەمەش نیشانەیەکی ئاماژەبەخشی نیاز پاکی بوو بەگشتی، کە سەرەڕای ئەو بارودۆخە بێ هیوایەش، گرنگترین هەرێمی ناوچەکە، مەبەستم هەولێرە، بەخۆ ڕاگری و چەسپاوی مایەوە و، لەمەودای چەند ڕۆژێکی کەمیشدا توانرا بێ هیچ پیادەکاریەکی تەمێ کردن ئارامی و ڕێکوپێکی بگەڕێنرێتەوە شوێنی خۆی، تەنیا دەشتی هەریرو ڕەواندوز نەبێ.

ئێستابا بەچێژەوە سەیری ئەو ڕۆڵە بکەین کە نوری لەو ڕوداوانەدا گێڕای. ئایا بێ هاندانی ئەو سورچیەکانی ئاکرێ لە ڕوبارێ دەپەڕینەوە و پشێویان لە هەموو ناوچەکەدا دروستدەکرد؟ ئەستەمە وەلامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە. لەگەڵ ئەوەی کەمن باوەڕێکی پتەوم بەوە هەبو کە بونی(پەنابەرەکان) نایەلێ کارێکی ئاوا بکەن، بەلآم گومانی تێدانیە کە سورچیەکان زۆر هەولیاندا شالآو بکەنە سەر دەشتی هەریر و(١) داخی خۆیانی پێ برێژن و، ئەگەری ئەوەش هەیە کە کاتێ حکومەت لە حالەتێکی شلۆقدابوو، ئەوان ئەو هەلە بقۆزنەوە، جاچ نوری لە ئارادابوایە یان نا.بەلآم دەبێ بڵێین کە نوری پشکۆکەی هێناو ئاگرەکەی کردەوە و، کڵپە وێرانکەرەکەی بەرزبوەوە.

نابێ ئەوەشمان لەبیربچێ کە براکانی نوری چۆن بەخوێنساردی کوژران. ئەمەش هەست و سۆزی کوردەکانی ناوچەکەی وروژاند، پێدەچوکە تۆڵەی خوداو خەڵك بەسەر ماڵی(ئیسماعیل بەگدا) برژێ. بەزەیی خواوەند هەولێری رزگار کرد و، سورچییەکانی سەروەشێن کرد و گێژبون. بۆیە لە کاتێکدا نێچیرێکی هاسان چاوەڕێی دەکردن، دەسبەرداری بون و بەدوای یەکێکی دیکە کەوتن، کە تەنیا ماڵوێرانیان لێیەوە دەسکەوت. لە ڕۆژی دەی ئەیلول، شێخ عوبەیدوڵلاّ بە شێخ مەعروفی وتبو کە بزوتنەوەکانی ئەو پەیوەستن بە قادر بەگەوەو ئەگەر ئەو(سەرکردەیە) پێی بڵێ هێرش مەکە سەر هەولێر، ئەوا نایکا. ئەمەو منیش نازانم کە ئەم دەگەڕێتەوە بۆ کردەوەی قادر بەگ و ئارەزوی ئەو یان نا، بەلاّم ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە هێزی وسورچییەکان لە ڕۆژی دوازدەی ئەیلول، لە ناکاو دەسبەرداری پرۆژەکەیان بون و بەرەو ئەو کەڵەکە چون کەلای گردمامك لەسەر زێی گەورەبوو، ڕۆژی دواتر لەزێ پەڕینەوە و لە ڕۆژی چواردەی مانگ شالاّویان بۆ ڕێگەی نێوان موسڵ و ئاکرێ برد. هێرشەکەیان زۆربە توندی بەرپەرچ درایەوە، بۆیە دوای ئەوەی زیانێکی زۆری گیانیان لێکەوت رایانکرد. پەنابەرەکان سەریان لە دونان و لەکاتێکدا دەیانویست جارێکی دیکە لەزێ بپەڕنەوە، شالاّویان بۆبردن و دیسان زیانی زۆریان لێکەوت و دەڵێن گوایە ژمارەیەکی زۆریان لە ئاودا خنکان. ئەمەش لە بەشی سەروی زێ و لەبەرامبەر چیای قەندیل ڕویدا(٢)، ئەو ڕوداوانەش ورەی ڕوخاندن و شکۆشیان لە ناو عەشیرەتەکانی دەوروبەریان دابەزی.

برێکی کەمی چیرۆکەکەماوە کەباسی بکەین. ڕێوشوێنی ئەوە ڕێکخرا تالە کۆتایی ساڵدا بچمە هیندستان و ئەرکی نوێ بگرمە ئەستۆ. کاتێ(سێرئەر نۆڵد ویلسۆن) لە هەشتی ئەیلول سەردانی کردین، کە بەبۆنەی ئەو گواستنەوە یە مۆڵەتێکم بداتێ تالە ئینگلتەرە بەسەری ببەم. لە پازدەی ئەیلول بروسکەیەك هات کە مۆڵەتم پێدراوە، ئەمەش کارێکی سەیر بوو، لە بروسکەکەشدا هاتبوو کە پۆستەکەم بە(ڕائید مارشاڵ، یارمەتیدەری حاکمی سیاسی ئاکرێ) بسپێرم. لەوبارەیە وە نارەزاییەکم پێشکەش کرد و داوای مۆڵەتم کرد تا بەرلەوەی برۆم لیواکە(پارێزگا) ڕێکبخەمەوە، بۆیە کارەکە بەشێوەیەك جورکرا کە دەسبەرداربونم لە سەرەتای تشرینی یەکەم بێ. بۆیە هەر یەکسەر دەستم بە چاکردنەوەی

دەزگای بەڕێوەبردنە پەرتەوازەکەم کرد و، سەرچاوەی یەکەمی پەشێویەکەشم هاندانی قادربەگ و هاوڕێکانی بوو تادوبارەسەردانی هەولێر بکەنەوە، بۆئەوەی دەربارەی ئەو کێشە دیارانەی نێوان ئەوان و حکومەت بگەینە چارەسەرێکی گونجاو. بۆم دەرکەوت کە ئەمەش زۆر لەوە ئەستەم ترە کە هیوام دەکرد، چونکە بە هۆی پیلانەکانی کە دوژمنەکانم لە هەولێر پیادەیان دەکرد، ئاغاکانی خۆشناو پێیان وابوو کە لەپشت ئەوکارەوە دەمەوێ بیانخەمە تەڵەوە. تاکو(٢٤)ی ئەیلولیش غیرەتیان نەکرد و نەوێران بێنە هەولێر.

هەر یەکسەر بە گەیشتنی هێزە سەربازیەکان حکومەت شکۆی خۆی بەدەستهێنایەوە. وەك بەرلە پشێویەکان، ئەرزوحاڵ داڕژانە سەرمان و، جوتیارەکان دەورەی ئەو فەرمانبەرانەیان دابوو کە لە یەکە بەڕێوەبردنەکاندا کاریاندەکرد و قیستی یەکەمی ئەو باجانەیان هێنابوو کە لە داهاتی گەنم و جۆدا بەسەریاندا سەپێندرابوو. ژاندارم و سەربازەکانم، ئەوانەی دەسبەرداری کارەکانیان ببون سەردانیان کردەوەو تکای گێڕانەوە سەرکاریان دەکرد، لەمەودای یەك هەفتە دا کارە ڕوتینیەکانی جاران گەڕایەوە و، بە باشترین شێوەکاردەکرا. تاکە شتی نوێ ئەوەبوو کە بەتکای خورشید ئاغا، حامیەم لە هەردوشوێنی مەخمور و قوشتەپە دانا، کە لە چەکدارە عەشایەرەکان پێکهاتبوو نەك ژاندارمە نیزامیەکان.

دوای نیوەڕۆی پازدەی ئەیلول لەگەڵ خورشید بەگ و ئەحمەدەفەندی سەردانی شێخ مستەفامان کرد تا سوپاسی ئەو هاوکاریانەی بکەین کە لەکاتی پشێویەکاندا پێشکەشی کردبوین. ئەو نیشتەجێی لای ڕۆژهەڵاتی دەورروبەری شاربوو لەبەر ئەوەی موریدی زۆری هەبون کە لەگوندەکانی نزیك ئاوی بەستۆڕە دادەنیشتن، بەباشی زانیاری دروستی پێدەداین. سەرەڕای ئەو فەتوایە ئاینیەی کە هێرشکرنە سەر هەولێری ڕیسوادەکرد و بانگی موحەممەدیە پاکەکانی دەکرد کە هاوکاری حکومەت بکەن، ئەمەش کردیە هۆکارێکی چالاکی پاراستنی هاوڕێیەتی عەشیرەتە غەیرە کوردیەکانی کە لە نزیك شارۆچکەکە نیشتەجێ ببون.

لە ڕۆژی(١٨)ی مانگدا سەید تەهای شامدینانی کە پیاوێکی بەڕێز بوو گەیشتە هەولێر. ئەو لە ناوچەکانی باکوری ڕەواندوز و لەهەر دووبەری سنوری فارسی

پێگەیەکی وەك پێگەی شێخ مەحمودی هەبوو لە سلێمانی، بەرلە داگیرکردنی بەریتانیا. بەدرێژایی چەندین نەوە خانەوادەکەی ئەو بەردەوام لەو ناوچەیەدا دەسەڵاتداربون. باپیری ئەو شۆرشێکی مەزنی دژی تورکەکان بەرپا کرد و بەهیوابوو سەربەخۆیی نەتەوەیی کوردی بەدەستبێنێ، وەك چۆن شێخ عەبدولقادری مامی ڕێزێکی گەورەی لای سوڵتان عەبدولحەمید هەبوو. لە ڕۆژی ئێستاشدا بەکەسێکی گرنگی ئەستەمبوڵ دادەنرێ. ساڵی ڕابردوو وابەباش زانرا کە شێخ(تەها) وەك شێخ موحمود بکرێتە(حوکمدار) و ڕەواندوزیش بچێتە ژێر قەڵەمڕەوی ئەو. هەرچونێك بێت، دانوستانەکان لەبەر داواکاریە زۆرەکانی ئەو، وەلانران. بەڵام ئێستا دەسەڵاتی ئەو تاڕادەیەك لە کورتی داوە، ئەمەش بەهۆی کەسایەتی(سمکۆ)ی (٣) سەرۆك عەشیرەتی شکاك و، لەگەڵیشیدا هاوپەیمانە. هەر چۆنێك بێت، تائێستا ئەو پیاوە گرنگی خۆی هەیە، هۆکاری دانیشتنێکم لەگەڵدا ڕێکخست کە لە(ڕایات)ی(٤) سەر سنور ئەنجامبدرێ و کاتەکەشی خرایە هەفتەی یەکەمی مانگی ئەیلول، بۆ ئەوەی دەربارەی ئەو کاروبارانە لێکۆڵینەوە بکەین کە پەیوەندیان بە دەسپێشخەری پەنا هەندە دیانەکانی (ورمێ)(٥)وە هەبوو. هەر هێندەی گەیشتنە شوێنی دیاریکراوو گوێی لە دەنگوباسی ئەو پشێویانە بوو کە بونە ڕێگری یەکتر بینینمان، ئیدی گەشتێکی ئەستەمی بەوچیایانەدا کردبوو کە دەیگەیاندە ڕانیەو، لەوێ ئیسماعیل بەگ دەبینێ و لەگەڵ خۆیدا بەرێی کۆیەدا بۆ هەولێری دەهێنێ.

بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە ماڵەکەمدا ئامادەبوو، مەلافەندی لەگەڵدابوو. جلی ئەسپ سواری ئەوروپی لەبەردابوو، مێزەرێکی جۆری عارەبی لەسەر نابوو بەشەدەیەکی دوڕەنگ پێچابویەوە، کە زێرین و سەوزبوو. لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی لەبیست و هەشت ساڵ تێنەپەڕیبوو کەچی پیاوێکی کە تەبوو بالأی لە شەش پێ زیاتر بوو، گۆشتن بوو، کەللەی گەورەبوو ڕومەتەکانی شۆڕبیونەوە و دوچاوی بچوکی تیژی هەبوو. ئەو لە ڕوسیادا گەڕابوو زمانی ئەوێ بە باشی دەزانی و فەڕەنسیشی دەزانی، توانای ئەقڵی زۆر باڵابوو، ئەو ئەقڵیەتی گفتوگۆی ئەوروپی و سروشتی تەڵەکەبازی ڕۆژهەڵاتی بەیەکەوە کۆکردبوەوە. چوار ڕۆژ لە هەولێر مایەوە، لە هەموو ڕۆژەکاندا گفتوگۆم لەگەڵداکرد و، قسەکانمان چەندین

کاتژمێری پێدەچوو، هەستم دەکرد مورێدێکم کە گفتوگۆلەگەڵ سوکرات دەکا. لە(٢٠)ی مانگ دەستم گرت و بۆ بینینی (عەقید نۆڵدەر) بردمە گوێر، کە بۆ ماوەی کاتژمێرێك لەبارگرانی وەڵامدانەوەی پرسیارە وردەکانی، پشومدا. ئێمە بانگێشتمان کردبوو تا دەربارەی گۆڕینەوە(مەبەستی مەسیحیەکانی ورمێیە) گفتوگۆی لەگەڵ دا بکەین، کەچی ئەو لەلایەکی دیکەوە، لەوهاتنەی هیوای دابینکردنی هاریکاری بەریتانیای هەبوو، مەبەستم چەك و دارایی پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ. بڕێکی زۆری لە زیرەکیەکی باش دەرخست و، بەتایبەت دوپاتی لاوازی ئێمەی کردەوە لە کاروباری پڕوپاگەندەکردن، چونکە ئێمە هەوڵێکی زۆرمان بۆ دژایەتی کردنی درۆکانی(حیزبی شەریفی) و(نیشتمانیە تورکەکان) نەخستبوە گەڕ، کە درۆودەلەسەیەك بون لە ناو ڕیزەکانی کوردەکان و لەهەموو شوێنێك بڵاو دەکرانەوە. ڕەنگە ئەو هەوڵانەی دابوشمان ئەوەندە نەبوبن ئەو لانیکەم، دوهاوپەیمانی عەشایەری گرنگ لە باکورهەن کە کاربۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ دەکەن و، زۆریش لەسەر ئەوەسوربوو کە پێویستە یارمەتی دروستکردنی بدرێ بۆ ئەوەی ببێتە کۆسپێك لە بەردەم مەترسی ڕوسی، کە ئەمەش مەترسیەك بوو زۆر بەزیادەڕۆییەوە گرنگی پێدرابوو، هەر هێندەی بەبیرۆکەکانی دەربارەی ئەو بابەتە بێزاری کردم، کە بەتەواوی بێزاربوم، ئیدی بەلاوەکی باسی گۆڕینەوەکەی کردو بەڕەخنە بەربوە گیانی پرۆژە پێشنیار کراوەکە. لەبەخت ڕەشیان ڕۆژێك کەلە ماڵەکەی مندابوو، باسی ئەو بابەتەی دەکرد، چاوی بەڕۆژنامەیەکی وێنە دارکەوت کە لەسەر مێزەکە دانرابوو، کردیەوە و وێنەی ژنێکی بەجلی ڕۆژهەلاتیەوە دیت و ئاخی هەڵکێشاو وتی: (ئەوە کێیە؟) پێم گوت کە ئەمە وێنەی(سورمەخانم)ە، یەکەم باڵیۆزە، کە نوێنەری سریانیە دیانەکانە لە لەندەن. وتی: (بزانەها، ئەو دیانانە بەسەلامەتی نایەنەوە وڵاتەکەی خۆیان، ئەوان چاویان لەوەیە ببنە نەتەوەیەکی مەزن و، کوردەکان ببنە ژێر دەستی ئەوان، بۆیە باڵیۆزیان لە لەندەن هەیەو، ئەمەش لەوە پترە کە ئێمە هەمانە. خودی ئەو ژنە، مەبەستم ئەوەیە کە لە وێنەدا دەیبینی، کاتێ لە ساڵی بەسەر چوو لە بەغدا بوم، پیلانی بۆ کوشتنی من دانابوو.) هەموئەوەو من

هەربێدەنگ بوم و وەڵامێکم نەبوو. زۆر دڵخۆش بوم کە لە(٢٣)ی مانگداو لـە مـاڵی مەلافەندی سەید تەهام بەرێکردو ماڵئاواییم لێکرد.

ئیسماعیل بەگ ئێستا کەسێکی داڕوخاوو هەڵچوبوو، دوای ئـەوەی بیـستی کـە نـوری دەربـازبوەُ و، ئێـستا لـە هـەموو کاتێـك پـتر هـاڕدراوی ئـەو نەگبەتیانـەبوو کەبەسـەری هـاتبون. موڵکـەکانی خـۆی و موڵکـەکانی پاشـاش هـەموو بەدەسـت دوژمنەکانیـەوەبون و، ئێـستا لەسـەر ئـەو بەخشـشانە دەژیـا کـە برادەرەکـانی بەخێری خۆیان دەیاندایە. زۆرم بەزەیی پێیداهاتەوە، سـەرەڕای ئـەو کوشـتنانەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرپرسیاریان بوو، کەچی تا ئەوپـەڕی ڕادە مرۆڤێکـی باش بوو، وەکچۆن بەدڵسۆزی خزمەتی حکومەتیشی کردبوو. بەپلـەی یەکـەمیش ئەو پۆستەی لە ڕەواندوز بەسەریمدا سەپاند، بوە هۆی ماڵوێرانی ئەو. بەڵێنم پێدا کە لە ئێستادا بەردەوام موچەکەی بدەمێ. هەموو هەوڵێکیش بـدەم تاموڵکـەکانی دەستکەوێتەوە. دوای ئەوەی ماوەیەك لای ئێمە مایەوە دواتـر ڕۆیـشتە لای پاشـا پیرەکەی باپیری، کە گەیشتبوە دەرگەڵە تا دواتر بچێتە شـەقڵاوە و بچێتە مـاڵی ڕەشـید بـەگی زاوای. جـارێکی دیکـە ئـەو پیرەمێـردەم نەدیتـەوە، هەرچـەندە بەرلەوەی هەولێر بـەجێبێڵم نامەیـەکم بەخەتـە لەرزۆکەکـەی پێگـەیی کـە پڕبولـە خەمی ڕۆیشتنی من و هیوای ئـەوەی سورچیەکان بەسـزای خۆیـان بگـەن. دواتـر بیستم کە قادر بەگ توانیبوی جارێکی دیکە بیباتەوە ماڵەکـەی خـۆی لـە باتـاس. دەتوانم ئەو پیرەمێردە ڕاڕاو خەمبارە بێنەمە بەرچاو کە ئەو ڕوداوانە دەگێرێتەوە کەبونە هۆی لـە دەسـتدانی ڕەوانـدوز و دوپاتیـشی دەکاتـەوە کـە هەموشـتێك بـە باشی بەڕێوەدەچوو ئەگەر بە ئامۆژگاریەکانی ئەوم بکردایە.

لە(٢٢)ی مانگ (خاتو مارتن) بە سواری کەرە سپیەکەوە لـە شـەقڵاوەڕا هـات، کـە بـەر لـەمانگێك یـان دومـانگ چـوبوە ئـەوێ، تـاگرژترین بەشـی هـاوین لـەوێ بەسەربباو بەردەوام کارە تەبشیریەکانی لە ناو دیانە کەلدانەکان پیادەبکا. ئەو لە بنکەی کارەکەیدا مایەوە و لەو ڕۆژە تەنگانەدا هیچ شتێك توشـی ڕاڕایـی نـەکرد و زۆر کـاری بـۆ ئارامکردنـەوەی دڵـی ئـەو خەڵکـە کـرد کـە تۆقیبـون و، لـە هـەموو ساتێکدا چاوەڕێ ی سەربڕینیان دەکرد. خۆشناوەکان وەك ڕێ و شوێنی ئاسـایی خۆیان هیچ ئازارێکیان نەدان، چونکە وەك کۆیلەی بەسـوود سـەیریان دەکـردن و،

قادر بەگ بەڕێزێکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵ (خاتوو مارتن) دا دەکردو، بۆخۆی سەردانی دەکردو، گومانیشی تێدا نیە کە هیوای ئەوەی هەبوو لە ئاشتبونەوەی لەگەڵ حکومەتدا یارمەتی بدا. ئەو بەگاڵتەپێکردنەوە باسی ئەوەی کرد کە قادر بەگ کاتێ فڕۆکەکانی بۆ یەکەم جار لەسەر سیساوە دیوە چۆن تۆقیوە و گەڕاوەتەوە شەقلاوە. ئەو ئێستاش شڵەژاوە و پێیەکی لە پاشە و پێیەکی لەپێشەو، لە توڕەبونی من دەترسێ، چونکە ئێستا حکومەت لە هەولێر دەسەلاتی خۆی بەدەستهێناوەتەوە.

بەهەر حاڵ، لە (٢٤)ی ئەیلول ئازایەتی هاتەوەبەرو لەگەڵ ساڵح بەگ و مستەفا ئاغا گەیشتە هەولێر. هەڵوێستی ئەو دڵنیایی و ڕەزامەندی دروست دەکرد، چونکە ئەو ڕازیبوو هەموو شتومەکەکانی حکومەت بگێڕێتەوە و بە ئامۆژگاری ئەویش ڕێگەم بە دەزگا حکومیە کۆنەکەی ناوچەی شەقلاوەدا دەست بەکار بێتەوە. لە دانیشتنێکی تایبەتیدا، لەنێوان من و ئەودا پێیگوتم کە ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی و ساڵح بەگ لەڕێ ونکردنی ئەو و هاندانی خۆشناوەکان بۆ بەشداریکردن لە پشێویەکان، بەرپرسیارن، وەکچۆن بەڵێنی کوشتنی یەکەمیانیدا، کە ڕایکردبوو، ئەگەر ڕوی لە شەقلاوە کردەوە.وەکچۆن وتی کە لەکاتی ئێستادا پێویستە وازلە ساڵح بەگ بهێنێ، کەمنیش ئەودەم حەزم دەکرد چاوەڕێ بکا تا هەلی ئەوە هەڵدەکەوێ بەپێی تاوانەکانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

هەرچی مستەفا ئاغاشە، بەرامبەر خزمەتەکانی، بە زیاد کردنێکی کەمی موچەکەی خەلاتمکردو سەرپشکم کرد لە قەرەبوکردنەوەی زیانەکانی ئەو پیاوانەی کە لە(گەلی) لەگەڵمدابون.

ئێستاکە کێشەی خۆشناو یەکلایی کرابوەوە، ئیدی توانای ئەوەم هەبوو کە کارەکانم بەرەو کۆیە وەرچەرخێنم. (لێژنە چوارکەسیەکە) — هەرچەندە لە بەرگرتن لە پشێوی لاوەکیاندا دەستە پاچەبوو و دەستەیەك لە ئەشقیاکان شەوانە هێرشیان دەکردە سەر شارۆچکەکە — بەڕواڵەت هەڵوێستێکی بێلایەنیان هەبوو، لە پیادەکردنی ئەرکە حکومیەکاندا بەگشتی سەرکەوتوبوو تەنانەت لە

کاتی قەیرانە توندەکەشدا. هەڵسوکەوتی(مستەربات) لەزیرەکیەکی بێوێنەوە سەر چاوەی گرتبوو و وەك چۆن تەنیا بونی ئەو لەوێ ڕێگربوو لەوەی دوژمنان خۆپیشاندانی دڕاندانەبکەن و ئەو دەمای بە تەلەفۆن گفتوگۆی دوورودرێژم لەگەڵدا دەکردن و وام لە هەموو گەورەکانی شار کرد – رسول ئاغاو (مەتران)ی لێدەرچێ کە هێشتا لە تەریکی دەژیا – بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی هەنوکەیی، بێنە هەولێر. لەبەر ئەوەی هێزم نەبوو نەمدەتوانی سزای عەبدوڵلا ئاغا بدەم، بۆیە ناچاربوم هێوری بکەمەوە. وەختێك بەخەیاڵمدا هاتبوو کە بیکەمە فەرمانڕەوای شارۆچکەکەو، ئەویش لێوەشاوەترین کەس بوو کە بۆئەو پۆستە لەبەردەستدابێ، بەڵام سەرم سوڕما لەوەی کە نزیکترین خزمەکانی ئەوەیان قبوڵ نەبوو. بۆیە هەناردمە بەڕێوەبەرایەتی(تەق تەق) و بەمانگانەیەکی گونجاو ڕازیم کرد، بەمەش کۆیەم لە کەسێکی مەترسیدار پاك کردەوە. بڕیارمدا جارێکی دیکە جەمیل ئاغا بکەمەوە فەرمانڕەوای کۆیە و لە ڕێی پێدانی پۆستی بە موچە توانیم لایەنگیری ئاغا بچوکەکانیش بەدەست بهێنم.

لە(٣٠) ئەیلول جارێکی دیکە کاروان بەرەو کۆیە بەڕێکەوتەوە، کە نەقیب براد شۆی لەگەڵدا بوو بۆ ئەوە دەگەڕایەوە تا کاتێك لەوێ بەسەربباو، تیایدا، ئەگەر بتوانێ، ناوچەکە ڕێکبخاتەوە و، سەروسامانی حکومەتیش بێنێتەوە، کە لە نێوان پیاو ماقوڵاندا، بەجیاوازیەکانیانەوە، دابەشکرابوو. لەو ئەرکەی دواییشیاندا زۆر سەرکەوتوبوو، لەماوەدای چەند ڕۆژێکی کەمدا دولەسێ ی ئەو پارەیەی دەستکەوتەوە کە لەدوای خۆمان بەجێمان هێشتبوو. لە کۆتایی ئەیلولدا، ئەحمەد بەگ، کە لە عەشیرەتی زراری بچوکەو لە دەوروبەری(دێرە) نیشتەجێن، گوێڕایەڵی خۆی پێشکەشکرد و، بەمەش ناوچەی کۆیە و خۆشناوەتی و، ناوچەی ڕەواندوز، تا بابەجیجك – لە کاتی گەیشتنی ڕائید مارشاڵ بۆ ئەوەی شوێنی من بگرێتەوە – جارێکی دیکەو بەشێوازی ئاشتیانە، لەژێر دەسەلاتی حکومەتدابون.

تەنیا سورچی و ڕەواندوز مابون. لە(١٢)ی تشرینی یەکەمدا قادربەگ جارێکی دیکە بۆ ماڵئاوایی لێکردنم، سەردانی کردمەوە و، وتی کە سورچییەکانی دەشتی هەریر ئارەزوی ئەوە دەکەن ملکەچی خۆیان پێشکەش بکەن. بەهەرحاڵ کە ئەوان پشێویان لە ناوچەکەدا نابوەوە. دوای ڕۆیشتنم زانیم کە، دەستەیەکی تەمێ کردن ڕەوانەی دەشتی هەریر کراون و باتاسیشی گرتۆتەوە و، لە کاتێکدا سەربازەکان ماوەرانیان سوتاندوە چونکە ژاندارمەکان بە فێڵ لەوێ کوژران (لەجێی سندان قوزەڵقورتە). لە(٢)ی تشرینی یەکەم ڕائید مارشڵ گەیشتنەجێ. ئیدی خۆم بۆڕۆیشتن ئامادەکرد. لەپێنجی مانگ گەشتێکم بە ناوچەی هەولێردا کرد و ئەویشم بە دواوەبوو، سەردانی هەموو ئاغا دزەییە دیارەکانم کرد. دیتمان کە خورشیدئاغا بەماشێنە(فۆرد)ە تازەکەی زۆر دڵخۆشەکە (حاکمی گشتی پاشایەتی) لەبەرامبەر خزمەتەکانی پێشکەشی کردبوو(٦) .

لەحەفدەی تشرینی یەکەمدا نەقیب لیتدیل لە ئەنجامدانی تۆڵەسەندنەوەیەکی مەردانەدا سەرکەوتوبوو، کە من بەرلە ڕۆیشتنم دەمویست ئەو کارەبکەم، ئەو ڕۆژە بەشێك لە(دەستەکەی موسڵ) بەرەو بنکەی خۆیان دەگەڕانەوە لە کاتی نیوەڕۆ گەیشتنە سەربازگەکەیان لە نزیك (تەرجان) کە گوندی حاجی ڕەشید ئاغایە. ئیدی نەقیب لیتلدیل و چەند کە سێك لەگەڵ دوو سەربازدا سواردەبن و بەرەو دیوەخانەکەی حاجی ڕەشید ئاغا دەچن و، داوای دیتنی دەکەن. دەستوپێوەندەکانی دەڵێن(ئاغا) کەیان چوەتەناو مەرەزکانی بۆ پشکینینان، ئالێرەدا نەقیب لیتلدیل دەڵێ: (ئاە، بەڕاستی ئەوەخەمە، چونکە دەستەیەك سەرباز لە دەرەوەی گوند هەڵیانداوە و، پێویستیان بەجۆ هەیە بۆ ئالیك) ئالێرەدا حاجی ڕەشید ئاغا بەپێکەنینەوە لە ژورێکی(لابیان) (ئەو ژورەی دەرگای لەژورێکی دیکە دایە) دێتە دەرەوە، ئالێرەدا نەقیب لیتلدیل ئاوڕ لە یەکێك لەدو سەربازەکەی دەداتەوە و دەڵێ: (برۆ بە دەروێش ئەفەندی بڵێ لەمەودای پێچ خولەکی دیکەدا پێویستم بە ماشێنە). سەربازەکە کەوتەڕێ و ئامازە

پێویستەکەی گەیانـد، ئـەودەم دەسـتەیەك لەسـەربازەکان هـاتن و دەوری ماڵەکەیانـدا، حـاجی ڕەشـید ئاغـا گـیراو خێـرا بـۆ سـەربازگەکە گواسـترایەوە و، نارەزایی دەردەبڕی و دەیگوت بێ گوناهە. ئەو دەستە سەربازە بە دەسگیرکراوی لەگـەڵ خۆیانـدا بردیانـە موسـڵ. ئـەو دەسـگیرکردنە نارەزاییـەکی لـە نـاو پیـاو ماقوڵەکاندا وروژاند و، لەو چەند ڕۆژەکەمەی دواترداو، لە هەمو هەلێکی گونجاودا، داوای بـەزەییان بـۆ دەکـرد، تـاکو مۆڵـەتی ئـەوە وەرگـرم بەربـدرێ. دەسـتەیەك لەوانـە، لـەو کـارەدا، لـە خۆیـان دەترسـان و، دەستەکەی دیکـە کـە دڵخۆشـبون کەببینن گـیراوە، لەبـەر ئـەو نەریتـە باوەیـان بوکـە دەبـێ هـەموان بـۆ پاراسـتنی هەریەکێکیان یەك بگـرن، ئەگـەر بکەوێتـە بەردەسـتی حکومـەت، لـە ناودەسـتەی یەکەمیشد، عەلی پاشا، زۆر پەشۆکابوو.

لە ڕۆژی(١٢)ی مانگ نیوەڕۆ خوانێکم بۆ ئەو گەورە فەرمانبەرانـە سـازکرد کـە لەژێر دەستی منـدا کاریـان دەکـردو، ئەرکـەکانی پۆسـتەکەی خـۆم، وەك حـاکمی سیاسی، بە شێوەیەکی فەرمی بە ڕائیـد مارشـاڵ سـپارد. هـەموو ڕۆژی دواتریـشم بـەڕێورەسمی ماڵئـاواییکردن بەسـەر بـرد و، بەیانیەکـەی سـەردانی هـەموو پیـاو ماقوڵەکانم کرد و سەردانی شێخ مستەفا ئەفەندیشم کرد. دوای نیوەڕۆش سـواری ئەسپەکەم بـوم و بـۆ بینینـی مەلافەنـدی ڕێگـەی بـاداوەم گرتـە بـەر. دوای ئـەوە فەرمانبەرە هیندیەکان و ناوخۆییەکان ئاهەنگێکی ناوباخچەیان بۆ گێـرام و تیایـدا (ئەفسەرانی خەزێنە) وتارێکی پـڕ لـە پیـا هەڵدانیان خوێنـدەوە و، بەشـێوەیەکی گونجـاو وەڵامـم دانـەوە. هەلەکەشـم قۆسـتەوە تـا کاتـژمێرێکی زێـڕ پێـشکەشی ئەحمـەدە فەنـدی بکـەم کـە(حـاکمی گشتی پاشـایەتی بـەریتانی لـە عێـراق، لـە پاداشتی خزمەتەکانیدا وەك خەڵات بۆی ناردبوو،ئـەودەم چـاوەکانی فرمێـسکێکی زۆریان باراند. هەر ئەودەمی دوو بروسکە هـات کـە تیایـدا هـاتبوو میـداڵی(خاچـی ئاسنێن: M.C) بە نەقیب لیتلدیل و(میـداڵی سـەربازی) بـە سـەید عـەلی ئەفـەدی بەخشراوە، لەبەرامبەر ئەو ئازایەتیەی کەلە هێرشـەکەی سەرباتاسـدا نوانـدبویان،

سەید عەلی بەهەراو هۆریاوە لە و تارکێشانەکەی کە بۆی کرا بەشداری کرد و وەك منداڵێك هەڵدەپەڕی.

لەبەیانی ڕۆژی دواتردا کاتێ میلی کاتژمێر ئاماژەی بۆشەش ونیوی تەواو دەکرد، شێخ مستەفا ئەفەندی بەسەردانێکی تایبەت بە ماڵئاواییکردنم گەیشتەجێ. دوعای خێری بۆ کردم و(ئاوا ! : و.ع) تکای لێکردم نامەی بۆ بنوسم. لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەش هەموو پیاو ماقوڵ و فەرمانبەرەکان هاتن، کەنزیکەی شەست کەس دەبون. هەموان لە خواردنەوەی چایە و قاوە بەشداریان کرد و، بۆ دواجاریش پیاو ماقوڵەکان تکایان لێکردم تا دەستەبەری مۆڵەتی بەردانی ڕەشید ئاغا بکەم. تەوقەم لەگەڵ هەمواندا کردو سواری ماشێن بوم و ئەوانەی لەوێبون هەمویان بەدەوری ماشێنەکەدا دەسوڕانەوە بۆ ماڵئاوایی لێکردنم.

خورشید ئاغا و ئەحمەدە فەندی و ئەنوەرە فەندی فەرمانبەری دارایی سەرەکی و سەید عەلی ئەفەندی لەگەڵمدا هاتن. دوسێ کاتژمێر لە مەخمورماینەوە و بەشداریم لە دوا خواردنی کوردی کرد، کە ڕێکەوت بوو بیخۆم و، خورشید ئاغاو مشیر چیان لە تواناادا بوو کردبویان. بەخەمەوە ماڵئاواییم لێکردن و لەدورەوە سەیری مەخمورم کرد کە شێوەکەی وردەوردە ون دەبوو. هەریەك لە ئەحمەدە فەندی و سەید عەلی ئەفەندی و(عەلۆ)ی کوڕی خورشید ئاغا، تا سەر زێیەکە لەگەڵمدا هاتن، تاببینن بەکەلەك دەپەڕمەوە ئەوبەری، ئەودەم خواحافیزیم لە هەموان کرد و، دواشتێك کە دەربارەی ئەحمەدە فەندی بەبیرم بێتەوە، دیمەنی ئەو بوو کە بە داچۆڕاوی و بێ هێزی ڕاوەستابوو.

◆

# بەشی بیست و یەک
# کۆتایی

بەو جۆرە بە ناسۆرێکی تەواوەی بۆتەی شەیداییەوە کوردستانم لەپشت خۆمەوە بەجێهێشت و، لە خۆم دەپرسی: تۆبڵێی قەدەر جارێکی دیکە وام لێبکاتەوە هابەشی لە بەخشندەییە لە خۆبوردوەکەی بکەمەوە، یان ڕوبەڕوی مەترسیەکانی چیاسەختەکانی ببمەوە. ئێرە وڵاتێکە گەندەڵی نەگەیشتوەتێ و خەڵکەکەی ئالودەی نەبوون. دوڵ و شیوی وەهای تێدایە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان گەشتیارێکی ئەوروپی پێی تێنەناوە و، گەلێکی تێدایە کە بە فیترە و تا ئێستاش(لە سەردەمی زێڕینیدا) پەیوەستە بە پاکیزیەکی ساویللکەوە، کە مرۆڤایەتی لەسەردەمە بەراییەکانیدا ئاشنای بوە، سەردەمێك ڕێك وەك ئەو کوردانەی ئێستا دەژیان. تایبەتمەندیەکی پیرۆزی پاك لە ڕەگەزی مرۆڤدا هەیە و، مەبەستیشم ئەوەیە هەر هێندەی لێی دابڕا ئیدی ڕابردو لە حسێبی ئێستا وەدەر دەنێ و خەم بۆ ئەوشتانە ناخوا کە بەسەر چون و ئەو ئازارانەی چەشتونی و، تەنیا ئەوانەی وەبیردێتەوە کە خۆش و بەسودبون. بەو جۆرە تاڵان و بڕۆو کوشتنی کە لەسەردەمە تاریکەکاندا ناسرابون، ئێستا لە ژێر بەڕەی لە بیرچوندان و لە بۆتەی یادەوەریشدا لە ساویللکەیی لادێی و ڕەوشتی چەقۆسوین و مۆرکی منداڵیی ئەقڵی مرۆیی زیاتر شتێکی دیکە نەماوە.

ئەوەی کە لە(نوسەر) ڕویداوە ڕێك لەو شتە دەچێ، چونکە ئەو ماندوێتی و ڕاڕایی و، تۆقین و لە ڕزینەی لە کوردستاندا دوچاری بوو ئێستا ڕۆیشتن و نەمان، و تەنیا یادەوەری هەڵگەڕان بەچیا سەختەکانداو تێپەڕین بە دۆڵە قوڵەکاندا ماون و، لەگەڵ ئەو خۆشیەی کە لە دەروندا تیشکی دەدایەوە کاتێ نەریتێکی سەیرت

چاولێدەکرد و بە دوای ڕێساکۆنەکاندا دەگەڕای و، هەستت بە ڕەوشتسازیەکی کۆن دەکرد وچێژت لە نانبدەیی ئەو پیرە مێردانە وەردەگرت کەڕیشیان سپی ببوو، هەستت بەو گیانی تیغ سوینە دەکرد کە ئاغاگەنجەکان، کە خوێن گەرمبون، هەیانبوو، هاوڕێتیە خۆشەکەیان و بینینی جلوبەرگە ئالووالآکان و، برق و باقی خەڵکی ڕۆژهەڵات کە فیترەیەکی دروستیان هەیە. هەندێ جار هەست بەوە دەکەم کە دەتوانم قوربانی بە هەموو دوارۆژی خۆم بدەم تەنیا لە پێناو ئەوەی ئێوارەیەك لە مەخمور و لەگەڵ خورشید ئاغادا بەسەر ببەم، یان خۆم هەڵدەمە سەرپشتی ئەسپەکەم و بە گەلی دا بەرەو ڕەواندوز بچم.

لە کوردستان دا برادەرێکی زۆرم پەیدا کردو، دوژمنیشم کەم نەبون و، لەوانەی دواییش دا تەنیا(ساڵح بەگی خۆشناو) کە کەناتوانم هەرگیز لێی ببورم، ڕەنگە هۆکارەکەشی تەنیا ئەوەبێ کە بەڕاستی خەڵەتاندمی. ئەحمەد پاشاو حاجی پیرداود دوژمنی پاك بون و دەرخستنی لایەنگیریشیان تەنیا ڕواڵەت بوو، هەرگیز هیوای ئەوەشیان نەبوو کە باوەڕیان پێبکەم. پەیوەندیە کەسایەتیەکانمان هەمیشە ڕێك و دروست بون و، پیلانەکانیشیان بۆ من دڵاراو چێژبەخش بون. زۆر شەیدای دەنگە زیوینە هەرتەقیەکەی (حاجی)م (ئاوا: و.ع) و حەزدەکەم گوێ لە خۆهەڵکێشانە زێدەڕۆکان و ئەو قسانەی بگرم کە سیمای گیانی قازانجکاری بازرگانیی ڕاشکاوی پێوەبوو هەمیشە(پاشا) ئاماژەی بۆ دەکردم.

بەڵام دیارترین کە سایەتی کەوێنە سادە مەڵاسەکەی بەزەینی منەوە ماوە کەسایەتی نوری بوو، پیاوێك بوو کڵپەی(مەبەست) نەك (ئازایەتی)، وەك ئەوەی کە خەڵکانی نەتەوەکەی هەیانە، لەگیانیدابوو. ئەو نیشتمان پەروەرێکەو پاڵەوانێکە کە مرۆڤ بە ڕوێکی شکومەندەوە حەزدەکا بە ئاشتی لەگەڵیدابژی لە جیاتی ئەوەی بەرەو پەتی سێدارەی ببا. ئەو نە داراییەك و نە دەسەڵاتێکی عەشایەری هەیە، بەڵام بوە هێزێك کە حکومەت نەیدەزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵدابکا. هەڵسوکەوتی هەڵسوکەوتێکی چەپخونی(مشاکس) سەیربوو، ئەمەش نەیدەهێشت ببێتە فەرمانڕەوای خەڵك و، ئەگەر مەرگ زوبەرۆکی نەگرێ ئەوا ژیانی بەشێوەیەك بەسەردەبا کە هاوشێوەی(ڕۆبن هود) بێ، بەڕوبەڕوبونەوەیەکی شەریفانەی حکومەت.

لە ناو ئەو برادەرانەی کە لە لیوای (پارێزگاری) هەولێر بە دەستم هێنان، ئەحمەدە فەندی بوو، گومانیش لەوەدانیە کە هەمیشە پایەیەکی باڵای هەبوو، ئێمەش کە لە چیرۆکەکەماندا ڕوداوە ئاشکراو کارە قورسەکانمان گێڕایەوە و کارە ئاساییەکانی کاروباری بەڕێوەبردنمان وەلانا، بۆیە زۆرکەم نەبێ ئاماژەمان بۆنەکرد. بەڵام ئەو هەمیشە لەتەکمدا بوو، وەك مێژووی تاکە کەسێ، بەوردی باسی مێژووی عەشیرەتەکانی بۆ دەکردم و، ئەوپێشینە یاساییانەی بۆ دەخستمەڕو کە پەیوەندیان بەهەندێ داواکاریەوە هەبوو کە ڕەنگە ئەستەم بێ تێیان بڕوانم و چارەسەریان بکەم، وەچکۆن هەموو دوا پڕوپاگەندەکان و چپە چپی بازاڕەکانی بۆ باس دەکردم و، بە شێوەیەك دەستی یارمەتی بۆ درێژدەکردم کە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی حکومەت و خۆشگوزەرانی و چاکەی گشتی خەڵکی تێدابێ، کە باوەڕێکی ڕاستگۆیانەی پێی هەبوو. ڕاهاتبوکە هەموو ڕۆژێك دوای گەیشتنە نوسینگەم بێتەلام وبمبینێ. ئەگەر پشێویەکیش ڕویدابا ئیدی وەسفی ناکرێ کە چۆن هەموو دو یان سێ کاتژمێر جارێك لە هاتوچۆی نوسینگەکەمدابوو زانیاری و پێشنیاری نوێی بۆ دەهێنام. ڕاهاتبوو کە مانگی جارێك دوان داوەتی من و ئەو ئەفسەرە بەریتانیانە بکا کە لە هەولێر لەگەڵمدابون، بۆ ماڵەکەی بۆ نانخواردن. گومانیشی تێدانیە زۆربەی ئەوانەی یادەوەری خێرایان بە خەیاڵدا دێتەوە دەربارەی ئەو سێزدە تا چواردە جۆر خواردنەی کە هەمیشە پێشکەشی دەکردین، ئەوەیان وەبیردێتەوە. دەربارەی برا دەرەکانی دیکەشم، ئەوا(خوێنەر) بە تەواوی دەیانناسێ و، مەبەستم ئەو دوپیاوە ئاینیە مەلا فەندی و شێخ مستەفا ئەفەندی و خورشید ئاغای پیرەمێر و مشیری گەنج و مستەفا ئاغای گەردییە کە ئەوان دڵسۆزیەکی نیشاندام کە لە هەموان زیاتر بوو تەنیا ئەحمەدەفەندی نەبێ و، ئەنجا(مەتران) و(مەبەستی مەلای گەورەی کۆیەیە)و جەمیل ئاغای کۆیی و عەبدوڵڵا پاشای بەتەمەن و شێخ محەممەد ئاغای باڵەك و لە کۆتاییشدا قادربەگی شەقڵاوەیی(هینری هەشتەم) (١)، کە ئێستاهەست بەو برادەرایەتیەی بەرلە هەڵگەڕانەوەکەی ناکەم. لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسایەتیانە ئێستا زۆرلێم دورن، بەڵام هێشتا هەمویان لە خەیاڵمدا ئامادەن، ئێستا پەرۆشی ئەوەم لە هەریەکێکیان بپرسم کە ئێستا چۆنەو لەوەتەی دواجاربینیومن چۆنن.

ناتوانم بەبێ باسکردنی سەید عەلی ئەفەندی تێپەڕم، خاوەنی ئەو دڵە ئازایە، شێردڵ، کە لەگەڵ ئەوەی عارەبێکی سورياييەو لەم وڵاتەدا گوێدرێژیکییشی دەگەڵ کاروانێدا نیە، (ئاوا! : و.ع) و مرۆیەکی کراوەشە بە تایبەت بەرامبەر پڕۆپاگەندەی(شەریفی). کەچی بە ئەوپەڕی دڵسۆزی خزمەتی حکومەتی کردوەو، لە زۆر بۆنەدا ئەو گیانی خۆی لەسەر دەستی دادەنا لە پێناوی حکومەتدا.

دەربارەی دواڕۆژی کوردستانیش، ئەوەیان نەکاری نوسەرەو نە کتێبەکەشی شوێنی لێکۆڵینەوەی دوا ڕۆژی کوردستانە. هەر چۆنێك بێ مەحاڵە قەڵەم باسی ئەو شتەبکا: ئەگەر دەسەڵاتی بەریتانیا بکشێتەوە، بێ ئەوەی دەسەڵاتی تورکی یان هەر دەسەڵاتێکی حکومی هاوشێوە شوێنی بگرێتەوە، ئەوا وڵات دەکەوێتە بێ سەروبەریەکی بێ ڕادە. سەرەڕای ئەوشتە جێگیرو گونجاوەش، مەبەستم: ئەوەیە کە ڕێوشوێنە داراییەکان هیچ کارێك بۆکشانەوە ناکاو، ئەڵتەرناتیڤی(بدیل) کشانەوەنیە، ئیدی ئەستەمە مرۆڤ بۆ ئەوەبچێ کە ئێمە، کە بۆیە هاناهاتنی چەوساوان هاتوین و بۆ ئەوەی سودەکانی حکومەتێکی باش بهێنین و قازانجەکانی بخەینەڕو، ئیدی زۆر خەمساردانە دەسبەرداری مەبەستەکانمان بین و، ئەو خەڵکە بێ سەرپەرشتیار بەجێ بهێڵین، کە ئەوان خەڵکێکن متمانەی خۆیان بە ئێمەداوە، ئیدی لە ڕێگەی ئاگری تۆڵەسەندنەوەی عەشایەری و شەڕی ناوخۆ، لە ناوبچن. (ئاوا! : و.ع) (٢)

لەبەر ئەوەی کە (نوسەر)یش باسی تاقیکردنەوەکانی خۆی دەکا بۆیە ناچارە کە ئەو کارە نایابانە پشتگوێ بخا کە(یاریدەدەرەکانی حاکمی سیاسی) ئەنجامیان داون، کە لەگەڵ ئەودا خزمەتیان کردوە، یان لە ناوچە بەڕیوەبەریەکاندا کاریانکردوە. هیچ مانگێک لە مانگە پشێویەکانی کە بەسەر نەقیب(کێرك)دا ڕەتبون لە ڕەواندوز و باتاس، بەکەمی نەبێ، باسیان نەکراوە، وەك چۆن باسی ئەو بارگرانیە نەکراوە کە دوچاری بوو و چیا لەژێر قورساییان دەینالآند، کاتێ لە ئاکرێ سورچیەکان هێرشیان کردو بەشی هەرە زۆری ئاکرێیان داگیرکرد. وەك چۆن مەحاڵە باسی ئەو وردەکاریانە بکەین کە پەیوەستن بە بەڕێوەبردنی نەقیب(ڕاندڵ) لە کۆیە کاتێ لە پۆستی(یاریدەدەری حاکمی سیاسی)بوو تیایداو لە ئایاری (١٩١٩) تا ئایاری (١٩٢٠)و بەدرێژایی کاتیش

نەخۆشبوو، یان ئەو پشێویانەی ڕوبەڕوی ئەو و نەقیب(بارکەر) بونەوە، لە ڕۆژانی شۆرشی شێخ مەحمود. لە بەڕێوەبردنی شاری هەولێریش سێ ئەفسەر یارمەتیدەربون کە: مولازم (کێرتن)و نەقیب (برادشۆ) و نەقیب دیکینس بون و ئەستەمیشە پیاهەڵدانی پێویست بۆ ئەو چالاکی و زیرەکیەیان بکرێ کە لە ئەرکەکانیاندا خەرجیان کرد. نەقیب برادشۆ لە کۆیە شوێنی نەقیب(ڕاندڵ)ی گرتەوە، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد دەبوایە چارەسەری ئەوبارە نالەبارەبکا کە لە ئەنجامی مردنی حەماغا و هەڵگەڕانەوەی خۆشناوەکان دروست ببو. هەرچی نەقیب(لیتلدیل)ە، ئەوا شتێکی ئەو تۆ نەماوە تا بخرێتەسەر ئەوەی پێشتر باسی کراوە، چونکە ئەوکارانەی ئەو کە باسیان لێوەکرا بەسە بۆ ئەوەی بەهای ئەو بسەلمێنن. ئەو لە ئازاترین ئەو پیاوانەیە کە نوسەری ئەم چەند دێرە بەدرێژایی ژیانی ناسیونی، ئەو سەرچاوەیەکی چالاکیە، کە لە کاتی ڕۆژە تەنگانەکانی بەسەر هەولێردا تێپەڕین، دەرکەوت. لە کارەکانیشیدا ژاندارمەکان بە تەواوی یارمەتیان دەدا، کە ئەو دەمای بونە هێزێکی سەربەخۆ لە ژێر فەرماندەیی مولازم(بارلۆ)دابون و، دواتر نەقیب هیگنس و مولازم بوا بەدوای یەکدا بونە فەرماندەیان.

دەبێ ئەوکارەی کە لە بوارەکانی پزیشکی و پەروەردەیی و ڕاژە هاوشیوەکانیدی کە لە هەولێر پیادەکران، بخرێتە سەر ئەو هەموکارانەی پێشتر. (نەقیب ویلیمیس) کە وەك ئەفسەرێکی پزیشکی لە ئاداری(١٩٢٠)دا گەیشتە هەولێر، بە یارمەتی پزیشکێکی عارەب، هەندێ چاکسازی مەزنی لەو نەخۆشخانەیەدا کرد کە پێشتر هەبوو. هەموو ڕۆژێ ژمارەیەکی زۆری هەژارانی بە خۆڕایی چارەسەردەکرد. لە کاتێکدا کە خەڵکە عەشایەرەکە بەڕێژەیەکی زۆر لە گوندەکانی دەوروبەرەوە دادەوەرین(دەهاتن)، بۆیە کارەکەی ئەو لە سوك کردنی ئازارەکانی نەخۆشەکان بەهایەکی سیاسی گەورەی هەبوو(٣).

فەرمانبەرە بەریتانیە بچوکەکان(ئەوانەی لە تۆماری ڕۆژنامەی فەرمی تۆمار نەکرابون و ئەو فەرمانبەرە هیندیانەش کە بەکارێکی باش هەڵسان. چونکە مستەر(جی.ئۆ. تێرنەر) چەند مانگی پرلە هیلاکی بەسەربرد و هەولێدەدا (بەڕێوەبەرایەتی دارایی و گومرگ) ڕێکبخا، لەکاتێکدا مستەر(سی. براون

ماندوبونی سەرەکی پیادەکردنی کاروبارەکانی(بنکەی گشتی لیوا﴿پارێزگا﴾ی) لە هەولێر، لەسەر شان بوو لە ڕێگەی پیادەکردنی ئەرکەکانیەوە کەسایەتیە نایابەکەی ئەو دەرکەوت. هەردوگوروبان(عریف) کینارد و شیباردیش زۆر بەلێوەشاوەیی یارمەتی نەقیب لیتلدیلیان دەدا، کە ئەو دوە لە بەرامبەر ئاستەنگە زۆرو قورسەکاندا بە هیممەتێك کاریاندەکرد کە ماندوبون و بێزاری نەدەزانی. دەستەبەریی تەواوی پۆلیسی شارۆچکەکەش — کە ڕەنگە لێوەشاوەترین پۆلیسی دامەزرێنراوی ناوخۆبن لەلیواکە — تەنیا بۆ هەوڵەکانی مستەر(ئێچ. سی. ڕۆبینز) دەگەڕایەوە. بەدرێژایی ئەوکاتەی(نوسەر) لە هەولێر بوو، ئەو فەرماندەیان بوو. لە نێوان فەرمانبەرە هیندیەکانیش باسی(مستەر دلّی جاند) دەکەین کە لە کاروباری خەزینەدا شارەزاییەکی زۆری هەبوو. دواتریش(موحەمەد سادق بات) کە لەکاتێکدا کاروبارەکان لەبارێکی هەرە تاریکدابون، ئەو لە کۆیە لەسەر کارەکەی بەردەوامبوو، شایانی باسکردنێکی تایبەتە.

بواری ئەوەش نەبوو کە باس لە کاری(فەرمانڕەوا سیاسەکان)ی ناوچە بەڕێوەبەریەکانی دراوسێ بکەین، وەك(عەقید ناڵدەر)، کە تۆوی دوبەرەکی زۆربە زانایی و شارەزایی لە ڕیزەکانی عەشیرەتی(شمەر)ی بەهێزدا دەچاند،(٥) بۆ ئەوەی نەتوانن هێرش بکەنەسەر هێڵەکانی گەیاندنی نێوان بەغداو موسڵ، لە کاتێکدا بارەکە زۆر خراپ بوو. هەروەها(ڕائید لونکریك) کە ڕەتیکردەوە بەرەو پیادەکردنی ڕێوشوێنێکی بەپەلە بەکێش بکرێ کە وتارە شۆڕشگێڕیەکانی کەرکوکلیەکان پاڵیان پێیەوە دەناو، زۆر ئازایانەش توانی ڕێکوپێکی بگەڕێنێتەوە درێژی و پانی ناوچەکەی و، لەمەشدا ژمارەیەکی کەمی سەرباز یارمەتیاندەدا. دوای ئەویش(ڕائیدسۆن) کە توانی یەکگرتویی چیاسەرکەشەکانی ناوچەی سلێمانی بپارێزێ.

ئامانجی نوسەر ئەوەبوو کە لەڕێی ئەو لاپەڕانەوە وەك ئەفسەرێکی (بەڕێوەبەرایەتی سیاسی) لەوڵاتی نێوان دوو ڕوباردا، نمونەیەك ئامادە بکا کە لە تاقیکردنەوە تایبەتیەکانی داڕێژراون. گومانیشی تێدا نیە کە زۆربەی ئەندامانی (بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی) لەو وڵاتەدا ئەگەر پێنوسەکانیان بخەنەگەڕ ئەوا دەتوانن کە جوانترین چیرۆکی پەیوەست بە سەرچڵیەکانیان بگێڕنەوە،

بەشێوەیەك کە لەسەروی ئەوانەبێ کە نوسراون. هەموویان، یان زۆربەیان لە کارەکانیاندا سروشیان لەهەمان ئەو گیانە مەزنە وەردەگرت کە (سێر ئەرنۆڵد ویلسۆن) هەیبوو، کە ڕێزو شکۆیەکی تایبەتی بۆ هەموو ئەفسەرەکانی هەبوو، وەك نموونەیەکیش، هانیدەدان لەسەر ڕێی ئەو بڕۆن و، ئامۆژگاری دادەدان و هەرگیزیش خۆی لە بڕیاری دەستپێشخەریەکانیاندا هەڵنەدەقورتاند، ئەگەریش دەستی تێوەردابا ئەوە بەدەگمەن بوو. لە تاریکترین ڕۆژەکانیشدا لە ساڵی ١٩٢٠، کەس بە ئاشکرا گلەیی لە بارودۆخی خۆی نەکرد، چونکە دەیدیت کە (سەرۆکەکەی) لە بنکەی ئەرکەکەیدا چەسپاوەو، هەرگیز نازانێ لاوازی چیە. ئەگەرچی لە کۆتاییە دڵتەزێنەکانی هەندێکیان حەسرەتکێش دەبوو، کە هەمیشە وەك منداڵی خۆی خۆشی دەویستن، یان کاتێ لە لایەن هەندێ کەسانی وڵاتی (خۆمان)دا ڕەخنە باران دەکرا، کە تەنیا کەم شتێکیان دەربارەی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار دەزانی و دەربارەی کارەکانی ئەویش کەمتر.

مەبەست لەو هەوڵە ساکارەش، بەتایبەت، زیندوکردنەوەی یادی ئەو ئەفسەرە بەریتانیانە و فەرمانبەرە (تۆمار نەکراوانەیان لە ڕۆژنامەی فەرمی)، کە لە وڵاتی نێوان دوو ڕووباردا خزمەتیان کردوو بەتایبەتیش لە کوردستان و، گیانیان لەپێناو خزمەتکردنی وڵاتەکەیان و ئەو خەڵکەدا بەخشی کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ئەوانیان پێ سپێردرابوو. گومانی تێدا نیە کە زۆربەی تاقیکردنەوەکانیان لەگەڵ خۆیاندا لە گۆڕنراون. (نوسەر)یش هیوا خوازە کە خزم و هاوڕێکانیان لەو چیرۆکەیدا، دەنگدانەوەی هیواو خۆزگەکانیان بدۆزنەوەو، ئاوێنەی ڕەنگ دانەوەی هەوڵ و سەرچڵیە ڕۆژانەکانیان بێ.

یەکەم کەسی کە لە کوردستان گیانی سپارد (نەقیب. سی. بیرسن)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسی بوو لە ئاکرێ و، لە نیسانی ١٩١٩دا کوژرا لەکاتێکدا بەپەرۆشی مژدەدەرێکەوە بێ چەك لەناو عەشیرەتە نەیارە لە یاسا دەرچوەکان دەسوڕایەوە. عەریف میسونیش وەکچۆن لە سەرەتای چیرۆکەکەماندا باسمان کرد لە سەرەتاکانی تەمموز لە هەولێر کوژرا. دواتر شۆڕشی ئامێدی، لەکۆتایی مانگدا هات، کاتێ هەریەك لە (نەقیب ویلی) کە تازە کرابوە یاریدەدەری حاکمی سیاسی و(نەقیب ماکدۆناڵد) ئەفسەری بەرپرس لە کاروباری ژاندارم و، عەریف

تروب، کە لە سەربانی ماڵەکەیاندا خەوتبون، هێرشیان کرایە سەرو، هەموویان کوژران. لەسەرەتای تشرینی دووەمیشدا هەریەك لە مستەر (بل) (کە لە فەرمانبەرانی خزمەتی مەدەنی هیند بوو) و حاکمی سیاسی لە موسڵ، کە پیاوێك بوو لە ئەنجامی کارکردنی لە سنووری باکووری ڕۆژئاوای هیندستان و کەنداوی فارسیدا– (یان ڕاستتر عەرەبی: و.ع) شارەزاییەکی مەزنی بەدەست هێنابوو و، (نەقیب سکۆت) کە تازە کرابووە یاریدەدەری حاکمی سیاسی بو لە ئاکرێ، بەفێڵ کوژران. کوشتنەکەشیان لەسەردەستی خانەخۆی زێبارییەکانیان بوو لە (پیرە کەپرە). دوای چەند هەفتەیەکی کەم (نەقیب وکەر) مرد، کە ڕەنگە لە هەموو ئەفسەرە گەنجەکانی سەر بە (بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی) زیرەکتر بوبێ و، کە شوێنی نەقیب سکۆتی لە ئاکرێ گرتەوە. هۆکاری مردنەکەشی، کە تەمەنی تەنیا (٢٢) ساڵ بوو، ئەوەبوو کە لەکاتی شەڕەکانی دژ بەو عەشیرەتەکانی کە (مستەر بل) یان کوشتبوو، توشی نەخۆشی (ئاوبەند) ببوو. لە حوزەیرانی ١٩٢٠دا هێزێکی عارەبان هێرشیان کردبووە سەر وکەرو مستەر لۆلەر، کە لەسەر بانی بەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکان کۆببونەوە بۆ بەرگری کردنیان. (٦) وە لەکاتی سەردانیکردنی ڕائید جی.ئەی.بارلۆ یاریدەدەری حاکمی سیاسی بۆلای سەرۆکی گوندێکی ئەو دەوروبەرە خانەخوێکەی دیلی دەکاو، دواتر کە هەوڵی ڕاکردن دەدا، گوللەباران دەکرێ. لە کۆتاییشدا، لەمانگی ئاب، نەقیب (سامۆن)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە کفری گیراو، ئەمەش لەسەر دەستی دەستەیەك لە کوردە عەشایەریەکان بوو کە پێشتر دەستیان بەسەر بنکەکەیدا گرت و، دواتر وەك تۆڵەی هەوڵەکانی لایەنی سەربازی بۆ داگیرکردنەوەی شارۆچکەکە، کوژرا.

لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی عارەبی لە ناوچەی فورات و ناوچەی باقوبە، زۆری دیکە کوژران. لە بەراییشیانەوە: عەقید. جی.بی.لچمان کە لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ تا تشرینی یەکەمی ١٩١٩ حاکمی سیاسی موسڵ بوو. لە سەرەتای مانگی ئابدا سەردانی شێخ (زاری زەوبەعی) کرد (خوا لێی خۆشبێ: و.ع)، زەوبەع عەشیرەتێکن کە لەنێوان فورات و بەغدا نیشتەجێن، بۆ ئەوەی ناچاری بکا لایەنگیری خۆی بپارێزێ کە تا ئەودەم هەیبوو. لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی دوور و درێژەوە لە پشتڕاو لەلایەن کوڕی خانەخوێکەی تەقەی لێکرا، ئەمەش لەکاتێکدا

کە خەریکبوو لە چادرەکە بێتە دەرەوە. ئەمە فێڵێکی بێ وێنەیە لە چیرۆکی خوێناوی وڵاتی نێوان دوو ڕوباردا. (٧) لچمان کەسایەتیەکی نایابی هەبوو، لە سیماو هەڵسوکەوتی لەژیاندا، هەندێ سیفەتی هەبوون کە وەك سیفەتەکانی شێخێکی بەدو دەچوون کە لە بیاباندا نیشتەجێبێ (ئاوا: و.ع). لەگەڵ ئەوەی کە خێرا هەڵدەچوو، جنێوفرۆش بوو، بەڵام لای هەموو ئەوانەی لەژێر دەستی ئەودا خزمەتیان کردبوو خۆشەویست بوو. ئەوانەی کە ئەگەر فەرمانیان بۆ دەرچوبا خۆیان بە ئاگر دانەدابا، ژمارەیان کەم بوو (ئاوا: و.ع).

بۆ گیانی ئەو پیاوە ئازایانەو تەرمی لەناوچویان کە لێرەو لەوێ لەژێر لمی بیابانی عەرەبی و خاکی دۆڵەکانی کوردستانی بچوکی ڕەنگینن سلاوی ماڵئاوایی نووسەریان بۆ دەنێرم. جێگەی شانازیشمە کە نووسەر یەکێ لەو ئەفسەرانەبێ کە لەژێر فەرماندەیی سێر ئەرنۆڵد ویلسۆن (حاکمی گشتی پاشایەتی بەریتانی لەسەردەمی داگیرکەردا: و.ع) لەوڵاتی نێوان دوو ڕوباردا کاری کردبێ و، وتەکانی پۆلسی ڕەسولیش دەخوازمەوە بۆ ئەو کردارانەیان کە بەرژەوەندی وڵاتەکەیان و ئەو کۆمەڵگایانەی کە کارەکانیان بەوان سپێردرابوو، دەپاراست: (بەزۆری لە گەڕانەکانیان و، لەنێوان کارە پڕ مەترسیەکان و، ئەو تەنگانانەی لەسەر دەستی دزەکان دەهاتنە ئاراوەو، لە مەلاسی بەردەوام و، لەنێوان کەڵبەکانی برسیەتی و، لەکاتی تینوێتی و، زۆرجاریش لە بەرۆژبونەکانداو، لە سەرما و گەرمادا).

◆

## پاشکۆی سێیەم

## سیستەمی بەڕێوەبردن لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا

ئیمپراتۆریای عوسمانی بۆ چەند ویلایەتێکی سەربەخۆ دابەشکرابوو، کە هەر ویلایەتێك لەلایەن والیەکەوە بەڕێوە دەبرا، ڕاستەوخۆ لەبەرامبەر قوستەنتینیەدا بەرپرس بوو. ولاتی نێوان دوو ڕووبار یان عێراق، بەر لە شەڕ، لەسێ ویلایەت پێکهاتبوو کە : موسڵ و بەغدا و بەسرە بوون. ئەو ویلایەتانەش بەسەر لیواکاندا دابەشدەکران کە بەرامبەر (یەکەی بەڕێوەبردنی) ژێر دەسەلاتی بەریتانیای ولاتی نێوان دوو ڕووبار بوون. سەرۆکی لیوا پێی دەگوترا (موتەسەریف). لیواش دابەشدەکرا سەر چەند قەزایەك و سەرۆکەکەشی (قایمقام)بوو. بچوکترین یەکەی بەڕێوەبردنیش (ناحیە) بوو (بەڕێوەبەر) فەرمانڕەوا بوو تیایداو بەهۆی ئاغاکانی عەشیرەتەکان و موختارى گوندەکانەوە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکەکەدا دەکرد. لەگەڵ ئەوەی کە (بەڕێوەبەر) دەسەلاتی دادوەری هەبوو، بەلام هەر تۆزێك لە فەرمانبەرێکی دارایی تێدەپەڕاند. دەسەلاتی جێبەجێکردن درابوە دەست قایمقام، کە بەرامبەر بە یاریدەدەری حاکمی سیاسی دەسەلاتی بەریتانیا بوو.

شتێکی ئاوەژوی سەیرە کە ئەفسەرێکی گەورە، بەپێی پێگەی ڕاستەقینەی خۆی، ئەرکی ئەفسەرێکی بچووك بەڕێوە ببا. بۆ نمونە والی ئەرکی موتەسەریف و قایمقام و بەڕێوەبەری ناحیە بۆ لیواو قەزاو ناحیە جێبەجێ بکا لە بنکەی گشتی خۆیەوە.

ئەنجومەنی پیاو ماقولانیش یارمەتی قایمقامەکان و گەورە فەرمانبەرەکانیان دەدا، ئەمەش، بەر لە داگیرکردنی ولات لەلایەن بەریتانیاوە، ئەوەندەی پەیوەندی بە فەرمانڕەوایی ولاتەوە هەبێ، قسەیەکیان نەبوو، یان ڕەنگە قسەیەکی کەمیان لە کارەکەدا هەبوبێ.

هەموو ئەو شارۆچکانەی کە دانیشتوانیان سێ هەزار کەس و زیاتر بوایە شارەوانیان هەبوو خەرجیەکی تایبەتیشیان بۆ دابین دەکرا. ئەنجومەنی شارەوانیش هەر چوار ساڵ جارێک هەڵدەبژێردراو هەڵبژاردنەکەش لەلایەن خەڵکەکەوە دەکراو، ئەو ماڵانەش کە نێرینەیان هەبوو هەندێ سیفەتی تایبەتیان هەبوو مافی هەڵبژاردنی ئەنجومەنیان هەبوو. ئەنجومەنیش بەگشتی هەڵدەبژێردراو کێ دەنگی پتری بهێنایە، بە ڕەزامەندی فەرمانڕەوای (ناوچەیی)، دەبوە سەرۆکی شارەوانی و ماوەی سەرۆکایەتیەکەشی چواری ساڵی دەخایاند. قایمقام یان هەر فەرمانبەرێکی گەورە سەرپەرشتی کاروبارەکانی شارەوانی دەکردو بە خەرجیەکانیدا دەچوەوە.

ڕونکردنەوەی سیستەمی دادوەری بە وردەکاریەکانیەوە کارێکی ئەوەندە پێویست نیە، جگە لە دادگا سزاییەکان و مەدەنیەکان، دادگای شەرعیش هەبوون، کە هەر یەکەیان لەلایەن قازیەکەوە سەرۆکایەتی دەکراو کاروبارەکانی ژن هێنان و تەلأقدان و میراتی و...تاد ئەمەش هەمووی بەپێی حوکمەکانی شەرع دەکرێن. ئەگەر دانیشتوانی شارۆچکەکەش ژمارەیان کەم بوایە ئەوا دەسەڵاتە سزایی و مەدەنیە سنوردارەکان بەقازی دەسپێردران.

جگە لەقازی، لە هەموو بنکەی قەزایەکدا (موفتی) هەیە، کە فەرمانبەرێکی ئاینیەو ئەرکی دەرکردنی فەتوایە دەربارەی ئەو خاڵانەی کە پەیوەندیان بە شەریعەتی موحەممەدیەوە هەیە (ڕاستیەکەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامە: و.ع) لەگەڵ ڕاگەیاندنی مانگی بەڕۆژوبون و هەردوو جەژنە گەورەکە. (مەبەستی جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز و جەژنی قوربانی پیرۆزە: و.ع)

◆




نەخشەی وڵاتی میزۆپۆتامیا و کوردستان

## پاشكۆی چوارەم

پوختەی ئەو ڕوداوانەی كە وڵاتی نێوان دوو ڕوبار، لەنێوان ئاگربەست و كۆتایی ساڵی ١٩٢٠ بەخۆیەوە بینی.

**١٩١٨، تشرینی یەكەم- كانونی یەكەم:**

داگیركردنی موسڵ و، ویلایەتی موسڵ بەگشتی بەپێی مەرجەكانی (ئاگربەست) هەوڵی دامەزراندنی لیوای سلێمانی و خستنەسەری قەزاكانی: كۆیەو ڕانیەو ڕەواندوز بۆ دروستكردنی دەوڵەتێكی كوردی كە (شێخ مەحمود (حوكمدار: فەرمانڕوا)بێ بەسەریەوە.

(دێر ئەلزور) داگیركرا، كە لەسەر فوراتەو كاروبارەكانی بەڕێوەبردران، (تێبینی: دێر ئەلزور، لەكاتی دەسەڵاتی توركەكان بنكەی لیوایەكی سەربەخۆ بوو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەستەنبوڵەوە دەكردو، بەشێك نەبوو لەعێراق).

**١٩١٩، نیسان:**

كوژرانی نەقیب بێرسن، یاریدەدەری حاكمی سیاسی لە زاخۆ و لەسەردەستی عەشیرەتی كویان.

**ئایار:**

شێخ مەحمود هەڵسا بە بەندكردنی هەموو ئەو بەریتانیانەی لەسلێمانی بوون و سەربەخۆیی تەواوی ڕاگەیاند.

**حوزەیران:**

شۆڕشی سلێمانی سەركوتكراو، هەڵگیرسێنەرەكەی (واتە شێخ مەحمودی حەفید) دەستگیر كراو دورخرایەوە.

**تەمموز:**

كوژرانی نەقیب ویلی، یاریدەدەری حاكمی سیاسی لە ئامێدی و هاوڕێكانی، پیادەكردنی ڕێوشوێنی تەمێكردن دژی بكوژانی و عەشیرەتی (كویان.

**تشرینی دووەم:**

كوژرانی مستەر (بل) حاكمی سیاسی موسڵ و نەقیب سكۆت یاریدەدەری حاكمی سیاسی لە ئاكرێ، لەسەر دەستی زێبارییەكان و بارزانییەكان. هێرش كردنە سەر ئەو دوو عەشیرەتە.

**كانونی یەكەم:**

هێرشێكی عارەبەكان بۆسەر دێر ئەلزۆر. چۆڵكردنی بەشی ژێر دەستی بەریتانیا لە دێر ئەلزۆر. بەردەوامبوونی هەڵمەتی دژ بە عەشیرەتەكانی فورات كە لە ڕۆژئاوای (هیت) نیشتەجێبون و بەردەوامبونی بەدرێژایی چەند هەفتە.

**١٩٢٠، كانونی دووەم:**

دەسپێكردنی شۆڕشی سورچییەكان، ئەو عەشیرەتە لە نیساندا هێرشیان كردە سەر ئاكرێ و كردەی سەربازیان لە دژدا ئەنجامدرا.

ئایار:

تێکدانی ئەو شەمەندەفەرەی کە گەشتی لەنێوان بەغداو شەرگات دەکرد لەسەر دەستی عەرەبەکان.

**حوزەیران:**

هێرشکردنە سەر تەلەعفەر و کوشتنی حاکمی سیاسی (رائید بارلۆ) و هاوڕێکانی لەو شارۆچکەیە.
وەرگرتنەوەی شارەکە بەکردەی سەربازی.

**تەمموز:**

سەرەتای شۆڕشی گەورەی عەرەبی لەسەر فورات، چۆڵکردنی لیوای دیوانیە و کەربەلا. گەمارۆدانی کوفە و سەماوە، بە ئەفسەرە سیاسیەکان و ئۆردوەکانیانەوە لەلایەن عەشیرەتەکانەوە، هێرشکردنە سەر حیللە. تێکدانی بەشێکی فراوانی هێڵی ئاسنی بەسرا- بەغدا.

**ئاب:**

بڵاوبونەوەی هەراوزەناو پشێوی لە ڕۆژهەلاتی دیجلە و داگیرکردنی باقوبە و کفری لەلایەن عەشیرەتەکانەوە، کوژرانی عەقید لچمان.

**ئەیلوول:**

گێرانەوەی سەقامگیری بۆ ڕۆژهەلاتی دیجلە.
ڕۆیشتنی عەقید سێر.ئەی.تی.ویلسۆن، کە لە (١٩١٧)ەوە لە پۆستی (بریکاری حاکمی گشتی پاشایەتی بەریتانی) بوو لەبەغدا. (سێر برسی کۆکس) وەك نوێنەری (سامی باڵای وڵاتی نێوان دوو ڕوبار گەیشتە بەغدا.

**ئەیلوول، کانونی یەکەم:**

پیادەکردنی کاری سەربازی دژی عەشیرەتەکانی فوڕات، ڕزگارکردنی کوفە و سەماوە و سەرکوتکردنی (شۆڕش).

**تشرینی دووەم:**

دامەزراندنی حکومەتێکی عەرەبی لەبەغدا.

◆

# پەراوێزەکان

## پێشەکی نووسەر:-

١. وەرگێڕانم بۆ (Transliteration)دانا، کە ڕەنگە بە (پیت کەشی)ش وەربگێڕدرێ، مەبەستیش نوسینی (وشە)یە لە زمانێك بە پیتەکانی زمانێکی دیکە. (وەرگێڕی عەرەبی).

٢. کردومانە بە عەرەبی و پێشەکیمان بۆ نووسیوە و شیمان کردۆتەوە و لەسەرمان نووسیوە بەو ناوەشەوە بلاومان کردۆتەوە. و.ع .

٣. لەسەردەمی داگیرکردنی بەریتانیا بە (نمایندەی گشتی حاکمی پاشایەتی لەعێراق) دەناسرا، نووسەریش کە حاکمێکی سیاسی بووە، ئەوا حاکمی گشتی سەرۆکی ئەو بوەو کتێبەکەشی بەناوی ( Mesopotamia Clash of Loyalties) کردومانەتە عەرەبی و پێشەکیمان بۆ نوسیوەو شیمان کردۆتەوە و لەسەرمان نوسیوەو بەشی یەکەمیمان لە ١٩٦٩دا بلاوکردۆتەوەو بەشی دوەمیشی لە ١٩٧١ و ناومان ناوە (ولاتی نێوان دوو ڕوبار- لەنێوان دوو لایەنگیریدا) و.ع.

## بەشی یەکەم:

١. (Essays): Bacon (نووسەر).

٢. دەزگایەکی بەڕێوەبردنی شارستانی بوو حکومەتی بەریتانیا لەکاتی داگیرکردنی عێراقدا دروستی کردو نووسەریش لەو ئەفسەرانەی سەر بەو دەزگایە بوو. و.ع

٣. ..............................

٤. مەبەستی هەلگیرسانی (شۆڕشی عێراق ١٩٢٠)ی شکۆمەندە دژی داگیرکەری بەریتانی ناحەز. و.ع

٥. لەبنەچەدا ئەو دروشمە لاتینیە: Aequam Memento Rebus in Arduis Servare Mentem. و.ع

٦. پێیدەگوترا: Political Officer و ئەوەی لەژێر فەرماندەییشی کاری دەکرد پێدەگوترا Assistant Political Officer. و.ع

٧. .................................

٨. حاكمی پاشایەتیشیان پێدەگوت، سەرەتاش سێر برسی كوكس ئەو پۆستەی وەرگرت دواتر سێر ئەرنۆڵد تالبۆت ویلسۆن بوو بە بریكاری حاكمی گشتی پاشایەتی و بەو ناونیشانەش بەیاننامەكانی مۆردەكرد و یاساو ڕژێمە عەرەبیەكانی دادەنا. و.ع

٩. .................................

١٠. لە سەرچاوە عەرەبیە كۆنەكان بە (بەندەنجین) ناسراوە و ماناكەشی بە تەواوی نەزانراوە، ئی وا هەیە كە پێی وایە لە (وەندینیكان– كۆی وەندنیك– هاتوەو واتە خاوەن زەویە پیاو چاكەكان و دواتر بوەتە بەندەنكین و دواتر مەندەلی– لە نووسراوە ئاشوریەكانیش بەناوی (ئەردنیكا) یان (ئەردریكا) هاتووە– وەك هیرۆدۆت باسی دەكا– و دەشڵێ هەندێ كانی نەوتی تێدایە و ئەو سەرچاوانەش هێشتا لە مەندەلیدان. و.ع

**بەشی دووەم:**

١. لە بنەچەی ناوی عێراقدا وتمان، لە ﴿تاج العروس﴾ ٧:٩ ماددەی عرق﴾ دا هاتووە، عێراق واتە لێواری ئاو، یان بە تایبەت كەناری دەریا، بەڕای زمانزانی كۆچكردوش (باوە ئەنستاس كرەملی (زمانی عەرەبی ٤: ٢٨٤: ٤٤٢) عێراق واتە ولاتی نزم یان ئەو ولاتەی ئەگەری نقومبوونی هەیە، هەروەها پێشی وایە كە عێراق بە عەرەبی كردنی وشەی (ئیراە)ی فارسیەو مانای كەنار دەگەیەنێ، چونكە لەسەر كەنداوی عەرەبیە، یان لێواری شەتولعەرەب. لێكۆڵەری ڕۆژهەلاتناسی كۆچكردوش (لە سترانگ) دەڵێ عەرەبەكان ناوی عێراقیان لە ولاتی نێوان دو ڕوباری لای باشوور ناوە، مانای تەواوی وشەكەش (گەوەڕ) یان (كەنار) دەگەیەنێ. كەچی سەرچاوەی بێگومانی ناوەكە هێشتا جێگای گومانە (بڕوانە كتێبە وەرگێردراوەكەمان. شۆڕشی عێراقی ١٩٢٠ ل ٢٤. (و.ع). وەرگێڕی كوردیش دەڵێ ئەی بۆ وشەی عێراق لە (ئوروك)ی سۆمەریەوە نەهاتبێ، كە پایتەختی یەكێك لە بنەماڵەكانی پاشاكانی سۆمەرە.

٢. ئەودەم بارودۆخی ولات، وەك نووسەر بۆی چوە، وابوە، چونكە لە هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە– وەك نووسەر دەڵێ– تەنیا دارخورمای لێبوە،

بەڵام واقعی ئێستا جیاوازە، چونکە داری میوەی لێ ڕواندراوە وەك پرتەقاڵ و تریێ و هەنار و خۆخ و قەیسی و هەرمێ و هەموو جۆرە مزرەمەنیەکی دیکە. و.ع

٣. دەکرێ ئەو زنجیرە چیایە بە سنووری جیاکەرەوەی خاکی بابل و خاکی ئاشووری کۆن دابنرێ. ئاشوریە کۆنەکان بەچیای حەمرینیان دەگوت (ئینج) و پێیان وابوو کە نشینگەی (ئاشوور)ی خواوەندی مەزنی ئەوانە. و.ع

٤. بە دروستی نازانرێ مانای ناوەکەی چیە، ئایا ئارامیە و لە (زاخوتا) وەرگیراوە کە مانای سەرکەوتن دەدا، یان بۆ ناوی گەلێك کە مێژونوسی ئەغریقی:– ئەسترابۆن بە ناوی (ساکۆبۆدس) ناویان دێنێ، ئەوەی کە گەواهیدەری کۆنی ئەو شوێنەیە دۆزینەوەی نشینگەیەکی کۆنە بەناوی (کیستە) کە شوێنەواری ئەوتۆی تێدا دۆزراوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی بابلیەکان و ئاشوریەکان. و.ع

٥. ئەوێ ناوچەی (هەکاری) کوردەکانەو، وەك نیمچە دورگەی (ئیبن عومەر) و بە دانیشتوانەکانی دەڵێن کوردەکانی هەکاری و جۆڵەمێرگیش شوێنی خەڵکانێکە کە پێیان دەڵێن جوڵەمێرگیەکان، دەڵێن گوایە لە (بەنی ئومەییە)ن و لەکاتی سەرکەوتنی (بەنی عەباس)دا پەنایان بۆ ئەوێ بردوە. و.ع

٦. وشەیەکی ئارامیەو، هۆکارێکی گواستنەوەی ئاویە بە کاریتە دروستدەکرێ و بەپەت دەبسترێتەوە لەسەر ئەمبانەی فودراو دادەنرێ و بەناو ڕوباردا دەڕوا. و.ع

٧. یان ڕوباری ڕەواندوز کە بە گەلی عەلی بەگدا دەچێتە خوارەوە کە بەهۆی بومەلەرزەیەکەوە دروستبووە نازانرێ کەی بووە، لەنزیك بێخمە دەڕژێتە زێ ی گەورە.

٨. زێی خوارو (زێی کۆیە) و زێی سەرو (زێی بادینان) کە زێی گەورە و زێی بچوکیان پێدەڵێن. لە نووسراوە کلاسیکیەکان زێ بە (زاباتس) ناسراوە و زیاتر پێدەچێ مانای (ڕوباری ڕون)بێ. و.ع.

٩. ئەو زێیە دوای ئەوەی دێتە سنووری عێراقەوە نزیکەی (٣٠)میل بەرەو باکوری ڕۆژئاوا دەڕواو ئەنجا بە دەربەندی (ڕەمکان)دا تێدەپەڕێ،

دەربەندیش بە دەروی نێوان زنجیرە چیا دەگوترێ و ئەگەر خەرەندێکی گەورەتریش بێ پێیدەڵێن گەلی . و.ع

١٠. ناوچەی قەراج کە مەخمور لەخۆ دەگرێ و لەپارێزگای هەولێرە، عەشیرەتی دزەیی، کە گەورەترین عەشیرەتی ناوچەکەیە، تێیدا نیشتەجێن، وەك چۆن ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی کە نووسەر باسی گوندەکانیان دەکا لەو ناوچەیەو لەگوێڕ بریتین لە تەی و جبور و ئەلعوبێد. و.ع

١١. ڕەحمەتی خودا، مەبەست بارانە، وەکچۆن لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتوە (ان رحمة الله قريب من المحسنين). و.ع

١٢. ...........................

١٣. دەشتی بەپیتی کەندێناوە دەکەوێتە نێوان قەرەچوغ و زورگەزراو و درێژی ٥٠کم و پانی ٢٣کم، گەلێ چۆمیشی تێدایە. و.ع

١٤. ژمارەی خێزانەکانی (٦٠٠٠) خێزان دەبێ و لە دەوروبەری قەرەچوغ و کەندێناوە و قەزای مەخمور نیشتەجێن و شوێنەکەیان درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە دیجلە و ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی ئەوێیان ناچار کرد کە بەرەو ڕۆخەکەی دی لە ڕوبار بپەڕنەوە، عەشیرەتێکی چالاکن. و.ع

١٥. مەبەست دوڕگەی (ئیبن عومەر)ە کە بەناوی (ئەلحەسەن کوڕی عومەر کوڕی خەتابی سەعلەبیە) ناوچەیەکە کە لە ناوخۆدا بە (بۆتان) ناودەبرێ و لەنێوان موسڵ و دیاربەکرە لە (الاخبار الطوال)ی دەینەوەریدا لە (ل:٢)دا هاتووە (وەستانی کەشتیەکەی نوح (د.خ) جێگیربونی لەسەر چیای جودی. چیای بەقەردی و بازیدی).

١٦. پێمان وایە کە ناوەکەی لە (شەقلاّباد)ەوە هاتبێ و یاقوت باسی دەکاو دەڵێ: (گوندێکی گەورەی خۆشی قەد چیایەکە کە بەسەر هەولێردا دەڕوانێ و ڕەزی ترێ و بێستانێکی زۆری هەیە و بەدرێژایی ساڵ بۆ هەولێر دەنێردرێ و بەشیان دەکا. هەشت فرسەخ لە هەولێر دوورە). ئیدیکە هەن پێیان وایە ئەو کەسەی کە ئەو گوندەی دروستکردوە و بەناوی خۆیەوە ناوی ناوە (شاە قولی بەگ کوڕی شاە عەلی بەگ) کە لەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونیدا میری بەهران بوە و ناوی ناوە (شاقوڵی ئاوا) واتە (شاقولی ئاباد). و.ع

١٧. ناوی ڕەواندوز لە دوو وشە پێکدێ، (ڕەوان) کە ناوی خێڵێکی ڕەوەندی کوردە (کە هەر ڕەوەندەکەیە و.ك) لەگەڵ دژ کە لە زمانی کوردی کۆندا مانای قەڵا دەگەیەنێ و ئیبن ئەسیر لە (الکامل)ەکەیدا بەناوی (ڕوینـدوز) ناوی هێناوە. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا (پاشای ڕەواندوز) سەربەخۆیی خۆی تێدا ڕاگەیاند، کەناوی محەمەد پاشای ڕەوانـدوزیەو ناسراوە بە پاشای کۆرە (پاشای گەورە) دەسەڵاتەکەی فراوان بوو قەڵادزە و ڕانیە و هەولێر و ئامێدی و زاخۆشی گرتەوە و لەسەردەمی ئەودا دروستکردنی تۆپ گەشەی کرد لە ڕەواندوز و تۆپێکیان لە مۆزەخانەی چەکی بەغدا هەیە. و.ع

١٨. کارێز لە ئاودێری ناوچەی هەولێر لەسەردەمی عەباسیەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوە چونکە ناوچەکە لەرۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا لێژ دەبێتەوە ئەو لێژیەش بیرۆکەی هەڵکۆڵینی کارێز و ئاودانی ناوچەکەی زیندو کردەوە، بە گرتنەبەری ئەو شێوازەی کە سەنحاریبی پاشای ئاشوریەکان لە جۆگە هەڵگرتن دایهێنا. دەڵێن لەسەردەمی عەباسیەکاندا ژمارەی کارێزەکانی ناوچەی هەولێر ٣٦٥ کارێز بووە، بۆیە ئەو ناوچەیەی نێوان هەولێر و ئاڵتون کۆپری پڕ لە باخ و بێستان بووە لە گەشتی (تافرینە: ١٦٣٨–١٦٤٢) بەناوی (عێراق لە سەدەی حەڤدەدا) شتێك هەیە کە پاڵپشتی ئەو قسەیە دەکاو دەڵێ گەیشتینە دەشتێکی فراوان کە پڕبوو لە داری بەردار، ئەمەش دەشتی هەولێرە. نووسەر باسی ئەوەش دەکا لەسەردەمی ئەودا (٦٠) کارێز هەبووە، بەڵام ئەمڕۆ لە ئەنجامی پشتگوێ خستنی پاککردنەوەیان ژمارەیەکی کەمیان ماوە و خەریکە لەبەین دەچن. کارێزی (قاسم ئاغا)ش کە بە مەودایەکی کەم لە هەولێر دورەو لە باشووری ڕۆژئاوای هەولێرە. قاسم ئاغاش باوکی یەعقوباغای سیری هەولێریە کە یەکێك لە شاعیرە ورياکانە. و.ع

١٩. ژمارەی دانیشتوانی هەولێر بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥) بە (٩٥٥٩٢) کەس دانراوە.

٢٠. ئەوەیان سەردەمی نووسینی کتێبەکە بووە، بەڵام ژمارەی دانیشتوانی ناوەندی قەزاکە و گوندەکانی بە (١٦١٢٤)کەس مەزەندە دەکرێ و ناحیەی

تەقتەقی سەر بەو قەزایەش بە (١٤٧٦٨) کەس مەزەندە دەکرێ. (ئەوەشیان هەر لە حەفتاکان و.ك).

٢١. ئێستا سەر بە پارێزگای کەرکوکەو ژمارەی دانیشتوانی ناحیەکە و گوندەکانی بە (١٠٢٧٦)کەس مەزەندە دەکرێ.

٢٢. ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە و گوندەکانی ئەمڕۆ بە (١٠٦٢٣) کەس مەزەندە دەکرێ و ناحیەی باڵەکی سەر بەو قەزایەش و گوندەکانی بە (٦٢٩٨) کەس و ناحیەی برادۆستیش لەگەڵ گوندەکانی (٦٢٩٨) کەس و ناحیەی دیانا و گوندەکانی (١٠٧١٥) کەسن.

٢٣. شەقلاوە ئێستا قەزایە و ناحیەی هەریری سەر بەویش ژمارەی دانیشتوانی بە (١٢٤١١) کەس و ناحیەی خۆشناویش بە (٩٨٨٨) کەس و سەلاحەدین بە (١٢٤١١) کەسمەزەندە دەکرێ.

٢٤. ئەوە ڕۆژانی نووسینی کتێبەکە بوو بەڵام ئەمڕۆ دانیشتوانی مەخمور و گوندەکانی بە (٥٩٦٨) کەس و کەندێناوە و گوندەکانی بە (١٩٧٩٦) کەس و گوێڕ و گوندەکانیشی بە (١٥٩٩٠) کەس و قەراج و گوندەکانیشی بە (١١١٣١) کەس مەزەندە دەکرێن. و.ع. (بێگومان ئەو سەرژمێریانە هی ساڵانی حەفتاکانن کە ئەو وەرگێڕانەی بە عەرەبی تێدا چاپ کراوەو ئێستا زۆر جیاوازە، و.ك).

٢٥. ئێستا بەپێی سەرژمێری (١٩٦٥) ژمارەی دانیشتوانی بە (٣٦٠٢٥٥) کەس مەزەندە دەکرێ.

٢٦. ............................

٢٧. گۆشتی بەراز لە شەریعەتی ئیسلامیدا حەرامە و، مرۆڤی کوردیش لە موسڵمانە هەرە پابەندەکانە بە فەرمانەکانی ئاینەکەیەوە. و.ع

٢٨. لە پۆلی پشیلەیە و قاچەکانی درێژە و کلکێکی درێی هەیە و سەری کلکی موەکانی ڕەشن.

٢٩. ............................

٣٠. خشۆکێکی چوار پێیە.

٣١. یان (بۆرەك) باڵندەیەکی وەك قەلە ڕەشە ڕەنگێکی زەردباوی هەیەو کلکێکی ڕەش و باڵەکانی بە ڕەنگی شین و ڕەش و سپیەکی زۆر خەتخەتن.

٣٢. (کۆلارە و سورەداڵ و مشك گرەشی پێدەڵێن. و.ك) باڵندەیەکی گۆشت خۆرەو دەنگی وەك حیلەی ئەسپ دەچێ.

٣٣. ..........................

٣٤. ..........................

٣٥. ..........................

٣٦. سەمەرەیە ئەگەر باسی ئەوە بکەین کە مێیەکەی جالجاڵۆکە دوای پیتاندن نێرەکەی دەخوا. (و.ع).

٣٧. شانشینی مێشەنگوین دنیایەکی سەیرە، شاژنەکەیان مرۆی سەرسوڕماو کردوە، چونکە مێیەیەو هەموو نێرەکانی لە شانشینەکەی خۆی کۆکردۆتەوە و بەهێزترین نێرەش بۆ جوتبوون و پیتاندن هەڵدەبژێرێ و دوای ئەو کارەش نێرەکە دەمرێ. پزیشکی نوێش سەلماندویەتی کە هەنگوین بۆ زۆر نەخۆشی سودێکی گەورەی هەیە. و.ع

٣٨. ..........................

**بەشی سێیەم:**

١. لەلیوای هەولێر کوردو تورکمان و عەرەب هەن و، بەناوبانگترین عەشیرەتە کوردەکانی هەولێریش: بریتین لە : دزەیی، گەردی، خۆشناو، سورچی، بارزانی، برادۆست، هەرکی، ناودەشت، باڵەك و هەندێ عەشیرەتی بچووکی دیکە.

٢. سەختی شوێنی نیشتەجێبونیان کە چیایی و بیابانیە گەورەترین کاریگەری بەسەر سروشتی ئەوانەوە هەبوەو وەك جەنگاوەری ئازاو بەجەرگ دروستبوون و لەبەر ئەوەی نیشتیمانی خۆیان تا ڕادەیەك بەروبومی کەمبووە، بۆیە وەك بەدوەکان، نەریتیان یان تاڵانکردنی ناوچە گوندیە جێگیرەکان بووە یان گەڕان و سوڕان بووە بە دوای لەوەڕو ئاودا. ئاشوریەکان ناویان ناون (کاردۆ). پێشدەچێ کێشە و ئاستەنگیان بۆ دراوسێ ئاشوریەکانیان دروستکردبێ، بۆیە هەڵمەتیان بردونەتە سەر کە زۆر کەم سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. و.ع

٣. نیشتیمانی کوردەکان لە کۆنەوە یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی دەوڵەتی بچوکی لەیەکتر جودا دوروست ببێ و، لەڕوی ئابووریەوە سەربەخۆ بێ،

ئەمــەش هۆیەکــە بــۆ زۆری دیالێکتــەکانی زمــانی کــوردی. دوو دیالێکتــە سەرەکیەکە بریتین لە سۆرانی و بادینی و هەندێ دیالێکتی بچکوتریش هـەن وەك فەیلی و لوڕی و هەورامی و زازایی. هەندێ دەوڵەتە کوردەکانی مێـژووی کۆنیش بریتین لە گۆتی و لۆلۆیی و کیسی و (ئارابخا– کـەرکوك) و میتـانی و کیشیەکان و ئۆراتو و مادیەکانیش بەپێی قسەی هەرە بلاّو نـەوەی کوردیـان خستۆتەوە. و.ع

٤. ئەوەیان حاڵی سەردەمی داگیرکاری بەریتانی ناحەزی بەسـەر چـوبوو. بـەلاّم ئەمڕۆ ناوچە کوردیەکان بەشێکن کە لە عێراق جیا نابنەوە و، گەلی کـوردیش برایەتی لەگەڵ گەلەکانی دیکەی عێراق هەیە و شـکۆی هـاولاّتیبوونی لەسـەر بنچینەی یەك خاکی و یەك ئایینی و مێژووی هاوبـەش و ئـابووری پـەیوەست بەیەك و چارەنووسی یەکگرتوو یەك هیوایی، هەیە. و.ع

٥. ئەمەش حاڵی ڕۆژەکانی داگیرکـاری فەرەنـسی ناحـەزبوو لـە سـوریا، کەچـی ئەمڕۆ لە سـوریا کـورد هـەن و شـکۆی هـاولاّتی بوونیـان لەگـەڵ عەرەبـەکان وەکو یەك هەیە. و.ع

٦. ڕەنگـە (کودراهـا، Kudraha) بـێ کـە لـە نووسـینە بزماریـەکان هـاتووە. (نووسەر).

٧. ئــەوەی کتێبــە مێژوییــەکان باســی دەکــەن هــەولێر پایتــەختی ســوڵتان موزەفەرەدین کەوکەبری ئەتابـەکی بـووە لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی شەشـی کۆچی و لە شوێنەوارەکانیشیدا تا ئێستا منارەی هەولێر دەبینرێ و، گوێمان لێنەبووە کە سەلاحەدین کردبی بە پایتەختی خۆی، لەشوێنی دیکەش ئەگەر گونجاو بێ زانیاری زیاترت دەربارەی مێژووی ئەو شارە دەدەینێ. و.ع

٨. ئەو ڕۆحە تۆرانیە بوو کـە بزوتنـەوەی نـەیاری ئـەو گەلانـەی دروسـتکرد کـە لـەژێر سـایەی ئیمپراتۆریـای عوسمانیـدا بـوون، لەوانـەش گـەلی عـەرەب کـە ســەرەتا لــە (کۆمەڵــەی لاوان و پــارتی مەرکەزیــدا) خــۆی نوانــد و داوای سەربەخۆبون و جیابونەوەی لەو ئیمپراتۆریایە دەکرد. و.ع

٩. لە ناحیەی بازیـان سـەر بـە قـەزای چەمـچەماڵ لـەدایك بـوەو پـەیوەنـدی بـە ئـەدیب و شـاعیری تـورکی ئـەو سـەردەمە (نـامیق کـەمال بـەگ) کـردوەو شیعرەکانیشی زۆر جۆرن، کۆمەلاّیەتی و گاڵتەجاری و داشـۆرین و فەلـسەفی

و پیاهەڵدان، کە لە دارشتن سادە و لە ماناد قوڵن. لە (١٣)ی کانونی دووەمی (١٩١٠) کۆچی دوایی کردوەو، لە گۆڕستانی گەیلانی لە بەغدا نێژراوە و شعرێکی فارسی لەسەر کێلی قەبرەکەی نووسراوە: ﴿ لە دیوانەکەیدا هەیە (و.ك)﴾. دیوانێکی شعری ناتەواوی هەیە کە لە ساڵی ١٩٣٥ لەبەغدا چاپکراوە. و.ع

١٠. لە زۆربەی ئەو قسانەی دەربارەی ئاینی کوردەکانەوە دەکرێن وەهە تێکەڵ و پێکەڵیەك هەیە: ئاینی زەردەشتی لە فارس و عاد دا شەش بەر لەزاین دەرکەوت و کوردەکانیش لەو میللەتانەبوون کە چوونە سەر ئەو ئاینە و لەکاتی دەرکەوتنی ئاینی مەسیحی دەستەیەکی کەمیان چوونە سەر ئەو ئاینە کە نەستوریەکانی ئێستان و بە بنەچە ئاشوورین. کاتێکیش کە ئاینی ئیسلام دەرکەوت تیشکی بەسەر ولاتی کورداندا بلاو بۆوە، ئەو نەتەوە رەسەن و زیندوە چوونە سەر ئەو ئاینە پیرۆزە، شارەزای بیروباوەرە راستەکانی بوون و رۆڵەکانی بەدڵ و بەگیان چوونە سەر ئەو ئاینە. بگەرێوە سەر: Sir Mark Sykes; The Caliphs، Last Heritage . و.ع

١١. ...............................

١١. (قزڵباش) مەزهەبێکی ئاینیە و هەندێ لە کوردەکان چونەتە سەری و مانای قزڵباشیش بە تورکی واتە (سەر سورەکان) (یان کلاو سورەکان)ەو لەبنەچەدا لە سەردەمی سەفەویەکان بە فارسەکانیان وتوە چونکە کلاوێکی سوریان لەسەر دەناو دواتر بووە نازناوی شیعە غولاتەکان. هەندێکیش پێیان وایە کە تەریقەتێکی تەسەوفە و لە کتێبی (الاعلام باعلام بیت الله الحرام)ی (قطب المكي)دا باسیکراوە. و.ع

١٢. کاکەییەکان لە قزڵباشەکان جودانین و لە راستیدا یەکتر رون دەکەنەوە.

١٣. (سارەلو) یان سارولی یان سارلیە عەشیرەتێکی تورکمانی کاکەیین هەندێ بۆ ئەوە دەچن کە لە ئاینێك وەرگیراوە ناوەکەی بریتیە لە (صارت لي الجنة) (واتە بەهەشتم بۆ بوو) سەرۆکەکانی عەشیرەتەکەش سەیدی کاکەیین و لە بەعشیقە و ئەلقوشدا بلاون و زۆربەیان لە هەولێرن و لەسەر لێواری زێی سەرون. و.ع

١٤. ماڵـەکانی ئـاکریَ لـە قـەدی چـیا دروسـتکراون و چـین چـین و هـەر چـینێك لەسـەرەوەی چینەکەی دیکەیـەو، تاقگەیـەکی لێیـە کـە سـی مـەتر بـەرزەو پێیـدەڵێن (سـیا) لـە (موعجـەم ئەلبولـدان)ی یـاقوتی حەمەویـدا بـە (عقـر الحمیدیة) ناوی هاتووە. و.ع

١٥. یاقوتی حەمەوی دەڵیّ: عیمادەدینی زەنگی (٥٣٧کۆچی- ١١٤٢ز) دروسـتی کـردوە کـە سـەلاحەدینی ئـەیوبی لـە نـاودارترین پیاوەکـانی بـووە. لەسـەر قەلآیـەکی کـوردان بنیـات نـراوە کـە پێیـدەڵێن (ئاشـب)، مـستوفی دەڵـیّ عیمادولدەولـەی دەیلـەمی کـە لـە (٣٣٨ك) مـردووە ئـاوەدانی کردۆتـەوە. دەنگوباسی فەرمانڕەوا بادینیەکانی ئامێدی لە شەرەفنامەدا زۆر باسـکراوە و ڕەنگە وشەی (ئامات) کە لە نووسـینە ئاشـوریەکاندا هـاتووە ئامـاژە بـیّ بـۆ عەمادیە کە کوردەکان پێدەڵێن ئامێدی. و.ع

١٦. بنچینەی ناوەکەی بە دروستی نازانریّ، ڕەنگـە ئـارامی بـیّ و لـە (زاخوتـا)وە هـاتبیّ کـە مانـای سـەرکەوتن دەگەیـەنیّ، وەکـچۆن مێژوەکـەش نـازانریّ و، پێمان وایە کە لـە شـوێنی (حەسـەنیە) دروسـتکرابیّ کـە عەرەبـە هاتوەکـان باسی دەکەن. و.ع

١٧. لە بنەڕەتدا (Scarecrow)یە لە کتێبەکـە. کـە لەشـێوەی مرۆڤدایـە و لـە کێڵگەدا دادەنریّ بۆ ئەوەی باڵندە بەروبوم و تۆوی کێڵگە نەخۆن. و.ع

١٨. ژنی کورد کە موسـڵمانە گوێڕایـەڵی مێردەکـەیتی و دەبـیّ بەباشـی مامەڵـەی لەگەڵدا بکاو ڕەنگە هەندیّ جار بەقسەی ژنکەی بکاو هەندیّ جاریش نا. و.ع

١٩. شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز ڕێسای لێهاتوانـەی بـۆ تـەلآق دانـاوە و تـەلآق دوو جارە یان پێکەوە ژیان بە باشی یان دەستبەردان و بە نەرم و نیـانی. ئەگـەر سێیەم جار تەلآقیدا ئەوا تا شـوێکی تـر نەکاتـەوە و تـەلآق نەدرێتـەوە بـۆی حەلالّ نابێتەوە، ئەگەر گەڕانەوە و پێیان وابوو سنورەکانی خـودا دەپـارێزن ئەوا گوناهیان لەسەر نیە، ئەو سنورانەش خودا بۆ میللەتێکی ڕون کردۆتەوە کە زانان و ژنی تەلآقدراویش مافێکی خۆی هەیە لەسـەر خواناسـان. (یـا ایهـا الذین آمنو اذا نکحتم المؤمنـات ثـم طلقتمـوهن مـن قبـل أن تمـسوهن فمـالکم علیهن من عدة تعتدونها فمتعوهن و سرحوهن سراحا جمیلا). و.ع.

٢٠. قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە دەڵێ: (والذين يتوفون منكم ويذرون ازواجا فأذا بلغن اجلهن فلا جناح عليكم فيما فعلن في انفسهن بالمعروف والله بما تعملون خبير). و.ع

٢١. پێویست بە نووسین ناکا.

٢٢. میوانداری ڕەوشتێکی ڕەسەنی عێراقە جا چ عەرەبی بێ یان کوردی بێ، ئەوە لە بیابانەوە هتوەو ئیسلامیش دانی پێدا ناوە، وەکچۆن دانی بە زۆر ڕەوشتی بەرزی مرۆییانەی دیکە داناوە هیچ شتێکیش وەك تروسکەی ئاگر (ئاگردان) ئامـاژە نیە بۆ نانبدەیی کە ڕێبواران لە شەودا ڕێگاکەی پێ بدۆزنەوە و بەرەو دیوەخان بچن. کە ئەمەش لەسەر گردێکدا دەکرێتەوە و بەرزبونەوەی دوکەڵیش لە ڕۆژدا بۆ هەمان مەبەستە. و.ع

٢٣. ڕەنگە ئەوە ڕێو ڕەسمی (دیوەخانی سەرۆك)بێ و ئەدەبی دیوەخان یان تێیاندا هەبێ کەمدو بێ لەبەر ئەو قسە نەستەقەی کە دەڵێ (زیاتر گوێ بگرەنەك بدوێی). و.ع

٢٤. لە بنەڕەتدا ناوێکی ڕوسیە (سامور فاریت) کە لە دوو بەش پێکدێ (Samor) واتە (زاتی، خودی) و (Varit) واتە دەکوڵێ، واتە ئەو دەزگایەی خۆی دێتە کوڵ و ڕەنگە لەڕێی ئێرانەوە هاتبێتە ناو زمانی خەڵکەکە. و.ع

٢٥. لە بنەڕەتدا: (Pony)یە کە جۆرێکە لە ماین یان جوانوی بچووك.

٢٦. لغاو ئاسنێکە دەخرێتە دەمی ئەسپەوە بۆ هاژوشتنی.

٢٧. (اصحاب الرقى) واتە ئەسحابولکەهف کە لە قورئاندا چیرۆکەکەیان باسکراوە. و.ع

٢٨. پێویست بە نووسین ناکا.

٢٩. ڕەنگە لەو ڕۆژانەی کە ئەو دیتونی حاڵی هاولاتیە کوردەکان ئاوا بوبێ لەعێراق، بەڵام ئەمرۆ دوای نەمانی سایەی دەرەبەگ و (هۆشیاری میللی) کە دەرەبەگ مەودایەتی زۆر باری گرانی سەرشانی جوتیاران بوو، ئێستا لەسەر ڕێی هاولاتیبونێکی چلاك و هۆشیار و ژیانێکی ئازاد و شکۆمەند، لاچوەو ژیانی بریاەتی و ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی هەیە. و.ع

٣٠. کلۆدیۆس جێمس ریچ (١٧٨٧–١٨٢٠) دنیا گەڕێکە کە پێشتر باسمان کردوەو بەعێراقدا گەڕاوە و لەو دەمەدا زۆر شتی لە هەموو لایەکی عێراق دیوەو بەرهەمی گەشتەکەشی لە دوو بەرگی گەورەدا نووسیوە کە دوای مردنی ژنەکەی لە ١٨٣٦ بەناوی. ( Marrative of a Resipence in Koordistan) ژاپی کردوە و ئەوەی ریچ نوسیویەتی لە پێشەنگی ئەو نووسینانە دادەنرێ کە لەسەر شوێنەواری عێراق نووسراون. و.ع

٣١. پێویست ناکا بنووسرێ.

٣٢. پێویست ناکا بنووسرێ.

## بەشی چوارەم

١. لقەکانی ئەو عەشیرەتە بریتین لە (میران) و (کۆنتۆلا) و (مامان) و لە دەوروبەری چیای قەرەچوغ و کەندێناوەو لە قەزای مەخمور نیشتەجێن رۆڵەکانی بە کۆشش و چالاکی بەناوبانگن و خاکی بەپیتی ناوچەکەشیان لەوەدا یارمەتیدەریانە. گومانیشی تێدانیە کە لەناوچونی دەرەبەگایەتی لەعێراق وا لە هەموو رۆڵەکانی ئەو عەشیرەتەو هەمو عەشایرەکانی دیکە دەکا کە ئەوەندەی کارەکە پەیوەندی بە مافی بە هاولاتی بونەوە هەبێ، هەموان یەکسان بن و ئەو جیاوازیەش لەناو بچێ کە لە دەست بەسەرداگرتنی زەوی بەهۆی هێزەوە دروست بوە. (و.ع).

٢. شارۆچکەیەکی بەراوەو چین لەسەر چین لە قەدپاڵی چیایەکدا بنیات نراوە. تاڤگەیەکی دلگری لێیە کە (٣٠) مەتر بەرزدەبێ و ناوی (سیپە)یە لە (موعجەم ئەلبولدان)دا ناوی بە (عەقر ئەلحەمیدیە)هاتوە کوردەکان پێیدەڵێن (ئاکرێ). (و.ع).

٣. لەوانەش مەنگوڕ و مامەش و پیران و سن و رەمك و سەیریشە باسی ئەوە بکەین کە بۆ چارەسەری برین شێوازێکی سەمەرەیان هەیەو بریندارەکە لە پێستەی مانگا دەگرن و دەیدرون و تەنیا سەری لە دەرەوەیە، هەر هێندەی پێستەکە دەستی بە بۆگەن کرد دەیهێننە دەرێ. (و.ع).

٤. شەقلاوە ناوچەی سەرەکی خۆشناوانەو لقەکانیشی پشت گوێ و میر وسی و میر مەحمەلین و هەندێکیان لە ناوچەی کۆیەو رانیەش دادەنیشن. (و.ع).

٥. ڕەنگە کاتێ خۆی شتی وا هەبوبێ. بەڵام ئێستا بە نەمانی دەرەبەگایەتی و بڵاوبونەوەی وشیاری، شتی لەو جۆرە لە ئارادا نەماوە. (و.ع).
٦. .........................
٧. .........................
٨. .........................
٩. .........................
١٠. .........................
١١. ئەوە ژمێرەی سەردەمی نوسینی کتێبەکەیە، بۆ ئەمڕۆش دەتوانی بچیتەوە سەر ئەو ژمارانەی لە بەشی ڕابردو باسمان کردوون. (و.ع).
١٢. تا ئەمڕۆش (خان)ێکی تیا دەبینرێ کە خانمی بەخشندەو بەڕێز (عادیلە خانم) وەك قۆناغێکی حەسانەوەی گەشتیاران بنیاتی ناوەو پۆلیس وەك بنکەیەك بەکاری دێنن. عادیلە خانمیش خێزانی ئەحمەد پاشای والی بەغدا بوە. (و.ع).
١٣. کوردەکان بە عەشیرەت دەڵێن (خێڵەکی). (و.ع).
١٤. ڕێبوار کە بەرەو هاوینەهەواری سەلاحەدین دەچێ چاوی بەو زێیە دەکەوێ کە هەردو زنجیرە چیای خانزاد و سەلاحەدین لە یەك جیا دەکاتەوە و لەسەر دۆڵەکەشدا دیوارێکی بەردینی داروخاو هەیە کە پاشماوەی پرۆژەیەکی ئاودێری سەردەمی سەنحاریبی ئاشوریەو بەردێکیان بە نوسینی بزماری لەسەری نوسراوە کە سەنحاریب تیایدا دەڵێ: (من سەنحاریبم پادشای وڵاتی ئاشوور و سێ ڕوبارم لە چیای خانی هەڵکۆڵیوە کە دەکەوێتە ژووری هەولێری شوێن نیشتەجێی خانمی بەڕێز عەشتاری خواوەندەو ئاوەڕۆکانیم بە ڕێك و ڕاستی هێناوە). (و.ع).

**بەشی پێنجەم:-**

١. مەزارەکە دەکەوێتە سەر یەکێك لەو دو شوێنەی کە شوێنەواری دارو پەردوی نەینەوا پێکدێنن، شوێنەکەی دیکەش پێیدەڵێن قوینجەق و هەردوکیان کیلۆمەترێك لە موسڵ دورن. شوێنەکەی یونس پێغەمبەریش لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بە گردی تۆبە ناسراوە. مەزارەکەش لە سەرەتادا پەرستگایەکی ئاشوری بوەو دواتر وەك هەندێ کەس بۆی دەچن کراوەتە

دێر یان کلێساو لە کۆتاییدا کراوەتە مزگەوت. یونس پێغەمبەریش یۆنان ئۆیۆنای پێغەمبەرەو بەگوێرەی ئەوەی کە لە تەوراتدا هاتوە، ڕەنگە لە سەردەمی (ئەسەر حەدون)دا ژیابێ. (و.ع).

٢. ناوەکەشی لە (ئەربائیلۆ)وە هاتوە واتە چوار خواوەند. کوردەکانی ناوچەکە پێیدەڵێن هەولێر و ماناکەشی پەرستگای خۆرە.

٣. پێمان وایە کە شارەکە ناوی (پردی زێڕین بێ) چونکە تورکەکان لەبەر ئەو وێکچونە ئاشکرایەی نێوان (زاب) و (ذهب)ی عەرەبی ئەو ناوەیان لیچناوەو عەرەبەکان پێیان گوتوە (قەنتەرە) و کوردەکانیش دەڵێن پردێ کە هەمان واتای هەیە. (و.ع).

٤. لە تۆمارە کۆنەکاندا ناوی (ئارابخا)یەو ناوی لێنراوە (کەرخینی) و ڕشەنگە ناوی کەرکوکیش لەوەوە وەرگیرابێ. (و.ع).

٥. ناوەکەی لە سۆمەریدا (کیماسن) و لای ئاشوریەکان و بابلیەکان (کەبرۆ)یە لەسەر واتای (خەڵکە عەرەبەکەی ئەوێش ناویان ناوە (کفر) و عوسمانیەکان ناویان ناوە (سەلاحیە) و یەکێك لەو قەلایانە بوە کە ئەو کاروانانەی دەپاراست کە لە باکوری ئێرانەوە دەهاتن. (و.ع).

٦. ئێستا ناوی (سەعدیە)یە ناوە کۆنەکەشی لە دو بەش پێکهاتوە، (قزل) سور بە تورکی و (ڕەبات)ی عەرەبی، واتە شریتی سور یان قایش پشتوێنی سور. (و.ع).

٧. شوێنەوار ناسان دەڵێن لە جێی شاری (ئەرنجا)ی شوێنەواری بوە لە دو هەزاری بەر لە زایین.

٨. عوسمانیەکان مەزهەبی حەنەفیان کردە مەزهەبی فەرمی دەوڵەتەکەیان و سەردەمی ئەوان پێی دەگوترا (سەر مەزهەب) واتە مەزهەبی سەرەکی، وە لەبەر ئەوەی دانیشتوانی شارەکە لە بنەچەیەکی تورکی بون، ئەو مەزهەبەیان کردە مەزهەبی خۆیان. (و.ع).

٩. قەلاکە گردێکی دروستکراوەو پاشماوەی (ئەربیللا)ی کۆن لەخۆناگرێ و ئەمەش ڕاستیەکی دور لە گومانە. لەسەردەمی نوسینی ئەم کتێبەشدا گەرەکی خواپێداوان و پیاوماقوڵان بوە لە دانیشتوانی هەولێر. وەك دەبینرێ خانوەکانیش بەتەك یەکەوە دروستکراون و ئەگەر کەسێك بیەوێ بچێتە ئەو

گەڕەکە تەنیا لە تاکە دەرگاکەیەوە ئەوەی بۆ دەکرێ و ئەمەش هۆکارێك بوە بۆ بەهێزکردنی لەڕوی غەوارە تەماعکارەکان و پیشەگەرانی شەو (مەبەست دزو تاڵانچیەکانە). جێی داخیشە کە ئەو دەرگا شوێنەواریە لە ساڵی ۱۹۵۹دا ڕوخێنرا. (و.ع).

١٠. ..........................

١١. بنکەی قەزایەکی سەر بە پارێزگای هەولێرە. (و.ع).

١٢. نەسرانیەکان کۆی (نەسرانیە)کە بۆ گوندی ناسرەی عیسای مەسیح دەگەڕێتەوە (س.خ) و دەڵێن پیتی (یاء) بۆ زێدەڕۆییە لە ماناکەیدا گومانیشی تێدانیە کە ئەو ژمارانەی نوسەر باسیان دەکا ئێستا گۆڕانیێ:ی گەورەیان بەسەردا هاتوە. (و.ع).

١٣. بە پێی بنچینەی گشتی ڕێو شوێنی (ڕێسای) شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز، پیاوی موسڵمان دەتوانێ ژنێکی ئەهلی کیتاب بهێنێ بەلاَم پێچەوانەکەی نەگونجاوە. (و.ع).

١٤. ..................

١٥. هەندێ لەو وتانەی نوسەرمان لاداوە کە سودێکیان نەبوەو بەنیشانی (........) ئاماژەمان بۆ کردوە، چونکە بنچینەیەکی بەهێزی نەبوەو تەنیا وەهم و تێکەڵ و پێکەڵیەکی نوسەرەو تێڕوانینی تایبەتی ئەو لەخۆوە دەگرێ بەرامبەر عەرەب و کوردو پەیوەندیەکانی نێوانیان. ئەو دو نەتەوە برایە لەسەر خاکی ئەو نیشتیمانە پیرۆزەدا ژیاون و پەیوەندی ڕێزگرتن لەنێوانیاندایەو هاو ئاینی و یەکچارەنوسی بەیەکیان دەبەستێتەوە. (و.ع).

١٦. (سارەلو) یان (سارەلویی) یان (سارلی) عەشیرەتێکی تورکمانی کاکەیین. باوەڕیان بە دۆنایدۆن (تناسخ) هەیەو هیچ شتێکی بێ پەردەیی و بێ ئابروییان نیە. لە گوندەکانیشیان (وەردەك) و (قەرقەشە)ن کە سەر بە ناحیەی قەرەقۆشن، هەندێکیان لە قەرەقۆینلۆ و بەعشیقەو ئەلقۆشن و بەشی هەرە زۆریان لە هەولێر لەسەر لێواری زێی گەورە دەژین. (و.ع).

١٧. وشەی کاکەیی وشەیەکی کوردیەو مانای (برایان) دەگەیەنێ ڕێبازێ:ی تەسەفەو دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی شێخ عیسای بەرزنجی (٧١٦ هـ) ١٣١٦ ز. ئەو ڕێبازەش لە چیاکانی هەورامان جێگیربون و هەر تاکێکی ئەو

دەستەیەش بە برا بانگی یەکتری دەکەن. جاران لە عێراق بە (فتوە) (جوانمەردی) ناسرابو، کە دەستەیەکن هەندێ عەشیرەتی سۆفی کۆدەکەنەوەو باوەڕیان ئیسلامیەو زێدەڕۆیی تێدایەو لەژێر کاریگەری بیروباوەڕەکانی (حوسەینی کوڕی مەنسوری (حەللاج) دایە. (و.ع).

١٨. موقەدەم ی.ب. سۆن نوسیویەتی: ناوی کەرکوك وەك دەڵێن، بە پشت بەستن بە بنچینەی بەهێز و پتەو لە، (قەلای سلۆقیەکان)ەوە هاتوە کە ناوێکی (کلدانی– سریانی)ەو دەگەڕێتەوە ڕۆژانی عیسای مەسیح (س.خ). (و.ع).

١٩. عەلی ئیلاهیەکان کە (نەسیری) یان (عەلەوی)شیان پێدەڵێن و جیاکردنەوەیان لە کاکەییەکان هاسان نیە، سەرۆکەکانیان (سەید)ن و دوپاتی دەکەنەوە کە موسڵمانن. (و.ع).

## بەشی شەشەم:–

١. ئامانجی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی کە دوای شۆڕشی (١٤) تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دەرچو، ئەوەبو کە موڵکداریە کشتوکاڵیە گەورەکان لەناوبباو ڕوبەری گونجاوی کشتوکاڵی بداتە جوتیارە ڕاستەقینەکان بۆ وەبەرهێنانی. (و.ع).

٢. عەبدولحەمیدی دوەمی سوڵتانی عوسمانی دەستی بەسەر باشترین زەویە کشتوکاڵیەکانی عێراقدا گرت و بەهۆی بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت بەناوی (بەڕێوەبەرێتی موڵکە سونیەکان) بەڕێوەی دەبردن، ئەو بەڕێوەبەرایەتیەش داهاتەکانی ڕەوانەی خەزێنەی تایبەتی سوڵتان دەکرد. ئە زەویانەش بە

٣. ........................

٤. ئەو بەروبومە کەمی کەمی ئەو برە دەردەخا کە جوتیار بەرامبەر ڕەنجەکەی دەستی دەکەوت. گومانیشی تێدا نیە کە جوتیارەکانی باکور لەژێر دەسەلاتی ڕەهای شێخ و ئاغاکاندابون و، تەنانەت تا ڕادەیەکیش سەرکارەکان، ئەوانە کاروباری گوندیان بەڕێوەدەبرد، کە یەکەیەکی کشتوکاڵی بوە لە باکور و، هەوڵیانداوە کێشەی جوتیارەکان چارەسەر بکەن و لەگەڵ حکومەتیشدا نێوانکاریان بۆ بکەن، ئەو کەسانەش پەیوەندی خۆیان بە پیاوەکانی داگیرکەرو نەزانی جوتیارانیان قۆستەوەو زەویە کشتوکاڵیەکانیان لەسەر خۆیان تاپۆ کردو هەڵیاندەسوڕاندن. (و.ع).

٥. هـر گونـدێکی کـوردی سـەرۆکێکی هەیـە کـە پێیـدەڵێن موختـار هـەروەها کوێخاشـی پێـدەڵێن و وەك سـەرکار وان– سـەرکار وشـەیەکی فارسـیە و لـە (سـەر) و (کـار) هـاتوەو بـوە بـە (کـال) واتـە (کـار) کـە کاریـان نێوانکـاری موڵکـدارو جوتیارەکـان بـوەو لەگـەڵ نێوانکـاری جوتیـار و حکومـەت و، دەسەلاتێکی ڕەهایـان بەسـەر گونـد و گوندنـشینەکان هـەبوە. (و.ع). ئەمـە هەڵەیەو وشەکە هەر خۆی کوردیەو (سەرکار)ە. (و.ك).

٦. یـەکێك لـەو پـارە کانزاییانـە بـو کـە لـە سـەردەمی داگیرکـەر و بەشـێکی سەردەمی مەلەکی لەناوچو بەکاردەهات و، بەهاکـەی نزیکـەی (٧٥٠) فلـسی پارەی ئێستایە. (و.ع).

٧. ....................

٨. بەهۆی ئەو سروشتەوە کشتوکاڵ لە کوردستاندا زۆر کۆنـە. کـۆنترین گونـدی کشتوکاڵیش (چەرمو)ە کە نزیك چەمچەماڵە لە پارێزگای کەرکوك و، نمونـەی گواستنەوەیە لە چاخی بەردینی کۆنەوە بۆ چـاخی بـەردینی نـوێ کـە مـرۆڤ تیایدا بۆ یەکەم جار کشتوکاڵی کردو ئاژەڵی ماڵی کرد. (و.ع).

٩. ....................

١٠. ....................

١١. ....................

١٢. ....................

١٣. ....................

١٤. ....................

١٥. ....................

١٦. ....................

١٧. ....................

١٨. لە کۆنەوە کفری سەرچاوەی نەوتی لە شوێنێکدا تێدابوە کە پێیدەڵێن (ئـۆن ئیچی ئیمام: واتە دوانزە ئیمام). (و.ع).

١٩. ڕیچ لە گەشتە بەناوبانگەکەیدا دەڵێ مەودای نێوان ئاڵتون کۆپری و دیجلە لە (١٨) کاتژمێر دەبڕدرێ و بە کەڵەکیش ڕۆژێکی پێدەچێ. (و.ع).

٢٠. ساوج بـۆلاق- سـابلاخ، ناوچـەیەکی کوردیـە لـە ئێـران و وەك دائیرەتولمەعاریفی ئیسلامیش دەڵـێ ژمـارەی دانیـشتوانی (٢٠٠٠٠) کـەس دەبێ کە لە کوردەکانی (موکری)ن و دەکەوێتـە باشـوری دەریاچـەی ورمـێ. (و.ع).

## بەشی حەوتەم:

١. لە شوێنە دیارەکـانی کـەرکوك قەلاّکەیـەتی کـە مێژوەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سەدەی پازدەهەمی بەر لە زایین و، لە ساڵی ١٩٣٢ لەسـەر ئـەو گـردەی کـە لەسەری دروسـتکراوە هەنـدێ سـواڵەتی سـورکراوە دۆزرانـەوە کـە نوسـینی بزمارییـان لەسـەرە. دەڵـێن گوایـە گـۆڕی هەنـدێ لـە پێغەمبـەرانی بـەنی ئیـسرائیلی تێدایـە وەك (دانیـال) و (میخائیـل) و (حـەنانیا) و (ئـەلیعازەر: عەزاریا) و لە یەکێك لە مزگەوتەکاندان و جولەکەکانیش باوەڕیان بەوە هەیەو سەردانیان دەکرد.

٢. لـە کۆتاییـەکانی تـشرینی یەکـەمی ١٩١٨دا هێزەکـانی تـورك لـەعێراق بـە سەرکردایەتی ئیحسان پاشا تـەواو لاواز بـوون و ژمـارەو چـەك و تفاقیـان لـە کەمبونەوەدابو. لە دەربەنـدی فەتحـە لـە ناوچـەی کـەرکوك کۆببونـەوە. دوا شەڕی نێوان بەریتانیەکان و تورکەکان ڕویداو پاشماوەی سـوپای شەشـەمی تورك لە ڕۆژی (٣٠) تـشرینی یەکـەم لـەو شـەڕەدا لـەناوبردران تـەنیا برێکـی کەمیان نەبێ کە لـە شـاری موسـڵ بـون. لـە (٣١)ی تـشرینی دوەمـدا سـاڵی ١٩١٨ تورکـەکانئالاّی ئاگربەسـتیان هـەڵکرد کـە لـە (٣٠) تـشرینی یەکەمـدا مۆرکراو لە (٣١)ی مانگدا کەوتە کارکردن. (و.ع).

٣. ....................

٤. تێبینی دەکرێ کە قسەو قسەلۆکی نابەجێ لەلایەن نوسـەرەوە بـەبێ هـۆ پـەخش دەکـرێ، قسە بزرکانـدنی دوای یەکیـشی ڕەنگـە زوڵـم کردنێـك بـێ لەوانەی ناویان دەهێنێ، خوا لە دونیـا تۆڵـەی لێبکاتـەوە، ڕەنگـە لەمرۆشـدا هەندێکیان لە تەمەنی پیریدابن و با گوێ بـەو شـتانە نـەدەن چونکە نوسـەر ئـەودەمای گـەنج بـوەو خـۆی بـە پلـە سـەربازیەکەیەوە ڕاناوە بۆیـە قسە ناڕاستەکانی ئەگەر ئەوان کاریان چاکە بوبێ، کاریان تێناکاو زیانیان لێ نـادا. (و.ع).

٥. ..................

٦. خوێنەری بەرێز تێبینی ئەوە دەکا کە نوسەر بە گومان و قینەوە سەیری ئەوانە دەکا کە ڕێکەوتیان دەکا. ئەو ڕق و جنێو بێ بەڵگە دابەش دەکا، بەڵام هەر خێرا هەڵەکانی خۆی ڕاست دەکاتەوە. (و.ع).

٧. ..................

٨. ..................

٩. ..................

١٠. دیسان دەمانەوێ زانیاریەکانی خوێنەری بەرێز دەوڵەمەند بکەین دەربارەی هەولێرٛ و دەڵێین کە تاکە شاری ئاشوریە کە هێشتا ناوەدانەو ناوە کۆنەکەی (ئەربیلا)ی تا ئەمڕۆ پاراستوە. ئەو ناوەش بەشێوەی (ئۆربیلم) و (ئەربا- ئیلۆ) واتە چوار چرا خواوەند هاتوەو بەوە بەناوبانگ بوە کە بنکەی خواوەند عەشتار بوە و بۆیە دەدرێتە پاڵ ئەو و بە (عەشتار ئەربیلا) بەناوبانگە. ئەو شەڕە مێژویەش ناوبانگی خۆی هەیە (دوا پاشای ئەخمینیەکان) ڕویداو بەناوی (کۆلمیلا) ناسراوەو بە شەڕی هەولێر ناونراوە چونکە هەولێر گەورەترین شاری ناوچەکەیە. (و.ع).

١١. گێڕانەوە ناوچەییەکان وایدادەنێن کە خەڵکی هەولێرە، بەڵام نیشتیمانی بنەڕەتی خێزانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (دوین) لە ئەرمینیا: سەیری (Minorsky: studies in caucasia History London. 1953. (pp/1/ET seq) بکە. دوین بە مەودای (٣٣)میل لە باکوری هەولێرەو ڕنگە قۆناغێك بێ لە قۆناغەکانی ڕاگوێزانی ئەو خانەوادەیە بۆ (تکریت) چونکە سەلاحەدین ئەیوبی لەوێ لە دایك بوە. (و.ع).

١٢. ..............

١٣. بە منارەی موزەفەریە ناسراوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سوڵتان موزەفەرەدینی کەوکەبری، فەرمانڕەوای هەولێر کە لە (٦٣٠ ك= ١١٣٢ز) کۆچی دوایی کردوە. ئەو بەشەی کە ماوە ئێستا (٣٧) مەتر بەرزە و، بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواریش هەندێ لە بناغەکانی مزگەوتەکەی دۆزیوەتەوە. منارەکەش لەسەر شێوازی منارەی سنجار و حەدبای موسڵ و منارەی تاووغ بنیات نراوە کە لە یەك سەردەم دروستکراون. بنچینەی منارەکەی هەولێر

هەشت لایەو دو دەرگای داخراوی هەیە، کە هەریەکەیان دەچێتە سەر پلیکانێك لە ناوەڕاستیشدا لولەکێکی هەیە کە هەردو پلیکانەکە بە دەوریدا دەسوڕێن. بەڕێوەبەرێتی گشتی شوێنەواریش لە ساڵی (١٩٦٠)دا چاکی کردۆتەوەو بناغەکەی بەهێز کردوە. (و.ع).

١٤. ئەو کەسە ئەبوبەکرەفەندی کوڕی حاجی عومەرە کە بە (کوچك مەلافەندی) واتە (مەلافەندی گچکە) بەناوبانگەو بەدرێژایی ژیانی سەرقاڵی وانە وتنەوە بوە لە مزگەوتی گەورەی هەولێر. (و.ع).

١٥. مەبەستی شۆڕشی یەکەمی عێراقە لە ١٩٢٠. (و.ع).

١٦. سەید ئەحمەد عوسمان (خوا لێی خۆشبێ) لەنێوان ١٩١٨-١٩٢١. سەرۆکی شارەوانی هەولێر بوەو کۆلان و دوکانەکانی ڕێکخستوەو لە سەردەمی پاشایەتی لەناوچوی عێراق کرایە (موتەسەڕیف). (و.ع).

١٧. دەکەوێتە سەر ئەو چیایانەی بە (دیبەگە) ناسراون و بەزۆری بیرە نەوتەکانی بەناوبانگە. (و.ع).

## بەشی هەشتەم:-

١. قەزای کۆیەو قەزای ڕانیە چیای هەیبەت سوڵتان لە یەکیان جیا دەکاتەوە کە بەرزیەکەی لەڕوی دەریاوە (٣٨٠٠) پێ دەبێ، کە زنجیرە چیایەکە لە سنوری ئێرانەوە تا ماردین لە تورکیا درێژ دەبێتەوە. ڕانیە شارۆچکەیەکە کە بەشێکی دەکەوێتە سەر گردێکی دەستکردو بەشێکی دەکەوێتە دەشتێکی پانەوە. ڕێگەیەکی کاروانانیش هەبوە کە کۆیەی بە ڕانیەوە دەبەستایەوە و دواتر قەلادزێ و سەردەشت لە ئێران. (و.ع).

٢. دەوڵەمەندکردنی زانیاریەکانی خوێنەر بێ سود نیە دەربارەی ئاغاکان حاڵ و باڵیان، کە سەردەمی نوسینی ئەم کتێبە چۆن بوە، دەڵێین: (ئاغا) نازناوێکی تورکیەو دەخرێتە دوای ناوێك وەك ئاماژە بۆ کەسێکی خانەوادەیەك لە خانەوادە عەشایەریە فەرمانڕەواکان. وا دیارە ئەو نازناوەش نوێیە. چونکە لە شەرەفنامەدا ناوی نەهاتوە (١٥٩٦ن) کە هەردو نازناوی (بەگ) و (خان) تیایدا بەربلاوە، ڕەنگە نازناوی ئاغاش لە کوردستانی باشوردا وردە وردە دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن سوڵتان مورادی چوارەمەوە (١٦٣٧)، بلاو بوبێتەوە. ئاغاکانیش کە جۆرێك لە دەرەبەگە

گەورەکانن بە دەستی خۆیان کار ناکەن بەوە دەژین کە لە مسکێنەکانیان دەستێنن. ئەوان ئاغایەتیان بەسەردا دەسەپاندن کە (زەکاتی) واتە (دەیەکی) بەروبومی زستانەی گەنم و جۆ دەگرتەوەو، سەرەرای (مەڕانە) کە لە پەنجا سەر مەڕێك یان پارەی ئەو سەر مەڕەیەو ئەنجا (پوشانە) کە باجی لەوەڕەو دواتر ڕێژەیەکی دیارینەکراو، کە بارودۆخ دیاری دەکا، لە هەر جۆرە بەروبومێکی کشتوکاڵی وەك (ڕۆنانە) و (هێلکانە)، ئەمە جگە لە بەخشینێك کە بۆ میوانداریکردنی ڕێبواران پێشکەشی دیوەخانی ئاغا دەکرا کاتێ دەهاتنە ئەو گوندەو گوندنشینەکانیش کێی ئامادەبوایە لەسەر خوانەکە دادەنیشت. وەکچۆن ئاغاکان باجیان دەخستە سەرئەوانەی کە کاری ناڕێکیان بکردایەو، هەروەها وەك باجی فەرمی شتێکیان لەوانەش وەردەگرت کە ژنیان بهێنایە (سورانە). هەروەها دەبوایە لەکاتی هاوسەرگیری لە خانەوادەی ئاغاش کورشانی عەشیرەت دەبوایە شتێك بۆ دەستەبەرکردنی تێچووەکانی ببەخشن یان بۆ تێچونی ئاهەنگی دیکە. بڕوانە: Edmonds: Kurds، Turks and Arabs. Pp223، 224 (و.ع).

٣. ....................

٤. هەمەوەندەکان بەوە ناسراون کە لە هەمو عەشیرەتە کوردیەکانی باشور ئازاترن لە شەڕدا. بەردەوامیش لە بەرامبەر تورکەکان پشتیوانیان لە میرە بابانیەکانی سلێمانی کردوە. ئەمەش وایکرد کە دەسەلاتی عوسمانی دەستەیەکیان لێ دور بخاتەوە بۆ تەرابلوسی ڕۆژئاوا (لیبیا)و بۆ ئەدەنە، ژن و منالەکانیشیان دوای حەوت ساڵ و لە ١٨٩٦دا گەڕانەوە بازیان. ئەفسانەکانی هەماوەند باسی سەرکێشیەکانی ئەوان دەکا لە (بەنغازی) تەرابلوسی ڕۆژئاواو تێبینی ئەوەش دەکرێ کە زۆر لە ناوە کوردیەکان و لەوانەش (هەمەوەند) بە (وەند) کۆتایی دێ کە پاشگرێکە لە کوردیدا مانای (لق) یا (سەریە) دەگرێتەوەو ئەو ناوەی پێشی ناوی کەسانی پێشترە. (و.ع).

٥. ................

٦. ....................

٧. ....................

٨. شێخ مەحمودە حەفید سەرۆکی بنەماڵەی ساداتی بەرزنجیە لە کوردستان. لە سلێمانی کرا بە (حوکمدار) و هەر تایەفەیەکی یان عەشیرەتێکی کوردیش کە نیشتەجێی نێوان ڕوباری سیروان (دیالەی باکور) و زێی گەورەن هەر کە لە پێشەوایەتی ئەو دڵنیابون، بەوە ڕازیبون. ئیدی قەڵەمڕەوی ئەو سلێمانی و هەندێ ناوچەی دەوروبەریشی لە پارێزگای کەرکوك گرتەوە. حاکمێکی سیاسی بەریتانیشی بۆ دامەزرێنرا تاکو ببێتە ڕاوێژکاری و هەروەها یاریدەدەری حاکمی سیاسیش لە هەریەك لە قەزای چەمچەماڵ و هەڵەبجەو ڕانیە دامەزرێنران. دەستەیەك لە سەربازانی سلێمانی بە فەرمانداری شێخ قادری برای شێخ مەحمود دروستکرا. شێخ مەحمود هەر خێرا دەستی بەسەر سلێمانیدا گرت و دەستی بەسەر خەزێنەدا گرت و هەمو ئەو فەرمانبەرە ئینگلیزانەی کە لەوێبون بەندکردو ئاڵایەکی بەرز کردەوە (ڕەنگی سەوزو مانگێکی هیلالی سوری تێدابو). (سۆن)ی حاکمی سیاسی چوە کەرکوك و یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە کشایەوە خانەقین. کاردانەوەی بەریتانیەکانیش پیادەکردنی هەڵمەتێك بو بۆسەر شێخ مەحمود کە لە دەستەکانی فیرقەی (١٨)ە تۆپچی و فڕۆکەو ئەندازیاران پێکهاتبو... ئەنجامەکەش لای خوێنەر ئاشکرایە. (و.ع).

٩. دەربەندی ڕەمکان هەردو چیای (کێوەڕەش) کە بەسەر ڕانیەدا دەڕوانێ و چیای (ئاسۆس– کەلار) کە بەسەر بنگرددا دەڕوانێ، لەیەك جیادەکاتەوە. زێی خواروش (بچوك) لەوێوە بۆ دەشتی بیتوێن دەرباز دەبێ. سوپای عێراقیش لەو دەربەندەوە بەرەو ئێران و ئازەربایجان و دەریاچەی ورمێ، تێپەڕین. دەشتی بیتوێن لە باشترین و بەپیت ترین و بەباران و بەراوترین دەشتەکانی عێراقە. تێبینی ئەوە دەکرێ کە زەویەکەی درز دەباو تۆوی وشك لەو درزانە دەچنە خوارێ و زەویەکە بەپیت دەکەن. (و.ع).

١٠. زۆربەی خانوەکانی لەسەر گردێکی شوێنەواری دروستکراون کە بە هەمان ناو ناسراوەو لەگەڵ گردێکی دیکەی نزیك لەوێ کە بە (گردی بلێڵ) کە شوێنەواری قۆناغەکانی بەر لە مێژو و سەردەمە ئاشوریەکانی لێیە. (و.ع). (ئێستا ژێر ئاوی دوکان کەوتوە. و. ك).

١١. پشدەر واتە پشتی دەروەو مەبەست دەربەندی ڕەمکانە، ئەمەش بۆ ئەو کەسانەی کە لەلای خۆر ئاواوە سەیری دەکەن. (و.ع).
١٢. گوندێکی نزیك سنووری عێراق- ئێرانەو بنکەی عەشیرەتەکانی پسدەرەو لەڕوی بەڕێوەبردنەوە بنکەی قەزایە. بەر لەوەی بگەیتە ئەوێش لەلای ڕاستی ڕێگاکەدا گردێکی گەورە دەبینرێ کە دارو پەردوی نیشتەجێیەکی ئاشوریی کۆنە، پێدەچێ کە شوێنەواری شاری (زەمبی) بێ کە لە دوەم هەڵمەتی سەرجۆنی پاشادا ناوی هاتوە، وەکچۆن لەو هەڵمەتەدا ناوی چیای (سمیرا) هاتوە کە ڕەنگە چیای قەندیلی بەناوبانگ بێ. (و.ع).

## بەشی نۆیەم:-

١. ئەو عەشیرەتە لە شەقڵاوە گردبونەتەوەو لە ناحیەی سەلاحەدین و هەریریش نیشتەجێن و، ناحیەیەکیش بەناوی ئەو عەشیرەتە هەیەو بنکەکەی (هیران)ەو پانتایی ناوچەی خۆشناوەتیش (١٠٠)کم٢ مەزەندە دەکرێ و ژمارەی دانیشتوانیشی بەپێی سەرژمێری ١٩٥٧ (٢٠٠٠) کەسە. (و.ع).
٢. ئەو پیاو ماقوڵە کرایە قایمقامی کۆیەو ئەو کە لە بنەماڵەی (حەوێزیەکانە) کچەکەی حەماغای هێناو بو بە زاوای (غەفوریەکان). عەشیرەتی حەوێزیش لە ناوچەیەکدا بلاون کە ڕوبەرەکەی (١٢٠)کم٢ و سەرۆکەکانیان لە کۆیە نیشتەجێن، ئەمەش وەك سەرۆکەکانی عەشیرەتی غەفوری. (و.ع).
٣. چیای سەفین کە شەقڵاوە دەکەوێتە دۆڵی باکوری، درێژبونەوەی چیای هەیبەت سوڵتانەو بەرزیەکەی دەگاتە (٧٠٠٠)پێ. (و.ع).
٤. یەکێك لە کەسایەتیە زۆر کۆمیدیەکانە کە ڕۆماننوسی ئینگلیزی (شەکسپیر)ی بەناوبانگ دایهێناوە. ئەو نمونەی کەسێکی دەبەنگی بەدمەست و دزە، کەچی پڕە لە چالاکی و دڵگرەو دڵی بینەران کەمەندکێش دەکا. لە ڕۆمانی (شانۆگەری) (هێزی هەشتەم) و (ژنە دڵخۆشەکانی ویندسەر) دەردەکەوێ لە شانۆگەری (هێنری پێنجەم)دا دەمرێ. (و.ع).

## بەشی دەیەم:-

١. شێخ مەحمودی حەفید خوا لێی خۆشبێ، درکی بەوە کردبو کە ژیان بەزم و ڕابواردن نیە، نابێ تەنیا بەلای خۆشگوزەرانی و ڕابواردندا بشکێنرێتەوە، بەڵکو خەبات و هەڵگرتنی باری قورسی سەرشانەو، شەیدای پایەی

(جکومداری سلێمانی یان کوردستان) نەبو، بۆیە دوژمنایەتی ئینگلیزەکانی کردو ئەوانیش دژایەتیان کرد. فەرمو بەکورتی باسی شۆڕشی کورد بە کورتی. شێخ مەحمود فەرمانی بە یەکێك لە پشتیوانانی خۆیدا، کە (مەحمود خانی دزەیی) بو، شاری سلێمانی داگیر بکا، ئەویش لە شەوی ٢٠/٢١/ئایار/ ١٩١٩ بەو کارە هەڵساو، هەمو ئەو ئەفسەر و سەربازە بەریتانیانەی لەوێ بون دەستگیرکران. ئیدی ئینگلیزەکانیش هەڵمەتێکیان بۆسەر شێخ مەحمود سازکرد کە بەهێزێکی کوردی لە تاسلوجە بەرەنگاریان بوەوە، لە نزیك سلێمانی شکستی پێ خواردن. جەنگ لەنێوان ئینگلیز و شۆڕشگێڕە کوردەکان تاکو ڕۆژی ١٩/ حوزەیرانی ١٩١٩ بەردەوام بو، کە (شەڕی گەورە) لەنێوان هەردولاو لە نزیك دەربەندیخان، ڕویداو، ئینگلیزەکان فیرقەیەك سەربازی خۆیان بە پاڵپشتی زرێ پۆش و فڕۆکەو تۆپ، تیایدا بەکارهێنا، شۆڕشگێڕە کوردە قارەمانەکانیش لەژێر سەرکردایەتی خودی شێخ مەحمود دابون. ئینگلیزەکان بە خیانەتی هەندێ لە (ئاغاکان)ی دەست و پێوەندی خۆیان توانیان دزە بکەنە پشت هێزی شۆڕشگێڕەکان و دەورەیان گرتن و شێخ مەحمودیان بریندار کردو پیاوەکانیشیان لەناوبردو شێخیان گواستەوە بۆ کەرکوك و لەوێشەوە بۆ بەغدا. ڕەوانەی دادگایەکی سەربازی بەریتانی کرا، بەڵام گیانە بەرزەکەی ئەوەی ڕەتکردەوە دان بەو دادگایەدا بنێ بۆ دادگاییکردنی، چونکە خۆی بە حوکمداری سلێمانی (بەڵکو کوردستانیش) دادەنا، لەکاتێکدا ئەو دادگایە بیانی و بەریتانی بو. لەگەڵ ئەوەشدا دادگایەکە فەرمانی لەسێدارەدانی بەسەر دادا دواتر کرایە بەندی هەمیشەیی. لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی بەریتانیای داگیرکەر لە مانەوەی لەعێراق دەترسا بۆیە بۆ هیندستان دوریخستەوە. شارەزاکانی سەربازی لە هونەرەکانی جەنگ هۆکاری شکستی شۆڕشی شێخ مەحمود بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە بە شەڕێکی بەرەیی هەڵسا لە بەرامبەر هێزێکی بەریتانی ڕاهاتن کردودا، کە ژمارەیان زیاترو چەکیان باشتربو، کە دەبوایە شەڕی چەتەیی بکردایە لەناوچە کوردیەکاندا. (و.ع).

٢. ئێستا قەزای مەخمورە. (و.ع).

٣. زۆر پێدەچێ مەبەستی خوالێخۆشبو (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) بێ، پیاو ماقوڵی هەولێر و ئەندامی ئەنجومەنی پیاو ماقولانی سەردەمی پاشایەتی گۆڕیەگۆڕ بێ. (و.ع).

٤. ..................

٥. ئەمە تێڕوانینی خودی نوسەرە، ئێمە بۆ ئەمانەتی وەرگێڕان دەینوسینەوە ڕەنگە هەموی فیشاڵ بێ. (و.ع).

٦. یەك لە نازناوەکانی شەیتانە. (و.ع).

٧. دیسان دەگەڕێینەوەو دەڵێین ئەوە ڕای نوسەرە لەو بارەیەوە، ڕەنگە لەخۆڕاش ئەو قسانە بکا، ئێمە بۆ ئەمانەتی وەرگێڕان هێنامانەوە ڕەنگە تەواو لە ڕاستیەوەش دووربێ. (و.ع).

٨. ..............

٩. عەشیرەتی گەردی لەناوچەی گردەکانی نزیك ئاوی بەستۆرە و دەشتەکەدا نیشتەجێن لە سەرەتای عەنکاوەڕاو خەریکی کشتوکاڵن و زیاتر بۆ ئەوە دەچین کە لە کۆیەوە هاتبن. (و.ع).

١٠. بنکەی ناحیەی عەنکاوە سەر بە قەزای ناوەندی هەولێرە. (و.ع).

١١. قوشتەپە مانای (گردی بڵندان) دەبەخشێ و ئێستا بنکەی ناحیەیەکە سەر بە قەزای ناوەندی هەولێرە. (و.ع).

١٢. گوندی هەریر دەکەوێتە ئەو دەشتە کە بە توتنی باش و هەنگوینی خۆش بەناوبانگە. (و.ع).

## بەشی یازدەهەم:-

١. ئەو ڕێیەی لەنێوان هەولێرو ڕەواندوزدا درێژ دەبێتەوە بە زنجیرەی چیایەکی نزمدا تێدەپەڕێ کە پێیدەڵێن (خانزاد) و دواتر بە زنجیرە چیای (پیرمام)دا تێدەپەڕێ، ئەنجا بە دەشتاییەکی نێوان چیای پیرمام و چیای سەفین و بە گوندێکی گەورەدا کە ناوی (کۆڕێ)یە کە نوسەر زیاد لە جارێك ناوی هێناوە، دواتر بە چیای سەفین هەڵدەگەڕێ تا دەگاتە شەقڵاوە کە دەکەوێتە دۆڵی ئەو چیایەی باکور. لە شەقڵاوەشەوە ڕێگاکە بەردەوام دەبێ و بە گوندی (هەریر)دا تێدەپەڕێ لەگەڵ دەشتی بەپیتی هەریر و باتاس، دواتر شۆڕدەبێتەوە تا دەگاتە دەرویەکی چیایی کە بە بێخمە ناسراوە- کە نیاز

وایە بەنداوێکی ئاودێری لێ دروستبکرێ– لەشێوەی دوکان و دەربەندیخان. ئەنجا بە چیای (سپیلك)دا سەردەکەوێ تا دەگاتە هەرە بەرزایی و دواتر بەرەو گوندی خەلیفان شۆڕدەبێتەوەو ئەنجا بە گەلی عەلی بەگدا تێدەپەڕێ– کە دە کیلۆمەتر دەبێ– کە دەروێکی سروشتیەو سێ لقی زێی گەورەی پێدا دەڕوا کە ئاوی خەلیفان و ڕەواندوز و دیانەیە ئیدی ڕێگاکە بەردەوام دەبێ تا دەگاتە ڕەواندوز. (و.ع).

٢. ئەو پیاوە پۆستی (فەرمانڕەوای پاشایەتی گشتی لەعێراق) هەبوە لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیاو ڕاستەوخۆ فەرمانڕەوایی عێراقی دەکرد. حاکمە سیاسیەکانی ویلایەتەکانیش ڕاستەوخۆ سەر بەو بون و نوسەریش بەوەی کە لە قەزای هەولێر کاریدەکرد پۆستی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) هەبوە، پەیوەست بە حاکمی سیاسی موسڵ بوە. لەو ڕوەشەوە تێبینی ئەوە دەکرێ کە ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی عێراق و دامەزراندنی دەزگایەکی مەدەنی بۆ بەڕێوەبردنی، خۆیان لە بەکارهێنانی ناونیشانە فەرمانداریە عوسمانیەکان بەدور دەگرت بۆیە ناونیشانی قایمقامیان کردە نمایندەی حکومەت (government agent) بەڕێوەبەری ناحیەیان کرد بە (مەئموری حکومەت). (یاریدەدەری حاکمی سیاسی)ش سەرپەرشتی هەمو کاروبارەکانی قەزاکەی دەکردو ئەو کەسانەش لە خەڵکی ناوچەکە یارمەتیان دەدا کە کلکایەتی ئەوانیان دەکردو هەڵیاندەبژاردن بۆ ئەو پۆستانە. وەکچۆن ئەنجومەنێکی شارەوانی هەبو کە لە ئاغاکان و پیاو ماقوڵان پێکهاتبوو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شارەوانی یارمەتیان دەدا. حاکمی سیاسیش لە لیوا (پارێزگا)داو یاریدەدەرەکانیشی لە قەزاکاندا کێشە سزایی و سوڵحکارەکانیان یەکلا دەکردەوە، بەڵام هەمو ئەمە بەزۆری بە عەقڵیەتێکی داگیرکارانەی– سەربازی بەریتانی جێبەجێدەکراو، هەندێ فەرمان دەردەکرا کە لە ڕاستیەوە دوربون. (و.ع).

٣. هێڵی ئاسنی نێوان بەغداو سامەڕا، وەك بەشێك لەو پرۆژە گەورەیەی کە ناوی (هێڵی ئاسنی بەرلین– ئەستەمبوڵ– بەغدا– بەسرا)یە، ئەندازیارە ئەڵمانیەکان بنیاتیان ناوە، وە لەبەر پێویستی سوپای بەریتانیاش هێڵەکە لە سامەڕاوە بۆ شەرگات ڕاکێشراو ئەمەش لە ساڵی ١٩١٧دا بو. (و.ع).

٤. ئاکرێ نزیکەی (٩٥)کم لە موسڵەوە دورە،ماڵەکانی لە قەدپاڵی چیایەکداو چین لەسەر چین بنیاتنراوە و تاڤگەیەکی لێیە کە نزیکەی (٣٠) مەتر بەرزەو پێیدەڵێن (سیپە).

مستەر بلێ پۆستی حاکمی سیاسی موسڵی لە عەقید لچمان وەرگرت، کە لە ١٢/تشرینی یەکەم/ ١٩١٩دا بۆ (کوت) گواسترابووەوە، بۆیە بەباشی زانی کە سەردانێکی ناوچەکانی لیواکە (پارێزگاکە) بکاو رێو شوێنی ئەوتۆ بگرێتەبەر کە خەڵکەکە نەتوانن سەربازە بەریتانیەکان بکوژن. (نەقیب سکوت)ی جێگری حاکمی سیاسی ئاکرێ لەگەڵ خۆیدا بردو چونە (پیرە کەپرا) کە بنکەی ناحیەیەك بو هەر بەو ناوە لە قەزای ئاکرێ (ئەو بنکەی ناحیەیە لە پەنجاکاندا گواسترایەوە گوندی {دینارتە}ی باکوری رۆژهەلاتی ئاکرێ). داوای لە فارس ئاغای زێباری و براکەی کرد بێنە ئەوێ و داواشی لێکردن دوای گەڕانەوەی لە گەشتەکەی بۆ (بارزان) کەفالەتێکی پارەیی بە بڕی (٤٠٠٠) روپیە بۆ هەر یەکێکیان لەگەڵ ڕادەست کردنەوەی ئەو چەکانەی هەیانە، ئەمەش تورەی ئەوانی وروژاندو هیچ خراپەکاریەکیان بەرامبەر دو میوانەکەیان نەکرد کاتێ لە گوندەکەیانداوبون و دواتر ئەو ڕوداوە ڕویدا کە نوسەر باسی کردوە. (و.ع).

٥. مەبەست شێخ عوبدولسەلامی بارزانیە کە والی عوسمانی موسڵ سلێمان نەزیف پاشا لە (٣)ی کانونی یەکەمی ١٩١٤ لە سێدارەی دا. (و.ع).

٦. دەشتی هەریر یان (دێرەی هەریر) ناحیەیەکەو ئێستا سەر بە شەقلاوەیە. (و.ع).

٧. گوندی (بجێل) دەکەوێتە دوری چوار کیلۆمەتر لە ڕۆژهەلاتی ئاکرێ. (و.ع).

٨. پێویستە بەکورتی باسی جوڵەکانی ئەو سوپایە بکەین. لە هەفتەی دوەمی تشرینی دوەمی ١٩١٩دا بەرەو ئاکرێ چوو کە بە دێرە هەریر و باتاسدا تێپەڕی عەشیرەتی سورچی بەریان پێگرتن و شەڕێ:ی توندیان لەگەڵدا کردن و کوژراوی لێکەوتەوە، بەڵام توانی لە ڕۆیشتن بەردەوام بێ و لە زێ بپەڕێتەوەو، (عەقید نۆڵدەر)ی حاکمی سیاسی نوێی موسڵ کە شوێنی حاکمی سیاسی پێشتری (کوژراوی) گرتەوە، واتە (مستەر بیل) کە لە ١٤/ تشرینی دوەم/ ١٩١٩ کوژرا، یارمەتی دەدان و بە هانایانەوە دەهات. ئیدی ئەو سوپایە لە ١٧/ تشرین/ ١٩١٩دا بێ هیچ بەرەنگاریەك گەیشتە ئاکرێ،

چونکە بارزانیەکان چۆڵیان کردبو. دوای ئەوە شەڕێك لەنێوان ئەو سوپایەو عەشیرەتی سورچیدا ڕویدا لە (کەردین) کە شەش کیلۆمەتر لە ئاکرێ دورەو هەردولا زیانیان لێکەوت، بەڵام شۆڕشگێڕان لەگەڵ ئەوەی زیانیان بە دوژمنەکەیان گەیاند، بەرەو ناوچە چیاییەکان کشانەوە. دواتر سوپاکە لە (١٠/کانونی یەکەم/ ١٩١٩ ) (پیرە کەپرا)ی داگیرکردو زێباریەکان پەنایان بۆ خاکی ئێران برد. (و.ع).

٩. مەبەستی (مەلا محەمەد ئەفەندی) (مەلای گەورە)ی قازی شەرعی کۆیەی ئەو کاتەیە. (و.ع).

١٠. ئەو بایە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا هەڵدەکات، لە هاویندا وەك (بای سەموم) ی (شەرجی)یە لە باشوری عێراق. لە زستانیشدا ساردە. (و.ع).

١١. دوبارەی دەکەینەوە کە ئەوانە بۆچونی تایبەتی نوسەرن، کە ڕەنگە ڕاست یان ناڕاست بن. ئێمە تەنیا بۆ ئەمانەتی وەرگێڕان هێنامانەوە. (و.ع).

١٢. پێمان وایە کە مەبەستی خوالێخۆشبو شێخ ئیبراهیم حەیدەریە کە پۆستی وەزیری ئەوقافی لە وەزارەتی خوالێخۆشبو یاسین پاشای هاشمی هەبوە لە سەردەمی پاشایەتیدا. (و.ع).

## بەشی دوازدەهەم:-

١. مەبەست پاشای کۆرە (پاشای گەورە: و.ك)کە لەسەردەمی ئەودا ڕەواندوز گەشەکردو تاکو لەوێدا تۆپ دروستکرا، لەوانەش تۆپێك کە ئێستا لە مۆزەخانەی چەکی بەغدایە. (و.ع).

٢. ناوەکەی لە دو وشەی کوردی پێکدێ. ڕەوان {(یان ڕەوەند) و.ك} کە ناوی هۆزێکی کوردەو مانای ڕەوەند دەگەیەنێ و (دژ) کە لە زمانی کوردی کۆندا مانای قەڵایە. (و.ع).

٣. قەڵایەکەو لەسەر تەپڵەکی چیایەکی هەڵچوی خڕدا بنیات نراوە کە تەپڵەکەکەی تەنیا جێگای شارەکەی تێدا دەبێتەوە. دیواری ماڵەکانی لەسەر لێواری هەڵدێرەکەیدا بنیات نراوە. (و.ع).

٤. بەڕای (خاتو کۆترۆن بێل G.L.Bell) لە شوێنی ئێستای زاخۆدا (حوسەینیە) ئاوەدان بوە کە خەڵکە عەرەبەکانی ناوچەکە باسی دەکەن گوندێکیش بەرامبەر زاخۆی ئێستاو لەبەری ئەوبەری (خاپور)دا هەیەو تا

ئێستا ناوی حوسەینیەی پاراستوە. سەیری کنیبەکەی بکە (لە مرادسو بۆ مراد سو) (Amurath to Amurath).

٥. کارگاه: ئەو قەلاّو پێگانەن کە ماون و لەوانەش پێگەیەك کە بەبەردو گەچ لەسەر لێواری زێی بچوك و لە نزیك بەنداوی دوکان بنیاتنراوە و ئامآژەیە بۆ کارەکانی ڕۆژانی بەسەرچوی ئەو پاشایە. (و.ع).

٦. بۆ نمونە بابانەکان چەندین قەلاّو پێگەیان بەرامبەر بەقەمچوغە دروستکردوە کە دەکەوێتە لێواری دەربەندێك تا ڕوبەڕوی ئەو قەلاّیە بێتەوە کە موحەممەد پاشای ڕەواندوز لە سارتکە لە بەری بەرامبەری ئەو زێیە دروستی کردوە. (و.ع).

٧. ئەوەی کە یارمەتیدەر بو بۆ دروستبونی بارێکی لەو جۆرە لە خودی ڕەواندوز: ئەوەیە کە دەکەوێتە شوێنێکی قایم، لەوەشدا تارادەیەك هاوشێوەی ئامێدیە، چونکە بەدۆڵ دەورە دراوەو پتر وەك قەلاّیەك دەچێ. وَ زیاتر دەوڵەمەندکردنی زانیاری خوێنەری بەڕێز لەو بارەیەوە دەڵێین کە لە سەردەمە کۆنەکانی عێراقدا نیشتەجێیەك بوە خراوەتە سەر مەملەکەتی ئەرمەنی. (و.ع).

٨. ..................

## بەشی سێزدەهەم:-

١. لە بنچینەدا (Assasinatin)ە، کە مانای کوشتنی ئەنقەست دەبەخشێ. (لەگەڵ سوربونی بەرایی)، وادیارە نیەتێك بۆ کوشتنی هەبوە. (و.ع).

٢. ..................

٣. ..................

٤. سەرۆك و ئاغاو پیاو ماقوڵەکان لەسەر میوانداری کردنی حاکمە سیاسیە بەریتانیەکان و یاریدەدەرەکانیان ڕاهاتبون، لەلایەك لەبەر نەبونی (میوانخانەی حکومی) و هەندێکیشیان ماستاوچێتیان بۆ دەکردن و خۆیان تێهەڵدەسون بۆ وەدیهێنانی جێی خۆکردنەوە لە لایان و دواتریش شکۆ و پایەو زەوی و زارو پارەو پول. (و.ع).

## بەشی چواردەهەم:-

١. ........................

٢. مەبەست (فەرمانبەرە بچوکەکان)ەو، سەردەمی پاشایەتی گۆڕ بەگۆڕیش هەمان ڕێچکەی گرت و ناوی (فەرمانبەرە مەزنەکان)یان لە ڕۆژنامەی فەرمی حکومەتی عێراقیدا بڵاودەکردەوە. (و.ع).

٣. کەسێکی کە متمانەم پێی هەیە پێی وتم کە ئەوماڵە شوێنی حەوانەوەی زۆربەی موتەسەریفەکانی سەردەمی پاشایەتی بو تاکو خانوێکلا نوێیان بنیاتنا، تا ببێتە ماڵی موتەسەریف. (و.ع).

٤. لە بنچینەدا Boxing day– کە لە ڕۆژێکی ئاوادا لەناو سەندوقدا دیاری دەدرایە بەردەستەکان و پۆستەچیەکان، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، ئەوە جێی پێکەنینیشە یەکێك لە وەرگێڕەکان بە (ڕۆژی فریشتەکان) وەریگێڕاوە. (و.ع).

٥. ئەمە یاری (قاشوانێیە) کە عەرەبەکان هەیانبوەو پێدەچێ ڕۆژئاواییەکان لەوانیان وەرگرتبێ. (و.ع).

٦. لە (زاویە) (الرباط) و (التكية) نزیکە. خانەقا وشەیەکی فارسیەو مانای ماڵ دەگەیەنێ دەڵێن گوایە لە بنچینەدا (خونەقاە) بوە، واتە ئەو شوێنەی پاشا نانی تێدا دەخوا (خەوانك)یش لە سنوری ساڵی (٤٠٠)ی کۆچی پیرۆز هاتۆتە ئاراو کراوەتە شوێنی تەسەوف بۆ خواپەرستی. (و.ع). (پێدەچێ خانەقا واتای ماڵی پادشا ببەخشێ، چونکە نەقشبەندیەکان بە دامەزرێنەری ئەو ڕێبازە دەڵێن شاهی بوخارا. و.ك).

٧. لە ئەفسانەیەکی گریکیدا باس لەو ژنە جەنگاوەرانە دەکا کە خەڵکی ئاسیای بچوکن (تورکیای ئێستا). شاباتۆکەشیان (شاژنەکەیان) کە ناوی (هیپۆلیتا)بوە پشتوێنی (ئاریس)ی پشت بەستوە کە (هەرقەل) لێی سەندو سیسیۆسی یارمەتیدەری هەرقەلیش (هیراکلیس) (ئەنیتۆپ)ی خوشکی شاباتۆی ڕفاندوەو بۆ گێڕانەوەشی ژنە ئامازۆنیەکان هێرشێك دەکەنە سەر ئەسینا، بەڵام دوای شەڕێکی خوێناوی بۆ ڕێیان پێدرا. دەستەیەکیش لەوانە لە دوا ساڵی شەڕی تەروادەدا بۆ یارمەتیو پشتیوانی هاتن، بەڵام (ئەخیل) هەموی کوشتن. (و.ع).

٨. دوای کوژرانی (مستەر بل)ی حاکمی سیاسی لەناوچەی (پیرەکەپرا) لە ١٤/ تشرینی دوەم/ کرایە حاکمی سیاسی موسڵ. (و.ع).
٩. سەرۆکی عەشیرەتی سورچیە لە ئاکرێ. (و.ع).
١٠. .................
١١. فاتمە خانم دوای مردنی مێردەکەی توانی کاروباری هەشت گوند ببا بەڕێوە، قسەکردن لەسەر ئەو خانمە دەمانباتەوە سەر قسەکردن لەسەر خانمێکی دیکەی هاوشێوەی ئەو کەلە هەمان ناوچەدا ژیاوە. کچە میرێك (میرزادە) هەبوە کە ناوی (خانزاد)بوەو لە هەریردا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوە، ئەو دەمەی مرنشینی سۆرانی کوردی دامەزراوە. تا ئێستاش ئەو میرنشینە شوێنەواری لەنێوان شەقلاوەو گەلی عەلی بەگدا ماوە. ئەو خانمە میرە جلی پیاوانی لەبەر دەکردو چەکی هەڵدەگرت و بەشەو بۆ چاودێری دەگەڕاو بۆ گوێگرتن لە گلەیی خەڵك و چارەسەرکردنی کێشەو تەگەرەکانیان دادەنیشت. کۆشکەکەشی لە شەقلاوە بوەو تا ئێستاش شوێنەواری لەسەر چیای سەفین ماوەو دوای مردنی ئەویش ئەو میرنشینە پوکایەوە و ئەمەش لەسەر دەستی فەرمانڕەوا عوسمانیەکانی عێراقدا بو لەو سەردەمە. (و.ع).

## بەشی پازدەهەم:-

١. ئاکرێ نزیکەی (٩٥)کم لە موسڵ دورە.
٢. سەرۆکەکانی عەشیرەتی زێباری ڕاپەڕیو ئەودەمای:
أ- بابەکراغای زێباری کە گوندەکەی (پیرەکەپرا)بو کە پێشتر باسی کرا.
ب- فارس ئاغای زێباری، کە گوندی (هوکی) هی ئەو بوەو دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای ئاکرێ و(١٢)کم لە (پیرەکەپرا) دورە.
ت- مەحمود ئاغای زێباری کە گوندەکەی (نەباخی)یەو دەکەوێتە پشت چیای پێرس. (و.ع).
٣. لە عەشیرەتە ڕەوەندەکانی کوردن و ڕەوەندە کوردەکانیش وەك بەدوە عارەبەکان لەناو ڕەشماڵدا دەژین کە لە موی بزن دروستدەکرێ و لایەکانی لێکدەدروێن و بەپێی گۆڕانی کەش و هەواو ئاڕستەی (با) بەرزو نزم دەکرێتەوە. پایەو سامانی خاوەن ڕەشماڵیش بە گەورەیی و ژمارەی ئەستوندەکانی پێوانە دەکرێ. (و.ع).

٤. دەشت وشەیەکی فارسیە. (و.ع). (سەیرە وەك ئەوەی کورد ئەو وشەیەی نەبێ، لە کاتێکدا کوردیەکی ڕەسەنەو فارسەکانی بە دەشت دەڵێن (سارا) و.ك).

٥. ....................

٦. ....................

٧. لەو دۆڵەدا گوندێك لەنزیك گوندی جوندیان هەیە کە جوندیان دەکەوێتە دەروەکەی و ناوی (خەلەکان)ە ڕەنگە مێژونوسی بەناوبانگ (ئیبن خەلەکان) خاوەنی (وەفیات ئەلئەعیان) خەڵکی ئەوێ بێ، وەکچۆن گوندێکی دیکەش بەو ناوە لەسەر ئەو ڕێگایە هەیە کە دەچێتەوە دوکان. (و.ع).

٨. (تێبینی دەکرێ) لەسەر کێلی گۆڕەکاندا لە کوردستان نیشانەی سەیر هەیە، لە هەندێ شوێن وێنەی (شانە)هەیە کە ددانەکانی لەلایەکەو لەسەر گۆڕی (کێلی) ژن کێشراوە، دەستێکی لە ئاسن دروستکراویش لەسەر گۆڕی روحانیەکان یان سەیدەکان دادەنرێ و کێلی گۆڕی سەرۆك عەشیرەتیش بە وێنەی شاخی کەڵەکێوی دەڕازێنرێتەوە، وەکچۆن تێبینی وێنەی خۆر دەکرێ لەسەر هەندێ کێلی گۆڕەکاندا کە تیشکی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکاتەوە. (و.ع).

٩. یان سابلاخ کە دەکەوێتە باشوری دەریاچەی ورمێ. (و.ع).

١٠. شوێنی لەدایکبونی زەردەشتە، لەسەر لێوارەکانیدا بانگەشەی بۆ ئاینەکەی کرد، وەکچۆن عیسا دوای (٧٠٠) ساڵ لەسەر لێوارەکانی دەریاچەی (تەبەریە) لە فەلەستین بانگەشەی بۆ ئاینەکەی کرد. (و.ع).

١١. سەرکردەیەکی کوردەو ناوی ڕاستەقینەی (ئیسماعیل ئاغایە)و سمکۆ نازناویەتی (بچوککراوەی ئیسماعیلە. و.ك) عەشیرەتەکەشی، واتە شکاك لەنێوان وانی تورکیاو ورمێی ئێران بڵاون. دەسەلاتی پەرەی سەندو حکومەتی ئێران ویستی بە هاسانترین ڕێگە لەناویببا، ئیدی بەناوی وتوویژ لەگەڵ کردنیدا بۆ ئەوەی بیکەنە سەرکردەی عەشیرەتە کوردەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئێران لە ساڵی ١٩٢٦ بانگێشتی تاران کراو لە ڕێگا لەنزیك (شنۆ)یە بۆسەیەکی بۆ دانراو تەقەی لێکراو کوژرا. (و.ع).

١٢. نەشارەزایی ڕەشە خەڵکەکەی کورد لە (زمانی عارەبیدا) لەگەڵ ئەوەی زۆریان ئەو زمانە خۆشدەوێ چونکە زمانی قورئانە پیرۆزەکەیان و فیقهی ئاینە پاکەکەیانە، بواری بۆ شێخەکانیان ڕەخساندوە ئەو پایە بەرزە لەناو کوردان وەرگرن، شێخەکانیان لە ڕوانگەی ئەوانەوە شەرع زان و پارێزەری ئاینن، هەندێ لەو شێخانەش ئەو دەسەڵاتە ئاینیەی خۆیان قۆزتوەتەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروبارە دنیاییەکانی ئەو عەشیرەتانەو. ئیدی شێخی ئاین بوەتە شێخی ئاین و دونیا. (و.ع).

١٣. کەسێکی کە گومانم لە قسەی نیە پێی گوتم کە لەو نەریتانەی لە ناوچەکەدا باوبوەو ڕەنگە ئێستاش شوێنەواری مابێ، کە یەکێك لە خەڵکەکە لەکاتی بڕانی ئاوی کانیەکە بە دەمانچەکەی تەقەی لەناو کانیەکە دەکردو گوایە خێوەکەی کە بەری ئاوەکەی گرتبو، کوشتوەو ڕەنگە ئاوەکەش بەڕێکەوت یان بەهۆی فشاری هەوا گەڕابێتەوەو وا بڵاوبوبێتەوە کە ئەو پیاوە خێوەکەی بەڕاستی کوشتوە. ئیدی خوا خۆی دەزانێ بەندەکانی چین. (و.ع).

١٤. پێشتر بنکەی ناحیەی بارزان بوەو دواتر گواستراوەتەوە بۆ مێرگەسور. (و.ع).

١٥. ..............

## بەشی شازدەهەم:-

١. ..................

٢. ..................

## بەشی حەڤدەهەم:-

١. شارێکی سەر دەریاچەکەیە لە باکوری وڵاتی فارس و درێژی دەریاچەکەش لە باکورەوە تا باشور پتر لە (٨٠)میل دەبێ و پانیەکەی نزیکەی سێیەکی درێژیەکەیەتی. ورمێش دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای دەریاچەکەو وەك دەڵێن شاری زەردەشتە. (ئەستەخری)ش ناوی لێناوە (دەریاچەی شۆرە)، شوراتەکانیش دەستەیەك لە خەواریجەکان بون، لەناو دەریاچەکەشدا دورگەیەك هەیە کە (ئیبن سەرابیۆن) ناوی ناوە دورگەی (کەبودان). هۆلاکۆی ستەمکارو وێرانکەری مەغۆلیش بەو سەروەت و سامانەی کە لە

بەغداو پارچەکانی خەلافەتی عەباسیدا تالآنی کردن قەلآیەکی لێ دروستکردو دواییش بۆ گۆڕی ئەو و بە (گۆڕ قەلآ) ناسراوە.

٢. ئەوانە لە تورکیاو فارس (ئێران) نیشتەجێبون و، بەریتانیە داگیرکەرەکان لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بۆ عێراقیان ڕاگواستن. ئۆردەگایەکیان لەنزیك باقوبە بۆ کردنەوە ناوی (ئاسوری)شیان لێنان. وەکچۆن سوپای (لیڤی)یان لێ دروستکردن، هەندێکیان لێ لە باکوری عێراق نیشتەجێکردن. ئەو تەیاریانەش کاتێ لەو سەربازگەیەبون کە ناوی جۆجەر بو- جۆجەر گوندێکە لە ناحیەی عەشایەر سەبعە لە قەزای ئاکرێ- ڕوبەڕوی هێرشێکی سورچیەکان بونەوە لە (١٥)ی ئەیلولی (١٩٢٠)و لەگەڵ یەکدا تێك ئانگژان تاکو فرشۆکە ئینگلیزیەکان بە هاواری تەیاریەکانەوە هاتن و ئەمەش دوای چل کوژراو سورچیەکانی ناچاری کشانەوە کردو زیانەکانی تەیاریەکانیش هەمان چمارە بو. بەو جۆرە تەپە سەرکاری بەریتانی سیاسەتی (پەرت کەو زاڵ بە)ی بەکارهێنا لەنێوان تایەفەیەك و تایەفەیەکی دیکەدا تا خۆی باڵادەست بێ. (و.ع).

٣. تۆڵە سەندنەوە نەریتێکی ڕەگداکوتاوی ناو کوردانە، ئەمەش لە پەندەکانەوە دەردەکەوێ وەك: (تۆڵە ڕۆژێکی بەسەردا بڕوا سارد دەبێتەوە) یان (برا لەپشت برابێ، مەگەر قەزا لەلای خودابێ) یان (مرۆڤ یەکجار دەمرێ) و بەشێوەیەکی ئاسایش تۆڵەسەندنەوە لە دیاردەکانی هاوکاری عەشایەریەو تاکە ڕێگاشە بۆ تۆڵە لەکاتێکدا کۆمەڵگا حکومەتێکی تێدا نەبێ مافی ستەمدیدە لە ستەمکار بسەنێ. (و.ع).

٤. مەبەستی پەلهاوێشتنی شۆڕشی عێراقی ساڵی (١٩٢٠)ە کە گەیشتۆتە لیوای دیالە. (و.ع).

٥. ....................

## بەشی هەژدەهەم:-

١. دێرە هەریر ناوچەیەکی سەر بە شەقلاوەیەو باتاسیش یەك لە گوندەکانیەتی کە نزیکەی (٣٠)کم لە ڕەواندوز دورە. (و.ع).

٢. ......................

٣. هەر گەنجێکی کوردستان کە دەگاتە بالغ بون، ئیدی دەبینی کە چەکێکی هەڵگرتوە و زۆر شەیدایەتی و لە زەماوەندو ڕێو ڕەسمی سەر قەبرانداو لە جەژنەکان و پێشوازی پیاوماقوڵاندا دەنگی تەقە دەبیسترێ. (و.ع).

**بەشی نۆزدەهەم:-**

١. لەمەوەو لەوەی کە (نوسەر) دواتر باسی دەکات، شوێنەواری شۆڕشی هاوڵاتیە کوردەکان لەسەر داگیرکاری ناحەزی بەریتانی دەردەکەوێ و چۆنیش پیاوەکانی ئەوانیان وەك پوشی گڕگرتو لێکردبو و بنچینەی سوپاکەیان هێنابوە هەژان، کە نوسەر خۆی بە ئاشکرا گەواهی ئەوە دەدا. بۆیە ئەم کتێبە باوان بۆ نەوەکانی دەگێڕنەوە. دەبینی نوسەر خەم بۆ ئەو دەسەڵاتە دەخوا کە هەبیوەو جەخاری ئەو هەمو پارە زیوانە دەخوا کە لە کڕینی ویژدانی ئەوانەدا بەکای دەهێنان کە لەدوای دەڕۆیشتن و هەستی بەوە نەدەکرد کە کاتێك دێ هەمو ئەو شتانەش سودیان نابێ. (و.ع).

٢. لەك وشەیەکی فارسیەو دەکاتە سەد هەزار ڕوپیە. (و.ع).

٣. دەکەوێتە سەر ڕێی گەورەو ئەو ڕێگایەی بە هەولێریەوە دەبەستێتەوە قیرتاو نەکراوەو نزیکەی (٥٣)کم دەبێت و تۆزێك لەخوار گوێڕەوە زێی گەورە لە (مەخڵەت) بە دیجلە دەگا. (و.ع).

٤. ..................

٥. ..................

**بەشی بیستەم:-**

١. ..............

٢. لە چیا بەرزو سەرکەشەکانە بەرزیەکەی دەگاتە نزیکەی (١١٤٠٤)پێ. (و.ع).

٣. مەبەست ئیسماعیل ئاغایەو عەشیرەتەکەی لەسنوری نێوان تورك و فارسداو لەناوچەی قەتور نیشتەجێن. (و.ع).

٤. ڕوبارێکی بەو ناوە هەیە کە بە دۆڵێکی بەهەمان ناودا دەڕواو گوندێکی لێیە بەناوی (خەلەکان)، لە (جوندیان) نزیکە. (و.ع).

٥. ئەو ناوە کراوە بە ڕەزاییە. (و.ع).

٦. ئەوە ڕێچکەی پیاوانی کۆیلەکەر بو، تێکدەر نەك ئیستیعماری ئینگلیزی وەك بۆ چاوبەست و بەهەڵە دابردن دەیانگوت، برادەرانی خۆیان خەلأت دەکرد مادام چاوەڕوانی سودیان لێدەکراو، دوژمنەکانیشیان بۆ ڕێگرتن لە کەسانی دیکە سزا دەدا، ئیدی خۆیان و هاوڕێکانیان ڕۆیشتن و ئەو ساڵانەو خەڵکەکەشی بەسەرچون، وەك ئەوەی خەونێك بوبن. (و.ع).

## بەشی بیست و یەک:-

١. ڕەنگە وێکچونەکەیان لە قەڵەویەکەیاندا بوبێ کە سیمای هەردوکیان بو. (و.ع).

٢. خەڵکی عێراق بە عەرەب و کوردو تورکمانەوە..... تەنیا بەوەندەی کۆیلەکار تەڵەکەو دەسیسەکانی ڕاگرێ دەتوانن بەئاشتی بژین و دەوڵەتێك دەمەزرێنن کە سەقامگیری پێشکەوتوانەی هەبێ. (و.ع).

٣. لایەنی سیاسی بە پێگەی یەکەم و پزیشکیەکەش لەپێگەی دوەم دێ. (و.ع).

٤. ..................

٥. بەپێی یاسای زێڕینی (پەرتکەو زاڵ بە). (و.ع).

٦. ........................

٧. ......................

◆

# DÛ SALÎ LE KURDISTAN

NÛSÎNÎ:
SIR. WILLIAM RUPERT HAY



WERGÊRANÎ:
LUQMAN BAPÎR

ROJHALAT
PRESS AND PUBLISHER ESTABLISHMENT